إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنۡ
ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ
رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٢ وَإِذۡ أَخَذۡنَا
مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم
بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٦٣ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُم
مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۖ فَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ
ٱلۡخَٰسِرِينَ ٦٤ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ
فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ٦٥ فَجَعَلۡنَٰهَا نَكَٰلٗا لِّمَا
بَيۡنَ يَدَيۡهَا وَمَا خَلۡفَهَا وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ٦٦ وَإِذۡ قَالَ
مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ قَالُوٓاْ
أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٦٧
قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا
بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَۖ فَٱفۡعَلُواْ مَا
تُؤۡمَرُونَ ٦٨ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ
يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ٦٩

قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَـٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ
إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ
تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟
ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ
قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَْٰٔتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾
فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ
ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ
فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ
مِنْهُ ٱلْأَنْهَـٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ
مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾
۞ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا۟ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ
يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ
يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا
خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓا۟ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ
عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾



پێشەکی :

# بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد الله نحمده ونستعينه ونستغفره ، و نعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل ، ومن يضلل فلا هادى له ، أشهد أن لا إله إلا واشهد أن محمدا عبده و رسوله اما بعد ...

فأن أصدق الحديث كتاب الله ، خير الهدى هدى محمد ﷺ ، وشر الأمور محدثاتها ، وكل محدث بعدعة وكل بعدعة ضلالة ، وكل ضلالة فى النار ...

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ١٠٢﴾ [آل عِمْرَان : ١٠٢]

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ١﴾ [النِّسَاء : ١]

قال تعالى: ﴿يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ٧١﴾ [الأَحْزَاب : ٧١]

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

بەلێ لە بەرگی دووەم باسی ئایەتەکانی سورەتی (البقرە) مان کرد کە ئایەتی (٤٠-٦١) ، بەلام لە بەرگی سێ یەمی تەفسیری شعیب تەفسیری تەواو کەری ئایەتەکان دەکەین ، کە لە ئایەتی (٦٢) دەست پێدەکات تاکو ئایەتی (٧٤) بە پشتیوانی(خوای گەورە ) بەلام لەم بەرگەدا زیاتری درێژە بە تەفسیرەکە نادەیە ، بەلکو تەنها ماناو مەبەستی کورت روون و ئاشکرا تەنەها بۆ تێگەیشتنی خوێنەری بەرزێز دیارە لە بەرگی سێ یەم هەستم کرد نەکو تەمەن رێگە نەدا، بۆ تەواو کردنی تەفسیری شعیب بۆ تەواوی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز کە هەموو خولیاو ئاواتەمە تەواوی قورئانی پیرۆز تەفسیر بکەن ، بە پشتیوانی (خوای گەورە ) ، هەروەها بە سوود وەرگرتن لە زانایانی تەفسیر ئەوانەی پێشینەکان ، ئەوانە ی ئەم سەردەمە، هەروەها بە سوود وەرگرتنی لە مامۆستاو زانایانی ئاینی ئیسلام ، ئەوانەی کە تەفسیری قورئانیان کردووە بەکوردی ، بەلێ لە بەرگی سێ یەمدا پشت دەبەستم بە بابەتە سەرکیەکانی ئایەتەکان لە هەر ئایەتێك دا باسی لێکدانەوە بابەتە دەکەم ، کەواتە لە هەر ئایەتێك بابەتێکی گرینگ دەخەمە بەرباس و لێکدانەوە لێ کۆلینەوە لە باس و بابەتەکە دا ، هەروەها زیاتریش لەم بەم بەرگەدا ، ووشەکان بە ماناو مەبەستی تەواو دەخەمە بەر باس شی کردنەوە راڤەکردنی ئایەتەکان ، بەپێ زانستی قورئانی پیرۆ ، هەر کو تەفسیری ئایەتێك بە ئایەتێکی قورئان ، واتە تەفسیری قورئان بە قورئان ، یان تەفسیری قورئان بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها تەفسیری قورئان بە هاوەلان و پێشینەکان و زانایانی تەفسیری قورئانی پیرۆز ، دیارە هەر لە ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کە لە تەفسیری سوورەتی (البقرە) دا لە ئائەتی (٦٢) دەست پێدەکەین تاکو ئایەتی (٧٤) سورەتی البقرە دا ، وادیارە ئایەتەکانی دووبارە هەر هەمووی لە سەر گاور جوولەکەکان ، بەتایبەتی جوولەکە یان نەوەی ئیسرائیل ، (إنشا الله ) بە پشتیوانی خوای گەورە ئەگەر تەمەت باقی بێت درێژە بە تەفسیری شعیب دەدەین ، ئەگەر هەر کەم کوریەك هەبێ ئەوا لە لایەن باوکی شعیب هاتووە بەگەورەیی رێزداری خۆتان لیمان ببورن ، ئەگەریش ئیجتهادێك مان کردووە یان سوودێمان گەیاندووە ، ئەوا لە (خوای گەورە) وەیە، فەزل بەرکەت و حیکمەت و هیدایەت و رێنمایی (خوای گەورە ) نیعمەتەی پێ بەخشیوین ..؟!

## ئایەتی: ( ٦٢)

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ٦٢﴾ [البَقَرَةِ : ٦٢]

واتە: بێگومان ئەوانەی باوەریان هێناوە لە (ئۆمەتی ﷺ ئەوانەش کە بوونە جوولەکە (شوێنکەوتەی (موسا) —علیە السلام - ) ئەوانەش کە گاورەکانیش کە (شوێنکەوتەی (عیسا ) — علیه السلام - ) ئەوانەش (صابئین ) قەومێکن لە سەر فیترەتن هیچ دینێکیان نیە شوێنیان بکەون ، ئەوانە هەر دەستە یەکیان باوەری هێنا بێت بە خواو رۆژی دوایی و کارو کردەوەی چاکەی ئەنجام دابێت ، جا ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە ، نەترس و بیمیان دەبێت ، نەغەم وپەرژارەش روویان تێدەکات ..؟!

[ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا ] ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وە ئەوانەی کە یەهودی بوونە، کە نسبەتە بۆ (یهودا) کە گەورەترین کوڕی یەعقوب بووە، یان بۆیە پێیان وتراوە یەهود چونکە لە کاتی تەورات خوێندندا خۆیان جوڵاندۆتەوە، یان وتراوە: (هَادُوا) واتە: ئەوانەی کە گەڕاونەتەوە (هُدنا) تەوبەیان کردووە لە پەرستنی گوێرەکەکە [ وَالنَّصَارَى ] وە ئەوانەی کە نەصارا بوونە کە نسبەتە بۆ دێی ناصیرە لە فەلەستین کە عیسى صلى الله علیه وسلم لەوێ بوو، یاخود لەبەر ئەوەی کاتی خۆی عیسایان سەرخستووە بۆیە پێیان وتراوە: نەصارا [ وَالصَّابِئِينَ ] ئەوانەی کە مەلائیکەت پەرست یان ئەستێرە پەرست بوونە، یان هیچ دینێکی دیاریکراویان نەبووە شوێنی بکەون [ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا ] هەر کەسێك لەمانە ئیمان بێنێ بەخوای گەورەو بەڕۆژی دوایی وە کردەوەی چاك بكەن [ فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ ] ئەوە لای خوای گەورە ئەجرو پاداشتی خۆیان هەیە [ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) ] وە ترسیان لەسەر نیە لە ڕۆژی قیامەت وە خەفەتیش ناخۆن بۆ دونیایان چونکە خوای گەورە باشتریان دەداتێ، ابن عباس ئەفەرمووێ: ئەمە بۆ ئەو سەردەمە بووە بەڵام لە دوای ئەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند [ وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ] (آلِ عِمْرَانَ : ٨٥) واتە: هەر کەسێك جگە لە ئیسلام دینێكی تر هەڵبژێرێ وە داوا بكات ئەوە خوای گەورە لێی قەبوڵ ناكات وە لە قیامەتدا لە زەرەرمەندانە .

هۆدابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە :

لە (سلمان فارسی ) – خوا لیٰ رازی بێت – دەگێڕیتەوە دەلێت : ((قال سلمانُ : سألتُ النّبيَّ صلَّى اللهُ عليْهِ وسلَّمَ عن أهلِ دينٍ كنتُ معهُم ، فذكرَ مِن صلاتِهِم وعبادتِهِم فنزلَتْ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ...﴾ [البَقَرَةِ : ٦٢] واتە: سلمانی فارسی کە هاوەلێکی گەورەو بەرێزی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ، تەمەنێکی زۆر درێژی هەبووە پێش ئەوەی موسلمان بێت ، زۆر ئاینی تاقی کردوونەوە ، وە چۆتە زۆر لە خوا پەرستان ، دەلیٰ : بۆ پێغەمبەری خوا باسی شوێنکوتووانی ئاینێکم کرد ، خۆشم لەگەلیان بووم و نوێژو خواپەرستیان هەبووە ، پرسیارم لێکرد ، ئایا ئەوانە حوکمیان چۆنە..؟! (خوای پەروەردگار ) ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ...﴾ [البَقَرَةِ : ٦٢]

بەلیٰ زۆرەبەی زانایانی تەفسیری قورئان دەلێن : بەراستی جوولەکە لە هەموو گەلێك دلرەقتر و سەر سەختترین بوون لەگەل پێغەمبەرەکانیان (عليهم السلام ) زۆریان لیٰ کوشتوونە، سەریان بریون ، هە لەگەل ئەمەشدا بە هیچ پێغەمبەرێکی تر دانانێن و بروا بە هیچ ئایینێك ناکەن ، چونکە ئەوان ئەمەی یان بەلایەوە کە ئەوان هەلبژاردەی (خوای گەورە) ن ، وە بەرساتی پێیان وایە هەر خۆیان خاوەنی ئایینی بەراستن بەهەشت هەر بۆ ئەوان ئامادەکراوە ، وە رەحم و میهرەبانی (خوای گەورە ) هەر لەگەل ئەوانە..؟!

ئینجا قورئانی پیرۆز لێرەد بەدرۆیان دەخاتەوە ، وە نیشان ئەدات کە هەموو ئایینێك هی خوایە مەبەست لە هەموویان باوەرهێنانە بە (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ، وە ئایینی ئیسلامە تەنها هاو تەنها ، هەر وەکو (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ﴾ [آل عِمۡرَان : ١٩]واتە : { تەنها دینی راست لای خوای گەورە ئیسلامە} [ إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ] بە دلنیایی تەنها دینێك کە خوای گەورە پێی رازی بێ و قبوولی بکات ئیسلامە..؟!

تێبینی / دەربارەی ئەم سێ ئایینە یان ئەم سێ ناوە راو بۆچوونی زانایان هەیە لەسەر یان ، قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ﴾ [البَقَرَةِ : ٦٢]

١-دەگونجێ ووشەی (یهود) لە یەکێك لەم نایانەی خوارەوە وەرگیرا بێت ، (یهود) لە (تهود) وەرگیرا بێت بە مانای دۆستایەتی ، یان بە (یهود ) بەمانای (تهود) بە واتای تەحەروك و جموجۆل یان لە (یهودا) وەرگیرابێت کە کورە کەورە کەی پێغەمبەر یعقوب –علیه السلام – ، یان ووشەی (یهود ) بەمانای گەرانەوە دێت یان (الرجوع ) وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ [الۡأَعۡرَاف : ١٥٦]واتە : ئێمە بۆ لای تۆ گەڕایینەوەو تەوبەمان کرد..؟!

لە (عبدالله بن مسعود )- خوا لێ رازی بێت –دەلێت : وەکو ئێمەی خەلك پێ دەزانین ناوی (الیهود بالیهودیه ) بەو ووشەیەی کە (موسا )دەلێت : قال تعالى: ﴿إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ [الۡأَعۡرَاف : ١٥٦]واتە : ئێمە بۆ لای تۆ گەڕایینەوەو تەوبەمان کرد..؟![1]

لە (أبو عمرو بن العلاء ) –رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : (یتهودون ) چونکە لە کاتی خوێنەوە (تەورات ) دا جموجۆل جوولە دەکەن ، وە ئەوان دەلێن : کاتێك (موسا ) تەوراتی پێ گەیشت زەوی و ئاسمانەکان دەستیان بە جوولە یان جموجۆل کرد ..؟![2]

٢- وە (نصاری ) کۆمەلێك جوولەکە بوون ، کە باوەریان بە پێغەمبەر (عیسا ) -علیه السلام – هێنا ئەمەش جەند راو بۆچوونی جیاوازی هەیە ، هەندێك دەلێن : جوولەکە کان بە ناشرین کردنی (عیسا)- علیه السلام – پێیان دووت : (هانصری ) واتە : سووك یان بێ بایەخ ، بەلام شوێکەوتوانی بەم ناوە شانازیان دەکرد ، ووتراویشە چونکە لە شاروچەکی یان گوندی (ناصرە ) نیشتەجێبووە پێیان ووتراوە (النصاری ) ئێستاش بە مەسیحیەکان یان بە کوردی گاوەرەکان دەناسرێن کە لە سەر ئاینی مەسیحی پەیرەوانی ئاینی (عیسا ) ن کە پێغەمبەری خوایە – علیه السلام - ئەوەتا ئەم ئاینە کە لەرستی دا ئاینێکی زیاتر غرافیات و زیاتر لە بیرو باوەری تصوف نزیکە ، بۆیە ئاینەکەیان گۆریووەوە ئەمەش

[1]-اخرجه ابن ابي حاتم (١٥٧٧/٥).
[2]-تفسير الثعلبي (٢٠٨/١).

هۆکارەکەی جوولەکە بووە ، چونکە زۆر دژایەتی ئاینی (عیسا) یان کردووە ، بۆیە نە ئەم (تەوراتە) تەوراتی (موسا) یە نەم (ئینجیلە ) ئینجیلی ( عیسا) بەلکو جوولەکە دەست کاری کردووە گۆڕیویەتی؟!

لە(عبداللە بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ناوی (النصاری ) لە (النصرانیە ) هاتووە واتە: پشتیوانیانی (عیسا) فەرموویەتی : هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾﴾ [آل عِمْرَان : ٥٢] واتە : کاتێك کە عیسی - صلی اللە علیە وسلم - هەستی کرد بەردەوامن لەسەر کوفرو ئیمانی پێ ناهێنن فەرمووی: کێ پشتیوانی منە لە دەعوەو بانگەواز کردن بۆ گەیاندنی دینی خوا [ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنْصَارُ اللَّهِ ] حەواری و قوتابی و کەسە تایبەتەکانی خۆی کە دوانزە کەس بوون وتیان: ئێمە پشتیوانی دینی خوای گەورەو پێغەمبەری خوای گەورە - صلی اللە علیە وسلم - ئەبین بۆ بڵاو کردنەوەکەی دینی خوا [ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ (٥٢) ] ئیمانمان بەخوای گەورە هێناوە وە تۆیش لە رۆژی قیامەت شایەتیمان بۆ بدە کە ئێمە موسڵمانین..؟![1]

لە(عبداللە بن عباس )- خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ناوی (النصاری ) چونکە ئەم گوندەیە یان ئەم شارەیە کە تێدا (عیسا) نیشتەجێ بووە ناوی (ناصرة ) بووە ..؟! .[2]

لە (محمد بن شهاب الزهري ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت :ناوی (نصاری ) چونکە ( الحیواریین ) دەیان ووت : (نحن أنصار اللە ) ..؟! .[3]

٣-بەلێ لەدەربارەی ئاینی (الصابئین ) زانایان چەند راو بۆ چوونی جیاوازیان هەیە ، ووشەی (الصابئی ) بە مانای لادان دێت ، ووتراوە : (صابئی )یە کان کۆمەلێك لە جوولەکە بوونە شوێنکەوتەی پێغەمبەر (یحیا ) بوونە – علیە السلام – وە باوەریان بەهاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ وە پێغەمبەری ئاخر زمان هەبووە ، چونکە جوولەکە زۆر تر رقیان لە (صابئیەکان ) بووە ، لە بەرئەمە دەیان ووت : ئەمانە

---

[1]-عزاه السيوطي إلى أبي شيخ ، موسوعةتفسير المأثورة (٤١٣/٢).
[2]-اخرجه ابن ابي سعد في طبقات (٥٣/١-٥٤) ،وابن جرير (٣٤/٢).
[3]-تفسير الثعلبي (٢٠٨/١).

(ئەستێرە پەرستن ) تاکو خەلك بە مان باوەر نەکات ، کە بانگەوازیان ئەوە بووە موژدەی هاتنی پێغەمبەری ئاخرەمانیان بلاودەکردەوە بەناو خەلکی دا موژدەیان بە هاتنی ﷺ دابوو ، بەلام رۆمانیەکان زۆریان لێکردن کە ببنە بە مەسیحی یان گاورە ، بەلام دەوترێت : ئەمانە ئەستێرە پەرست بوون ، یان ملائیکەیان فریشتەیان دەپەرست و لە ئاییینی جوولەکە گاورەکان لایان دابوو ..؟!

لە (عمر بن الخطاب ) – خوا لیّ رازی بێت – دەفەرمووێت : ئەوانە گەلێکن لە ئەهلی کتاب ،سەر براوەکانیان وەك سەر براوی ئەهلی کتابە ..؟! [١]

لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : پر سیار دەربارەی (صابئی ) کرا لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیّ رازی بێت – فەرمووی : ئەوانە گەلێکن لە نێوان جوولەکە و گاورەکان و مەجووس یان ئاگر پەرستەکان ، سەر براوەکانیان حەلال نیە ، وە هاسەر گیریشیان یان نکاح شیان ..؟! [٢]

لە(ابی العالیە )- رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : (الصابئون ) ئەوانە کۆمەلێکن لە ئەهلی کتاب ، وە کتابی (الزبور ) دە خوێنەوە ..؟! [٣]

لە (مجاهد بن جبر) – رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : (الصابئون ) گەلێکن لە نێوان جوولە و وجوس دان ، ئەوان ئاییینیان نیە ، وە ئەوان نەجوولەکەن و نەگاورن ، ئەوانە گەلێکن بیّ باوەرن کتابیان نیە..؟!

لە(الحسن البصری )- رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : (لصابئون ) لە نێوان مجوس و جوولەکە دان ،خواردنی سەربراوەکانیان حەلال نیە ، وە نکاح وهاوسەرگیریان لە گەل ئافرەتانیان حەلال نیە ، ئەوان : مجوسن ، ئەوان ملائکە یان فریشتە دەپەرستن ..؟! [٤]

[١]-تفسير الثعلبي (٢٠٨/١).
[٢]-اخرجه عبدالرزاق في مصنفه (١٠٢٠٨).
[٣]-اخرجه ابن جرير (٣٧/٢).
[٤]-اخرجة ابن جرير (٣٥/٢)، ابن اب حاتم (١٢٨/١)

له‌(مقاتل بن سليمان)- ره‌حمه‌تی خوا لیّ بیّت – ده‌لیّت : (الصابئين ) ئه‌وانه گه‌لیّكن نوێژه‌كانیان روو به‌ره‌و قبیله‌یه ، وه كتابی (الزبور ) ده‌خوێنه‌وه ، وه فریشته ده‌په‌رستن ..؟! .[1]

له‌(وهب بن منبه )- ره‌حمه‌تی خوا لیّ بیّت – ده‌لیّت : (لصابئی) ئه‌وانه گه‌لیّكن ده‌زانن (خوای گه‌وره ) تاك و ته‌نهایه ، به‌لام هیچ شریعه‌تیّكیان نیه كاری پیّ بكه‌ن ، وهیچ كوفر نه‌بوونه ..؟! .[2]

له‌(قتاده بن دعامه )- ره‌حمه‌تی خوا لیّ بیّت – ده‌لیّت : (الصابئون ) گه‌لیّكن فریشته‌كان ده‌په‌رستن ، وه نوێژ ده‌كه‌ن به غیری قیبله ، واته : (غیری الكعبه )، وه كتابی (الزبور ) ده‌خوێنه‌وه ..؟! .[3]

له‌(أبی الزناد )- ره‌حمه‌تی خوا لیّ بیّت – ده‌لیّت :(الصابئون ) گه‌لیّكن له (العراق ) ده‌ركه‌وتوون كه (بكوثي ) ئه‌وانه له‌م گونده دابوونه یان له‌م شاره‌ی كه له (العراق ) دایه ، ئه‌وان باوه‌ریان به هه‌موو پێغه‌مبه‌رانه‌وه هه‌بووه ، وه هه‌موو سالیّك سی رۆژ به‌رۆژوو ده‌بن ، وه پیّنج نوێژ ده‌كه‌ن له‌رۆژیّك دا به‌ره‌و (اليمن )..؟! [4]

له‌(عبدالرحمن بن زید بن أسلم )- ره‌حمه‌تی خوا لیّ بیّت – ده‌لیّت : (الصائبون ) ئه‌وانه ئه‌هلی ئایین له ئاینه‌كان ، ئه‌وانه له جزیره ژیاون ، له جزیره‌ی موصل ، ده‌لیّن : ( لا إله إلا الله ) به‌لام كاری پیّ ناكه‌ن ، و كتابیان نیه ، وه پێغه‌مبه‌ریشیان نیه ، ته‌نها ووته‌ی (لا إله إلا الله ) یان هه‌یه ، باوه‌ر به هیچ پێغه‌مبه‌ریّكیان نیه ، هه‌روه‌كو ئه‌و موشریكانه‌ی سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له مككه وان ، ئه‌وانه وه‌كو موشریكانی مككه وان ..؟! .[5]

---

[1]-تفسير مقاتل بن سليمان (١/١١٢).
[2]-اخرجه ابن ابي حاتم (١/١٢٨).
[3]- اخرجه عبدالرزاق في مصنفه (١٠٢٠٦) ، وابن جرير (٢/٣٧).
[4]-اخرجه عبدالله بن وهب في الجامع تفسير القران (١/٦٣-٦٤).
[5]-اخرجه ابن جرير (٢/٣٦).

## باسی (الخوف ) واته: ترس

پێناسه‌ی : (الخوف ) واته : ترسی پێشبینی یان ترسی جاوه‌روانی كردن له‌ شتێكدا .

ووتراوه : ترس شله‌ژان و جوولەی دله له یادكردنه‌وه‌ی ئه‌وه‌ی لێی ده‌ترسێت .

ووتراوه : ترس هێزی زانسته یان زانینه به تێپه‌ر بوون بریاره‌كان ، ئه‌مه هۆی ترسه ، نه خودی ترسه‌كه .

ووتراوه: ترس هه‌ڵهاتنی دله له هاتنی ئه‌وه‌ی لێی بێزاره له كاتی هه‌ست پێ كردنیدا .

ووتراوه : ترس بریتیه له پێشبینی سزا به تێپه‌ر بوونی هه‌ناسه‌كان .

له (الجرجانی ) ده‌ڵێت : ترس چاوه‌رێكردنی شتێكی بێزاركه‌ر یان مكروها ، یان له ده‌ستدانی ئازیزێك و خوشه‌ویستێك؟!.[1]

### ئه‌و ووشانه‌ي په‌یوه‌ندارن به ووشه‌ي (الخوف ) یان ترسه‌وه :

یه‌كه‌م : (الخشیة ) واته : ترسی له زانست و زانین :

به‌لام (خشیه ) به‌هێزو توندتره له (الخوف ) ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ﴾ [المَائـِدَة : ٤٤] واته : ئه‌ی زانایان ئێوه له خه‌ڵكی مه‌ترسێن و به‌تاك و ته‌نها له من بترسێن..؟! هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَـٰٓؤُاْ﴾ [فَاطِر : ٢٨]
واته : ته‌نها به‌نده زاناكان ئه‌وان به زانیاریه‌وه له خوای گه‌وره ئه‌ترسێن، (ابن عباس) ده‌فه‌رمێت: (زانا ئه‌و كه‌سه‌یه كه شه‌ریك بۆ خوا دانه‌نێت و حه‌ڵاڵی به حه‌ڵاڵ بزانێت و حه‌رامی به حه‌رام بزانێت و ئامۆژگاریه‌كانی خوای گه‌وره بپارێزێت و جێبه‌جێی بكات و دڵنیا بێت كه ده‌گاته خوای گه‌ورەو لێپرسینه‌وه‌ی له‌گه‌ڵدا ده‌كات)، (سه‌عیدی كوڕی جوبه‌یر) ده‌فه‌رمێت: (ترسان له خوا ئه‌وه‌یه كه له تاوان بتگه‌ڕێنێته‌وه) ..؟!

دووه‌م : (الرعب ) واته: ترسی پڕكردنه‌وه و ستری برین .

(ابن فارس ) – ره‌حمه‌تی خوا لێ بێت – ده‌ڵێت : مانای (الرعب ) ده‌گه‌رێته‌وه بۆ سی سه‌رچاوه : ترسی ن پڕكردنه‌وه، وه برین .[2]

---

[1]-التعريفات الجرجاني ص ٩٠ .
[2]-مقايش اللغة ابن فارس (٤٠٩/٢).

(الرعب ) ئەو ترسەیە کە دلە راوکی و رارای توندو لە ترسناکی هەندێك جار دەبێتە هۆی لەدەستدانی تواناو جوولە .؟!

سێ یەم : (الشفقه) بریتیە ترسێکی ناسك و لاوازی دل کە مرۆڤ بەدەستی دەهێنیت ، ئەمەش خەمخۆری تێکەل دەبێت لە گەل ترس و دلە راوکی .[1]

دەوترێت : ترسێکە لە جۆرێك لە ناسکی ، وە لاوازی دڵ کە مرۆڤ بەدەستی دە هێنێت یان ئەزموونی تێدا دەکات ،هەروەکو دەوترێت : دایك بەزەیی بە منداڵەکەی دێتەوە ،واتە بەزەیی سووکە ترسێکی پێدا دێتەوە ، بە هیچ شێوەیەك نابێتە ترسی تەواو ،هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت: قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ ٥٧﴾ [المُؤۡمِنُون : ٥٧] واتە : ئەو کەسانەی کە ترسی خوای گەورەیان لە دڵدایەو بە بەردەوام لە خوای گەورە ئەترسێن..؟!

چوارەم: (الرهبة ) واتە : ترسی شلەژان و لە رزین :

(الرهبة ) بریتیە لەو پەری هەڵهاتن کە لەو شتەی لێ دەترسێت ، بە پێچەوانەی ووشەی (الرغبة ) کە بریتیە لە لە گەشتی دڵ بۆ بەدەست هێنانی ئەوشتەی کە ویستی لێ یەتی یان حەزی لێ دەکات ..؟![2]

ترسی (الرهبە ) یان ترسی شلەژان و لەرزین (الوجل) بریتیە لە لەرزینی دڵ و درز تێبوونی بە هۆی یادکردنەوەی ئەوکەسەی کە لە هێز و دەسەلات و بەرێوەبەردنە ،وە لە سزای دەترسێت یان بە هۆی بینینییەوە.؟!

پێنچەم : (الهیبة) واتە : ترسی بە گەورەزان یان ترسی بە مەزنزانین :

ترسی (الهیبە) برتییە لە ترسێکی هاومل لەگەل بە مەزنزانین و شۆکەندی دانەپاڵ ، بە زۆری ئەم جۆرە ترسە لەگەل خۆشەویستی و ناسیندایە .

## جۆرەکانی ترس

[1]-مدارج السالكين ابن قيم (٥٠٨/١).
[2]-الراغب الاصفهاني (٣٦٦/١) ، بصائر ذوي التمييز الفيروزآبادي (٣٣١/١).

هەرکەسێك قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە ترس دابەش کراوە بەچەند جۆرێك:

دابەش کردنی ترس بە دوو جۆر : ترسی مشروعی ، وە ترسی غیر مشروعی :

یەکەم : ترسی مشروعی واتە: ترسی دروست ، دابەش دەبێ بە دوو جۆر :

١-ترسی فتری واتە: لە فترەتەوە ئەم جۆرە ترسە بوونی هەیە ،ئەم جۆرە ترسە حالەتێکی لە ناکاوە لە پڕ بۆ مرۆڤ دروست دەبێت ، بە دلە راوکی ناخۆشی و نارەحەتی دا تێپەر دەبێت ، بەهۆی نزیك بوونەوەی لە سەرچاوەی مەترسیەکە و ئەو خراپەیەی کە دێتە رێ ، ئەجۆرە ترسە ترسێکی فتریە مرۆڤ بە ویستی خۆی نیە لە ناکاو تووشی دەبێت ، هەلبەت بەسەر هەموو مرۆڤێك دادێت تەنانەت پێغەمبەرانیش -علیهم السلام - ئەم جۆرە ترسە سیفەتێکی زەمکراو لۆمەکردن یان کەم و کوری نیە ، بەلکو لە ناکاو روودەدات ، بۆ نموونە وەکو دیاردە سروشتیەکان یان هەوالێکی لە ناکاوی ناخۆش ، یان بینینی دەرندەیەکی سامناك هەمووئەمانە ترسی فترەی لە خۆیەوە ئەم ترسە بوونی هەیە لە هەموو مرۆڤێك دا ، جا پەیێ رێژەیی ترس و دلە راوکێیەکە هەیەتی..؟!

٢-ترسی محمود واتە : ستایشکراو ئەم ترسەیە کە (خوای گەورە) و پێغەمبەرەکەی ﷺ لەم ترسە رازیە .

ترسی محمود یان ستایشکراو : چەند جۆرێکە کە ئەمانەی خوارەوەن :

١-ترس لە مقامی (خوای گەورە) :

(خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ۝٤٦﴾ [الرَّحۡمَٰن : ٤٦]واتە: { پاداشتی پـێشەنگەکان لەبەهەشتدا} [ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ ] وە ئەوانەیشی ترسی ڕاوەستانی ڕۆژی قیامەتیان هەیە لەبەر دەستی خوای گەورە ئەوانە دوو بەهەشتیان بۆ هەیە، یاخود وتراوە: ئەوانەی کە لەوە ئەترسێن ئەزانن کە خوای گەورە چاوی لێیانەو ئەیانبینێ و ئاگای لێیانەو ترسی بینینی خوای گەورەیان هەیە ترسی ڕاوستانیانە لەبەر دەستی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت ئەوانە دوو بەهەشتیان بۆ هەیە، دوو باخیان بۆ هەیە کە لە ئاڵتوونەو هەرچی قاپ و خشڵ و ئەو شتانەی کە تیایەتی هەمووی لە ئاڵتوونە، کە ئەمانە (موقەڕڕەب) و پێشەنگەکانن کە سەرەتا دەچنە بەهەشتەوە، کە پێغەمبەران و پیاوچاکان و شەهیدان و راستگۆیانیان لەگەڵدایە..؟! (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ۝٤٠﴾ [النَّازِعَات : ٤٠]واتە : [ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ ] بەڵام کەسێك لە دونیادا ترسا بێت لە ڕاوەستان لەبەر دەستی خوای گەورەو زانیبێتی ڕۆژێك ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە [ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى ] وە لە ترسی خوای گەورە قەدەغەی نەفسی خۆی کردبێ لە هەواو ئارەزوو جڵەوگیری کردبێت..؟!

٢-ترس لە سزای (خوای گەورە) :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا ۝٥٧﴾ [الإِسۡرَاء : ٥٧] واته : و لە سزایشی دەترسن بەڕاستی سزای پەروەردگارت هەمیشە مەترسی لێکراوە و خۆ لێ پارێزراوە..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ۝٤٠﴾ [العَنكَبُوت : ٤٠] واته : ئەوسا ئێمە هەریەك لەوانمان بەتاوانی خۆی سزادا (لەناومان بردن) جا هەندێکیان بایەکی بەهێزمان ناردە سەریان بەوردە بەردەوە وە هەندێکی تریان پیاهەڵشاخانێك و دەنگێکی گەورە لەناوی بردن وە هەندێکیشیانمان بەناخی زەویدا بردە خوارەوەوە هەندێکی ترمان لەوان لەدەریادا نوقم کرد خوا ستەمی لێ نەکردن بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد..؟!

لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لێی رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلێت : ((لَمَّا مَرَّ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ بالحِجْرِ قالَ: لا تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أنْفُسَهُمْ، أنْ يُصِيبَكُمْ ما أصَابَهُمْ، إلَّا أنْ تَكُونُوا بَاكِينَ، حذرا أن يصيبكم ما أصابهم . ثم زجر فأسرع حتى خلفها )) .[1] واته: لە گەل پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەر (الحجر) دا تێپەرین ، پێغەمبەری ﷺ فەرمووی : مەرۆنە جێگاو رێگای ئەوانە کە ستەمیان لە خۆیان کردووە ، مەگەر بە گریانەوە نەبێت ..؟! نەوە کو ئەوەی تووشی ئەوان بوون تووشی ئێوەش بێت ،پاشان خۆیشی لە ووشترەکەی ئەدا هەتا بەپەلە ئەوێیان بەجێهێشت ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةٗ لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ۝٣٧﴾ [الذَّارِيَات : ٣٧] واته : وە نیشانەیشمان بەجێهێشت بۆ ئەو کەسانەی کە لە سزای بە ئێش و ئازاری خوای گەورە ئەترسێن تا ئەم سزایە ببێتە پەندو نیشانە یەك بۆ کەسانی تر، کە خوای گەورە شوێنەکەی کردن بە دەریاچەیەکی بۆگەنی پیس..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ كَبِيرٍ ۝٣﴾ [هُود : ٣] واته : بەڵام ئەگەر پشت هەڵبکەن لە شوێنکەوتنی قورئانی پیرۆزو خوای گەورەو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئەوە من لە ئێوە ئەترسێم کە سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە بتانگرێتەوە کە ڕۆژی قیامەتە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ۝٨٤﴾ [هُود : ٨٤] واته : من لەوە ئەترسێم ئەگەر ئێوە لەسەر ئەم کارانە بەردەوام بن خوای گەورە سزایەکتان بدات لە ڕۆژێکدا کە سزای خوای گەورە دەورتان بدات و شوێنی ڕاکردن و پەناتان نەبێ بۆی ڕا بکەن..؟!

٣-ترس وبیمە لە پشت گوێ خستنی ئەرك و واجبەکان یان فەرزەکان :

---

[1] -صحيح مسلم برقم (٣١٩٨).

به‌ڵێ ئیماندار زۆر چاك ده‌زانێ پێوه‌ری یان میزان هه‌ژماره كردن و حیساب كردن ووردو ده‌قیقه له كێش و پێوانه‌كردنی گه‌ردیله‌یه كیش دا هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره ) دفه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨﴾ [الزَّلْزَلَة : ٧ - ٨] واته : {چاكه‌و خراپه چه‌ندێك كه‌م بێت ده‌یبینیته‌وه} [ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) ] له‌و ڕۆژه‌دا هه‌ر كه‌سێك كرده‌وه‌ی چاكی كردبێ له دونیادا به ئه‌ندازه‌ی مسقاله زه‌ڕه‌یه‌ك واته: بچووكترین مێرووله یاخود ئه‌و گه‌رده‌ی كه ئه‌بینرێت ته‌پو تۆزێك له په‌نجه‌ره‌یه‌كه‌وه دیاره ئه‌وه‌ش ئه‌گرێته‌وه، جا كه‌سێك به ئه‌ندازه‌ی یه‌كێك له‌و گه‌ردانه چاكه‌و خێری كردبێ ئه‌وه له ڕۆژی قیامه‌تدا ئه‌جرو پاداشته‌كه‌ی وه‌رئه‌گرێ، بۆیه نابێ مرۆڤی موسڵمان چاكه‌ی له‌لا كه‌م بێ، هه‌ر بۆیه پێغه‌مبه‌ر - صلی الله علیه وسلم - ئه‌فه‌رمووێ: (خۆتان له ئاگری دۆزه‌خ بپارێزن ئه‌گه‌ر به له‌ته خورمایه‌كیش بێت كه كردووته به‌خێر له پێناو خوای گه‌وره‌دا به‌كه‌می مه‌زانه، ئه‌گه‌ر قسه‌یه‌كی چاكیش بێ به‌كه‌می مه‌زانه، ئه‌گه‌ر له دۆلكه‌كه‌ت ئاو بكه‌یته ناو گڵاسی كه‌سێكی تره‌وه به‌كه‌می مه‌زانه، ئه‌گه‌ر به‌ڕووی خۆش به‌رامبه‌ر موسڵمانێك ڕاوه‌ستی و ڕووت له گه‌ڵیدا خۆشبێ به‌كه‌می مه‌زانه، ئه‌گه‌ر پێی ئاژه‌ڵێك به‌دیاری به‌ری بۆ هاوسێكه‌ت به‌كه‌می مه‌زانه)، ئه‌مانه هه‌رچه‌نده خێرو شتێكی یه‌كجار كه‌من، به‌ڵام له ڕۆژی قیامه‌تدا هه‌ر كه‌سێك له‌وانه كه‌متر به ئه‌ندازه‌ی گه‌ردێك یان مێروووله‌یه‌كی بچووك خێرو چاكه بكات ئه‌یبینێته‌وه‌و خوای گه‌وره ئه‌جرو پاداشتی ئه‌داته‌وه له‌سه‌ری، وه چاكه‌یش یه‌ك به ده‌یه تا یه‌ك به حه‌وت سه‌د تا زیاتریش. .؟![ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨) ] وه به پێچه‌وانه‌یشه‌وه هه‌ر كه‌سێك ئه‌گه‌ر به ئه‌ندازه‌ی مێرووله یه‌كی بچووك یان گه‌ردێكی بچووك شه‌ڕو خراپه بكات له ڕۆژی قیامه‌تدا ئه‌یبینێته‌وه ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره لێی خۆش نه‌بێت، ئه‌گه‌ر لێی خۆشبوو ئه‌وه هیچ ئه‌گه‌ر لێی خۆش نه‌بووبێ ئه‌وه له ڕۆژی قیامه‌تدا خوای گه‌وره لێپرسینه‌وه‌ی له‌گه‌ڵدا ئه‌كات، بۆیه نابێ مرۆڤی موسڵمان تاوانی بچووكیشی پێ كه‌م بێ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هیچ بچووكێك له‌گه‌ڵ به‌رده‌وامیدا بچووك نیه به‌ڵكو گه‌وره ئه‌بێت، والله أعلم..؟!

**به‌ڵێ بێ گومان كتابی (خوای گه‌وره ) هیچ كرده‌وه‌یه‌ك به‌جێ ناهێڵێت به‌لكو هه‌مووی ده‌نووسێت جا چ كرده‌وه‌ی بچووك بێت یان كرده‌وه‌ی گه‌وره بێت هه‌ر هه‌مووی له كتابه حیساب ده‌كرێت و ده نووسرێت ، هه‌موو كرده‌وه‌كان له كتابه‌كی دا پارێزراوه هیچیان له بیر ناكرێت ، جا كرده‌وه‌كانی به نهێنی بێت یاخود به ئاشكرابێت ، نه به‌شه‌و و نه‌رۆژ هه‌ر هه‌مووی له كرده‌وه‌كان ده‌نووسرێت ..؟!**

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت** : قال تعالى: ﴿وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ۝٤٩﴾ [الكَهْف : ٤٩]واته : {هاوار كردن له ده‌ست تاوانه بچوكه‌كان!} [ وَوُضِعَ الْكِتَابُ ] وه له ڕۆژی قیامه‌تدا نامه‌ی كرده‌وه‌كان دائه‌نرێ [ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ ] وه تاوانباران ئه‌بینی ئه‌ترسێن له وه‌رگرتنی نامه‌كانیان بۆ ئه‌وه‌ی ئابڕوویان نه‌چێ [ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا ] وه ئه‌ڵێن: هاوار بۆ خۆمان ئه‌مه چۆن كتابێكه هیچ تاوانێكی بچووك و گه‌وره نیه ئیلا هه‌ر هه‌مووی سه‌رژمێر كردووه‌و هه‌مووی تیا نووسراوه‌ته‌وه،

یەکەمجار هاواریان کرد لە بچووکەکان کە کۆبۆتەوە لەسەریان ئینجا لە تاوانە گەورەکان (بۆیە نابێت مرۆڤ تاوانی بچوکی پێ کەم بێت، چونکە کۆ ببێتەوە مرۆڤ بە هیلاك دەبات و هاوار دەکات لێیان) [ وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا ] وە ئەوەی لە دونیا کردوویانە لە چاکەو خراپە ئەبینن هەر هەمووی نووسراوەو جێگیر کراوەو پارێزراوە [ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا (٤٩) ] وە پەروەردگارت ستەم لە هیچ کەسێك ناکات و تاوانی کەس ناخاتە سەر کەسی تر، وە لە پاداشتی کەس کەم ناکاتەوە ..؟!

**بەلێ ئەمە وای لێدەکات بە بەردەوام چاودێری و لێپرسینەوەی بکرێت لەگەل هەموو کردەوەکان ، لە ترسی ئەوەی کە شتێك دزە بکات کردەوەکانی پووچ بێت ، یان لە ترسی ئەوە کە کارو کردەوەکانی بە باشی ئەنجام نەدا ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموێت : قال تعالى:** ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّ قُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ٦٠﴾ [المُؤۡمِنُون : ٦٠] واتە : وە ئەو کەسانەی لەوەی کە پێمان بەخشیوون ئەیبەخشن هێشتا دڵیشیان ئەترسێ کە خوای گەورە لێیان وەرنەگرێ، وە ئەزانن و دڵنیان کە ئەوان بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێنەوەو خوای گەورە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکات، (عائیشە) پرسیاری ئەم ئایەتەی لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - کرد ئایا ئەمانە کەسانێکن دزی دەکەن و زینا دەکەن و مەی دەخۆن و لە خوا دەترسێن؟ فەرمووی: (نەخێر ئەی کچی صدیق بەڵکو ئەمانە کەسانێکن نوێژ دەکەن و بە ڕۆژوو دەبن و زەکات دەدەن و لەوە دەترسێن خوا لێیان قەبوڵ نەکات)..؟!

لە( عائشَةَ ) – خوا لێ رازی بێت- قالت : (( سألتُ رسولَ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ عن هذِهِ الآيةِ : ((وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ)) أَهُمُ الَّذينَ يشرَبونَ الخمرَ ويسرِقونَ ؟ قالَ : لا يا ابنةَ الصِّدِّيقِ ولَكِنَّهمُ الَّذينَ يصومونَ ويصلُّونَ ويتصدَّقونَ وَهُم يَخافونَ أن لا يُقبَلَ منهم ؛ ((أولئِكَ الَّذينَ يسارِعونَ في الخيراتِ)) [١]. **واتە: دەربارەی ئەم ئایەتە لە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسی ، : ((وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ))واتە: ئەونەش وا حەق ببەخشن لەو مالەی خوا پێداون کەچی ئیمان لەدلیان دەلەر زێ ، ووتم : ئەوانەن کە شەراب دەخۆنەوە و دزی دەکەن ..؟! فەرمووی : نا ئەی کچی صدیق ، بەلکو کە رۆژوو دەگرن و نوێژ دەکەن و دەبەخشن ، هێشتا دەترسن لێیان وەرنە گیری** (( وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ)) **واتە : ئەوانەی ئەو سیفەتەیانەیان تێدایە ، کە سانێکن لە ئەنجامدانی کارە چاکەکاندا — لەبەر رەزامەندی (خوای گەورە) هەمیشە پێش برکێ دەکەن و پەلە دەکەن ، وە بۆ ئەنجامدانی کارەچاکەکان ، لەخەلیکی تر لە پێشترن ..؟!**

**دووەم : ترسی غیر مشروعی واتە : ترسی نادروست :**

---

[١]-سنن الترمذي برقم (٣١٧٥).

ئەم ترسەیە کە لە خوداوە نیە ، نە لە سیفەتەکانی خودا ، کە پێویستی بە سەر سامی ترس هەبێ ،نەك لە گوناهو تاوانەکانی بەندە ، بەلکو بۆ بابەتیچکی ترە ترسەکە ..؟! هەروەکو قورئانی پیرۆز باسی ترسی سەرزەنشت کردن ولۆمەکردنی کردووە یان ترسی غیر مشروعی نادورست ئێمەش باسی دەکەین :

١-ترس لە شەیتان :

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ [آل عِمْرَان : ١٧٥] واتە : [ إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ ] ئەوەی کە داتانئەنیشێنێت و نایەڵێ دەرچن بۆ جیهاد وە ئەتانترسێنێ ئەوە تەنها شەیتانە کە ترسی دۆستەکانی خۆی لە کافران ئەخاتە دڵی باوەڕدارانەوە [ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ] بەڵام ئەی باوەڕداران ئێوە لەوان مەترسن و ترسی کافرانتان نەبێ، ئێوە تەنها لە من بترسن ئەگەر ئیماندارن ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ ۖ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢٦٨] واتە : [ الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ ] بەڕاستی شەیتان وەعدو بەڵێنی فەقیری و هەژاری بە ئێوە ئەدات و بەوە ئەتانترسێنێت بۆ ئەوەی کە نەبەخشن [ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ ] وە فەرمانتان پێ ئەکات بە بەدڕەوشتی و خراپەکاری و چرووکی و ڕەزیلی [ وَاللَّهُ يَعِدُكُمْ مَغْفِرَةً مِنْهُ وَفَضْلًا ] بەڵام خوای گەورە وەعدو بەڵێنی لێخۆشبوون و فەزڵ و چاکەی خۆی داوە بە هەر کەسێك کە لە پێناو خوای گەورەدا ببەخشێ وە جێی بۆ پڕ ئەکاتەوە وە بەرەکەتی تێ ئەکات [ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ] بەڕاستی فەزڵ و ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە زۆر فراوانە وە خوای گەورە زۆر زانایە..؟!

٢-ترس لە دوژمن :

بەلێ بێ گومان ئەم ترسە دروست نیە ، چونکە نابێت ئیماندار ترسی هەبێت لە دوژمنی ئیسلام و ئیمانداران ، بۆیە دەبێت ئیمانی دامەزراوی هەبێت بەرانبەر دوژمنانی ئیسلام و دوژمنانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، هەروەك لە رابردوودا پێغەمبەران بەرانبەر دوژمنی خوا بوونەتەوە بێ ئەوەی ترس بیمەیان هەبێت ، هەرەکو فروفێل و مکر و نەخشە و پیلانی دوژمنانی ئیسلامیان پوچ کردۆتەوە ، وەستاون لە میدانی جەنگ لە پێناوی پەرز راگرتنی پەیامی (خوای گەورە ) ، بەلێ وێنەی ترس لە دوژمن ئەم ترسە لۆمەکراوە نادروستە غیر مشروعە ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ [آل عِمْرَان : ١٧٥] واتە : بەلام ئەی باوەڕداران ئێوە لەوان مەترسن و ترسی کافرانتان نەبێ، ئێوە تەنها لە من بترسن ئەگەر ئیماندارن ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣﴾ [التَّوۡبَة : ١٣] واتە: ئایا لێیان ئەترسێن؟ خوای گەورە شایەنترە کە لێی بترسێن، ئەگەر ئێوە باوەڕدارن لەوان مەترسێن چونکە سوودو زیان تەنها بەدەست خوای گەورەیەو بەدەست ئەوان نیە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ [المَائـِدَة : ٣] واتە : [ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ دِينِكُمْ ] ئەمڕۆ کافران بێ ئومێد بوونە لە دینەکەی ئێوە کە بتانگەڕێننەوە بۆ سەر دینی خۆیان [ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ ] ئێوە لەوان مەترسێن کە زاڵبن بەسەرتانداو تەنها لە من بترسێن من سەرتاندەخەم بەسەریانداو پشتیوانتانم [ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ] ئەمڕۆ دینەکەی خۆم بۆتان تەواو کرد، هەرگیز پێویستتان بە زیادە نابێت بیهێننە ناو دینەکەتانەوە، وە ئاشکرام کرد بەسەر هەموو دینەکاندا، (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بیدعەی حەسەنە لە دیندا نیە، (ئیمامی مالیك) دەفەرمێت: (هەرکەسێك لە ئیسلامدا بیدعەیەك بکات و بڵێت حەسەنەیە ئەوا بڕیاری ئەوەی داوە کە پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - خیانەت و ناپاکی لەم دینە کردووە، چونکە خوای گەورە دەفەرمێت: ئەمڕۆ من دینەکەی خۆمم بۆتان تەواو کرد، بۆیە ئەوەی ئەو ڕۆژە دین نەبوبێت ئەمرۆیش دین نیە، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوەو کردی بە بەڵگە لەسەر قسەکەی) لە پاش ئەم ئایەتە هیچ حەڵاڵ و حەرامێك دانەبەزی [ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي ] وە نیعمەتی خۆم تەواو ڕژاند بەسەرتاندا بەوەی کە مەککەم بۆ ئازاد کردن و بەسەر کافراندا زاڵم کردن [ وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ] وە ڕازی بووم کە ئیسلام دینی ئێوە بێ تا ڕۆژی قیامەت، وە ئێوەیش ڕازی بن کە دینتان بێت، ئەمە دوا ئایەت بووە لە قورئانی پیرۆز دابەزی لە (حَجَّةُ الْوَدَاعِ) لە حەجی ماڵئاوایی لە ڕۆژی عەرەفە لە ڕۆژی جومعەدا کە پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - بە پێوە ڕاوەستا بوو، وەهەشتاو یەك ڕۆژ پاش ئەم ئایەتە کۆچی دوایی کرد..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖ﴾ [المَائـِدَة : ٥٤] واتە : [ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ] زەلیلی و خۆبەکەمزانین و ڕەحم و سۆزو تەوازوع بۆ باوەڕداران دەردەبڕن [ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ ] بەعیززەت ئەبن بەرامبەر بە کافران [ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ] جیهاد ئەکەن لە پێناو خوای گەورەدا [ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ] وە لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن لە وتنی حەقدا کە ببینن، چونکە نە ئەجەل نزیك دەکاتەوە نە ڕزق و ڕۆزی دوور دەکاتەوە..؟!

**٣-ترس لە مردن دەبێتە هۆی وازهێنان لە جیهادو تێکۆشان هەلاتن لە تکلیف :**

**بەلێ بێگومان ترس لە مردن ترسێکی ئاساییە هەموو مرۆڤێك ئەم ترسەی هەیە ، بەلام ترسێك کە جبانی و ترسنۆکی بێت ، یان نەچوون بۆ تکلیف جیهادو تێکۆشان یان فەرزێك واز لێ بهێنیت کە واجبە جیهاد کردن بۆ ئەو موسلمانانەی توانای جستەیی توانای مادی و معنوی جیهاد کردنیان هەیە ، بەلام ئەم تکلیفە واز لێ بهێنن**

تركی بكه‌ن ، یان له‌ مه‌یدانی جه‌نگ ترسنۆكه‌ رابكه‌ن و هه‌ل بێن ، جیهاد نه‌كه‌ن به‌ هۆی ترسنۆكی و جبانی خۆیان ئه‌م ترسه‌ غیر شه‌رعیه‌ و نادروسته‌ مرۆڤ ئه‌نجامی بدا ، ئه‌م ترسه‌ ترسێكی سه‌رزه‌نشت كراو و لۆمه‌كراوه‌.

(خوای گه‌وره‌ )ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟ ثُمَّ أَحْيَٰهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾﴾ [البَقَرَة : ٢٤٣] واته‌ : { به‌سه‌رهاتی تاڵوت‌و جالوت} [ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ ] ئایا نابینی ئه‌وانه‌ی كه‌ له‌ ماڵی خۆیان ده‌رچوون له‌ ترسی مردندا كه‌ هه‌زاره‌ها كه‌س بوون، (ابن عباس) ئه‌فه‌رمووێ: چوار هه‌زار كه‌س بوون له‌ ترسی نه‌خۆشی تاعوندا له‌ شار ده‌رچوون [ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ] خوای گه‌وره‌ پێی فه‌رموون: بمرن، یه‌كسه‌ر هه‌موویان مردن [ ثُمَّ أَحْيَاهُمْ ] پاشان زیندوویانی كردووه‌ تا تواناو ده‌سه‌ڵاتی خۆی نیشانیان بدات كه‌ مردن به‌ده‌ست خوای گه‌وره‌یه‌ [ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ] به‌ ڕاستی خوای گه‌وره‌ فه‌زڵ و چاكه‌ی به‌سه‌ر خه‌ڵكیه‌وه‌ یه‌كجار زۆره‌ به‌ڵام زۆربه‌ی خه‌ڵكی شوكرانه‌بژێری خوای گه‌وره‌ ناكه‌ن..؟!

وێنه‌ی ئه‌م ترسه‌ی كه‌ لۆمه‌كراوه‌ له‌ مردن ، ئه‌ویش ترس له‌ بت و بت په‌رستان یان طاغوت و له‌ سنوور ده‌رچووان ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓا۟ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾﴾ [هُود : ٥٤] واته‌ : {هود پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - تۆمه‌تبار ده‌كرێت به‌ شێتی} [ إِنْ نَقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ ] ئێمه‌ ئه‌ڵێین: هه‌ندێك له‌ خوایه‌كانی ئێمه‌ كه‌ تۆ قسه‌یان پێ ئه‌ڵێی ئه‌وان ده‌ستیان لێ وه‌شاندوویت و شێتیان كردوویت [ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ ] هود - صلى الله عليه وسلم - فه‌رمووی: من خوای گه‌وره‌ ئه‌كه‌م به‌ شایه‌ت وه‌ ئێوه‌ش شایه‌ت بن كه‌ من به‌ریم له‌ هه‌موو ئه‌و خوایانه‌ی كه‌ ئێوه‌ كردووتانه‌ به‌ شه‌ریك بۆ خوای گه‌وره‌و له‌ غه‌یری خوای گه‌وره‌ ئه‌یانپه‌رستن..؟!

٤–ترس له‌ نائومیدی وه‌ تێپه‌راندنی :

چونكه‌ نامێد بوون له‌ ره‌حمه‌ت و به‌زه‌یی (خوای گه‌وره‌) ده‌بێته‌ هۆی ترس و به‌رده‌وام بوون له‌ گوناهو تاوان ئه‌م ترسه‌ كه‌ نائومیدی له‌دواوه‌یه‌ ئه‌م لۆمه‌كراوه‌ نادروست ناشه‌رعیه‌ ، بۆیه‌ ده‌بێت مرۆڤ ترسی نه‌بێت له‌ نائومید بوو چونكه‌ (خوای گه‌وره‌ ) به‌ ره‌حمه‌ به‌ به‌زه‌یی له‌گوناهوتاوانه‌كان خۆش ده‌بێت ، یان ئه‌وكه‌سانه‌ی ئومێدیان به‌ ژیان نه‌ماوه‌ خۆیان ده‌كوژن یان تووشی نائومێدی ده‌به‌ن له‌ ژیان به‌ هۆی له‌ده‌ست دانی خۆشه‌ویسته‌كانیان یان زه‌ره‌و زیانی مالی دونیان خۆیان ده‌كوژن ترسیان هه‌یه‌ كه‌ جارێكی تر هه‌لناسنه‌وه‌ بێ ئومێد ده‌بن ، بۆیه‌ بێ گومان ئه‌م جۆره‌ ترسه‌ حه‌رام و سه‌رزه‌نشت كراوه‌، لۆمه‌كراوه‌..؟!

(خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾﴾ [الزُّمَر : ٩] واته‌ : [ أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا ] ئایا كه‌سێك به‌ درێژایی كاته‌كانی شه‌و له‌ عیباده‌تی خوای گه‌وره‌دا بێت، وه‌ له‌ سوجده‌دا بێت و به‌ پێوه‌ ڕاوه‌ستابێت و شه‌ونوێژ بكات، (ابن عمر) ده‌فه‌رمێت: (ئه‌و كه‌سه‌ ئیمامی عوسمانه‌)، چونكه‌ زۆر شه‌ونوێژی

دەکردو جارێکیان لە یەك رکاتدا هەموو قورئانی خەتم کرد [ يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ ] وە لە قیامەت و سزای خوای گەورە بترسێت و بە ئومێدی ڕەحمەتی خوای گەورە بێت وەکو کەسێك وایە کە شەریك بۆ خوای گەورە دانێت؟ بێگومان یەکسان نین، دەبێت پەرستن بە (خەوف و ڕەجائەوە) بە ترس و ئومێدەوە بێت و هەردووکی پێکەوە کۆبکرێتەوەو بەم شێوازە بێت، چونکە ترسەکە زیاتر بێت مرۆڤ بێئومێد دەکات لە رەحمەتی خوا، وە ئومێدەکە زیاتر بێت مرۆڤ بێباك دەکات لە ئەنجامدانی تاوان، بەڵام لەکاتی سەرەمەرگدا دەبێت رەجائو ئومێد زیاتر بێت، تا گومانی باش بە خوای گەورە ببات و تا خوای گەورەیش بە گومانی باشی خۆی لەگەڵیدا بکات {زاناو نەزان یەکسان نین} [ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ] ئایا زانایان وەکو نەزانان وان لە دیندا؟ واتە: هەرگیز یەکسان نین [ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ (٩) ] بەڵکو تەنها ئەو کەسانە بیر ئەکەنەوەو پەندو ئامۆژگاری وەرئەگرن کە خاوەنی عەقڵ و ژیرین..؟! **هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویت:** قال تعالى: ﴿وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ۝٨٧﴾ [يُوسُف : ٨٧]واتە: وە بێئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوای گەورە [ إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ (٨٧) ] بە دڵنیایی هیچ کەسێك بێئومێد نابێت لە ڕەحمەتی خوای گەورە تەنها کەسانێکی کافرو بێباوەڕ نەبێت..؟! **(خوای گەورە ) دەفەرموویت** : قال تعالى: ﴿قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ۝٥٦﴾ [الحِجر : ٥٦]واتە : ئیبراهیمیش - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: کێ هەیە بێ ئومێد بێ لە ڕەحمەتی خوای گەورە مەگەر کەسانێکی گومڕا، من بێ ئومێد نیم و بە دووری نازانم کە لەم تەمەنەدا مناڵم بێ چونکە دەزانم تواناو رەحمەتی خوای گەورە چەند فراوانە..؟!

## باسی (الحزن ) واتە: غەمباری

پێناسەی : (الحزن ) غەمباری یان دلتەنگی :

١_پێناسەی :(الحزن ) غەمباری یان دلتەنگی لەرووی زمانەوانیدا:

(دلتەنگی دژی خۆشەیە ، وەپێچەوانەی لە خۆشبەختی ، وە (الحزن ) بەم مانایانەش دێت : (الهم ، الحزونة ، الخشونة ) ، وە زەوی چەند ئەستوورە )..؟! .[1]

(الراغب) دەڵێت : (الحزن ) یان دلتەنگی ،زەبری زەوی یان توندی زەوەی ، یان زەبری لە هەناسە و رووح یان تووندی لە هەناسە و رووح ،بە هۆی ئەمەوە غەم و پەرژارەی بە سەر دادێت ، وە دژی خۆشیە ، بەلام زەبر یان تووندی وەکو غەم و پەژارەو نارەحەتی نیە ، وەکو دەڵێن : زەبری یان توندی لە سینگدا ، ئەمە دلتەنگە ، دەڵێن : (یحزن ،حزنته )..؟! ) .[2]

٢–پێناسەی :(الحزن ) غەمباری یان دلتەنگی لەرووی شەرعیەوە :

(السمعانی ) دەڵێت : (دلتەنگی واتە : ئازاری دلە لە دابرانی مەحبوب یان خۆشەویستەکەی ..؟!).[3]

(الجرجانی ) دەڵێت : (دلتەنگی یان غەمباری واتە :دەربرنێکە لە کاتی روودانی شتێکی ناخۆش و مکروە ، یان لە دەستدانی کەسێکی ئازیز و خۆشەویست لە رابردوودا ..؟! ) .[4]

---

[1] مختار الصحاح الرازي ص ٧٢،القاموس المحيط الفيروز ابادي ص ١١٨٩ .
[2] -المفرادت ، الراغب الاصفهاني (١١٤/١٣).
[3] -تفسير القران ، السمعاني (١٢/٣).
[4] -التعريفات ، الجرجاني ص٨٦ .

## ئه‌و ووشانه‌ی په‌یوه‌ندی داران به ووشه‌ی (الحزن ) دلته‌نگی یان غه‌مباری :

یه‌كه‌م : (الكآبة ) واته: (خه‌مۆكی )

ووتراوه (الكابه) واته : (باروو دۆخێكی خراپ و ناخۆشه به‌هۆی غه‌م وپه‌ژاره‌وه تووش ده‌بێت ..؟! )[١]

ووتراوه (الكابه ) واته: شوێنه‌واری خه‌مۆ كیه كی قول و كاریگه‌ر له سه‌ر روخسارو ده‌م چاویه‌وه دیاره ، ئه‌مه پیٚ ده‌لێن : (الكابه ) وه نا ووترێت : خه‌مۆكی یان دلته‌نگی ، دیارنیه یان نابیرێت ، به‌لكو ئاماژه‌یه له‌سه‌ر ده‌م و چاو روخسار دا ، ئه‌م ئاماژانه‌ش پیٚ ده‌وترێت : (الكابه ) یان خه‌مۆكی ..؟! ).[٢]

دووه‌م : (الغم ) واته : (ئازاری دل )

ووتراوه : ئه‌وه دل توونديه یان خه‌مۆكی يه به‌هۆی شتێكه‌وه به‌سه‌ر دلدا دادێت ..؟! .[٣]

سیٚ یه‌م : (الأسف ) واته : (زۆر غه‌مبار بوون)

ووتراوه (الاسف ) زۆر غه‌مباری ، ئه‌وه‌ی كه دلته‌نگی زۆره له گه‌لیدا تووره‌یی هه‌یه.[٤]

چواره‌م : (الحسرة) واته : (تامه‌زرۆیی شتێكه كه له‌ده‌ستی چووه)

ووتراوه : (ئازاری دل ، به له‌ده‌ستدانی كه‌سێك وه په‌شیمانبوونه‌وش له‌گه‌لی دایه ، وه‌ك ئه‌وه وایه كه ئه‌م تامه‌زریه ، نه‌یزانی بێت ، دواتر وا لێكردووه په‌شیمان بێته‌وه له‌سه‌ر ئه‌م كاره‌ی كه ئه‌نجامی داوه ..؟! ) .[٥]

پێنچه‌م : (الهم ) واته: (دلته‌نگی نه‌فس یان دل ره‌قی نه‌فس )

---

[١]-الكليان الكفوي ص٧٧٣.
[٢]-الفروق للغوية ، العسكري ص٤٤٣.
[٣]-المعجم الوسيط ، مجمع اللغة العربية (٢/٦٦٣).
[٤]-التوقيف ، المناوي ص٥٠.
[٥]-التوفيق ، المناوي ص١٤٠.

ووتراوه: (الهم ) (خه‌م وپه‌ژاره‌یه مرۆڤ ده‌توێنێته‌وه یان وه‌كو توانه‌وه‌ی چه‌وری و دونگ یان (الهم توانه‌وه‌ی رووح یان نه‌فسه ئه‌مه بنچینه‌كه‌یه‌تی ..؟!) .[1]

شه‌شه‌م : (الفرح ) واته (خۆشی و شادی و به‌خته‌وه‌ری ) .

یه‌كه‌م : دلته‌نگی یان غه‌مباری سروشتی هه‌موو مرۆڤێكه :

له (عكرمه) — خوا لێ رازی بێت — دلێت : ده‌رباره‌ی ئه‌م ئایه‌ته، قال تعالى: ﴿لِّكَيْلَا تَأْسَوْاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ﴾ [الحَدِيد : ٢٣] واته: (عكرمه ) ده‌لێت : هیچ كه‌س نیه دلخۆش نه‌بێت ، یان دلته‌نگ و خه‌فه‌تبار نه‌بێت ، به‌لام ئه‌گه‌ر به‌لاو ناخۆشه‌یه به‌سه‌رتانه‌وه هات ئه‌وا ئارام بگرن ، به‌لام ئه‌گه‌ر به‌خته‌وه‌ری و دلخۆشه‌یه كیش هات ئه‌وا سوپاگوزاری (خوای گه‌وره ) بكه‌ن ..؟! .[2]

به‌لێ غه‌مگینی یان دلته‌نگی شتێكی فتری سروشتیه مرۆڤه به‌سه‌ری دادێت وه‌لامی ده‌داته‌وه كه به‌ویستی خۆی نیه یان به‌هه‌ست نستی خۆی نیه به‌سه‌ری دادێت، وه دلته‌نگ و غه‌مگین ده‌بێت بۆ ئه‌وه‌ی له‌ده‌ستی داوه ، یان ئه‌و به‌لاو به‌دبه‌ختیه‌ی له ژیانی دونیادا به‌سه‌ری داهاتووه ، وه ژیانی مرۆڤ تێ ناپه‌رێت ، به‌ته‌نها به‌خۆشی و به‌خته‌وه‌ری به‌لكو ده‌بێت هه‌لبه‌زین و دابه‌زینی تێدابێت ، وه‌كو دلته‌نگی و خه‌فه‌تباری غه‌مگینی ، هه‌روه‌ها خۆشی شادی به‌خته‌وریشی تێدا به‌دی ده‌كرێت ، بۆیه خه‌مۆكی وه‌كو له‌ده‌ستدانی ئازیزان و بێ به‌ش بوونیان له بینیان و دووری دابران له خۆشه‌ویستان ، هه‌روه‌ها ئه‌و به‌لاو ناخۆشیانه‌ی كه تووشی مرۆڤه‌كان دێت ، ئه‌مانه هۆكاری سه‌ره‌كین بۆ خه‌فتاری دلته‌نگی غه‌مگینی بۆیان ، چونكه ناگونجێ به‌ته‌نها خۆشی شادی به‌خته‌وه‌ری له ژیانی دونیادا به‌دی به‌هێنرێت ، به‌لكو سروشتی مرۆڤه‌كان وایه ،ده‌بێت به ناخۆشی دلته‌نگی بۆ ئازیزان خه‌فتبارو غه‌مگین بێن ، هه‌روه‌كو پێغه‌مبه‌ران به له‌ده‌ستدانی خۆشه‌ویست ئازیزانیان ، یان دلته‌نگی بۆ گه‌له‌كه‌یان كه باوه‌ریان به پێغه‌مبه‌ران نه‌ده‌هێنا ، یان به درۆیان ده‌خستنه‌وه ، هه‌لبه‌ته پێغه‌مبه‌رانیش له ژیانی دونیادا تووشی دلته‌نگی و غه‌فه‌تباری بوونه ، به‌لێ بێگومان دلته‌نگی شتێكی حه‌تمیه هه‌موو مرۆڤێك تووشی ده‌بێت ، ناتوانرێت خۆمانی لێ بدزینه‌وه ، به‌لام ئه‌م دلته‌نگیه له مرۆڤێكه‌وه بۆ مرۆڤێكی تر رێژه‌كه‌ی ده‌گۆرێت ، به پێ جۆری مرۆڤه‌كان هه‌ر یه‌كه‌و به به‌شی خۆی خه‌فه‌تبارو دلته‌نگ ده‌بێت ، به‌لام ئه‌وانه‌ی بۆ ژیانی دونیا خه‌تبارو دلته‌نگ غه‌م وپه‌راژایان زۆره ئه‌مانه له خه‌سارەت مه‌نده‌كانن له‌دونیادا ، چونكه دلته‌نگی بۆ ژیانی دونیا به رێژه‌یه‌كی زۆر نادروست ناپه‌سنه‌ده ده‌بێته هۆی له‌ده‌ستدانی خۆی ، ئه‌مه‌ی له‌م سه‌رده‌مدا بوونی هه‌یه هه‌ر هه‌موو بۆ ژیانی دونیا دلیان توندو خه‌فتبار ده‌بن ، بۆیه ئه‌وه‌ی ئیمانی دامه‌زراوه باوه‌ری ته‌واوی هه‌یه دلته‌نگیه‌كه‌ی یان

[1]-المفردات ، الراغب الاصفهاني ص٨٤٥.
[2]-الحاكم في المستردك على الصحيحين الاسناد صحيح .

غەمگنیەکەی جیاوازە لەوەی کە باوەڕی لاوازە ، بۆیە ڕێژەی نەخۆشی دل لەوانە زیاتر بەدی دەکرێت کە باوەریان و ئیمانیان لاواز دامەزراونیە ، بەلام ئەوەی ئیمانی دامەزراوە دەزانێت هەر دلتەنگی یەك و خەفتباری یەك تووشی بووە ئەمە لە(خوای گەورە ) یە ئارامگرە لە سەر ی ، یان خۆشەیەك رووی تێ دەکات ئەواسوپاسگوزاری (خوای گەورە ) دەکات لە سەری ..؟!

بەلێ پێغەمبەر (یعقوب ) – علیه السلام – کە بەهۆی لە دەستدانی کورە شیرینەکەی خۆی تووشی دلتەنگی غەمگینی بوویەوە، بەلام ئارامی لەسەر لە دابرانی (یوسف ) – علیه السلام – گرت لە دوایی دا بە کورە شیرینەکەی خۆی شاد بوویەوە ،بێ گومان ئەمەش تاقی کردنەوەیەکی (خوای گەورە ) بوو بۆ بەندەکەی خۆی.

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٨٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨٦﴾﴾ [يُوسُف : ٨٤ - ٨٦]واتە : [ وَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا أَسَفَى عَلَى يُوسُفَ ] پشتی تێ کردن و قسەی لەگەڵدا بڕین و دیسانەوە خەفەتی بۆ یوسف - صلى الله عليه وسلم - خوارد (لە کاتی بەڵاو موصیبەتدا وتنی: إنا لله وإنا إليه راجعون تەنها بەم ئوممەتە بەخشراوە ئەگەر نا دەبوایە یەعقوب وای بوتایە) [ وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ ] وە چاوی سپی بوو لە غەم و خەفەتداو ڕەشایی لە چاویدا نەما [ فَهُوَ كَظِيمٌ ] وە ئەو غەم و خەفەتی خۆی ئەشاردەوەو بۆ کەسی دەرنەئەبڕی..؟! [ قَالُوا تَاللَّهِ تَفْتَأُ تَذْكُرُ يُوسُفَ ] وتیان: سوێند بە خوای گەورە تۆ بەردەوام بیری یوسف - صلى الله عليه وسلم - ئەکەیت و خەفەتی لێ ئەخۆی [ حَتَّى تَكُونَ حَرَضًا ] تا لەش و عەقڵت بێهێز دەبێت و لەناو دەچێت [ أَوْ تَكُونَ مِنَ الْهَالِكِينَ] یان هەر ئەمریت و تیا ئەچی ئەوەندە خەفەت ئەخۆیت و ئەوەندە بۆی ئەگری (بەزەییان بە باوکیاندا هاتەوەو ویستیان بێدەنگی بکەن)..؟! [ قَالَ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ ] (بَثّ) واتە: ئەوپەڕی غەم و خەفەت و سەختترینی، یەعقوب - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: شەکواو گلەیی و ئەوپەڕی غەم و خەفەتی خۆم بۆ لای خوای گەورە دەرئەبڕم [ وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ] وە ئەوەی کە لەلایەن خوای گەورەوە من ئەیزانم ئێوە نایزانن، لە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە، یان پاداشت وەرگرتن لەسەر موسیبەت، یاخود خوای گەورە پێی وتووم و ئەزانم یوسف زیندووە، یان یوسف - صلى الله عليه وسلم - خەوەکەی ڕاست بووەو هەر ئەگەڕێتەوە.

بەسەرهاتی حەزرەتی (مريم ) –عليها السلام – کە ژانی مندال بوونی بۆ هات غەم وپەژارەو دلتەنگی رووی تێکرد ، فەرمووی : ئاواتی خواست فەرمووی : خۆزگە بمردمایە بۆ ئەوەی خەلکی گومانی خراپم پێ نە بات ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴿٢٦﴾﴾

[مَرْيَم : ٢٣ - ٢٦]واته : [ فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ ] كه ژانی منداڵ بوونی بۆ هات ژانی مناڵ بوونەكه بردی بەرەو ژێر دارخورمایەك [ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا ] ئەمیش ئاواتی خواست خۆزگه پێش ئەوەی ئەمەم بەسەردا بێ بمردمایه بۆ ئەوەی خەڵكی گومانی خراپم پێ نەبات (ئەمەیش بەڵگەیه لەسەر ئەوەی كه دروسته مرۆڤ له كاتی فیتنەدا ئاوات بخوازێت به مردن) [ وَكُنْتُ نَسْيًا مَنْسِيًّا] وه خۆزگه من شتێكی بێ رێز بوومایەو هەر باس نەكرامایه، یاخود هەر دروست نەكرامایه، یاخود وەكو پەڕۆی حەیزاوی بوومایه كه فڕێ ئەدرێ و ناوم نەبوایه..؟! [ فَنَادَاهَا مِنْ تَحْتِهَا ] له ژێریەوه لەژێر دارەكەوه جبریل، یاخود عیسى بانگی لێ كرد [ أَلَّا تَحْزَنِي ] خەفەت نەخۆی [ قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ] ئەوه پەروەردگارت كانیاو و جۆگەله ئاوێكی له ژێرتەوه دەركردووەو تێ ئەپەڕێ لەو ئاوه بخۆرەوه..؟! [ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ] وه ئەو قەدی دار خورمایه ڕابوەشێنه خورمای تەڕت بۆ دێته خوارەوه (كاتی خورما پێگەیشتن نەبووه)..؟! [ فَكُلِي وَاشْرَبِي ] له خورما تەڕەكه بخۆ و له ئاوەكه بخۆرەوه (هیچ شتێك وەكو خورمای تەڕ بۆ ئافرەتی زەیستان بەسوود نیه) [ وَقَرِّي عَيْنًا ] وه چاورۆشنابه پێی و خۆت له خەفەت دووربخەرەوه [ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنْسِيًّا] وه ئەگەر هەر مرۆڤێكت بینی ئەوه به ئاماژه پێیان بڵێ: من نەزرم كردووه بۆ پەروەردگارم كه خۆم بگرمەوه له قسه كردن و ئەمڕۆ قسه لەگەڵ هیچ مرۆڤێكدا ناكەم (وتراوه له بەرۆژوو بوونی ئەواندا خواردن و قسه كردنیش حەرام بووه)..؟!

**بەلێ (خوای گەوره ) به پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : ئەی ﷴ خەفتبار غەمگین مەبه بۆ ئەوه بێ باوەرانه كه پەله دەكەن له سەرپێچی و عینادی كردن ، چونكه ئەوانه هیچ زیانێك به (خوای گەوره ) ناگەیەنن بەلكو زیان به خۆیان دەگەیەنن ..؟!**

**(خوای گەوره ) دەفەرمووێت** : قال تعالى: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْكُفْرِۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي ٱلْأٓخِرَةِۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ١٧٦﴾ [آل عِمْرَان : ١٧٦] واته : ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - خەفەت نەخۆی لەو كافرانەی كه پەله ئەكەن له سەرپێچی و عینادی كردن [ إِنَّهُمْ لَنْ يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا ] ئەوان به دڵنیایی هیچ زیانێك به خوای گەوره ناگەیەنن بەڵكو تەنها زیان بەخۆیان ئەگەیەنن [ يُرِيدُ اللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي الْآخِرَةِ ] خوای گەوره ئەیەوێ ئەوان هیچ بەش و ئەجرو پاداشتیان نەبێ له قیامەتدا [ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ] وه سزایەكی زۆر گەورەیان بۆ هەیه ..؟!

**پێغەمبەری خوا ﷺ دلتەنگ وغەمگین دەبێت به درۆی بێ باوەران و كافرو موشركەكان و دووروو فاسیقه كان**

**(خوای گەوره ) دفەرمووێت** : قال تعالى: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِي يَقُولُونَۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ٣٣﴾ [الْأَنْعَام : ٣٣] واته : ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - بەدڵنیایی ئەزانین كه تۆ خەفەت له قسەی كافران ئەخۆی [ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ ] بەڵام باش بزانه كه ئەوان تۆ بەدرۆ نازانن لەبەر ئەوەی دان ئەنێن به

ڕاستگۆیی تۆدا [ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ (٣٣) ] به‌ڵام ئه‌و زاڵم و سته‌مكارانه له حه‌قیقه‌تدا ئایه‌ته‌كانی خوای گه‌وره‌و كتابی خوای گه‌وره به‌درۆ ئه‌زانن و ئینكاری و نكوڵی لێ ئه‌كه‌ن..؟!

**به لێ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بۆ له‌ده‌ستدانی كوره‌كه‌ی (إبراهیم ) غه‌مگین و خه‌فه‌تبار بوو ، یان كه‌سه‌نزیكان وهاوه‌ڵانی خۆی كه له ده‌ستی ده‌دان ، له پێش چاوی وون ده‌بوون ، ئه‌وا بۆیان دلته‌نگ ده‌بوو به‌له ده‌ستدانیان.**

**له** (أنس بن مالك ) **– خوا لێ رازی بێت – ده گێریته‌وه ده‌لێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ:** ((تَدمَعُ العَينُ ، ويحزنُ القلبُ ، ولا نقول إلا ما يُرضِى الربَّ ، واللهِ إنا بفُراقك يا إبراهيمُ لمحزونونَ)) .[1] **واته: چاوه‌كانی فرمێسك لێ ده‌باری ، دڵ ته‌نگ بوو ، هیچی نه ووت : ته‌نها ئه‌وه نه‌بێت ده‌ی ووت : ئه‌مه ره‌زای په‌روه‌ردگاری له سه‌ره ، وه به دابرانی تۆ ئه‌ی (إبراهیم ) دلته‌نگ و خه‌فه‌تبارم ..؟**

---

[1]-شيخ الالباني صحيح الجامع برقم (٢٩٣١).

## هۆکارەکانی دڵتەنگی یان خەفەتباری

### یەکەم : دوورکەوتنەوەی لە ئیمان و باوەڕبوون :

قەدەغەکردنی دڵتەنگی و غەمیگینی ئەوانەی کە دوور دەکەونەوە لە ئیمان و باوەر ، وە لە ئایەتەکانی قورئانیش باسکراوە ، بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ نهی یان قەدەغەی دڵتەنگی و خەفەتباری کردووە ، بە هۆی ئەوەی کە کافران دوور دەکەتنەوە لە ئیمان و باوەر ، هەروەها ئیمانیان نەدەهێناوە بەو بانگەوازیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی هاتووە ، بێ باوەر بوون پێی ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك قەومەکەی باوەری نەدە هێنا و بە دوای بانگەوازیە کەی نە دەکەتوون ، ئەوا دڵتەنگ و خەفەتبار دەبوو بۆیان ، لە سەر باوەر نەهێنانیان ،وە کفریان بە پەیامەکەی دەکرد ، وە وەلامیان نەدەدایەوە نەدەهاتنە ناو ئایینەکەی ، هەر بۆیە لە ئایەتەکانی قورئان باسی ئەم جۆرە دڵتەنگی و غەمگینیە دەکات ، کە قەدەغەی کردووە ئەوانەی بێ باوەرن بۆیان دڵتەنگ بین و خەفەتبار و غەمگین بین بۆیان ، بۆیە ئەم ئایەتانە ئاماژەیە کە دڵتەنگ نەبین بەوەی کە کافران باوەرناهێنن.

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾﴾ [آل عِمرَان : ١٧٦]واتە : [ وَلَا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ ] وە ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - خەفەت نەخۆی لەو کافرانەی کە پەلە ئەکەن لە سەرپێچی و عینادی کردن [ إِنَّهُمْ لَنْ يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا ] ئەوان بە دڵنیایی هیچ زیانێك بە خوای گەورە ناگەیەنن بەڵکو تەنها زیان بەخۆیان ئەگە یەنن [ يُرِيدُ اللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي الْآخِرَةِ ] خوای گەورە ئەیەوێ ئەوان هیچ بەش و ئەجرو پاداشتیان نەبێ لە قیامەتدا [ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ] وە سزایەکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُوا۟ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾﴾ [المَائـِدَة : ٤١]واتە : { گوێ نەگرتن لە درۆ} [ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لَا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنَ الَّذِينَ قَالُوا آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِنْ قُلُوبُهُمْ ] ئەی پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - خەفەت لەو کەسانە نەخۆی کە پەلە ئەکەن لە کافر بوون و کافر ئەبنەوە لەوانەی کە بەدەم وتیان: ئێمە ئیمانمان هێناوە بەڵام بەدڵ ئیمانیان نەهێنا بوو کە مونافیقان بوون [ وَمِنَ الَّذِينَ هَادُوا سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ ] وە خەفەت لە جوولەکەکانیش نەخۆی کە گوێ بۆ درۆی گەورەکانیان ئەگرن ئەوانەی کە دەستکاری تەورات ئەکەن [ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ] وە گوێ لە کەسانێکی تریش ئەگرن ئەوانە

ی کە خۆیان نایەن لە مەجلیسی تۆدا دانیشن لە تەکەبورو لووتبەرزیدا [ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِنْ بَعْدِ مَوَاضِعِهِ ] دەستکاری تەورات ئەکەن کە وتە و فەرموودەی خوای گەورەیە، وە لە شوێنەکانی خۆی ئەیگۆڕن وەکو ئایەتی ڕەجم کە دەستکاریان کردبوو [ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا فَخُذُوهُ ] ئەم ئایەتە لەسەر ئەو دوو جولەکەیە دابەزی کە زینایان کرد بوو ئەیانووت: ئەگەر هاتوو محمد- صلى الله عليه وسلم - بڕیاری دا بە سەد جەڵدە ئەوە وەری بگرن وە ئیشی پێ بکەن [ وَإِنْ لَمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا ] وە ئەگەر وانەبوو وە بڕیاری ڕەجم کردنی دا ئەوە وەری مەگرن و کاری پێ مەکەن، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: لە تەوراتدا چی باسکراوە؟ وتیان ئابڕویان دەبەین و جەڵدەیان لێ دەدەین، (عبدالله¬ی کوڕی سەلام) فەرمووی: درۆتان کرد بەڵکو ڕەجم کردنە، تەورات بێنن، هێنایان وخوێندیانەوە یەکێکیان دەستی خستبووە سەر ئایەتی ڕەجمەکە پێش و پاشیان خوێندەوە، (عبدالله) فەرمووی دەستت لاببە، دەستی لابرد ئایەتی ڕەجمەکە دەرکەوت وتیان ڕاستتکرد ئەی محمد دەبێت ڕەجم بکرێن و پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - بڕیاری دا ڕەجم کران [ وَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ ] وە هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێ گومڕای بکات کە شایەنی هیدایەت نەبێ [ فَلَنْ تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ] ئەوا تۆ موڵکی هیچ شتێکت نیە لای خوای گەورەو ناتوانی هیچ شتێکی بۆ بکەیت، یان سزای خوای گەورەی لەسەر بگەڕێنیتەوە [ أُولَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ] ئەمانە خوای گەورە نەیوویست دڵیان پاك بکاتەوە لە کوفرو شیرك و نیفاق هەروەکو چۆن دڵی صەحابە باوەڕدارەکانی پاك کردەوە [ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ ] ئەمانە لە دونیادا خوای گەورە سەرشۆڕیان ئەکات [ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ] لە ڕۆژی قیامەتیش خوای گەورە سزایەکی زۆر گەورەی بۆ داناون..؟!

**(خوای گەورە ) دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾﴾ [لُقْمَان : ٢٣] واتە: [ وَمَنْ كَفَرَ ] وە هەر کەسێکیش کوفر بکات [ فَلَا يَحْزُنْكَ كُفْرُهُ ] ئەوە ئە ی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆ خەفەت مەخۆ لە کوفر کردنی و زیان بە تۆ ناگەیەنن بەڵکو تەنیا زیان بە خۆیان ئەگەیەنن [ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ] سەرەنجام و گەڕاندنەوەی ئەوانیش هەر بۆ لای ئێمەیە [ فَنُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا ] وە هەواڵیان پێ ئەدەین لەو کردەوانەی کە لە دونیا کردوویانە [ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە بەو دڵەی کە لەناو سینگدایە..؟!

**(خوای گەورە ) دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًاۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾﴾ [البَقَرَة : ٣٨]واتە : [ قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا ] خوای گەورە فەرمووی: هەمووتان دابەزنە سەر زەوی [ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى ] هەر کاتێك هیدایەت و وەحی و کتابتان لە منەوە بۆ هات [ فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ ] ئەوەی شوێن ئەو کتابە بکەوێ و کاری پێ بکات [ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ] ئەوانە ترسیان لەسەر نیە لە داهاتوو لە قیامەت [ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ] وە خەفەتیش ناخۆن لە ڕابردوو لەوەی لە دونیا بەجێیان هێشتووە چونکە خوای گەورە باشتریان پێ دەبەخشێت..؟!

**دووەم : بەدرۆ خستنەوە :**

بەڵێ بێ گومان قەدەغەی کردووە دلتەنگ و خەفەتبار بین بۆ ئەو کەسانەی کە ئاینی ئیسلام و پێغەمبەری خوا ﷺ بە درۆ دەزانن باوەریان بەم ئاینە پاك و بێگەردە نیە ، بۆیە کافران پێغەمبەری خوا ﷺ یان بەدرۆ دەزان بوختانیان پێدا هەلدەبەستی و سیفەتی درۆیان دەدا پالی ، بۆیە لەم کاتەدا زۆر دلتەنگ خەفەتبار و غەمگین دەبوو ، بۆیە کافران و موشریکان دەیان ووت : ئەوەی هێنایەوتی لە (خوای گەورە ) وە نیە بەلکو بۆ خۆی هەلی بەستووە ، هەروەکو کافران و مولحیدەکانی ئێستا ئەم قورئانە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلام بەدرۆ دزانن، بۆیە (خوای گەورە ) بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾﴾ [الأنعَام : ٣٣] واتە : [ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ ] ئەی محمد- صلی الله علیه وسلم - بەدڵنیایی ئەزانین کە تۆ خەفەت لە قسەی کافران ئەخۆی [ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ ] بەلام باش بزانە کە ئەوان تۆ بەدرۆ نازانن لەبەر ئەوەی دان ئەنێن بەڕاستگۆیی تۆدا [ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ (٣٣) ] بەڵام ئەو زاڵم و ستەمکارانە لە حەقیقەتدا ئایەتەکانی خوای گەورەو کتابی خوای گەورە بەدرۆ ئەزانن و ئینکاری و نکوڵی لێ ئەکەن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾﴾ [يس : ٧٦] واتە: [ فَلَا يَحْزُنْكَ قَوْلُهُمْ ] تۆ ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - با وتەی ئەوان خەفەتبارت نەکات و خەفەتی لێ نەخۆی کاتێك کە شەریك بۆ خوا دائەنێن و تۆ بە درۆ دەزانن [ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ] ئەوەی کە ئەوان ئەیشارنەوەو ئەوەی کە ئاشکرای ئەکەن ئێمە ئەزانین و ئاگامان لە هەمووی هەیە..؟!

**سێ یەم : لە کاتێ دوژمن هێرش دەکات تووشی زیان وشکست هێنان دەبین :**

ئەوە بوو لە غەزای ئوحدا ، بێ باوەران هێرشیان کرد ، توانیان موسلمانان تووشی زیان و شکست بکەن ، چەندین موجاهید شەهیدو بریندارو بوون ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بریندارو زامدار بوو، بۆیە ئالەم رۆژەدا واتا لە رۆژی غەزای ئوحد ، سوپای ئیسلام و تووشی زەرەو زیانی زۆر هات، بۆیە لەم کاتەدا ئەوان زۆر دلتەنگ و خەفەتبار غەمگین بوون ، بەلام بۆ ئەم رووداوە (خوای گەورە ) نەهی یان قەدەغەی کردووە کە موسلمانان دلتەنگ بن و خەفەتبار بن ، هەروەك (خوای گەورە ) دفەرموویێت : قال تعالی: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾﴾ [آل عِمرَان : ١٣٩]واتە: وە ئێوە لاوازو بێدەسەڵات مەبن وە خەفەت مەخۆن هەر ئێوەی موسڵمان بەرزو باڵادەست و سەرکەوتوو دەبن بەسەر دوژمنتاندا ئەگەر ئیماندار بن..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَـٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَـٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ [آل عِمرَان : ١٥٣]واتە: [ إِذْ تُصْعِدُونَ

] کاتێك کە ڕائەکەن بۆ سەر شاخەکە [ وَلَا تَلْوُونَ عَلَى أَحَدٍ ] وە ئاوڕ لە کەس نادەنەوە لەوانەی کە لەگەڵتاندان یان لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - [ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ ] وە پێغەمبەری خواش - صلى الله عليه وسلم - بانگتان ئەکات لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی تر کە لەگەڵیان جەنگ ئەکەن ئەی بەندەکانی خوا بگەڕێنەوە [ فَأَثَابَكُمْ غَمًّا بِغَمٍّ ] بەهۆی ئەم هەڵهاتنەوە خوای گەورە تووشی غەم وپەژارە لەسەر غەم و پەژارەتانی کرد چونکە سەرپێچی پێغەمبەری خواتان کردو - صلى الله عليه وسلم - بیستان کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - کوژراوە [ لِكَيْلَا تَحْزَنُوا عَلَى مَا فَاتَكُمْ ] بۆ ئەوەی کە خەفەت نەخۆن لەو غەنیمەیەی کە لە دەستتان چوو [ وَلَا مَا أَصَابَكُمْ ] وە لەو تێکشکاندنەش کە ڕووبەڕووتان بووەوە [ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ] وە خوای گەورە زۆر زانایە بە کردەوەکانی ئێوە ..؟!

## چوارەم : دلتەنگی لە حالەتی نارەحەتی دا :

**بەلێ دلتەنگی یان خەفەتباری قەدەغەکراوە ، لە حالەتی نارەحەتی دا ، لە قورئانی پیرۆز دا ، هەروەکو پێغەمبەر (لوط ) – علیه السلام – و حە زرە تی (مریم ) – علیها السلام - ، وە هاوەلای پێغەمبەری خوا ﷺ (ابو بكر صديق ) کاتێك لە ناو ئەشکەوتەکەبوون لە گەل پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی نارەحەتی و ترس ودلتەنگی بوون.**

**١–پێغەمبەر (لوط ) –علیه السلام– :**

**کاتێك (خوای گەورە ) فریشتەی نارده خواروە بۆ لە ناوبردنی قەومەکەی یان گەلەکەی (لوط ) –علیه السلام– ئەوە بوو (لوط ) –علیه السلام– لەم کاتەدا تووشی ترس و نارەحەتی هات بە هۆی هاتنی ئەم دوو فریشتەیە ، لەبەر ئەوەی هاتبوون بۆ ئازار و سزادانی قەومەکەی یان گەلەکەی ، چونکە نەی دەزانی ئەوان فریشتەن ، ئەوان لەسەر شێوەی خۆیان نەهاتبوون ، بۆیە زۆر ترساو نارەحەت بوو ، هەلبەتە دلتەنگ وخەفەتباریش بوو ..؟!**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗاۖ وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٣٣﴾ [العَنكَبُوت : ٣٣]واتە : {پێغەمبەرانیش غەیب نازانن!} [ وَلَمَّا أَنْ جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ ] وە کاتێك کە نێردراوانی ئێمە چوون بۆ لای لوط پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - لەسەر شێوەی گەنجی زۆر جواندا پێی ناخۆش بوو [ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا ] وە زۆر دڵتەنگ بوو لەبەر ئەوەی میوانی پیاوی هاتووە ئێستا قەومەکەی بزانن دێن دەستدرێژی ئەکەنە سەریان، نەیزانی ئەمانە فریشتەن (پێغەمبەرانی خوایش غەیبیان نەزانیوە تەنها ئەوەندەی کە خوای گەورە نیشانی دابن، ئیتر چۆن خەڵکی تر بانگەشەی زانینی غە یب دەکەن؟!) [ وَقَالُوا لَا تَخَفْ ] ئەوانیش خۆیان پێ ناساند کە ئێمە فریشتەین، وە پێیان وت: ئەی لوط - صلى الله عليه وسلم - مەترسێ [ وَلَا تَحْزَنْ ] وە خەفەتیش مەخۆ [ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ ] بەدڵنیایی ئێمە خۆت و کەسوکاریشت (باوەڕداران) ڕزگار ئەکەین [ إِلَّا امْرَأَتَكَ ] تەنها خێزانەکەت نەبێ [ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ] ئەو ئەمێنێتەوە لەناو سزاکەدا..؟!

**٢- بەسەرهاتی حەزرەتی (مریم ) -علیها السلام - کە ژانی مندال بوونی بۆ هات غەم وپەژارەو دلتەنگی رووی تێکرد ، فەرمووی : ئاواتی خواست فەرمووی : خۆزگە بمردمایە بۆ ئەوەی خەلکی گومانی خراپم پێ نە بات ..؟!**

(**خوای گەورە** ) **دەفەرمووێت** : قال تعالى: ﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴿٢٦﴾ ﴾ [مَرْيَم : ٢٣ - ٢٦]واتە : [ فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ ] کە ژانی مندالّ بوونی بۆ هات ژانی منالّ بوونەکە بردی بەرەو ژێر دارخورمایەك [ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا ] ئەمیش ئاواتی خواست خۆزگە پێش ئەوەی ئەمەم بەسەردا بێ بمردمایە بۆ ئەوەی خەڵکی گومانی خراپم پێ نەبات (ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە مرۆڤ لە کاتی فیتنەدا ئاوات بخوازێت بە مردن) [ وَكُنْتُ نَسْيًا مَنْسِيًّا] وە خۆزگە من شتێکی بێ ڕێز بوومایەو هەر باس نەکرامایە، یاخود هەر دروست نەکرامایە، یاخود وەکو پەڕۆی حەیزاوی بوومایە کە فڕێ ئەدرێ و ناوم نەبوایە..؟! [ فَنَادَاهَا مِنْ تَحْتِهَا ] لە ژێریەوە لەژێر دارەکەوە جبریل، یاخود عیسى بانگی لێ کرد [ أَلَّا تَحْزَنِي ] خەفەت نەخۆی [ قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ] ئەوە پەروەردگارت کانیاو و جۆگەلە ئاوێکی لە ژێرتەوە دەرکردووەو تێ ئەپەڕێ لەو ئاوە بخۆرەوە..؟! [ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ] وە ئەو قەدی دار خورمایە ڕابوەشێنە خورمای تەڕت بۆ دێتە خوارەوە (کاتی خورما پێگەیشتن نەبووە)..؟! [ فَكُلِي وَاشْرَبِي ] لە خورما تەڕەکە بخۆ و لە ئاوەکە بخۆرەوە (هیچ شتێك وەکو خورمای تەڕ بۆ ئافرەتی زەیستان بەسوود نیە) [ وَقَرِّي عَيْنًا ] وە چاوڕۆشنابە پێی و خۆت لە خەفەت دووربخەرەوە [ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنْسِيًّا] وە ئەگەر هەر مرۆڤێکت بینی ئەوە بە ئاماژە پێیان بڵێ: من نەزرم کردووە بۆ پەروەردگارم کە خۆم بگرمەوە لە قسە کردن و ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا ناکەم (وتراوە لە بەرۆژوو بوونی ئەواندا خواردن و قسە کردنیش حەرام بووە)..؟!

**٣-کاتێك (ابو بکر صدیق ) - خوا لێ رازی بێت - له‌گه‌ل پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له ئه‌شکه‌وته‌که دابوون :**

**ئه‌وه بوو (ابو بکر ) هاورێ و هاوده‌می پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بوو، له کۆچ کردنی بۆ شاری ، مه‌دینه کاتێك له شاری مککه ده‌رچوون ، بۆ ئه‌وه‌ی له ده‌ستی کافران خۆیان رزگار بکه‌ن و خۆیان حه‌شار بده‌ن ، ئه‌وه بوو چوونه ناو ئه‌شکه‌وتی (الحراء) له‌وێدا خۆیان حه‌شاردا بۆ ئه‌وه‌ی کافرانی قوره‌یش پێیان نه‌زانن، ئه‌وه بوو کافران به‌دوایان دا ده‌گه‌ران ، ئه‌وانیش هه‌ردووکیان له نێو ئه‌شکه‌وته‌که دا بوون ، کاتێك گه‌یشتنه به رده‌م ده‌رگای ئه‌شگه‌وت زۆر لێ یان نزیك بوونه‌وه ، ئه‌وه بوو (ابو بکر ) تووشی ناره‌حه‌تی ترس بیمه بوو ، له‌م کاته‌دا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ، به هاوه‌له‌که‌ی خۆی واته (ابو بکری صدیق) فه‌رموو: دلته‌نگ و خه‌فه‌تبار مه‌به ، چونکه (خوای گه‌وره ) مان له گه‌ل دایه ..؟! هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویێت :** قال تعالى: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾ [التَّوْبَة : ٤٠]واته : {فه‌زڵی ئه‌بو به‌کری صدیق} [ إِلَّا تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ ] ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - سه‌رنه‌خه‌ن و له‌گه‌ڵیدا جیهاد نه‌كه‌ن ئه‌وه به‌دڵنیایی خوای گه‌وره پێغه‌مبه‌ری خوای - صلى الله عليه وسلم - سه‌رخست [ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ ] كاتێك كافران له‌ مه‌ككه‌ ده‌ریان كرد كه‌ یه‌كێك بوو له‌ دوو كه‌سه‌كه‌: كه‌ پێغه‌مبه‌ری خواو - صلى الله عليه وسلم - ئه‌بوبه‌كر بوو (خوای لێ ڕازی بێت) [ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ ] كاتێك له‌ ئه‌شكه‌وته‌كه‌دا بوون له‌ شاخی (ثهور) كه‌ نزیكه‌ له‌ مه‌ككه‌ له‌ كاتی كۆچ كردنیان بۆ مه‌دینه‌ [ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا ] كاتێك كه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - به‌ هاوڕێكه‌ی ئه‌فه‌رمووێ كه‌ ئه‌بوبه‌كره‌: خه‌فه‌ت مه‌خۆ خوای گه‌وره‌ له‌گه‌ڵمانه‌، كه‌ ئه‌بوبه‌كر خه‌فه‌تی له‌وه‌ ئه‌خوارد فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر یه‌كێك له‌ كافران له‌سه‌ر ئه‌شكه‌وته‌كه‌ ته‌ماشای پێی خۆیان بكه‌ن ده‌مانبینن، پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - فه‌رمووی: خه‌فه‌ت مه‌خۆ خوامان له‌گه‌ڵدایه‌و سه‌رمان ئه‌خات تۆ گومانی چی به‌ دوو كه‌س ده‌به‌یت كه‌ خوای گه‌وره‌ سێیه‌میانه‌ [ فَأَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ ] خوای گه‌وره‌ هێمنی و ئارامی دابه‌زانده‌ سه‌ر دڵی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - [ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهَا ] وه‌ پشتیوانی كرد به‌ سه‌رباز كه‌ ئه‌مان ئه‌وو سه‌ربازانه‌یان نه‌بینی كه‌ مه‌لائیكه‌ت بوون [ وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُوا السُّفْلَى ] وه‌ وشه‌ی كافران كه‌ شیركه‌ خوای گه‌وره‌ نزمی كرد [ وَكَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا ] وه‌ وشه‌ی خوای گه‌وره‌ كه‌ ته‌وحیدو (لا إله إلا الله) یه‌ خوای گه‌وره‌ به‌رزی كردووه‌ [ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ] وه‌ خوای گه‌وره‌ زۆر به‌عیززه‌ت و باڵاده‌ست و كاربه‌جێیه‌..؟!

## لا تحزن خه‌فه‌تبار مه‌به..؟

✓ بیربکه‌وه سوپاس گوزاری (خوای گه‌وره) به ..؟!

**كه‌واته بیر له‌و به‌هه‌ره و نیعمه‌ت وبه‌شانه‌ى (خواى گه‌روه ) بكه‌وه كه به‌سه‌رتا باراندووه ، هه‌ست ده‌كه‌یت تۆیان داپۆشیوه هه‌ر له سه‌ر سه‌رته‌وه تاكو بنی پێته‌وه ، ئه‌م ئایه‌تانه‌ى خواره‌وه ئه‌م به‌هه‌ره‌و نیعمه و به‌شانه‌ى (خواى گه‌وره ) ن كه به مرۆڤه‌كانى به‌خشیوه كه هیچ كات هه‌ژمار ناكرێن نیعمه‌ته‌كانى خوا ..؟!**

**(خواى گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت** : قال تعالى: ﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُۚ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ۝٣٤﴾ [إبْرَاهِيم : ٣٤] واته: [ وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ] وه له هه‌موو شتێك له‌وه‌ى كه ئێوه داواتان كردووه خواى گه‌وره پێی به‌خشیون [ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ] وه ئه‌گه‌ر بتانه‌وێ نیعمه‌ته‌كانى خواى گه‌وره بژمێرن ئه‌وه له ژماردن نایه‌ن و تواناى ژماردنیتان نیه له‌به‌ر زۆرى ئه‌و نیعمه‌تانه‌ى كه خواى گه‌وره پێی به‌خشیون [ إِنَّ الْإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ] به‌ڕاستی مرۆڤ زۆر زوڵم و سته‌م له نه‌فسی خۆی ئه‌كات وه زۆر كوفرانه‌بژێری نیعمه‌ته‌كانى خواى گه‌وره ئه‌كات..؟!

**نیعمه‌تی یان به‌هه‌ره‌ى ته‌ندروستی له‌ش ساخی ، هه‌روه‌ها ئاسایش و هێمنی ، نیعمه‌تی خۆراك و پۆشاك ئاو هه‌وا ...هتد وه هه‌رچی له بوونه‌وه‌ر دایه ، له به‌رژه‌وه‌ندی تۆ دایه ..؟! كه‌چی ئه‌وانده جاهیل غافلین هه‌ستی پێ ناكه‌ت مرۆڤی بێ باوه‌رو دوو روو ئیلحاد ، كه‌چی ده‌ركی پێ ناكات ، به‌دواى ئاره‌زه‌و قێزه‌ونه‌كانى ده‌كه‌وێت ، ده‌ركی نیه به‌م هه‌موو نیعمه‌ت به‌هه‌ره یه كه (خواى گه‌وره ) پێ به‌خشیوه ..؟!**

**(خواى گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت** : قال تعالى: ﴿أَلَمْ تَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةًۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ۝٢٠﴾ [لُقْمَان : ٢٠] واته : [ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] ئایا نابینن خواى گه‌وره هه‌رچی له ئاسمانه‌كاندایه له خۆرو مانگ و ئه‌ستێره‌و هه‌ورو باو باران، وه ئه‌وه‌ى له زه‌ویدایه له دارو به‌ردو زه‌رعات و دانه‌وێڵه‌و رووه‌ك و ئاژه‌ڵ و روبارو كانی هه‌مووى بۆ ئێوه ژێربار كردووه‌و بۆ سوودو به‌رژه‌وه‌ندی ئێوه‌ى دروست كردووه [ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ] وه نیعمه‌ته ئاشكراو نهێنیه‌كانى خۆى به‌ته‌واوى ڕژاندووه به‌سه‌رتاندا [ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ ] وه له‌گه‌ڵ ئه‌مانه‌یشدا له‌ناو خه‌ڵكیدا كه‌سانێك هه‌ن گفتوگۆو ده‌مه‌قاڵێ ئه‌كه‌ن له زاتی پیرۆزو یه‌كخواپه‌رستی خواى گه‌وره‌دا [ بِغَيْرِ عِلْمٍ ] به‌بێ ئه‌وه‌ى زانست و زانیاریان هه‌بێ [ وَلَا هُدًى ] وه به‌بێ ئه‌وه‌ى له‌سه‌ر ڕێگاى هیدایه‌ت بن [ وَلَا كِتَابٍ مُنِيرٍ ] وه به‌بێ ئه‌وه‌ى كه كتابێكی ڕووناك و ئاشكرایان پێ بێت كه له‌و كتابه گفتوگۆ بكه‌ن..؟!

پرسیار ئایا بۆ مەگەر کارێکی ئاسانە تۆ بە سەر قاچەکانتەوە گوزەر بکەیت ..؟! وە بەسەر قاچەکانتەوە بوەستی ..؟! وەلام / کەچی زۆر کەس قاچی نیە براو پێ بوەستێ ..؟! تۆ خەفەتبار و غەمبار مەبە چونکە (خوای گەورە ) چاکەی لە گەلدا کردووی بە پێ وە بوەستی و بە سەر قاچە کانت گوزەر بکەیت !؟..

پرسیار ئایا شتێکی کەمە یان ئاسانە تۆ بە پراو پری تێر خەوبیت ..؟! هەروەها گەدەت یان ماعیدەت لە خۆراك پر بکەیت و چێژو تامی لێوە وەر بگریت ..؟! هەروەها خواردنەوەی وەکو ئاوی ساردو سازگارو نۆش بکەیت ..؟! وەلام / کەچی کەسانێکی زۆر هەن لەم ژیانەدا ، لە تاو ئیش و ژانی گەدەیان نان و خواردنەوەیان پێ ناخورێ ، یان خەو یان لە چاوی براوە تامەزرۆی ساتێکی خەون بە ئارامی بخەون ، لەبەر ئیش و ژان و ئازاری جستەیان ، بۆیە خەویان لە چاوی زراوە ..؟! هەروەها تام و چێژی خواردن و خواردنەوەیان لە دەمدا گۆراوە هەستی بە چێژو تام ناکەن ، ئاوی سازگار لە قورگیان زوخاوە ، بەلێ تۆ خەفەتبار و غەمبار مەبە ، چونکە نیعمەتەکان هەژمار ناکرێن ..؟!

پرسیار ئایا بۆ وورد نابیەوە لە بیستن و بیناییت ..؟! کە (کەور کوێر ) نیت ، ئایا بۆ بیرناکەیتەوە کە هەست هۆشی پێ بەخشیوەی ، ژیری پێدای بۆ ئەوەی لە ژیان بکەی و خەفەتبار نەبی ، بۆ بیرناکەیەوە کە عەقل ژیری هۆشت هەیە ، نەبوویتە بە کەم عەقل یان ئەم بەهەرەیەت نەبێ وەکو شێتێك لە ژیان گوزرەبکەیت ، ئەگەر بە قەد چیایی هەلگورد یان سەفین ئالتون زێر هەبێت بێ نرخ دەبێت ..؟! چونکە عەقل ژیریت لە دەست داوە ، هەروەها ئەگەر چاویکت لەدەست بدەیت هەموو مولك سامانی دونیا تەرخان دەکە بۆ چارەسەرکردنی چاوەکەت ، بۆ بیر لەم نیعمەتەی بینین و بیستن و عەقل هۆش و ژیری ناکەیتەوە.؟!

(خوای گەورە ) دفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١﴾ [الذَّارِيَات : ٢١] واتە : وە لە نەفسی خۆیشتاندا چەندەها بەڵگە هەیە لەسەر یەکخواپەرستی خوای گەورە ئایا بۆ نایبینن و بۆ هەستی پێ ناکەن..؟!

(خوای گەورە ) دفەرموویت : قال تعالى: ﴿يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨٣﴾ [النَّحۡل : ٨٣]واتە : نیعمەتەکانی خوای گەورە هەمووی ئەزانن و ئەیناسن بەڵام لە دوای ئەوە نکوڵی لێ ئەکەن بەوەی کە عیبادەت بۆ غەیری خوای گەورە ئەکەن [ وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ] وە زۆربەشیان کافرو بێباوەڕن..؟!

### ✓ لەدوای جوان مەچوو یان بەدوای کڵاوی با بردوو مەکەوە ..؟

بیرکردنەوە یان یادکردنەوە لە رابردوو دا ، یان لێکدانەوە تاو توێ کردن لە بیرو هزردا ، وە یان سوو دڵ توندی دلتەنگی و خەفەتباری لە پێناو ئاخ و داخیدا ، ئەم گەوجی و گێلی و گەمژەیی و نەفامیە ......؟!

بێگومان کەسانی ژیرو هۆشمەند بەدوای کلاوی با بردوو ، بە دوای هەلدانەوەی کەونەکان ناچن لاپەرەی رابردووی ژیانی خۆیان هەلدەنەوە خەفتبار و غەمبار دلتەنگ بن بۆی ..؟! بۆیە بەدوای هەلدانەوەی لاپەرە کۆنەکانی ژیانیان ناکەون ، برینیان ناکولێنەوە ، بەلکو رابردوویان دەنێژن لە کونجی زیندان فەرمۆشی دەکەن رابردوویان دەپێچنەوە و، وە کۆت زنجیر دەکرێن ..؟! چونکە رابردوو ناگەرێتەوە ، نە بە دڵ توندی و نەبە خەم و پەژارە نە بە سووخوادرنەوە ئاخ داخ دەگەرێتەوە ..؟! پرسیار ئایا دەتوانێت پێچەوانەی رەوشی سروشت و فترەتی ژیان رەفتارو مامەلە بکەیت ..؟! روبار بەرەو ژوور ..؟! رۆژ ئاوابوون بەرەو رۆژە هەلاتن ..؟! مندال بگەرێنیتەوە ناو سگی دایکی ..؟! شیر بگەرێنیتەوە بۆ گوانی ئاژەلان ..؟! فرمێسك بگەرێنیتەوە بۆ چاوەکان..؟! بێ گومان نەخێر ..!! ئیتر چی تر لە دوای چەتری دێوە زمەی رابردوو دا یان لە ژێر لەدەست چوودا مەگوزەرێنە ..؟! چونکە تارمایەکی زۆر ترسناکە ..؟!

(خوای گەورە) باسی گل و قەومەکانی رابردووی کردووە وە باسی کردار و رەفتارەکانیان دەکات ، دەفەرمووێت: قال تعالى: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾﴾ [البَقَرَة : ١٣٤] واتە : [ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ] ئەمە ئوممەتێکە لە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانیان [ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُمْ مَا كَسَبْتُمْ ] ئەوان چیان کردبێ لە چاکە بۆ خۆیانە وە ئێوەش چی بکەن بۆ خۆتانە [ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ] ئێوە پرسیارتان لێ ناکرێت کە ئەوان چ کردارێکیان کردووە واتە: بەوە نابێ کە بەدرۆ بڵێن ئێمە لە نەوەی ئیبراهیمین و تەواو بەهەشت بۆ ئێمەیە بەهیواو ئاوات خواستن نیە ئەبێ خۆتان ئیمان بێنن وە کردەوەی چاك بکەن..؟!

بەلێ ئەو کەسەی بۆ رابردوو دەگەرێتەوە ، وەك ئەوە وایە دووبارە ئارد بهارێتەوە ، وە یان پوشکەی داری بروا ببرێتەوە هەر لە کۆنەوەش گوتراوە ((بەوانەی ئەسرین بۆ رابردوو دەرێژن ، مردووی پار هاوێنی ئەمرۆ بۆی مەکە بە شێن و گریان )) بە هەمان شێوە بە ئاژەلی کەریان ووت : ئایا بۆ کاوێژ ناکەی وەك بزن ..؟! ئەویش ووتی : ئاخر من رەقم لە درۆیە ..؟!

## ✓ دلته‌نگ مه‌به هه‌ر ئه‌م رۆژه‌ی ئێستات رۆژه ..؟!

به‌لێ بێگومان كاتێك به‌یانیت كرده‌وه چاوه‌ری ئێواره لێ داهاتن مه‌به ..؟! یان كاتێك ئێواره‌ت به‌رێكرد چاوه‌ری به‌یانی مه‌به ..؟! وای دانێ هه‌ر ئه‌م رۆژه ژیان ده‌كه‌ت ، نه‌ك دوێنی یان نه‌وه‌ك به‌یانی دادی ژیان ده‌كه‌یته‌وه ، به‌لكو ده‌بێت وا بیر بكه‌یته‌وه ته‌نها ئه‌و رۆژه‌ی كه تێدای ژیان بكه‌ی نه‌بیر له دوێنی ده‌كه‌یته‌وه وه‌نه بیر له‌به‌یانی ده‌كه‌یته‌وه ..؟! چونكه ته‌نها ئه‌و رۆژه رۆژی ژیانته ، كه پرشنگی رۆژ به‌سه‌رت دا هه‌لاتووه‌و تۆی له ئامێز گرتووه ، كه‌واته ته‌مه‌نت ته‌نها یه‌ك رۆژه له ژیاندا..؟! یان ته‌مه‌نت رۆژێكه ..؟! ده‌سا هه‌ر بۆ ئه‌م رۆژه بژی برمه ..؟! هه‌لبه‌ته هه‌ر له رۆژێك چاوت به دونیا دا هه‌ل هێناو هه‌ر له‌م رۆژه‌دا ده‌مری سه‌ر ئه‌نێیه‌وه ..؟! چونكه ده‌بێت هه‌ر له‌م رۆژه‌دا هه‌رچی هه‌ول و كوشش هه‌یه ئه‌نجامی بده‌ی ،هه‌رچی كرده‌وه‌و خێرو چاكه هه‌یه ئه‌نجامی بده‌ی ،هه‌رچی فه‌رزو واجب هه‌یه ئه‌نجامی بده‌ی ، هه‌رچی راست و دروست حه‌ق ره‌وایه ئه‌نجامی بده‌ی ، چونكه نه‌وه‌ك نه‌گه‌یته‌وه به ئێواوه‌ر یان ئێواره نه‌وه‌ك نگه‌یته‌وه به به‌یانی ..؟! بۆیه نابێت غافل بیت له نوێژه‌كانت نابێت غافل بیت له خوێندنه‌وه‌ی قورئان و فه‌رمووده‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ، هه‌روه‌ها نابێت غافل بیت له كرده‌وه‌ی چاكه له گه‌ل خه‌لك دا ، یان نابێت غافل بیت له به‌خشندیی و ره‌حم به‌زه‌یی و دادگه‌ریت له‌م رۆژه‌دا ، بۆیه ده‌بێت له‌م رۆژه‌دا پێش بركێی چاكه ئه‌نجام بده‌یت ، بێ گومان له‌م رۆژه دا نابێت چركه‌ساته‌كان به فیرۆبده‌ی به كرداری خراپ..؟!

چونكه ته‌مه‌ن یه‌ك رۆژه خه‌فه‌تبار مه‌به دلته‌نگ مه‌به ..؟! بۆیه به‌رده‌وام له پێشبركێی دابه له‌چاكه كردن

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ١١٤] واته : [ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ ] وه ئیمانیان به‌خوای گه‌وره‌و به‌رۆژی دوایی هه‌یه وه فه‌رمان ئه‌كه‌ن به چاكه به جووله‌كه‌كانی تریش ئێوه‌ش وه‌رن موسڵمان بن و شوێن پێغه‌مبه‌ری خوا بكه‌ون - صلى الله عليه وسلم - [ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ ] وه رێگری ئه‌كه‌ن له خراپه [ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ ] وه ده‌ستپێشخه‌ری ئه‌كه‌ن له ئه‌نجامدانی كاری چاكدا [ وَأُولَئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ (١١٤) ] ئا ئه‌وانه كه ئیمانیان هێناوه ئه‌مانیش له‌گه‌ڵ پیاوچاكاندان له‌گه‌ڵ صه‌حابه‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوادان - صلى الله عليه وسلم - له‌وانه‌ی كه خوای گه‌وره فه‌رمووی: ئێوه باشترین ئوممه‌تن ..؟!

بێ گومان دەشێ لەم رۆژەدا ساتەکانی بەر فەروان کەی ، هەر خولەکێك ئەم رۆژە بکەیت بە سالێ ..؟! هەر چرکە ساتێکی ئەم رۆژە بکەیت بە مانگێك ..؟! تۆیی کرداری چاکە تێدا بچێنی ، هەلسوکەوتی جوان بروێنی ، فەرمێسکی پەشیمانی هەلوەرێنە بۆ پەروەردگارت ، هەر خولەکێك لەم رۆژەدا بەدەم زکرو یادی (خوای گەورە ) بکەیت ، وە هەر لەم رۆژەدا تویشوی کۆچی یەکجارەکی بەرهەم بهێنی ..؟!

(خوای گەورە) دفەرموویێت : قال تعالى: ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٤﴾ [الأَعۡرَاف : ١٤٤] واتە : خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسى - صلى الله عليه وسلم - من تۆم هەڵبژاردووە بەسەر خەڵکی سەردەمی خۆتدا بەوەی کە پەیامی خۆم بۆت ناردووە، وە ڕاستەوخۆ قسەم لەگەڵدا کردووی بەبێ واسیتە [ فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ ] ئەوەی کە پێم بەخشیویت بەجوانی وەری بگرە، وە لەو کەسانە بە کە شوکرانەبژێری خوای گەورە ئەکەن لەسەر ئەم نیعمەتانە..؟!

بەلێ ئەگەر تۆ بە هەست و ویستی پۆلاینەوە هەواو ئارەزووە کانت بگری دەتوانی بیرۆکەی (هەر ئەم رۆ دەژیم بەدەست بێنی ، یان وەك ئەلقەیەك لە گوێ بگری ، هەموو چرکە ساتەکانی ژیانی ئەمرۆت دەستە بەر بکەیت ، بنچینەی کەسایەتی و شکۆو عزەت بەخشندەیت تووندو تۆل بکەیت ، ئەوسا دەلێت : تەنها ئەمرۆم ماوە یان ئەم ساتەوەختەم لە بەردەست ماوە لە ژیاندا ، بۆیە بۆ ئەم چرکەساتەی ژیانی ئەمرۆم ووتە گەفتارەکانم بژاردە دەکەم ..؟! خراپەکاری کرداری پرو چوو قێزە وون ناکەم ، لە پاش ملە زەمی کەس ناکەم ، یان بوختان و قەسە هەلنابەستم لەم رۆژەدا ،چونکە هەلبژادەکەی ئەم رۆژە دەبێت بە چاکە خێرو کرداری جوان تێپەرێت ، چاکە کار دەم تەنا بۆ ئەم رۆژە دەژیم ..؟! مندالە کانم بە جوانی پەروەردەکەم لەم رۆژە دا نفقەیان بە حەلالی بۆ پەیدا دەکەم ..؟! هەر لەم رۆژە دا دەبێت پێشنگ بێت بۆ کەس و کارو خانەوادە خزمە و دۆست و هاورێکان ..؟! هەر لەم رۆژەدا ئەرك و کارکردنی ژیانی رۆژانە زۆر بە جوانی بەرێ دەکەم ، بە حەلالی بژێوی ژیان پەیدا دەکەم بۆ مال و مندالەکانم ، هەر لەم رۆژە دا بەپرسیارەتی خۆم بۆ ئیش کارەکەم بێ غەش و بێ کەم و کوریەوە رادەپەرێنم ..؟! بەدلسۆزیەوە دەچمە سەرکارەکەم چونکە (خوای گەورە) یاوەرمانە کارەکانمان بۆ ئاسان دەکات ، ئەگەر بە ئەخلاص و دلسۆزیەو ئیش کارەکانم ئەنجام بدەین ..؟! بۆیە لە دلسۆزی بۆ هەر کارێکدا ئەوا هەموو بوونەوەرو مرۆڤەکان (خوای گەورە ) بۆت فەراهەم دەکات ، ئەگەر تەنها لە پێناوی (خوای گەورە ) دا هەر کاریچك ئەنجام بدەیت ، وە بەدلسۆزی راست و دروستی بۆی بچیت ..؟! بۆیە هەر بۆ ئەمرۆ دەژیم بۆ ئەوەی کاری چاکە و پەسند لە لای (خوای گەورە ) لە دلم دا دەروێنم ..؟!بۆ خەلکی دەمە داری بەر ..؟! برسی بێ نان تێر دەکەم ..؟!رزگار کەر دەبم بۆ ئەوەی کۆستی کەوتبێ ..؟! دلنەوای فەقیر هەژاران دەمەوە ..؟!

## ✓ خۆت بە ئاینده سەرقاڵ مەکە هەر بۆ ئەمرۆ بژی ..؟

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١﴾ [النَّحل : ١] واتە : [ أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلا تَسْتَعْجِلُوهُ ] سزای کافران، یاخود تەواوتر ڕۆژی قیامەتە، واتە: ڕۆژی قیامەت هاتووە هیچ گومانێکی تیا نیە بەڵام ئێوە پەلە ئەکەن لە هاتنیدا (بە صیغەی ڕابردوو هاتووە چونکە قیامەت دێت و ڕوو دەدات هیچ گومانێکی تێدا نیە) [ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ] پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە لەو هاوەڵبڕیاردانەی کە ئێوە ئەیدەنە پاڵ خوای گەورە، خوای گەورە زۆر لەوە پاك و مونەززەهو بەرزترە..؟!

پێشبڕکێ لەگەڵ ڕووداوەکاندا مەکە ..؟! خۆناتەوێ پەلە بکەیت و کۆپەلە ناو سگ لە ناو بەریت لەوەی کە کاتی خۆی دابێت ..؟! یان ناتەوێت داری بەرهەمدار پێش بێگەیشتنی بەرهەمەکە بخۆی ..؟! خۆ هێشتا سبەینێ دانەهاتوو جێگای قسەو باس نیە ، واتە پێش ڕووداوەکان مەکەوە یان هێشتان سەبەینی دانەهاتووە..؟!یان بۆ هەر ووداوێك کەڕوویدا ئینجا قسەی لە سەر دەکرێ ، نەك پێش ڕوودانی پەلە بکەت.؟!بۆیە سبەینی بوونی نیە ..؟!یان ڕووداوەکە بوونی نیە بۆ خۆمانی پێ سەرقاڵ بکەین ..؟!بۆیە نابێت بۆی دڵتەنگ و خەفەتبار بین ..؟!چونکە هەرچی ڕووبدات لێمان نادیار ناڕوونە ، هێشتا هەر لە ئاسمانەوە نەگەیشتۆتە سەر زەمین ..؟! چونکە زۆرانبازی کردن لە گەڵ سێبەر دا جۆرێکە لە ڕەشبینی نائۆمیدی لە ئایندەدا ، چونکە ئەوەندە (قتورە ) واتە : (پیسکە یان چاوتەنگە) بیر لە ئایندەیەکی دوور دەکاتەوە ، وادەزانی نانی نابێ بیخوات پۆشاك نابێت لە بەری کا ، هەروەك (خوای گەورە ) بۆ مان باس دەکات کە ئەوانەی سیفەتی (قتور )یان هەیە ، دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ إِذٗا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ قَتُورٗا ١٠٠﴾ [الإِسۡرَاء : ١٠٠] واتە: ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئەگەر خەزێنەکانی ڕەحمەتی خوای گەورە لە ڕزق و ڕۆزی بەدەست ئێوە بوایە ئەوە ئێوە نەتانئەبەخشی و ڕەزیلیتان ئەکرد [ خَشْيَةَ الْإِنْفَاقِ ] لە ترسی ئەوەی کە تەواو بێت [ وَكَانَ الْإِنْسَانُ قَتُورًا ] وە بەڕاستی مرۆڤ زۆر ڕەزیل و چروکە..؟!

بەلێ زۆرن ئەوانەی حیسابی خۆیان بۆ هەزار ساڵ دەکەن ، وادەزانن نامرن و ناگەڕێنەوە بۆ لای (خوای گەورە ) لە چرکەساتێك دا کۆتایی بە ژیانی دەهێنرێت ، هەموو خەون ئارەزوو خۆزگە کانی هەبوو بۆ ئاینده لەگەڵ خۆی دا دیباتە ژێر گەڵ لە پڕ هەموو ژیانی کە بۆ هەولداوە کۆکردۆتەوە دەبێتەوە بە سفر یان بە هیچ ..؟! بۆیە ئاینده بەلاوە نێ لە بیری کە باس وخواسی داهاتوو قەد مەپرسە ..؟! لە هەرشە و گۆرەشەی بێ بنەما مەترسە ..؟! چونکە ووتراوە : خوا یەکە و دەرگای هەزار بنو بێ خەم و خەیاڵ ..؟!

### ✓ دلنیابە هەموو ناخۆشیەك خۆشی لە دوایە

**ئەی مرۆڤ دەستەو دامێن دامەنیشە ، بێ جارە نائومێدو رەش بین مەبە ، چونکە دوای بالاو ناخۆشی خۆشی لەدوایە ..؟! لە دوای برسی بوون دلنیابە تێر دەبی ، لە دوای کەم خەوی خەو خۆش دەبی ، لە دوای ناساغی لە ش ساغ دەبی ، چونکە خوا یەك و دەرگای هەزارە بێ ئومید مەبە لە رەحمەت و بەزەیی و بە خشندەیی پەروەردگار ،هەموو تاریکیەك رووناك دەکاتەوە ، هەموو دەرگایەکی داخراوە ولادەکات ، بۆیە نائومید و لە ژیان مەبە یان هیوا بر مە ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ٥٢﴾ [المَائـِدَة : ٥٢] واته : [ فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ ] ئەبینی ئەو کەسانەی کە نەخۆشی گومان و نیفاق لە دڵیاندایە کە مونافیقانن پەلەو دەستپێشخەری و پێشبڕکێ ئەکەن لە دەربڕینی خۆشەویستی و سەرخستنیان بۆ گاورو جوولەکە [ يَقُولُونَ نَخْشَى أَنْ تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ ] ئەڵێن: لەوە ئەترسێین نەوەکو کافران زاڵبن بەسەر محمد داو- صلى الله عليه وسلم - ئەوان دەسەڵاتدار بن و دەوڵەتیان هەبێت ئەو کاتە ئێمەش تووشی زەرەرو زیان ببین [ فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِنْ عِنْدِهِ ] ئە ی محمد- صلى الله عليه وسلم - بەڵێ: نزیکە و بەدڵنیایی خوای گەورە موسڵمانان سەر ئەخات وە فەتحیان بۆ دەکات وەکو دەرکردنی (بەنی قورەیضە) و (بەنی نەضیر) لە مەدینە، وە فەتحی مەککە، یاخود هەر کارێکی تر کە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ موسڵمانان بێ کە دەسەڵات و توانای جوولەکەکان نەهێڵێ و موسڵمانان زاڵ بکات بەسەریاندا، یاخود کاروباری مونافیقان بۆ موسڵمانان ئاشکرا بکات و ئابڕویان ببات [ فَيُصْبِحُوا عَلَى مَا أَسَرُّوا فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ ] ئەو کاتە مونافیقان ئەوەی لە دڵی خۆیاندا لە نیفاق شاردوویانەتەوە پەشیمان ئەبنەوە لێی..؟!

**بێ گومان لە دوای ئەسرین سرین خەندو پێکەنین دێت ، وە لەدوای ترس وبیمە خۆشی شادی ئارامی دێت.؟! هەروکو پێغەمبەر ابراهیم – علیه السلام – خستیانە ناو ئاگر بە گری ئاگر نەسووتا ، چونکە (خوای گەورە ) دەرگای چاودیری لێ ولا کردبوو بەم فەرمانە ، کە دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿قُلۡنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ٦٩﴾ [الأنبِيَاء : ٦٩] واتە: {خوای گەورە ئیبراهیم پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - رزگار دەکات} [ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ (٦٩) ] دوای ئەوەی کە ئاگرێکی زۆر گەورەیان کردەوە کە ئاگری وا گەورە نەکرابووەوە، وە گڕو بڵێسەی زۆر گەورە بوو نەیانتوانی لێی نزیك ببنەوە بە مەنجەنیق ئیبراهیمیان - صلى الله عليه وسلم - هەڵدایە ناوی، لەو کاتەدا ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: (حسبي الله ونعم الوكيل، واتە: تەنها خوام بەسە، وە باشترین پشتپێبەستراوە) خوای گەورە ئەفەرمووێ: وتمان ئەی ئاگر ساردو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - ، ئەگەر نەیفەرموایە سەلامەت بە ئەوەندە سارد ئەبوو لە ساردیدا ئیبراهیمی - صلى الله عليه وسلم - ئەبەست و ئازاری پێ ئەگەیاند (لەو کاتەدا

هەرچی ئاگری دونیا هەبوو هەر هەمووی کوژایەوەو کەس سوودی لە ئاگر نەبینی، وە هەرچی گیانلەبەر هەبوو فووی لە ئاگرەکە دەکرد بۆ ئەوەی بکوژێتەوە تەنها قومقمۆك (پیسپیسۆك) نەبێت کە فووی دەکرد بۆ ئەوەی ئاگرەکە گەشتر بێت، هەر بۆیە سوننەتە بیکوژیت)..؟!

**هەروەها پێغەمبەر (موسا) — علیه السلام — کە دەرچووە قەومەکەی لە گەلدا بوو ، فیرعەون و دەست پێوەندەکانی بە دوای داچوون ، کاتێك گەیشتنە سەر لێواری دەریا ، هیچ ڕێگەیەکیان نەبوو بۆ دەرباز بوون لە چەنگی فیرعەون ، بەلام پەروەردگای (موسا) — علیه السلام — دەرگایی لیٚ کردنەوە بە خشندەیی خۆی داباران بەسەریان ئەوە بوو کە دەریاکەی شق کردن و کردیە بە ڕێگای ووشکانی بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لە چەنگی فیرعەون و دەست پێوەندەکان ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت :** قال تعالی: ﴿وَإِذۡ فَرَقۡنَا بِكُمُ ٱلۡبَحۡرَ فَأَنجَيۡنَٰكُمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ۝٥٠﴾ [البَقَرَة : ٥٠] واتە: وە کاتێك ئەو دەریایەمان لەت کرد وە ڕێگای وشکانیمان بۆ کردنەوە تا تیایدا بڕۆن و ڕزگارتان بێت لە دەستی فیرعەون، وە ئێوەمان ڕزگار کرد لە خنکان، وە فیرعەون و شوێن کەوتوانیانمان خنکان لەناو ئاوەکەدا وەئێوەش بەچاوی خۆتان ئەو دیمەنەتان بینی کە خۆتان ڕزگارتان بوو وە فیرعەون و داروودەستەکانی تیاچوون کە لە ڕۆژی عاشورادا بوو..؟!

**هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویێت :** قال تعالی: ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ۝٦١ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ۝٦٢ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ۝٦٣ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ۝٦٤ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ۝٦٥ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ۝٦٦﴾ [الشُّعَرَاء : ٦١ - ٦٦]واتە : کاتێك کە هەردوو کۆمەڵەکە ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوەو یەکتریان لێ دەرکەوت و یەکتریان بینی [ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ] هاوەڵانی موسا - صلی الله علیه وسلم - وتیان: ئەی موسا - صلی الله علیه وسلم - ئەوە فیرعەون پێمان گەیشت و پێشمان ئاوەکەیەو دواشمان فیرعەون و سەربازەکانیتی..؟! [ قَالَ كَلَّا ] موسا - صلی الله علیه وسلم - فەرمووی: نەخێر ئەوان بە ئێمە ناگەن [ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ] بە دڵنیایی من پەروەردگارم لەگەڵدایە بەزانیاری و بیستن و بینین و تواناو دەسەڵاتی، ئەو سەرمان ئەخات و ڕێنماییمان ئەکات و ڕزگارمان ئەکات..؟! {بە ئیزنی خوا دەریا دەبێت بە زەوی وشك} [ فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى ] خوای گەورە ئەفەرمووێ: وەحیمان بۆ موسا - صلی الله علیه وسلم - نارد [ أَنِ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ ] بەو گۆچانەی بە دەستتەوەیە بیدە بە دەریاکەدا [ فَانْفَلَقَ ] دەریاکە لەت بوو، بوو بە زەویەکی وشك [ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ] وە بە ئیزنی خوای گەورە ئاوەکە بەرز بووەوەو هەر شەپۆلێکی وەکو پارچە شاخێکی گەورە لە ئاسمان ڕاوەستاو بوو بە دوانزە ڕێگا، لەبەر ئەوەی دوانزە هۆز بوون بۆ ئەوەی هەر هۆزێك بە ئیسراحەت بپەڕنەوە، وە نێوانی ئاوەکەیش خوای گەورە بای ناردو وشکی کردو بەناو وشکانیدا تێ ئەپەڕین، وە تاق و کەلێنی لە نێوان ئاوەکاندا کردەوە تا لە یەکتری دیار بن و دڵنیا بن هەموویان ڕزگاریان بووە. {موسا پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - و موسڵمانان ڕزگاریان دەبێتو فیرعەونو سەربازانی نوقمی دەریاکە دەبن} [ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ ] وە ئەلەوێدا فیرعەون و سەربازەکانیمان نزیك کردەوە لە دەریاکە تا چوونە ناو دەریاکەوە ئەوانیش بە دوایاندا ڕۆیشتن..؟! موساو - صلی الله علیه وسلم - ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون هەمووما‌ن ڕزگار کردن و لە دەریاکە پەڕینەوە ..؟!

### ✓ ژیان وەکو خۆی بنرخێنە ..؟

بێ گومان سروشتی ژیان وایە خۆشیەکانیش هەر تالن ..؟! بەر بەستی زۆری لە رێیە ، ئەوە نیە بەلێن: ئەمرۆ بە خۆشی بەرێ دەکەم ، بەلکو هەر خۆشیە وەرگرتنەکەشی تالی ناسۆزیە ، یان هەول و ماندوو بوونی دەوێت ، چونکە رێگای ژیان سەخت و زۆر دژوارە ، بە زۆر جۆرو رەنگ خۆی دەنوێنی ، وە پر لە ئەشکەنجەو ئازار ، وە ژیان ئالۆزی نشێوی و بەرزی نزمی زۆر تێدایە ، تۆش بە شەکەتی ماندوو بوون هیلاکی لە نێو ئەم کێژاوەی ژیان دەخولێتەوە ..؟! هەرچی دێتە بەر چاوت لە خاوخێزان و باوك دایك و برا و خوشك و خزمان و دۆست هاورێکان ، هەروەها کارو پیشە و بژێوی و پۆست پلە بەرپرسیاریەت و کاربەدەستی و هەر پیشەیەك و کارو گوزەرانێك ، بێ گومان دەبێت بەربەستێکیان بێتە پێش یان لە رێ دابێت ، چونکە ئەم ژیانە بێ لێل وێل ناچێتە سەر ، دەی تۆش خۆراگربە بەهێزو بەتوانابە بەردەمە لە پێشبرکێ چاکەکاران دابە ، بە ئاوی ئەم ژیانە شەر و خراپەکاری و گرەکەی بکوژێنەوە ، چونکە ئەوەی ووتراوە دەلێن : تۆلە بەتۆلە بێ گومان هیچ سوودی نیە بەلکو هەر زەرەر..؟! بەلکو دەبێت لێ بووردەو بەخشندە بێت بەرانبەر کێشمە کێشی ئەم ژیانە ، چونکە ئەو ژیانە راستەقینە نیە ، بەلکو ژیانی قیامەت ژیانێکی راستە قینەیە ، بۆیە دەبێت پێش ئەوەی لێ پرسینەوەی لە گەل دابکرێت لە قیامە تۆ لە ژیانی دونیا دا ، لێ پریسنەوە لە گەل خۆت دابکە ، پێش ئەوەی لە قیامەت وەزن بکرێت تۆ لە ژیانی دونیادا کێش وەزنی خۆت بکە ..؟! هەربۆیە ژیانی دونیا دەبێت وەکو خۆی بنرخێنین ..؟!

لە (ابو هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((الدُّنيا ملعونةٌ مَلعونٌ ما فيها ، إلَّا ذِكْرُ اللَّهِ وما والاهُ وعالمًا ومتعلِّمًا)) [1]. واتە : دونیا و هەرچی لە دونیادایە نەفرەت لێکراوە جگە لەم دوو شتە : زیکر و یادی خوا و ئەو کارو کردەوانەی کە (خوای گەورە ) خۆشی دەوێن و جێگەی رەزامەندینی ، مامۆستا و فێرخوازی زانستی شەرعی ..؟!

بێ گومان ئەگەر بەدوای کەسێکی بێ هەلە کەم و کوری دا بگەرێت یان بەدوای هاوسەرێکی بێ کەم کوری بگەرێت بێ گومان دەستت ناکەوێ ..؟!

[1] -سنن الترمذي برقم (٢٣٢٣).

له (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – ده گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً، إنْ كَرِهَ منها خُلُقًا رَضِيَ منها آخَرَ، أَوْ قالَ: غَيْرَهُ)) [١]. واته: با هیچ پیاوێکی ئیماندار هاوسه‌رێکی ئیماندار نه‌بوغزێنی ، چونکه ئه‌گه‌ر ره‌وشتێکی ئه‌وه‌ی به دل نه‌بیٚ ..! !ئه‌وا شتێکی تری هه‌ر به‌دڵ ده‌بێت ..؟!

✓ گۆیی زه‌وی به‌سه‌ر کۆڵته‌وه هه‌ڵه‌گره ..؟

که‌سانێك هه‌ن کێشه‌ی هه‌موو جیهان به هی خۆ ده‌زانن ، یان دوو سه‌گ به‌شه‌ر دێن غه‌میان لێ ده‌خوات ..؟!،یان به‌دوای هه‌موو شتێکه که‌چی هیچ نازانێن ..؟! ده‌ستی له هه‌موو شتێك دایه ، خه‌می دونیا خستۆته کۆلی نانیش نیه بخوات ..؟! بۆ هه‌موو شتێك قسه‌یه‌کی هه‌یه ..؟! ئه‌م جۆره که‌سانه دل رقه و پیسکه و گه‌مژه‌و حه‌سوود و نه‌زان وغافل ، بۆیه که‌سانێك جه‌نگێکی جیهانی له دل و ده‌روونیاندا ده‌گه‌رێ ، که‌چی له سه ر پێخه‌فه که‌یان که پال ده‌که‌ون ، هه‌ر کاتێ ئه‌م جه‌نگی ده‌روونیا دامرکا ، ئه‌وا له کۆتایی دا ده‌ست که‌وته‌کانیا بریتیه له ( نه‌خۆشی دڵ ، نه‌خۆشی شه‌کره ، نه‌خۆشی پاله په‌ستۆی گه‌ده ، نه خۆشی ده‌روونی ...هتد ..؟!

به‌لێ ئه‌م که‌سانه زۆر چاوته‌نگ و چاو چنۆکن نه خۆشی دل ره‌قی و حه‌سوودی له ناخیاندایه ، چونکه به گران بوونی شت ومه‌ك کالا و ئه‌وا مرچ و مۆنن ..؟! به ده‌رنگ باران بارین ، ئه‌وا هاواریان لێ هه‌لده‌ستێت ، هه‌روه‌ها به دابه‌زینی نرخی ئه‌و شت مه که‌ی که هه‌یانه ئه‌وا کۆچیان ده‌که‌ویت گرژو مۆن ده‌بن ..؟! چونکه ئه‌وان هه‌میشه له ژیان بێزارن ، ئه‌وانه دووروون له ژیاندا به هیچ شتێك دڵ یان خۆش نابێت ته‌نها به ئازاردانی به‌رانبه‌ره‌که‌یان نه‌بێت هه‌روه‌کو (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿ ۞ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ ۚ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾ ﴾ [المُنَافِقون : ٤] واته :{مونافیقان قسه‌زانن} [ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ] وه کاتێك که ئه‌یانبینی سه‌رسام ئه‌بی به لاشه‌و شێوازیان که شێوازیان جوانه [ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ] وه ئه‌گه‌ر قسه‌یش بکه‌ن گوێ له قسه‌که‌یان ئه‌گری، واته: سه‌رنجت ڕائه‌کێشن له‌به‌ر زمان پاراوی و زمان لووسی و ڕه‌وانبێژییان وه‌کو (عبدالله¬ی کوڕی ئوبه‌ی کوڕی سه‌لول)ی گه‌وره‌ی مونافیقان [ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ ] به‌ڵام له لاوازی و ترسنۆکیاندا وه‌ك دارێکی کلۆرو ناوبۆش وان که پاڵی دابێ به دیوارێکه‌وه‌و خۆی ڕانه‌وه‌ستێت، یان چۆن دارێك له مه‌جلیسی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - دابنێیت هیچ تێناگات ئه‌وانیش ئاوان { مونافیقان ترسنۆکن} [ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ] له ترسنۆکیاندا هه‌موو ده‌نگێك یان شتێك ڕوو بدات وائه‌زانن بۆ ئه‌وان هاتووه‌و دژی ئه‌وانه، یان ئایه‌ته‌کانی قورئان که دائه‌به‌زێ ئه‌زانن که ئابڕووی ئه‌وان ئه‌بات [ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ ] ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - دوژمنی ڕاسته‌قینه ئه‌مانه‌ن

---
[١]-صحيح مسلم برقم (١٤٦٩).

ئاگاداریان به [ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ] خوای گه‌وره بیانكوژێ و نه‌فره‌تی خوای گه‌وره‌یان لێ بێت چۆن له پاش ناسینی حه‌ق لێی لائه‌ده‌ن بۆ كوفر..؟!

### ✓ به‌شتی كه‌م نرخ یان كه‌م بایه‌خ مه‌روخێ..؟

به‌لێ كه‌سانێك هه‌ن به شتی كه‌م نرخ بێ بایه‌خ ده‌روخێن ، وه‌كو پاره و مال سامان ، یان وه‌كو پله و پۆست كاربه‌ده‌ستی ، هه‌روه‌ها به ئاره‌زووه قێزونه‌كانی دونیا وه‌كو شه‌هوت بازی خۆشی رابواردنی دونیا یان كۆش و ته‌لار دروست كردن مه نارەوا و ناحه‌قی كه خواردنی مال خه‌لك به ناحه‌قی، ئه‌مانه ته‌نها شتێكی بێ نرخن چونكه له قیامه‌تدا لێ پرسینه‌وه‌یان له‌سه‌ر هه‌یه ..؟! (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموێت : قال تعالى: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ [الشُّعَرَاء : ٨٨ - ٨٩]واته : ئیلا ئه‌گه‌ر كه‌سێك بگاته خوای گه‌وره به دڵێكی پاكه‌وه كه پڕ بێت له ته‌وحیدو سوننه‌ت دوور بێت له شیرك و بیدعه، وه دڵێك پاك بێت له تاوان و سه‌رپێچی كه دڵی مرۆڤی ئیمانداره..؟! (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموێت : قال تعالى: ﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ ﴿٢٩﴾﴾ [الحَاقَّة : ٢٨ - ٢٩] واته : ئه‌ڵێ: ئه‌و هه‌موو سه‌روه‌ت و سامان و ماڵه‌ی كه هه‌مبوو هیچی سوودی پێ نه‌گه‌یاندم و سزای خوای گه‌وره‌ی لێ نه‌گه‌ڕاندمه‌وه..؟! [ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ] هه‌ر حوجه‌و به‌ڵگه‌یه‌ك كه له دونیا به‌ده‌ستمه‌وه بوو ئێستا هه‌مووی ڕۆیشت و نه‌ما له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له ڕاستیدا به‌ڵگه نه‌بووه به‌ڵكو شوبهه‌و گومان بووه، یاخود (سُلْطَان) واته: هه‌موو پله‌و پایه‌و ده‌سه‌ڵاتێك كه هه‌مبووه له دونیا هه‌ر هه‌مووی ڕۆیشت و هیچی فریام نه‌كه‌وت و له‌گه‌ڵمدا نه‌هات..؟!

له (سهل بن سعد الساعدي) – خوا لێ رازی بێت – ده گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((لو كانتِ الدنيا تعدلُ عندَ اللهِ جناحَ بعوضةٍ ؛ ما سقى كافرًا منها شربةَ ماءٍ)) .[١] واته: ئه‌گه‌ر دونیا به قه‌د باله مێشوله‌یه‌ك نرخی هه‌بوایه له لای (خوای گه‌وره) ئه‌وا نه‌یده‌هێشت كافر قومێ ئاوی دونیا بخواته‌وه ..؟!

له‌(المستورد بن شداد ) – خوا لێ رازی بێت – ده گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((أترونَ هذه هانتْ على أهلِها حين ألقَوْها ؟ قالوا : مِن هوانِها ألقَوْها يا رسولَ اللهِ، قال : الدنيا أهونُ على اللهِ

[١]-سنن الترمذي برقم (٢٣٢٠).

من هذه على أهلها)).[1] واتە: دەلێ من لەگەل ئەو سوورانەدا بووم کەپێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بەرخێکی مردارەوە بوو راوەستاین ، فەرمووی : دەبینن ئەم چەند بێ نرخ بووە ، لە لای خاوەنی کاتێ کە فرێی داوە .؟! ووتیان: ئەی پیغەمبەری خو ﷺ بە هۆی بێ نرخیەوە خاوەنەکەی فرێداوە ، فەرمووی : دەی ئەمە چەند بێ نرخە بەلای خاوەنەکەیەوە ، دونیاش ئەوەندە بێ نرخە بەلای (خوی گەورە ) .

## ئایەتی: (٦٣)

قال تعالى: ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٦٣﴾ [البَقَرَةِ : ٦٣]

واتە : [ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ ] خوای گەورە دیسان بە بەنو ئیسرائیل بە جوولەکە ئەفەرمووێ: خوای گەورە عەهدو پەیمان و بەڵێنی لێتان وەرگرت بەوەی کە لە تەوراتدا بۆتان هاتبوو کە ئیمان بێنن بە پێغەمبەرانی خوا [ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ ] وە کێوی (طور)یشمان هەڵگرت ئەو کێوەی کە خوای گەورە قسەی لەگەڵ موسى صلى الله عليه وسلم کرد لەسەری، کاتێك کە موسى تەوراتی هێنا بۆ بەنی ئیسرائیل وتیان: وەری ناگرین وە شوێنی ناکەوین تا خوای گەورە خۆی قسەمان لەگەڵدا نەکات چۆن قسەی لەگەڵ تۆدا کردووە، خوای گەورەش ئەمری کرد بە مەلائیکەت ئەو شاخە گەورەیە کێوی (طور) لە فەلەستین کە ئەوترێ: درێژیەکەی فەرسەخێ بووە زیاد لە سێ میل بووە لە زەویەکە هەڵیکێشاوە وە خستۆتیە بان سەریان وەکو سێبەرێك سێبەری بۆیان کردووە وەکو هەور [ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ ] دەی ئێستا ئەوەی کە بۆتان هاتووە بە جددی و بە ڕێکوپێکی وەری بگرن و هیچی لێ مەفەوتێنن وە ئەوەی کە تیایەتی با لە یادتان بێت و پارێزراو بێت و ئیشی پێ بکەن ئەگەر نا شاخەکە بەر ئەدەینەوە بان سەرتان ئەو کاتە تەوبەیان کردو سوجدەیان بۆ خوای گەورە برد [ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ] بەڵکو تەقوای خوای گەورە بکەن..؟!

### جوولە کە هەر پەیمان دەدات هەر دەي شكێنێ :

بەلێ (خوای گەورە ) بە نەوەی جوولەکە دەفەرمووێت : ئێوە یادی ئەو نیعمەتەش بکەنەوە کاتێك پەیمانمان لێوەرگرتن کە لە سەر رێبازی (تەورات) برۆن یان پەیرەوی (تەورات ) بکەن ، هەروەها کێوی (طور) مان بەرسەرتانەوە راگرت و پێمان ووتن : ئەو بەرنامەیەی پێماندا‌ون بە توندی بێگرن ئەگینا ئەم چیایە یان کیوە

[1] -سنن الترمذي برقم (٢٣٢١).

ده‌ده‌ین به سه‌رتاندا ، هه‌میشه‌ش با له بیرتان بێت چی تێدایه‌و جێتان لێده‌خوازێت ، بۆ ئه‌وه‌ی له خوا ترس و پارێزکاربن یان ته‌قوا کار بن ..؟!

تێبینی / نه‌وه‌ی جووله‌که ئیمانیان نه‌هێنا هه‌تاکو (خوای گه‌وره ) کێوی (طور)ی به سه‌ریانه‌وه رانه‌گرت ، ئینجا ئیمانیان هێنا ، واته : ئیمانیان به ترس به زۆری هێنا ، وه‌ك كه‌سێك كه زۆری لیٚ بكرێت له ئیمان هێنانی ده‌بێت ئیلا ئیمان بهێنی ..؟! بیٚ گومان ئه‌مه نیشانه‌یه‌کی گه‌وره‌یه یان ڕووداوێکی گه‌وره‌یه ، که (خوای گه‌وره ) کێوی (طور) ی به‌رزکردووه به‌سه‌ریانه‌وه ، له‌و کاته‌دا به ده‌نگێك بانك كران ئه‌گه‌ر بێت و ئه‌م کتێبه واته (تورات) به هێزو به توندی وه‌ر بگرن ئه‌م کێوه یان چیایه ناخه‌ینه به سه‌رتاندا و ئه‌وانیش په‌یمانیان دا ، که ئه‌م (ته‌وراته) به هێزو به‌توندی خۆمان وه‌ری ده‌گرین و بیر ده‌که‌ینه‌وه له‌و شته‌ی که له‌و (ته‌وراته) دا هاتووه ..؟!

به‌لیٚ به‌لام نه‌وه‌ی جووله‌که لایاندا سنووری (خوای گه‌وره ) یان به‌زاند ، بیریان له‌و په‌یمانه نه‌کرده‌وه که پێیاندرا بوو که (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموێت : قال تعالى: ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَـٰقَكُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٦٣] به‌لیٚ په‌یمانیان پێدرا که (ته‌ورات ) بوو ، ئه‌وانیش ووتیان : ئێمه توندی به هێزو قوه‌ته‌وه وه‌ری ده‌گرین ، به‌لام دواتر په‌یمانه‌که‌یان شکان ، وه سه‌رپێچی یان له به‌لێن په‌یمانه‌که‌ی خۆیان کرد ، هه‌روه‌کو پیشه‌ی جووله‌که له رابردووشدا هه‌ر وابووه ، له سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ په‌یمان و به‌لێنیان ده‌دا دواتر ده‌یان شکان و نه‌یانده‌برده‌سه‌ر ، ئه‌وا قورئانی پیرۆز باسی سیفه‌تێکی تری جووله‌که‌مان بۆ باس ده‌کات ، ئه‌ویش په‌یمان شکاندیان له رابردوودا ، له‌م باسه ئه‌وه‌مان بۆ ده‌رده‌که‌وێت ، که ئه‌و که‌سه‌ی ئاینی پیرۆزی (خوای گه‌وره ) وه‌رده‌گرێت و باوه‌ری پیٚ هه‌یه ، به‌لام ئیمان باوه‌ره که‌ی لاواز ده‌کات ده‌لێت: (من نوێژ ده‌که‌م و ڕۆژوو ده‌گرم و هه‌ر ئه‌وه‌نده‌شم پیٚ ده‌کرێت ئیتر له‌وه زیاتر من چی بکه‌م ..؟! ئه‌م جۆره قسانه هیچ سوودیان نیه ..!! چونکه ئاین یان باوه‌ر و ئیمان پێویستی به هێز و قوه‌ت و دامه‌زراوی هه‌یه ،چونکه کاتێك مرۆڤ هه‌ر ئاین و باوه‌رێك که وه‌رده‌گرێت ده‌بیٚ جدی بێت یان دلسۆز ئه‌خلاصی ته‌واوی هه‌بێت ، چونکه (خوای گه‌ور ) کتێب به‌رنامه و یاساو ریسایی خۆی بۆ داناوه که وه‌ری بگرێت و په‌یره‌وی بکات ، له سه‌ر ئه‌م رێبازه کۆلنه‌دات به‌رده‌وام بێت بۆهه‌میشه.

زانایانی ته‌فسیری قورئانی پیرۆز ، هه‌ر هه‌موو له سه‌ر ئه‌وه‌ی یه‌ك ده‌نگن ، که ئه‌و کیچوه‌ی به‌رز کرایه‌وه به‌سه‌ر نه‌وه‌ی جووله‌که ئه‌مه یه‌کێکه له هه‌ر نیشانه‌گه‌وه‌ی کانی (خوای گه‌وره) بۆ قه‌ومه‌که‌ی (موسا) – علیه السلام– وه یه‌کێك بووه له‌و شته سه‌ر سورهێنه‌رانه‌ی که (خوای گه‌وره ) ته‌نا بۆ نه‌وه‌ی جووله کردووه ، ئه‌مه له‌م کاته بووه کاتێك (خوای گه‌وره ) کتێبی (ته‌ورات)ی به (موسا) به‌خشی ، که له‌سه‌ر چه‌ند به‌ردێکی ته‌خت و لووس بوون ، پێیان دووترا : (الواح ) نووسراوه‌ته‌وه ، ئاله‌م کاته (موسا ) ته‌ورات ده‌هێنی بۆیان ده‌خوێنێته‌وه ، ده‌فه‌رمووی : ئه‌وه (خوای گه‌وره ) ئه‌م شریعه‌ته‌ی بۆ ئێوه ناردووه ، که‌ئێوه‌ش پێوه‌ی پابه‌ند بن ؟! هه‌ر چه‌ند (موسا) زۆر ئامۆژگاریان ده‌کات ، به‌لام ئه‌وان ده‌لێن : نه‌خێر . ئێمه پابه‌ند نابین یان په‌یره‌وه‌ی ناکه‌ین ..!! دوتر (خوای گه‌وره ) کێوی (طور) له ده‌شتی سینا له مصر به‌رز ده‌کاته‌وه ، ده‌هێنێته سه‌ریانه‌وه ، وه‌ك هه‌ورێك! (موسا ) پێیان ده‌لیٚ : (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموێت : پابه‌ند ده‌بن به (ته‌ورات ) یان نا ..؟!

ئه‌وانیش له‌ ترسان به‌ ناچاریه‌وه‌ دڵێن : ئێمه‌ پابه‌ند و په‌یره‌ی (ته‌ورات ) ده‌که‌یت ..!! هه‌روه‌ك ئه‌وه‌ی كه‌ (خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ۝٦٣﴾ [البَقَرَةِ : ٦٣]

## ئه‌م په‌یمانه‌ی كه‌ (خوای گه‌وره‌ ) له‌ باره‌یه‌ وه‌ باسی ده‌كات (ته‌وراته‌ )

ئه‌م په‌یمانه‌ له‌ دوو شوێنی دیكه‌ له‌ قورئاندا باسكراوه‌ په‌یمانێكی دووانزه‌ برگه‌ییه‌ (١٠) له‌ ئایه‌تی (٨٣–٨٤) سوره‌تی (البقره‌ ) دا باسكراون كه‌ به‌م شێوه‌یه‌ (خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ۝٨٣ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ۝٨٤﴾ [البَقَرَةِ : ٨٣ - ٨٤]واته : {به‌ڵێن وه‌رگرتن له‌ به‌نی ئیسرائیل} [ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ ] وه‌ ئێمه‌ عه‌هدو په‌یمان و به‌ڵێنمان له‌ به‌نی ئیسرائیل وه‌رگرت له‌ ته‌وراتدا له‌سه‌ر زمانی پێغه‌مبه‌رانیان [ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ ] كه‌ عیباده‌ت بۆ غه‌یری خوای گه‌وره‌ نه‌كه‌ن [ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ ] وه‌ چاكه‌كار بن له‌گه‌ڵ دایك و باوكتان و خزمی نزیك و بێ باوك و هه‌ژاراندا [ وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا ] وه‌ له‌گه‌ڵ خه‌ڵكیشدا با قسه‌و گوفتارتان جوان و چاك بێت [ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ] وه‌ نوێژه‌كانتان بكه‌ن وه‌ زه‌كاتی ماڵتان بده‌ن [ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِنْكُمْ ] به‌ڵام له‌ دوای ئه‌م عه‌هدو په‌یمان و به‌ڵێنانه‌ ئێوه‌ پشتتان هه‌ڵكرد ته‌نها كه‌مێكتان نه‌بێ له‌ جووله‌كه‌ كه‌ موسڵمان بوون وه‌كو (عبدالله‌¬ی كوڕی سه‌لام) [ وَأَنْتُمْ مُعْرِضُونَ ] وه‌ ئێوه‌ رووتان وه‌رگێڕاو پشتتان هه‌ڵكرد..؟! [ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَاءَكُمْ ] وه‌ عه‌هدو په‌یمان و به‌ڵێنمان لێتان وه‌رگرتووه‌ له‌ ته‌وراتدا له‌سه‌ر زمانی پێغه‌مبه‌رانتان كه‌ خوێنی یه‌كتری نه‌ڕێژن [ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنْفُسَكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ ] وه‌ یه‌كتری له‌ ماڵ و حاڵی خۆتان ده‌رنه‌كه‌ن [ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنْتُمْ تَشْهَدُونَ] وه‌ ئێوه‌ دانتان به‌م شته‌دا ناوه‌و پێی ڕازی بوون وه‌ خۆیشتان ئاگادارو شایه‌تن..؟!

به‌ڵێ له‌ سوره‌تی (المائده‌ ) (خوای گه‌وره‌ ) باسی دوو برگه‌ی دیش ده‌كات كه‌، ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿۞ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ۝١٢﴾ [المَائـِدَة : ١٢]واته: [ وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا ] وه‌ به‌ دڵنیایی خوای گه‌وره‌ عه‌هدو به‌ڵێنی له‌ به‌نی ئیسرائیل وه‌رگرت وه‌ دوانزه‌ نه‌قیبمان لێ هه‌ڵبژاردن بۆ ئه‌وه‌ی كاروباریان به‌ڕێوه‌به‌رن، واته‌: ئه‌وانه‌ی كه‌ گه‌وره‌ی قه‌ومه‌كه‌ن، پێغه‌مبه‌ری خوایش- صلى الله عليه وسلم - له‌شه‌وی (عه‌قه‌به‌) به‌یعه‌تی له‌ دوانزه‌ له‌ ناودارو گه‌وره‌كانی ئه‌نصار وه‌رگرت كه‌ سیانیان له‌ (ئه‌وس) بوون و نۆیان له‌ (خه‌زره‌ج) ئه‌مان چوون به‌یعه‌تیان له‌ قه‌ومه‌كه‌یان

وەرگرت بۆ پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - [ وَقَالَ اللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ] وە خوای گەورە پێی فەرموون: من لەگەڵتانم بەوەی سەرتان ئەخەم و یارمەتیتان ئەدەم و پشتیوانیتان ئەکەم و دەتانپارێزم [ لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلَاةَ وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ وَآمَنْتُمْ بِرُسُلِي ] ئەگەر نوێژەکانتان بکەن وە زەکاتی ماڵەکانتان بدەن وە ئیمان بە پێغەمبەرانی من بێنن [ وَعَزَّرْتُمُوهُمْ ] وە بە گەورەیان بزانن وە سەریان بخەن [ وَأَقْرَضْتُمُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ] وە قەرزێکی باش بە خوای گەورە بدەن بەوەی کە ببەخشن لە پێناو خوای گەورە خوا پاداشتان ئەداتەوە [ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ ] ئەوە بە دڵنیایی خوای گەورە تاوانەکانتان ئەسڕێتەوە [ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ] وە ئەتانخاتە بەهەشتەوە کە پڕە لە باخ و باخات و جۆگەلە ئاو بەژێر دارو کۆشکەکاندا ئەڕوات [ فَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنْكُمْ ] وە لە دوای ئەم عەهدو بەڵێنە هەر کەسێك لە ئێوە کوفر بکات [ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ] ئەوە ڕێگای ڕاستی وون کردووەو گومڕا بووەو لە ڕێگای ڕاست لایداوە..؟!

## (١٠) دە برگەی ئایەتی (٨٣) (٨٤) سورەتی (البقرە ) ئەمانەی خوارەوەن :

١-قال تعالى: ﴿لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾

٢-قال تعالى: ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا﴾

٣-قال تعالى: ﴿وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾

٤-قال تعالى: ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾

٥-قال تعالى: ﴿وَٱلۡمَسَٰكِينِ﴾

٦-قال تعالى: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا﴾

٧-قال تعالى: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾

٨-قال تعالى: ﴿وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾

٩-قال تعالى: ﴿لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ﴾

١٠-قال تعالى: ﴿وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ﴾

**بەڵێ برگەی (١١) و (١٢) ئەم ئایەتەی سورەتی (المائدە) یە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویّت : قال تعالى:** ﴿۞ وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ

وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ [المائـدة : ١٢]

## دەربارەی باسی (التقوى ) یان خۆپارێزی

پێناسەی (التقوى ) واتە: وریایی و ئاگا لە خۆبوون و خۆپارێزی .

(ئیمامی علی ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : (( التقوى : الخوف من الجليل ، والعمل بالتنزيل ، والقناعة بالقليل ، والاستعداد ليوم الرحيل )) واتە : ترسان لە خوا ، وە کارکردنە بەوەی نێردراوە لای خواوە ، بەکەم رازی بوونە ، وە خۆ ئامادە کردنە بۆ رۆژی کۆچ کردن ، بۆ دیداری (خوای گەورە ) ..؟!

(ابن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : (تەقوا بریتیە لەوەی گویرایەلی خوا بکرێت و سەر پێچی نەکرێت ، (خوای گەورە)ت لە یادبێت وە لەبیری نەکەی ، سوپاسی بکەیت ، وە سپلە نەبێت)

(راغب الاصفهانی ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : (( وصار التقوى في اصطلاح الشرع : حفظ النفس عما يؤثم )) واتە: تەقوا لە زاراوەی شەرعیدا بریتیە لە (خۆپاراستن لە هەر شتێك ، کە تاواتباریی تێدایە ).

(ابن كثير ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : تەقوا :( ناوێکی گشت گیرە یان هەمەلایەنە ، بۆ ئەنجامدانی کرداری چاکە ، وە وازهێنان لە کارە قەدەغەکراوەکان )

(عمری کوری خەتاب ) – خوا لێ رازی بێت – پرسیاری لە (ابى بن كعب ) – خوا لێ رازی بێت – کرد فەرمووی : (التقوى ) چیە ..؟!

ئەویش فەرمووی : (هل سلكت طريقا ذا شوك ..؟!) ئایا هیچ جارێك بە ڕێگەیەکی درکاوی دا نەرۆیشتی ..؟!

(عمر) فەرمووی : بەڵێ .

فەرمووی : (فماذا فعلت ) واتە : لە کاتەدا چیت دەکرد.؟!

(عمر ) فەرمووی : (شمرت واجتهدت )واتە : خۆم هەلدەکرد و خۆم دەپاراست و ئاگادرای خۆم بووم ..!!

فەرمووی : (فذلك التقوى ) واتە : دە ئەمە تەقوایە ..؟! .[1]

تێبینی : ووشە (التقوى ) لە قورئانی پیرۆز دا (٢٥٨) جار هاتووە ..؟!

## ئەو کەسانەی فەرمانیان پێ دەکرێت (تەقوادار بن )

بێ گومان شێوازە کانی قورئان لە فەرمانە کردن بە (التقوى ) جیاوازە ، هەروەکو فەرمان بە خەلکی کراوە بە (تەقوای ) بە تاك و بە کۆمەل ، وە بە باوەردار و ، وە بە بێ باوەریش کراوە ، هەروەکو لە سەر زمانی زۆربەی پێغەمبەران – علیه السلام – وە پیاوچاکان بۆ هەموو خەلکی بە گشتی هاتووە ..؟!

١–بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ :

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ۝١﴾ [الْأَحْزَاب : ١]واتە : [ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ ] ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بەردەوام بە لەسەر تەقوای خوای گەورە [ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ ] وە گوێڕایەڵی کافران و مونافیقان مەکە [ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ] بەدڵنیایی خوای گەورە زۆر زاناو کاربەجێیە..؟!

٢–بۆ هاوەلان – خوا لێیان رازی بێت – :

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ۝١٢٣﴾ [آل عِمْرَان : ١٢٣]واتە : [ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ ] ئەی باوەڕداران خوای گەورە ئێوەی لە جەنگی بەدردا سەرخست بەسەر کافراندا [ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ ] وە کاتێك ئێوە کەم و زەلیل بوون [ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ] تەقوای خوای گەورە بکەن بەڵکو شوکرانەبژێری خوای گەورە بکەن ..؟!

٣–بۆ کەسانی تێ گەیشتووە عاقل و ژیر :

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ وَٱتَّقُونِ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ۝١٩٧﴾ [البَقَرَة : ١٩٧]واتە : [ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى ] خەڵکی یەمەن حەجیان دەکردو خواردنیان لەگەڵ خۆیان ناهێناو ئە

[1]- تفسير القرطبي (٢٠٣/١).

یانووت: ئێمه تەوەكول ئەكەینە سەر خوا، كە دەگەیشتنە مەككە داوایان لە خەڵكی دەكرد خوای گەورە ئەم ئایەتە ی دابەزاندو فەرمووی: زادیش لەگەڵ خۆتاندا بەرن بەڵام باشترین زادیش تەقوای خوای گەورەیە بۆ قیامەت، وە زادی دونیاش خواردنەكەیە كە یارمەتیدەرتە لەسەر تەقوا [ وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ ] ئەی ئەو كەسانەی كە خاوەن عەقڵن تەقوای من بكەن و خۆتان لە تاوان بپارێزن و بە تەنها لە من بترسێن..؟!

٤–بۆ ئیمانداران :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓا۟ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَـٰهِدُوا۟ فِى سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾﴾ [المَائـِدَة : ٣٥]واتە : [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ ] ئەی باوەڕداران تەقوای خوای گەورە بكەن [ وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَةَ ] وە هەموو وەسیلەو هۆكارێكی شەرعی بگرنەبەرو داوای بكەن كە بتانگەیەنێ بەخواو لە خوای گەورەتان نزیك بكاتەوە، وە خۆتان لە خوای گەورە نزیك بكەنەوە بە گوێڕایەڵی كردنی و كاركردن بە رازی بوونی، وەسیلە بەرزترین پلەو شوێنە لە بەهەشت، وە نزیكترین شوێنی بەهەشتە لە عەرشی پیرۆزی خوای گەورە كە تایبەتە بە پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - [ وَجَاهِدُوا فِي سَبِيلِهِ ] وە جیهاد بكەن لە پێناو خوای گەورەدا [ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ] بەڵكو خوای گەورە سەرفرازتان بكات لە دونیاو قیامەت..؟!

٥– بۆ ئەهلی كتاب :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾﴾ [النِّسَاء : ١٣١]واتە : [ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] وە هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی و لە نێوانیاندا هەیە هەمووی موڵكی خوای گەورەیەو بەتەنها خۆی هەڵسوكەوتی تیادا دەكات و بەڕێوەی دەبات [ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ اتَّقُوا اللَّهَ ] وە بە دڵنیایی ئامۆژگاری ئەوانەی پێش ئێوە لە ئەهلی كتاب وە ئێوەش ئەكەین بەوەی كە تەقوای خوای گەورە بكەن [ وَإِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] بەڵام ئەگەر تەقوای خوای گەورە نەكەن و كوفر بكەن ئەوا هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی و لە نێوانیاندا هەیە هەمووی موڵكی خوای گەورەیەو خوای گەورە پێویستی بە ئێوە نیە [ وَكَانَ اللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ] وە خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندو بێ پێویست و سوپاسكراوە هەرچی لە زەوی و ئاسمان هەیە سوپاسی خوای گەورە دەكات..؟!

٦-بۆ گشت خه‌لكی :

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ①﴾ [النِّسَاء : ١]

## سیفه‌ته‌كانی كه‌سانی (متقین ) یان (ته‌قوادر)

### یه‌كه‌م : (اعتقادي ) واته : سیفه‌تی بیرو باوه‌ر :

١-ئیمان هێنان به (غیب ) یان شته په‌نهانه‌كان :

(خوای گه‌وره) دفه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَـٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ② ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ﴾ [البَقَرَة : ٢ - ٣] واته : [ ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ ] ئه‌م په‌رتووكه كه قورئانی پیرۆزه هیچ گومانێكی تیادا نیه كه له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه دابه‌زیووه [ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ (٢) ] هیدایه‌ت و رووناكی و ڕێنماییه بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ته‌قوای خوای گه‌وره ئه‌كه‌ن و خۆیان له تاوان ئه‌پارێزن... {هه‌ندێك له سیفاتی مرۆڤی خۆپارێزو موتته‌قی} [ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ ] یه‌كێك له سیفاتی موتته‌قی ئه‌وه‌یه كه ئیمان به غه‌یب ئه‌هێنن ئه‌و شتانه‌ی كه شاراوه‌یه‌و نادیاره‌و خوای گه‌وره‌و پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم هه‌واڵیان پێ داوه باوه‌ڕیان به هه‌مووی هه‌یه..؟!

٢-ئیمان هێنان به ڕۆژی دوایی :

(خوای گه‌وره) دفه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ④⑨﴾ [الأَنبِيَاء : ٤٩]واته : [ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ ] ئه‌و كه‌سانه‌ی كه له خوای گه‌وره ئه‌ترسێن به نهێنی له كاتێك كه خوای گه‌وره‌یان له دونیا نه‌بینیوه [ وَهُمْ مِنَ السَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ] وه ئه‌وان ترسی هاتنی ڕۆژی قیامه‌ت و لێپرسینه‌وه‌یان هه‌یه.

## دووه‌م : سیفه‌تی (الفعلیه ) واته : سیفه‌تي كرداری :

١-نوێژ كردن :

(خوای گه‌وره) دفه‌رموویّت : قال تعالی: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٢ - ٣]واته : [ ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ ] ئه‌م په‌رتووكه كه قورئانی پیرۆزه هیچ گومانێكی تیادا نیه كه له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه دابه‌زیووه [ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ (٢) ] هیدایه‌ت و رووناكی و ڕێنماییه بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ته‌قوای خوای گه‌وره ئه‌كه‌ن و خۆیان له تاوان ئه‌پارێزن... {هه‌ندێك له سیفاتی مرۆڤی خۆپارێزو موتته‌قی} [ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ ] یه‌كێك له سیفاتی موتته‌قی ئه‌وه‌یه كه ئیمان به غه‌یب ئه‌هێنن ئه‌و شتانه‌ی كه شاراوه‌یه‌و نادیاره‌و خوای گه‌وره‌و پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم هه‌واڵیان پێ داوه باوه‌ڕیان به هه‌مووی هه‌یه [ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ ] وه نوێژه‌كانیان ئه‌نجام ئه‌ده‌ن به ڕوكن و مه‌رج و واجب و خشوع و سوننه‌ت و شێوازه‌كانی و له‌كاتی خۆیدا..؟!

(خوای گه‌وره) دفه‌رموویّت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ۝١٥ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُحۡسِنِينَ ۝١٦ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ۝١٧ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ۝١٨﴾ [الذَّارِيَات : ١٥ - ١٨] واته : {هه‌ندێك له سیفاتی موتته‌قی و خۆپارێزان} [ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (١٥) ] به‌ڵام ئه‌و كه‌سانه‌ی كه له دونیادا ته‌قوای خوای گه‌وره‌یان كردووه ئه‌وانه به دڵنیایی له‌ناو باخ و باخاتێكی زۆری به‌هه‌شتدان كه ئاو به ژێریدا ئه‌ڕوات... [ آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ (١٦) ] ئه‌و نازو نیعمه‌تانه‌ی خوای گه‌وره له‌ناو به‌هه‌شتدا پێیان ئه‌به‌خشێ وه‌ری ئه‌گرن، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌مان له دونیادا كه‌سانێكی چاكه‌كار بوونه... [ كَانُوا قَلِيلًا مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ (١٧) ] وه به شه‌ویش كه‌م ئه‌خه‌وتن به‌ڵكو زۆربه‌ی شه‌و نوێژیان ئه‌كرد، وه كه‌م جار هه‌بووه شه‌وێكیان به‌سه‌ردا تێپه‌ڕێ و تا به‌یانی بخه‌ون و نوێژی تیادا نه‌كه‌ن، به‌ڵكو ئیلا نوێژیان تیادا كردووه [ وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ (١٨) ] وه شه‌ونوێژه‌كه‌یان درێژ ئه‌كرده‌وه تا به‌ره‌به‌یان له به‌ره‌به‌یانیشدا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كاتی دوعا قه‌بوڵ بوون و لێخۆشبوونه له‌و كاته‌دا داوای لێخۆشبوونیان له خوای گه‌وره ئه‌كرد...؟!

٢-زه‌كات و نفقه‌ و خه‌رج كردن بۆ مال و مندال :

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت :** قال تعالى: ﴿وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ١٧٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٧] واته : {شێوازی چاكه كردن} [ لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ] چاكه ته‌نها ئه‌وه نیه كه رووبكه‌نه رۆژهه‌ڵات و رۆژئاوا، دیسان ره‌دده بۆ جووله‌كه‌و گاوره‌كان كه زۆر قسه‌یان كرد سه‌باره‌ت به‌گۆڕینی قیبله [ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ ] به‌ڵكو چاكه ئه‌وه‌یه كه هه‌ر كه‌سێك ئیمان بێنێ به‌خوای گه‌وره‌و به‌رۆژی دوایی و به فریشته‌كان و به كتێبه ئاسمانیه‌كان و به سه‌رجه‌م پێغه‌مبه‌رانی خوای گه‌وره [ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ ] وه له كاتێكدا كه ماڵه‌كه‌ی له‌لا خۆشه‌ویست و شیرینه ببه‌خشێ و بیدات به خزمی نزیكی خۆی و به بێباوكان و هه‌ژاران و ڕێبواران و ئه‌وانه‌ی كه له ناچاریدا داوا ئه‌كه‌ن و پێویستیانه و ئه‌وانه‌ی كه كۆیله‌ن به‌و پاره‌یه خۆیانی پێ ئازاد ئه‌كه‌ن [ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ] وه نوێژه‌كانی بكات و زه‌كاتی ماڵه‌كه‌ی بدات، وه ئه‌وانه‌ی وه‌فایان هه‌یه به‌رامبه‌ر ئه‌و عه‌هدو په‌یمانه‌ی كه به‌خوای گه‌وره‌و به‌خه‌ڵكیان داوه [ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ] وه ئه‌وانه‌ی كه ئارامگرن له‌كاتی سه‌غڵه‌تی و هه‌ژاری و نه‌خۆشیدا، وه له كاتی جه‌نگ و رووبه رووبوونه‌وه‌ی دوژمندا [ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ] ئا ئه‌مانه ڕاستگۆن له ئیمانه‌كه‌یاندا، وه ئه‌مانه ته‌قوای خوای گه‌وره یان كردووه‌و موتته‌قین نه‌ك جوله‌كه‌و گاور..؟!

٣-الاستغفار و داوای لێ خۆش بوون كردن له (خوای گه‌وره).

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت :** قال تعالى: ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ١٧﴾ [آل عِمۡرَان : ١٧]واته : [ الصَّابِرِينَ ] ئه‌وانه‌ی كه صه‌برو ئارامیان گرتووه له دونیا [ وَالصَّادِقِينَ ] وه ئه‌وانه‌ی كه ڕاستگۆ بوونه له نیه‌ت و له كرده‌وه‌یاندا له نهێنی و ئاشكرادا [ وَالْقَانِتِينَ ] وه ئه‌وانه‌ی گوێڕایه‌ڵ و ملكه‌چی خوای گه‌وره بوونه [ وَالْمُنْفِقِينَ ] وه ئه‌وانه‌ی كه ماڵی خۆیان به‌خشیوه له پێناوی خوای گه‌وره‌دا [ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ (١٧) ] وه ئه‌وانه ی له به‌ره‌به‌یاندا داوای لێخۆشبوونیان له خوای گه‌وره كردووه ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ١٨﴾ [الذَّارِيَات : ١٨] واتە : وە شەونوێژەکەیان درێژ ئەکردەوە تا بەرەبەیان لە بەرەبەیانیشدا لەبەر ئەوەی کاتی دوعا قەبوڵ بوون و لێخۆشبوونە لەو کاتەدا داوای لێخۆشبوونیان لە خوای گەورە ئەکرد..؟!

٤-ترس لە (خوای گەورە ) :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ﴾ [الأَنبِيَاء : ٤٩] واتە : ئەو کەسانەی کە لە خوای گەورە ئەترسێن بە نهێنی لە کاتێك کە خوای گەورەیان لە دونیا نەبینیوە..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَـٰٓؤُاْ﴾ [فَاطِر : ٢٨]واتە: تەنها بەندە زاناکان ئەوان بە زانیاریەوە لە خوای گەورە ئەترسێن، (ابن عباس) دەفەرمێت:(زانا ئەو کەسەیە کە شەریك بۆ خوا دانەنێت و حەڵاڵی بە حەڵاڵ بزانێت و حەرامی بە حەرام بزانێت و ئامۆژگاریەکانی خوای گەورە بپارێزێت و جێبەجێی بکات و دڵنیا بێت کە دەگاتە خوای گەورەو لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات)، (سەعیدی کوڕی جوبەیر) دەفەرمێت: (ترسان لە خوا ئەوەیە کە لە تاوان بتگەڕێنێتەوە)

لە (عائشة أم المؤمنين ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕیتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((فَقالَ: وَاللَّهِ، إنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَخْشَاكُمْ لِلَّهِ، وَأَعْلَمَكُمْ بما أَتَّقِي)) .[١] واتە : سوێند بەخوا ، من هیوام وایە لە هەمووتان زیاتر لە خوا ترس بم ، وە شارەزا تربم کەچۆن (تەقوادار بم ) لە سزای (خوای گەورە ).

٤-(القنوت) : واتە : ناوێکە بۆ ئەو دعاو پارانەوەیە کە لە شوێنی تایبەت لە نوێژ دا ئەنجام دەدرێت لە کاتی وەستان بە پێوە ..؟!

کەواتە: (القنوت ) بریتیە لە دوعاو پارانەوەیەکی بەکۆمەل و لە ناو باشترین جۆر و کاتی دا کە عیبادەتی نوێژو کۆتایەکەیەتی دانراوە لەوە رەگرتنی داواکاری و پارانەوە کان ، کاتێك ناخۆشیەك و ڕووداوێك ڕوو دەکاتە موسلمانان بۆ ماوەیەکی کاتی ئەم دوعاو پارانەوەیە دەکەن ،وەکو هەموو ئەو دوعاو پارانەوانەی بەندە ئەجامی

[١]-صحيح مسلم برقم (١١١٠).

ده‌دات له كاتی پێویستی دا تاكو پێویستیه‌كه‌ی جێ به‌جێ ده‌بێت ،هه‌رچه‌نده ئه‌مه‌و پێویستیه‌كان كاتییه ، (القنوت ) تیش دوعاو پارانه‌وه‌یه‌كی به كۆمه‌ل و كاتییه ..؟!

(خوای گه‌وره ) دفه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾﴾ [البَقَرَة : ٢٣٨]واته : [ حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى ] پارێزگاری له‌سه‌ر نوێژه‌كانتان بكه‌ن و به‌رده‌وام بن له‌سه‌ری به‌تایبه‌تی نوێژی ناوه ڕاست كه نوێژی عه‌صره [ وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ] سه‌ره‌تا له‌ناو نوێژدا قسه‌یان له‌گه‌ڵ یه‌كتریدا ده‌كرد خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند ئیتر بێده‌نگ بوون، واته به‌پێوه نوێژه‌كانتان ئه‌نجام بده‌ن له نوێژی فه‌رزدا به‌ڵام سوننه‌ت مرۆڤ ئه‌توانێ به دانیشتنیشه‌وه بیكات (قَانِتِينَ) واته: گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره بكه‌ن وه خشوعتان بۆ خوای گه‌وره هه‌بێ وه بێده‌نگ بن و قسه مه‌كه‌ن له‌ناو نوێژه‌كانتاندا..؟!

## سیه‌فه‌ته‌كانی ته قوادار له ره‌وشت ره‌فتاری دا

١-وه‌سف كردنی (خوای گه‌وره ) بۆ (المتقين ) به خۆگری و ئارام گرتن :

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ﴿١٧﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ١٧]واته : [ الصَّابِرِينَ ] ئه‌وانه‌ی كه صه‌برو ئارامیان گرتووه له دونیا [ وَالصَّادِقِينَ ] وه ئه‌وانه‌ی كه ڕاستگۆ بوونه له نیه‌ت و له كرده‌وه‌یاندا له نهێنی و ئاشكرادا [ وَالْقَانِتِينَ ] وه ئه‌وانه‌ی گوێڕایه‌ڵ و ملكه‌چی خوای گه‌وره بوونه [ وَالْمُنْفِقِينَ ] وه ئه‌وانه‌ی كه ماڵی خۆیان به‌خشیوه له پێناوی خوای گه‌وره‌دا [ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ] وه ئه‌وانه‌ی له به‌ره‌به‌یاندا داوای لێخۆشبوونیان له خوای گه‌وره كردووه ..؟!

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾﴾ [الۡأَنفَال : ٤٦] واته : {كێشه‌و دووبه‌ره‌كی هۆكاری تێكشكانه} [ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ] وه گوێڕایه‌ڵی خواو پێغه‌مبه‌ری خوا بكه‌ن - صلى الله عليه وسلم - (چونكه سه‌رپێچی خواو پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - هۆكاره بۆ سه‌رنه‌كه‌وتن و تێكشكان له به‌رامبه‌ر دوژمنان) [ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ] وه كێشه‌و ناكۆكی له نێوانتاندا نه‌بێت، چونكه ئه‌بێته هۆی فه‌شه‌ل و دۆڕاندنتان وه هێزو قوه‌ت و سه‌ركه‌وتنتان ئه‌ڕوات و نامێنێت [ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ] وه ئارام بگرن به‌ڕاستی خوای گه‌وره له‌گه‌ڵ ئارامگرانداێه‌و پشتیوانیان ئه‌كات و سه‌ریان ئه‌خات و یارمه‌تیان ئه‌دات..؟!

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾ [البَقَرَة : ١٧٧]واته : [ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ] وه ئه‌وانه‌ی كه ئارامگرن له‌كاتی سه‌غڵه‌تی و هه‌ژاری و نه‌خۆشیدا، وه له كاتی جه‌نگ و ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی دوژمندا [ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ] ئا ئه‌مانه ڕاستگۆن له ئیمانه‌كه‌یاندا، وه ئه‌مانه ته‌قوای خوای گه‌وره‌یان كردووه‌و موتته‌قین نه‌ك جوله‌كه‌و گاور..؟!

تێبینی / وه‌سفكردنی (خوای گه‌وره ) بۆ (المتقين ) به خۆگری ئارام گرتن بۆ هه‌موو بارودۆخی ژیان یان هه‌موو به‌لاو نصیبه‌تێك دا ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ته‌قوادارن ئارام و خۆگرن ،به قه‌ده‌ری (خوای گه‌وره ) رازین سه‌بر ده‌گرن، به‌لام زۆربه‌ی زانایان ته‌فسیر له سه‌ر ئه‌م ووشه‌یه یه‌ك ده‌نگن له مانه‌و مه‌به‌سته‌كه‌ی ووشه‌ی ﴿ٱلۡبَأۡسَآءِ﴾ واته: ناخۆشی و ناره‌حه‌تی هه‌ژاری ..؟! به‌لام پرسی

هەژاری ئەوە تاقی کردنەوەیە لە لایەن (خوای گەورە ) بۆ بەندەکانی ، هەلبەتە ئەوانەشی ئارام و خۆگر لە سەر هەژاری یان فەقیری ئەوا کەسانێك تەقوادارن ،ئەو وەسفەی کە (خوای گەورە ) لە ئایەتەکانی باسیان دەکات ، هەروەها ستایشیان دەکات بە خۆگری ئارام گرتنیان لە سەر فەقیری و هەژاری و نەداری نەهامەتی نارەحەتی ناخۆشیە کانی ژیان ئەوانەن کە ئارامگرو تەقوادران ، هەروەکو ئەوانەی هەژارن فەقیرن داهات و دەرامەتانی بەش ناکات ئەوانە لە لای (خوای گەورە) شەریف و رێزدارترن چونکە زۆرینەی خەلکی بەهەشت لە هەژارانن ..؟!

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((يَدخُلُ فُقراءُ المسلِمينَ الجَنةَ قَبلَ أغنيائِهم بِنصفِ يَومٍ وهُو خَمسُمِائةِ عَامٍ)) .[1] واتە : هەژارانی موسلمانان نیو رۆژ لە پێش دولەمەندەکانەوە دەچنە بەهەشتەوە ، کە بریتیە لە (٥٠٠) پێنچ سەد سالٓ ..؟!

لە (عمران بن حصين) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((طَّلعتُ فی النَّارِ فرأيتُ أكثرَ أهلِها النِّساءَ واطَّلعتُ فی الجنَّةِ فرأيتُ أكثرَ أهلِها الفقراءَ)) .[2] واتە :دۆزەخم نیشان درا ، سەیرم کرد زۆربەی خەلکەکەی ئافرەتانن ، بەهەشتیشم نیشان درا ، سەیرم کرد زۆربەی خەلکە کەی هەژارەکانن ..؟!

٢-(كظم الغيظ ) توورەیی خۆیان سەرکوت دەکەن ، یان دان بەخۆ دادەگرن لە توورەیی دا :

(خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿سَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤﴾ [آل عِمۡرَان : ١٣٣ - ١٣٤] واتە: [ وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ ] وە پێشبڕكێ و پەلە بكەن بۆ لێخۆشبوونێك لە پەروەردگارتانەوە [ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ ] وە بۆ بەهەشتێك كە پانتایەكەی فراوانە بە فراوانی ئاسمانەكان و زەوی كە گەورەترین دروستكراون [ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ] كە خوای گەورە ئەو بەهەشتەی ئامادەكردووە بۆ ئەو كەسانە ی كە تەقوای خوای گەورە ئەكەن (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بەهەشت ئێستا دروستكراوەو ئامادەكراوە)..؟! {هەندێك لە سیفاتی مرۆڤی خۆپارێزو موتتەقی} [ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ ] ئەو كەسانەی كە ئەبەخشن لە پێناو خوای گەورە لە كاتی هەبوونی و نەبوونیاندا، لە نەخۆشی و لەشساغیاندا [ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ ] وە ئەو كەسانەی كە ڕقی خۆیان ئەخۆنەوەو لەبەر خوا دەرینابڕن خوای گەورە لە پێش چاوی خەڵكی بانگی دەكات لە ڕۆژی قیامەت تا بە ئارەزوی خۆی حۆری هەڵبژێرێت [ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ ] وە ئەو كەسانەی كە لە خەڵك

---
[1] -سنن الترمذي برقم (٢٣٥٤).
[2] -سنن الترمذي برقم (٢٦٠٣).

ئەبوورێن وە سزای خەڵکی نادەن [ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ] وە بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە چاکەکارو لێبووردەن ..؟!

لە (عمران بن حصين) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَن كَظم غيظًا ، وهو يقدرُ على أن يُنفِذَه دعاه اللهُ على رؤوسِ الخلائقِ حتَّى يُخيِّرَه في أيِّ الحورِ شاءَ)) [1]. واتە : ئەو کەسەی کە بتوانێ رەقی خۆی بڕێژی بەڵام لەبەر رەزامەندی (خوای گەورە) رەقەکەی یان توورەیی خۆی بخواتەوە ، ئەوە لە رۆژی قیامەتدا (خوای پەروەردگار ) لە ناو ئاپۆرای خەلکدا بە بەرچاوی سەرجەم دروستکراوەکانیەوە بانگی دەکات و خۆی پشك دەکات بە ئارەزووی خۆی حوریەکانی بەهەشت هەلبژێرێت بۆخۆی ..؟!

٣-(العفو) واتە: ئەو کەسانە کە لە خەلکی خۆش دەبن :

(خوای گەورە ) دفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤﴾ [آل عِمۡرَان : ١٣٤]واتە: [ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ ] ئەو کەسانەی کە ئەبەخشن لە پێناو خوای گەورە لە کاتی هەبوونی و نەبوونیاندا، لە نەخۆشی و لەشساغیاندا [ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ ] وە ئەو کەسانەی کە رِقی خۆیان ئەخۆنەوەو لەبەر خوا دەرینابڕن خوای گەورە لە پێش چاوی خەڵکی بانگی دەکات لە رۆژی قیامەت تا بە ئارەزوی خۆی حۆری هەڵبژێرێت [ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ ] وە ئەو کەسانەی کە لە خەڵك ئەبوورێن وە سزای خەڵکی نادەن [ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ] وە بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە چاکەکارو لێبووردەن ..؟!

(خوای گەورە ) دفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣﴾ [المَائـِدَة : ١٣] واتە : [ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ ] بەڵام تۆ لێیان ببورەو لێخۆشبوو بە [ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ] بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە چاکەکارن..؟!

٤-(الصدق ) واتە: راستگۆیی لە هەموو بارێك دا :

[1]-سنن الترمذي برقم (٢٤٩٣).

**(خوای گه‌ور ه) ده‌فه‌رموویت :** قال تعالى: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ۝١٧٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٧]واته: ئا ئه‌مانه ڕاستگۆن له ئیمانه‌كه‌یاندا، وه ئه‌مانه ته‌قوای خوای گه‌وره‌یان كردووه‌و موتته‌قین نه‌ك جوله‌كه‌و گاور..؟!

**(خوای گه‌ور ه) ده‌فه‌رموویت :** قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ۝٣٣﴾ [الزُّمَر : ٣٣]واته: [ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ ] وه ئه‌و كه‌سه‌ی كه ڕاستی و ته‌وحیدو یه‌كخواپه‌رستی هێناوه كه پێغه‌مبه‌ری خوایه -صلى الله عليه وسلم - ، یان جبریله، یان سه‌رجه‌م پێغه‌مبه‌رانه [ وَصَدَّقَ بِهِ ] وه ئه‌وانه‌یشی كه به‌ڕاستیان داناوه، واته: باوه ڕداران، یان وتراوه: مه‌به‌ست پێی (ئه‌بوبه‌كری صدیق)ه (خوای لێ ڕازی بێت) كه یه‌كه‌م كه‌س بوو ئیمانی هێناوه [ أُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ] ئا ئه‌مانه به‌ڕاستی كه‌سانێكی موتته‌قی و له خواترس و خۆپارێزن..؟!

**٥-(الوفاء بالعهد ) واته: وه‌فاداری بۆ عه‌هدو په‌یمان و به‌لێن :**

**(خوای گه‌وره ) دفه‌رموویت :** قال تعالى: ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُواْ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٧] واته : وه نوێژه‌كانی بكات و زه‌كاتی ماڵه‌كه‌ی بدات، وه ئه‌وانه‌ی وه‌فایان هه‌یه به‌رامبه‌ر ئه‌و عه‌هدو په‌یمانه‌ی كه به‌خوای گه‌وره‌و به‌خه‌ڵكیان داوه..؟!

**(خوای گه‌وره ) دفه‌رموویت :** قال تعالى: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَـٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيْهِۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبْدِيلًا ۝٢٣﴾ [الأَحزَاب : ٢٣]واته: [ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ] (ئه‌نه‌سی كوڕی مالیك) ده‌فه‌رمێت: (ئه‌نه‌سی كوڕی نه‌زری) مامم له غه‌زای (به‌در) به‌شداری نه‌كرد، وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئاماده‌ی یه‌كه‌م غه‌زا نه‌بووم كه كوشتاری كافرانت كرد ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره یارمه‌تیم بدات ئاماده بم له كوشتاری كافران ده‌مبینێت كه چی ده‌كه‌م، له غه‌زای (ئوحود)دا كه موسڵمانان تێكشكان، وتی: خوایه من داوای لێبوردنت لێده‌كه‌م كه هاوڕێكانم تێكشكان، وه به‌ریم له‌وه‌ی كه كافران ده‌یكه‌ن، پاشان چووه پێشه‌وه (سه‌عدی كوڕی موعاز) پێی گه‌یشت، وتی: ئه‌ی (سه‌عدی كوڕی موعاز) سوێند بێت به خوای باوكم من بۆنی به‌هه‌شت ده‌كه‌م له لای (ئوحود)ه‌وه، (سه‌عد) فه‌رمووی ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئه‌وه‌ی (ئه‌نه‌سی كوڕی نه‌زر) كردی من نه‌متوانی بیكه‌م، (ئه‌نه‌س) ده‌فه‌رمێت: بینیمان هه‌شتاو ئه‌وه‌نده برین به له‌شیه‌وه یه كه به شمشێرو رم و تیر لێیدرابوو، وه كوژرا بوو وه لاشه‌ی شێوێنرابوو كه‌س نه‌یناسیه‌وه ته‌نها خوشكه‌كه‌ی نه‌بێت به سه‌ره‌په‌نجه‌كانی ناسیه‌وه، (ئه‌نه‌س) ده‌فه‌رمێت: ئه‌م ئایه‌ته له‌سه‌ر (ئه‌نه‌سی كوڕی نه‌ضر)و هاوشێوه‌كانی دابه‌زیوه: له‌ناو پیاواندا كه‌سانێك هه‌ن كه ڕاستگۆ بوونه له‌و به‌ڵێنه‌ی كه به خوای گه‌وره‌یان داوه كه به‌رگری له

دینی خوای گەورە بکەن [ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ ] جا هەیانبووە بەڵێنەکەی جێبەجێ کردووە کە بەڵێنیان داوە کە بگەن بە دوژمن کوشتاریان بکەن، یاخود مردوونەو شەهید بوونە، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەفەرمێت: (طلحة لەم کەسانەیە) [ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ ] وە هەشیانە چاوەڕێیە کە ئەجەلی بێت و لە پێناو خوای گەورە بکوژرێ [ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا ] وە ئەو بەڵێنەی کە بە خواو پێغەمبەری خوایان داوە - صلى الله عليه وسلم - نەیانگۆڕیوەو بەردەوام بوونە لەسەری..؟!

## فەزل و شوێن و سوودو بەرهەمەکانی تەقواداری یان خۆپارێزی کردن لە سەر موسلمانان

١- (خير زاد ) واتە : تەقوا زیاد بوونی چاکە کردن :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٩٧] واتە : [ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى ] خەڵکی یەمەن حەجیان دەکردو خواردنیان لەگەڵ خۆیان ناهێناو ئەیانووت: ئێمە تەوەکول ئەکەینە سەر خوا، کە دەگەیشتنە مەککە داوایان لە خەڵکی دەکرد خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: زادیش لەگەڵ خۆتاندا بەرن بەڵام باشترین زادیش تەقوای خوای گەورەیە بۆ قیامەت، وە زادی دونیاش خواردنەکەیە کە یارمەتیدەرتە لەسەر تەقوا [ وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ] ئەی ئەو کەسانەی کە خاوەن عەقڵن تەقوای من بکەن و خۆتان لە تاوان بپارێزن و بە تەنها لە من بترسێن..؟!

٢-(التقوى اجمل لباس يتزين به العبد ) واتە: جوانترین پۆشاکە بۆ ڕازاندنەوە کە بەندە لە بەری بکات :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٢٦﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٦] واتە : [ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ ] ئەی نەوەکانی ئادەم ئەوە ئێمە پۆشاکێکمان بۆ دابەزاندوون بۆ ئەوەی کە عەورەتتان داپۆشێ [ وَرِيشًا ] وە پۆشاکێکیش بۆ جوانی کە خۆتانی پێ بڕازێننەوەو عەورەتی خۆتانی پێ داپۆشن [ وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ] وە بەڵام پۆشاکی تەقواو ئیمان و کردەوەی چاك و لە خوا ترسان ئەمە باشترین پۆشاکێکە کە خەڵکی خۆی پێ بڕازێنێتەوە [ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ] ئەمانە نیشانەی خوای گەورەن بەڵکو ئێوە یاد بکەنەوە..؟!

تێبینی / دەربارەی پۆشاکی تەقوا [ وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ] بەڵێ زانایانی تەفسیری قورئانی پیرۆز بە تایبەتی (ابن الجوزی ) رەحمەتی خوای لێ بێت – لە (کتابی زاد المسر ) دا دابەشی کردووە بە دە جۆری چاکە کردن :

١-سەبرو ئارامی و وە بەانگەوازی خوای گەورە بۆ یە کتاپەرستی ، وەنجامدانی کاری چاکە کردن یەکێکە هەر کارە جوانە کانی پێغەمبەران – علیه السلام – .

٢-کاری چاکه‌ کردن .

٣-باوەر هێنان یان ئیمان هێنان بەخوای تاك وتەنها .

٤-ترس له‌ (خوای گەوره‌ ) .

٥-هەبوونی ئابروو حەیا .

٦-داپۆشینی عەورەت له‌ کاتی نوێژ کردن دا .

٧-پۆشینی دروع یان زریپۆشی ئامرازی جەنگی بۆ جیهاد کردن .

٨-ئافرەتی داوێن پاك و یان پاکیزه‌ .

٩-تەقوای هەیە له‌ گەرماو له‌ ساردی واته‌: هیچ پلەکانی گەرما یان سەرمان نایوەستێنی له‌ تەقواداری .

١٠- ئەو پۆشاکەی که‌ ئەهلی قیامەت بۆ چاکه‌ کردن لەبەری دەکات باشتره‌ لەو پۆشاکەی بۆ دونیا لەبەردەکرێت..؟!

٣-وصیەتی سەرجەم پێغەمبەرانە که‌ به‌ فەرمان کردن به‌ گەل و قەومەکانیان که‌ تەقوادار بن :

(خوای گەوره‌)دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ١٣١﴾ [النّسَاء : ١٣١] واته: [ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] وه‌ هەرچی له‌ ئاسمانەکان و زەوی و له‌ نێوانیاندا هەیە هەمووی موڵکی خوای گەوره‌ یەو بەتەنها خۆی هەڵسوکەوتی تیادا دەکات و بەڕێوەی دەبات [ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ اتَّقُوا اللَّهَ ] وه‌ به‌ دڵنیایی ئامۆژگاری ئەوانەی پێش ئێوه‌ له‌ ئەهلی کتاب وه‌ ئێوەش ئەکەین بەوەی که‌ تەقوای خوای گەوره‌ بکەن [ وَإِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] بەڵام ئەگەر تەقوای خوای گەوره‌ نەکەن و کوفر بکەن ئەوا هەرچی له‌ ئاسمانەکان و زەوی و له‌ نێوانیاندا هەیە هەمووی موڵکی خوای گەورەیەو خوای گەوره‌ پێویستی به‌ ئێوه‌ نیه‌ [ وَكَانَ اللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا] وه‌ خوای گەوره‌ زۆر دەوڵەمەندو بێ پێویست و سوپاسکراوه‌ هەرچی له‌ زەوی و ئاسمان هەیە سوپاسی خوای گەوره‌ دەکات..؟!

(خوای گەوره‌)دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٠٦﴾ [الشُّعَرَاء : ١٠٦] واته‌ : کاتێك نوح - صلى الله عليه وسلم - (لەبەر ئەوەی له‌ هۆزو نەتەوەی خۆیان بوو خوای گەوره‌ به‌ برا ناوی ئەبات) پێی وتن: ئایا بۆ تەقوای خوای گەوره‌ ناکەن و واز له‌ پەرستنی ئەو بتانە ناهێنن و شوێن من ناکەون..؟!

(خوای گه‌وره)ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾﴾ [الشُّعَرَاء : ١٢٤]واته : كه هود پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - له هۆزو عه‌شیره‌تی خۆیان بوو پێی وتن بۆ ته‌قوای خوای گه‌وره ناكه‌ن به‌وه‌ی كه ئیمان بێنن..؟!

(خوای گه‌وره)ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾﴾ [الشُّعَرَاء : ١٤٢] واته : صالّح پێغه‌مبه‌ریش - صلى الله عليه وسلم - كه له هۆزو عه‌شیره‌تی خۆیان بوو پێی وتن ئه‌وه بۆ ته‌قوای خوای گه‌وره ناكه‌ن..؟!

(خوای گه‌وره)ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾﴾ [الشُّعَرَاء : ١٦١] واته : كاتێك لوط - صلى الله عليه وسلم - كه له هۆزو عه‌شیره‌تی خۆیان بوو پێی فه‌رموون: ئه‌وه بۆ ته‌قوای خوای گه‌وره ناكه‌ن وه ئیمان ناهێنن..؟!

(خوای گه‌وره)ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ۖ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾﴾ [العَنكَبُوت : ١٦] واته : {بانگه‌وازی ئیبراهیم پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم -} [ وَإِبْرَاهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ] وه ئیبراهیمیش - صلى الله عليه وسلم - كاتێك كه به قه‌ومه‌كه‌ی خۆی فه‌رموو: به‌تاك و ته‌نها خوا بپه‌رستن و شه‌ریكی بۆ دامه‌نێن وه ته‌قوای خوای گه‌وره بكه‌ن [ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ] ئه‌مه خێری دونیاو قیامه‌تی ئێوه تێدایه‌و باشتره له‌وه‌ی كه شه‌ریك بۆ خوا بڕیار بده‌ن ئه‌گه‌ر ئێوه زانیاریتان هه‌یه...؟!

(خوای گه‌وره)ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾﴾ [الشُّعَرَاء : ١٠ - ١١] واته : {گفتوگۆی نێوان موسا پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - و خوای گه‌وره} [ وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ] وه په‌روه‌ردگارت بانگی له موسا - صلى الله عليه وسلم - كرد بڕۆ بۆ لای ئه‌و قه‌ومه سته‌مكاره كه قه‌ومی فیرعه‌ونه (ئه‌میش به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه خوای گه‌وره قسه ده‌كات و سیفه‌تی قسه كردنی هه‌یه)..؟! [ قَوْمَ فِرْعَوْنَ أَلَا يَتَّقُونَ] قه‌ومی فیرعه‌ونه كه ته‌قوای خوای گه‌وره ناكه‌ن، پێیان بڵێ: ئایا بۆ له سزای خوای گه‌وره ناترسێن..؟!

(خوای گه‌وره)ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾﴾ [الزُّخْرُف : ٦٣] واته: [ وَلَمَّا جَاءَ عِيسَى بِالْبَيِّنَاتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُمْ بِالْحِكْمَةِ ] وه كاتێك كه عیسا - صلى الله عليه وسلم - به‌ڵگه‌ی ڕوون و ئاشكراو موعجیزه‌ی هێنا وتی: ئه‌وه من حیكمه‌ت یان پێغه‌مبه‌رایه‌تیم بۆ هێناون [ وَلِأُبَيِّنَ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ] وه تا هه‌ندێك له‌و شتانه‌ی كه ئێوه ئیختیلاف و ناكۆكی و جیاوازی له نێوانتاندا هه‌یه له ئه‌حكامی ته‌ورات بۆتان ڕوون بكه‌مه‌وه [ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ] وه ئێوه ته‌قوای خوای گه‌وره بكه‌ن وه گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره‌و گوێڕایه‌ڵی من بكه‌ن..؟!

(خوای گەورە)دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٢٣ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ١٢٤﴾ [الصَّافَّات : ١٢٣ - ١٢٤] واتە : {بانگەوازی ئیلیاس پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - } [ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ] وە ئیلیاسیش - صلى الله عليه وسلم - پێغەمبەرێکی تر بووە لە پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل، یان وتراوە: ئیدریس - صلى الله عليه وسلم - بووە..؟! [ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلَا تَتَّقُونَ] کاتێك کە بە قەومەکەی خۆی فەرموو ئەوە بۆ تەقوای خوای گەورە ناکەن و بۆچی عیبادەتی جگە لە خوای گەورە ئەکەن..؟!

(خوای گەورە)دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٧٧ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ١٧٨ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ١٧٩﴾ [الشُّعَرَاء : ١٧٧ - ١٧٩]واتە : شوعەیب - صلى الله عليه وسلم - پێی فەرموون: ئەوە بۆ تەقوای خوای گەورە ناکەن بەوەی کە ئیمان بێنن..؟! [ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ] من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوەو پەیامی خوای گەورەتان وەکو خۆی پێدەگەیەنم بەبێ زیادو کەم..؟! [ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ] دەی ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن وە گوێڕایەڵی من بکەن..؟!

٤–فەزل و گەورەیی تەقوا یان خۆپارێزی دەبێتە چاودێری کردنی (خوای گەورە ) پەسەرمانەوە بۆسەرکەوتن:

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨﴾ [النَّحل : ١٢٨]واتە : هـ دڵنیایی ئەو کەسانەی کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن وە چاکەکارن خوای گەورە لەگەڵیاندایە بە سەرخستن و یارمەتیدان، والله أعلم..؟!

٥–ئەوکەسەی تەقواداره ولی (خوای گەورە ) ی واتە: دبێتە دۆست و پیشتیوانی و سەرخەری :

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩﴾ [الجَاثِيَة : ١٩]واتە : وە خوای گەورە دۆست و پشتیوان و سەرخەری ئەو کەسانەیە کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن..؟!

٦–ئەوکسەی تەقواداره (خوای گەورە ) خۆشی دەوێت :

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٧٦﴾ [آل عِمۡرَان : ٧٦] واتە : [ بَلَى مَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ وَاتَّقَى ] بەڵێ هەر کەسێك وەفای هەبێ بەرامبەر بە عەهدو پەیمانی و ماڵی خەڵکی بگەڕێنێتەوە، یان وەفای هەبێت بەرامبەر ئەو عەهدو پەیمانەی کە بە خوای گەورەی داوە کە ئیمان بە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بێنن، وە تەقوای خوای گەورە بکات و ماڵی خەڵکی بەناحەق نەخوات و ئەمانەتی خەڵکی بگەڕێنێتەوە [ فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ] ئەوە هەر کەسێك بەو شێوازە تەقوای خوای گەورە بکات بەدڵنیایی خوای گەورە خۆشی ئەوێ ..؟!

٧-ئەوکەسەی تەقوادارە رەحمەت و سۆزو بەزەیی (خوای گەورە ) دەباریٚ بەسەردا :

(خوای گەورە) دەفەرموویٚت : قال تعالى: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٠﴾ [الحُجُرَات : ١٠]واتە: {تەنها باوەڕداران برای راستەقینەی یەکترن} [ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ] تەنها باوەڕداران برای ڕاستەقینەی یەکترن [ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ] ئێوەیش صوڵح و ئاشتەوایی بکەن لە نێوان براکانتاندا [ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ] وە تەقوای خوای گەورە بکەن بەڵکو خوای گەورە رەحمتان پێ بکات..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویٚت : قال تعالى: ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ [الأَعۡرَاف : ١٥٦] واتە : [ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ] بەڵام ڕەحمەتی من ئەوەندە فراوانە هەموو شتێکی گرتۆتەوە [ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ ] ڕەحمەتی خۆم ئەنووسم بۆ ئەو کەسانەی کە تەقوای من ئەکەن وە زەکاتی ماڵەکانیان ئەدەن، یان دەروونی خۆیان پاك دەکەنەوە لە خراپە..؟!

٨-تەقوا دەبێتە قبول بوون کارو کردەوە کان وە بەردەوام بوون لە سەر کردەوەی چاکە:

(خوای گەورە) دەفەرموویٚت : قال تعالى: ﴿قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ﴾ [المَائـِدَة : ٢٧]واتە : (هابیل)یش بە براکەی وت: خوای گەورە خێر لە کەسانێك قبووڵ دەکات کە تەقوای خوای گەورە بکەن وە ماڵی باش ببەخشن..؟!

٩-تەقوا دەبێت پێوەری جیاکەورە لە نێوان بەندەکانی (خوای گەورە) :

(خوای گەورە) دەفەرموویٚت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾ [الحُجُرَات : ١٣] واتە: [ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ ] ئەی خەڵکی ئێمە ئێوەمان دروست کردووە لە نێرو مێیەك کە ئادەم و حەوا بووە [ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ] وە ئێوەمان کردووە بە چەند گەل و هۆزێکەوە تا یەکتری بناسن {بەڕێزترینتان لای خوای گەورە بەتەقواترینتانە} [ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ] بەڕێزترینتان لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کە لە هەموو کەس بەتەقواتر بێت ئەوە لای خوای گەورە لە هەموو کەس بە ڕێزترە [ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە وە زانیارییەکی زۆر وردی هەیە..؟!

١٠-تەقوا دەبێتە برکەت لە رزق رۆزی زیاد بوونی رزق :

(خوای گەورە) دەفەرموویٚت : قال تعالى: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ﴾ [الطَّلَاق : ٢ - ٣] واتە : [ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ ] وە هەر کەسێك تەقوای خوای گەورە بکات بەوەی کە سنووری خوای گەورە نەبەزێنێ و تاوان و سەرپێچی نەکات وە خێزانەکەی تەڵاقدا لەسەر سوننەت تەڵاق بدات، وە گەڕاندییەوە لەسەر سوننەت بیگەڕێنێتەوە، وە شایەت





دابنێ [ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا (٢) ] ئه‌وه خوای گه‌وره ده‌رووی خێری لێ ئه‌کاته‌وه له‌و کێشه‌یه‌ی که که‌وتۆته ناوی و ڕزگاری ئه‌کات، وه له ناخۆشییه‌کانی دونیاو قیامه‌ت رزگاری ده‌کات، یاخود که‌وته ناو هه‌ر شوبهه‌و گومانێك له دیندا خوای گه‌وره ده‌رووی لێ ئه‌کاته‌وه‌و ڕزگاری ئه‌کات، یاخود له‌سه‌ره‌مه‌رگدا له ناخۆشییه‌کانی سه‌ره‌مه‌رگ ڕزگاری ئه‌کات، (ئیبنو مه‌سعود) ده‌فه‌رمێت: (گه‌وره‌ترین ئایه‌ت له قورئاندا که کردنه‌وه‌ی ده‌روی خێری تێدا بێت ئه‌م ئایه‌ته‌یه) [ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ] وه هه‌ر که‌سێك سنووری خوا نه‌به‌زێنێ و ته‌ڵاقدان و گه‌ڕاندنه‌وه‌ی له‌سه‌ر سوننه‌ت بێ خوای گه‌وره ڕزق و ڕۆزی ئه‌دات به شێوازێك که به خه‌یاڵیدا نه‌هاتووه، به‌ڵام که‌سێك که ته‌قوای خوای گه‌وره نه‌کات یان ته‌ڵاقدان و گه‌ڕاندنه‌وه‌ی له‌سه‌ر سوننه‌ت نه‌بوو له‌سه‌ر بیدعه بوو ئه‌و کاته ته‌سکی و ته‌نگی له‌سه‌ر ئه‌و که‌سانه‌یه که سه‌رپێچی ئه‌حکامه‌کانی خوای گه‌وره ئه‌که‌ن وه ته‌قوای خوای گه‌وره ناکه‌ن..؟

١١–(خوای گه‌وره) له‌گه‌ل ته‌قوادارانه :

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت** : قال تعالى: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩٤﴾ [البَقَرَة : ١٩٤] واته: وه ته‌قوای خوای گه‌وره بکه‌ن و سنوره‌کانی مه‌به‌زێنن، وه بزانن که خوای گه‌وره له‌گه‌ڵ ئه‌و که‌سانه‌دایه که ته‌قوای خوای گه‌وره ئه‌که‌ن به‌وه‌ی سه‌ریان ئه‌خات و پشتیوانیان ئه‌کات و یارمه‌تیان ئه‌دات..؟!

١٢–ئه‌وکه‌سه‌ی ته‌قواداره کارو کرده‌وه‌کانی رۆژانه‌ی بۆ ئاسان کرده‌کرێت :

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت** : قال تعالى: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤﴾ [الطَّلَاق : ٤] واته: وه هه‌ر که‌سێك ته‌قوای خوای گه‌وره بکات و خۆی له تاوان بپارێزێ ئه‌وا خوای گه‌وره کاروباری له دونیاو قیامه‌تدا بۆ ئاسان ئه‌کات..؟!

١٣–ئه‌و که‌سه‌ی ته‌قوای (خوای گه‌وره) ده‌کات ، ده‌بێته سرینه‌وه‌ی هه‌موو گوناهو تاوانه‌کانی پێشوویی :

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت** : قال تعالى: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ٥﴾ [الطَّلَاق : ٥] واته : [ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ ] وه‌هه‌ر که‌سێك ته‌قوای خوای گه‌وره بکات و سنووری خوای گه‌وره نه‌به‌زێنێ ئه‌وه خوای گه‌وره له تاوانه‌کانی خۆش ئه‌بێ و ئه‌یسڕێته‌وه [ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا ] وه ئه‌جرو پاداشتیشی زۆر گه‌وره ئه‌کات و ئه‌جرو پاداشتێکی زۆر گه‌وره‌ی ئه‌داته‌وه له دونیاو قیامه‌تیش که بریتیه له به‌هه‌شت..؟!

١٤–ئه‌و که‌سه‌ی ته‌قوای په‌روه‌ردگاری ده‌کات ، ڕزگاری ده‌بێت له ئاگری دۆزه‌خدا :

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت** : قال تعالى: ﴿وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا ٧١ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيّٗا ٧٢﴾ [مَرۡيَم : ٧١ - ٧٢]واته : وه هیچ که‌سێك له ئێوه نیه ئیلا ئه‌بێ به‌سه‌ر پردی (سیراط) دا تێپه‌ڕێ و بچێته سه‌ر ئاگری دۆزه‌خ [ كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا ] ئه‌مه کارێکه‌و بڕاوه‌ته‌وه‌و کۆتایی هاتووه‌و خوای گه‌وره بڕیاری له‌سه‌ر داوه..؟! [ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا ] پاشان ئه‌وانه‌ی ته‌قوای خوای گه‌وره‌یان کردووه‌و له خوای گه‌وره ترساون و خۆیان له تاوان پاراستووه ئه‌وانه ڕزگار ئه‌که‌ین و له‌سه‌ر پرده‌که ده‌یانپه‌ڕێنینه‌وه [ وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ

فِيهَا جِثِيًّا ] وە ئەوانەیشی کە ستەمکار بوونەو ستەمیان لە خۆیان کردووە بە کوفر کردن و هاوبەشبڕیاردان لەسەر چۆکیان فرێ ئەدرێنە دۆزەخەوە..؟!

١٥-تەقواداران سەرفراز سەر کەوتوون لە دونیا و لەقیامەتدا :

**(خوای گەورە) دەفەرموێت** : قال تعالی: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ۝٣١﴾ [النَّبَإ : ٣١]واتە: پاشان خوای گەورە دێتە سەر هەواڵی ئەوانەی کە لە دونیادا تەقوای خوای گەورەیان کردووەو خۆیان لە تاوان پاراستووە، ئەوان سەرکەوتن و بردنەوەو ڕزگاربوونیان لە ئاگری دۆزەخ بۆ هەیە، یاخود وتراوە: (مَفَازًا) واتە: باخیان لەناو بەهەشتدا بۆ هەیە..؟!

١٦-تەقوا دەبێتە هۆی زانایی و بەرچاو ڕوونی و جیاکردنەوەی حەق و نارەوا :

**(خوای گەورە) دەفەرموێت** : قال تعالی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانًا﴾ [الأَنفَال : ٢٩] واتە: ئەی باوەڕداران ئەگەر ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن و خۆتان لە تاوان بپارێزن خوای گەورە واتان لێ ئەکات کە جیاکاری بخەنە نێوان حەق و باتڵەوەو حەق و باتڵ لێك جیابکەنەوەو بناسنەوەو دەبێتە هۆی سەرخستن و سەرفرازیتان..؟!

١٧-تەقوا دەبێتە هۆی کردنەوەی دەرووی خێر :

**(خوای گەورە) دەفەرموێت** : قال تعالی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجًا ۝٢﴾ [الطَّلَاق : ٢] واتە : [ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ ] وە هەر کەسێك تەقوای خوای گەورە بکات بەوەی کە سنووری خوای گەورە نەبەزێنێ و تاوان و سەرپێچی نەکات وە خێزانەکەی تەڵاقدا لەسەر سوننەت تەڵاقی بدات، وە گەڕاندییەوە لەسەر سوننەت بیگەڕێنێتەوە، وە شایەت دابنێ [ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا ] ئەوە خوای گەورە دەرووی خێری لێ ئەکاتەوە لەو کێشەیەی کە کەوتۆتە ناوی و ڕزگاری ئەکات، وە لە ناخۆشییەکانی دونیاو قیامەت ڕزگاری دەکات، یاخود کەوتە ناو هەر شوبهەو گومانێك لە دیندا خوای گەورە دەرووی لێ ئەکاتەوەو ڕزگاری ئەکات، یاخود لەسەرەمەرگدا لە ناخۆشییەکانی سەرەمەرگ ڕزگاری ئەکات، (ئیبنو مەسعود) دەفەرمێت: (گەورەترین ئایەت لە قورئاندا کە کردنەوەی دەروی خێری تێدا بێت ئەم ئایەتەیە)..؟!

١٨-هەر کارو کردەوە یەك لە سەر بنچینەی تەقوا دامەزرێ ئەو هەرگیز هەرس ناهێنی و موفەق دەبێت :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ﴾ [التَّوْبَة : ١٠٩]واتە: جا ئایا کەسێک بناغەی مزگەوتەکەی دامەزراند بێت لەسەر خواناسی و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا چاکترە..؟!

١٩-سەرئەنجامی خێرو چاکە لە گرەوی ئارام گرتن و تەقواداری دایە:

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿فَٱصْبِرْۖ إِنَّ ٱلْعَـٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ۝٤٩﴾ [هُود : ٤٩] واتە: تۆ ئارام بگرە لەبەرامبەر کافراندا بە دڵنیایی سەرەنجام هەر بۆ ئەو کەسانەیە کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن..؟!

## ئێستا با بزانین تەقواداریی و ووردبوونەوە چییە و چۆنەوە ، چۆن دەستگیر دەبێ ..؟

بەڵێ باشترین ڕێگای بەدەستهێنانی تەقواداری یان پارێزگاریی و ووردبوونەوە ، ئەوەیە کە مرۆڤ هەموو ڕۆژێك بە بێ سەرزەنشت کردن ، بە گوێرەی ئەو پەیمانە پێنچ خالە ، لە گەل نەفس و دەروونی خۆی رەفتار بکات ، کە زانایانی خواناس ژیرو هۆشیار و تەقوادار ، بۆ بەرەو لای خوا چوون و کامل بوون ، ئەمە یان داناوە لە سەری یەك دەنگن کە خۆی لە ئەو پەیمانە کە پێنچ خالە ئەمانەی خوارەوەن :

١-(المشارطة ) واتە : شەرت و مەرج لە گەل داگرتن .

٢-(المراقبة ) واتە : چاودێریی کردن .

٣-(المعاتبة ) واتە: سەر کۆنە کردن .

٤-(المحاسبة ) واتە: لێ پرسینەوە .

٥-(المعاقبة ) واتە : سزادان .

یەکەم : (المشارطة ) واتە : شەرت و مەرج لە گەل داگرتن :

بەڵێ هەموو ڕۆژێك بەیانیان کە لە خەوێ هەلسای بە شێوەیەکی بە هێز پۆلاینەوە ، دەبێت شەرت و مەرج لە گەل خۆت دابنێ ، خۆت بدوێنەو مەرج لە گەل نەفسی خۆتدا بگرە ، کە ئاگاداری خۆی بێ و وریاو بێدار و وورد بێ و ، چونکە نابێت گیرۆدەی هیچ خراپە یەك و گوناهو تاوانێکی بێ شەرعی بێت ، یان هەلسو کەوت و رفتارێکی پووچ هیچ سوودی نەبێت کە پێ دەلێن : (لغو) و ناپەسند (مکروە ) کە دوور بێت لە رەوشت بەهای مرۆڤی موسلمان ..؟!

ئەو ئاگا لە خۆ بوونەوە هۆشیاریی و ووردبوونەوەیە بۆ مەرج داگرتن بە پاراستنی حەوت شت دێتەدێ:

١-(الكلمات ) واتە: دەربڕینی ووشەكان لەدەم دەردەچێت ، كەواتە هیچ ووشەیەك نەلێ و وە نەبیستی ، كە شیاوی تاوان بێ ، یان لایەنیکەم پووچ و بێ سوود بێ و ،وەئەوەی ئێستا كە ڕوودەدات لە ناو تۆرەكۆمەلایەتیەكان هەر هەمووی ناشەرعیە لە دەربرینی ووشەی قێزەون عیبدار ، خۆیان سووك چرۆك دەكەن بۆ بەدەست هێنانی برە پارەیەك یان ناو بانگ دروست كردن بۆ بێ شەرمی بێ ئابروویی ..؟!

٢-(النظرات ) واتە : سەرنجەكان ، كەواتە بەندەی موسلمان سەرنج نەداتە هیچ شتێك كە حەرام بێت ، یان لایەنی كەم پووچ و بێ سوود ، یان ناپەسند (مكروە) بێ و ، چاوی بەو سەرنج بینینی حەرام خەریك نەكات.؟!

٣-(الخطرات ) واتە :هیچ بیرو نیازێك خراپەیەك بەدل دەروونی خۆیدا نەهێنی ، كە خراپە ، یان لایەنی كەم نادروست و ناپەسندبێ ، لە نیازو مەبەستی خراپ و پووچ بەتاڵ ، دەبێت دوورە كەویتەوە لە نیازی خەراپ ..؟!

٤-(الحظات ) واتە: هیچ چركە ساتێكی تەمەنی لە بێ شەرعی دا نەبێ ، یان خەریكی كارو كردەوەی ناشەرعی بێت ، تەمەنی تەنها بە (لغو) قەسەی بێ سوودو پرو پووچ بەسەر بەرای ، یان تەمەنی خۆی بەسەر بەرێ بە هەواو ئارەزووەكانی دونیا ، بە دوای گاڵتە كەپ خۆشی ناشەرعی دونیادا بگەرێ ، هەمیشە سەر گەرمی دونیا بێت ، بێ گومان تەقوادرا دەبێت خەمی قیامەتی بێت زیاتر لەوەی خەمی دونیا بێت ..؟!

٥-(الخطوات ) واتە : بەرەو هیچ كارێكی خراپ ناپەسەند هەنگاو هەڵنەنێ ، بەڵكو تەنها دەبێت بەرەو كاری خێر و چاكەكردن هەنگاو هەڵبێنی ..؟!

٦-(القمات) واتە: هیچ پاروویێك ، یان لوقمێك وا لە گەرووی ئاوا نەكات كە حەرام بێت ، دەبێت وەك مرۆڤ ڕەفتار بكات ئاگاداری لوقمەی حرام و حەڵال بێت ، نەك وەكو ئاژەل ڕەفتار بكات هەرچی هەبێت لووشی بكات ، تەنها

خه‌ریکی تێرکردنی زگی خۆی بێت ، نه‌ك هه‌ر له سه‌ر حه‌رام نه‌فسی خۆی قه‌ده‌غه‌بكات به‌لكو ده‌بێت له‌سه‌ر ئه‌و شتانه‌ی نادیارو شبهه‌شن و جێگای گومانن ،ده‌بێت وریا بێت خۆی نه‌خاته حه‌رامه کراوه‌کان ، هه‌روه‌ها له موباحه‌کانیش دا زیاده‌ڕۆیی نه‌کات ..؟!

٧-(الحرکات ) واته : هیچ جووله‌یه‌کی حه‌رام و ناشه‌رعی به هیچ له ئه‌ندامه‌کانی لاشه‌ی نه‌کات ، که حه‌رام و ناپه‌سند بێت یان (مکروه ) بێ ، هه‌روه‌ها له هه‌ر جووله‌یه‌کی پێویست په‌سه‌ند و کاری چاکه‌ش دا درێغی نه‌کات..؟!

دووه‌م : (المراقبة) واته: چاودێری کردن :

به‌لێ دوای ئه‌وه‌ی به‌و شێوه‌یه‌ی که له خالی یه‌که‌م دا باسمان کرد ، ئه‌ویش مه‌رج دانان له‌گه‌ل خۆتدا گرت و به‌لێنێکی به‌هێز خۆراگرو بته‌وت له‌گه‌لدا ئیمزا کردووه یان مۆر کردووه ، ئینجا ده‌ست به‌جێ دوا به‌دوای ئه‌وه چاودێریی و لێکۆلینه‌وه و پشکنینێکی وورد و به‌رده‌وام بخه سه‌ر خۆت و زۆر چاك ئاگاداری و شه و رسته‌کانی زمانت به ، وه روانینی یان دیده‌ی سه‌رنجه‌کانی چاوت ، نیازو مه‌به‌ستی و خولیاو خه‌یاله کانی دلّ و هۆش و مێشکت به ، وه چرکه ساته‌کانی ته‌مه‌نت به فیڕۆمه‌ده ، وه هه‌نگاوه‌کانی پێ و به جوانی به‌هاوێ ، وه ئاگاداری ئه‌و لوقمه خوادرنه‌به که گه‌ده‌ت پێ تێر ده‌که‌ی ، بزانه پارووه یان لوقمه خواردنه‌که پاك و خاوێنه یان پیس بۆگه‌نه‌ه که ده‌یان خۆی ..؟! ئینجا سه‌رنجێك بده به جموو جۆل و یان جووله‌کانی ئه‌ندامه‌کانی لاشه‌ت ، به‌لێ بێ گومان ئه‌مانه‌ی که باسمان کرده ده‌بێت (خوای گه‌وره ) له هه‌مووی رازی بێت ، لایه‌نی که‌م نابێت ببنه مایه‌ی شه‌رمه‌زاری وخه‌جاله‌ت یان ره‌نج به خه‌ساریی و دونیاو قیامه‌ت بێت ..؟! هه‌لبه‌ته ئه‌م چادێری کردنه خۆ پیشکنینه تایبه‌ت نیه به کات و شوێنێکی تایبه‌تی و دیاریی کراوه‌وه و ، به‌لکو پێویسته هه‌ر له هه‌لسانت له خه‌ودا تاکو کاتی پێش نووستن ، به‌رده‌وام بێت و یه‌ك تاو له خۆی بێ ئاگا نه‌بێ ، چونکه شه‌یتان نه‌فس و ئاره‌زووی مرۆڤ هه‌میشه له پوسه‌و پیلانگیری دان ، هه‌ر چاوه‌ڕێ هه‌ول ساته‌وه‌ختێکی غافل بوونت ده‌که‌ن ، دره‌فتێ کیان بۆ هه‌لبکه‌وێت ، ئه‌وا یه‌ك سه‌ر تووشی گوناهو تاوانت ده‌که‌ن ، بێ گومان هه‌ولده‌ده‌ن دووچاری خراپه‌کاریه‌ك یان تاوانێکی گه‌وره‌ت بکه‌ن ، یان دوورت ده‌که‌نه‌وه له خێرو چاکه ..؟!

سێ یه‌م :(المعاتبة) واته : سه‌ر کۆنه کردن یان سه‌رزه‌نشت کردن :

به‌لێ ئینجا دوای له خه‌و هه‌لسانته‌وه تاکو کاتی نووستن یان سه‌ر جێگه‌ی خه‌وتن ، به ووردی و بێ پسانه‌وه چاودێریی خۆتت کردوو ، چاو گوێ و زمان ده‌م زارو دلّ و میشك و گه‌ده‌و ده‌ست و پێ یه‌کان ، باقی ئه‌ندامه‌کانی

لاشە ، کردە جێگایی سەرنج و تێرامان و ووردبوونەوەی خۆت ، شەو کاتێ چوویتە سەر جێگەی نووستنی خۆت ، مەخەوە هەتاکو چاوێکی یان سەرنجێکی ووردو قول بە هەلسوکەوتەکانس ڕۆژانەی خۆت یان ئەو ڕۆژەی کە تێدا ژیانت کردووە ئەگێریەوە ، جا ئەگەر کە سێکی چاکە کار بووی ، لەم ڕۆژەدا خێرو کردەوەی چاکەی زۆر کردووە ، ئەوا سوپاسی (خوای گەورە ) بکە ..؟ ئەوا سوور بزانە ، کە بە کۆمەکو هاوکاری و یاریدەو پشتگیریی (خوای گەورە ) کردووتەو ، ئەگەر خوا نەکردە ، خراپەیەکیشت بەرچاو کەوت ، ئەوا دەست بەجێ تەوبەی نصوحی لە سەر بکە و بگەرێ یەوە بۆ لای پەروەردگاری جیهانیان ، وە داوی لێ خۆش بوون لە (خوای گەورە ) بکە ، سوور بزانە ، کە نەفست بە فەرمانی شەیتانی بەد ، تووشی ئەو خراپە کاریەی کردووی ، بەلێ مادەم زانیت شەیتان تووشی خراپە جەبرەزەی کردووی ئەوا جێ خۆیە تی سەرکۆنەو سەرزەنشتی نەفسی خۆت بکەی..؟!

چوارەم : (المحاسبة ) واتە: لێ پرسینەوە :

بەلێ پاش ئەوەی کە هەموو پێش خەوتنێك لۆمەو سەرکۆنەو سەرزەنشتی نەفسی خۆتت کرد لە سەر هەل و خراپە و تاوانە کانت ، ئەگەر زانیت نەفست بەو سەر شکاندنەوە و خۆ لێ توورە کردن و سەر کۆنە کردنە ، چاك بوویەوە وە ئەدەب شەرم حەیای پەیدا کرد ، بێ گومان ئەوە چاکە هەنگاو بگۆزیتەوە بۆ چوارەم خال ، ئەویش (المحاسبە ) یە بەین بەین هەر ڕۆژێك جارێك یان لایەنی کەم هەر حەفتەیەك جارێك دەست بکە بە لێ پرسینەوەیەکی زۆر توندو ووردی نەفسی خۆت ، تەنانەت لەسەر گەدیلەیەکیش یان سەرە دەرزیش حیساب بکەو ، یەك تۆزێك بەزەیەیت بەخۆتدا نەهێتەوە ، چونکە تاوان و خراپەکاریەکانی بەزەیی یان بە تۆ دا نەهاتۆ تەوە ، چونکە ویستوویەتی لەرێ ئەو تاوان خراپەکاریانەی کردووتە ، دووچاری توورەیی و ئازارو سزاو ئەشکەنجەی (خوای گەورە) بێتەوە یان لە دونیا و لە قیامەت لە خەسارەت مەندان بێت ، هەم لەدونیادا هەم لە قیامەتیش دووچاری ریسواییی سەر شۆری زەلیلی بێتەوە ، بەلێ ئینجا ئەگەر لە ئەنجامی ئەم لێ پرسینەوەیەدا هەستت کرد ، کە نەفسی خراپەکارت شایستەی سزاو جەزرەبەیە ، ئەوە یەکسەر لەگەلی بگوازەوە بۆهەنگاوی پێنچەم.؟!

پێنچەم : (المعاقبة ) واتە : سزادان :

وەکو باسمان کرد دوای لێ پرسینەوەیەکی وورد و قوول ، ئەگەر بۆت دەرکەوت نەفست شایستەی سزاو جەزرەبەیەو ، ئینجا کاتی دارکاریکردنە یان تەمێکردنیەتی ، بەبێ سەلبوونەوە دوو دڵ مەبە ، بەرۆکی نەفسی خۆت بگرەو زەبرێکی کوشندەو پر بە پێستی لێ بدە ، لە خەوی بێ ئاگاو سستیی تەمبەلی و تەوەزەلی و لاشە گرانیی دا بەخەبەری بهێنەوە هەلسەوە لە خەوە بێ ئاگایە ، ئەو کۆت زنجیرەی کە شەیتانی مرۆڤ و شەیتانی جن خستوویەتە دەست پێ و گەردەنیتەوە ، بە شمشێر شەق شەقی بکە و بی پسێنە ..؟!

## ئایەتی (٦٤)

قال تعالى: ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ۝٦٤﴾ [البَقَرَةِ : ٦٤] واتە : [ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ ] لە دوای ئەم هەموو موعجیزە یەك لە دوای یەکانە دیسان پشتیان هەڵکرد لەو عەهدو بەڵێن و پەیمانەی کە دایان [ فَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَكُنْتُمْ مِنَ الْخَاسِرِينَ ] کە ئەگەر فەزڵ و ڕەحمەتی خوای گەورە نەبوایەو خوای گەورە بەڕەحمی خۆی ڕەحمی لێتان نەکردایە ئەوە ئێوە لە زەرەرمەندان ئەبوون..؟!

بەلێ روو وەر چەرخاندنی نەوەی جوولەکە لە ڕێبازی (خوای گەورە) دوای ئیمان هێنان و بەلێن وەرگرتن لێیان ، دوای بەرز کردنەوەی کێوی (طور) بەسەریانەوە بەلگەی دورستە لە سەر ئینکاری یان عینادییان ، وە جێگیر نەبوونی ئیمان و باوەر لە دلی جوولەکە دا ، هەر وەك بە بەلگەی ئەم ووتەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ [البَقَرَةِ : ٦٤] واتە: لە دوای ئەم هەموو بەلگە و موعجیزە زۆرەی یەك لەدوای یەك بۆیان دادەبەزی ، دووبارە پشتیان هەلکر لەو بەلێن و پەیمانەی کە دایان ..؟! بەلام لەدوای دا بەزەیی و یارمەتی و فەزلی (خوای گەورە ) بۆ نەوەی جوولەکە ، ئەوە بوو کە (خوای گەورە) لێیان خۆش بوو دوای بەلێن و پەیمان شکاندنیان وە روو وەرچەرخاندن ، هەروەك (خوای گەوە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ۝٦٤﴾ [البَقَرَةِ : ٦٤] واتە : ئەگەر فەزل و رەحمەتی (خوای گەورە) نەبوایە (خوای گەورە ) بەرەحمی خۆی رەحمی لێتان نەکردایە ئەوە ئێوە لە خەسارەت مەندان یان لە زەرەمەندان و مایە پووچان ئە بوون ..؟!

له (عبدالله بن عباس ) — خوا لێ رازی بێت — له سه‌ر ئه‌م ووته‌یه که (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى:

﴿لَكُنتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٦٤﴾ واته : زه‌ره‌مه‌ند یان مایه پووچی دونیا رۆژی دوایی ده‌بن ..؟!.[1]

## (الرحمه ) به‌زه‌یی

### ١-پێناسه‌ی (الرحمه ) له‌رووی زمانه‌وانیه‌وه :

ده‌رباره‌ی ماده‌ی (ر ، م ، ح ) په‌یوه‌ندی به ناسكی و نه‌رم و نایني و سۆزو میهره‌بانی یه‌وه هه‌یه .

(ابن فارس ) — ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت — ده‌لێت : (الراء ، والحاء ، والميم ) له بنچینه‌دا یه‌ك سه‌رچاوه‌یه ، ئاماژه‌یه بۆ نه‌رم و نیانی یان ناسكی و سۆزو میهره‌بانی و به‌زه‌یه‌وه ، وه كو ده‌لێن : (رحمه يرحمة إذا رق له وتعطف عليه والرحم والمرحمة والرحمة بمعنى ) .[2]

(ابن منظور ) — ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت — ده‌لێت : به‌زه‌یی ، نه‌رم و نیانی و ناسكی سۆزو میهره‌بانیه ، واته: به‌زه‌یی له نه‌وه‌ی ئاده‌م دا ،میهره‌بانی وناسكی و سۆزو به‌زه‌یی دڵه ..؟! .[3]

### ٢-پێناسه‌ی (الرحمه) له‌رووی شه‌رعیه‌وه :

(الراغب الاصفهان ) — ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت — ده‌لێت : به‌زه‌یی و نه‌رم ونیانیه كه پێویستی به ئه‌حسان یان میهره‌بانی هه‌یه بۆ مردووه‌كه ، وه هه‌ندێك جار ته‌نها له ناسكی و نه‌رم ونیانی به كارده‌هێنرێت یان پوخت ده‌كرێ

[1]-اخرجه ابن ابي حاتم (١٣٢/١).
[2]-ابن فارس في مقاييس اللغة (٣٩٨/٣).
[3]-ابن منظور في لسان العرب (٢٣١/١٢).

،وەهەندێك جار بە ئەحسان بەكاردەهێنرێت و پوخت دەكرێ ، لە نەرم ونیانی وەكو دەلێن : (خوای گەورە ) رەحم بە فلان كەس بكات ..؟! .[1]

(الكوفي ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : بەزەیی حالە تێكی سوزداریە یان ویجدانیە ، زۆر جار نمایش دەكرێ ،بۆ ئەوانەی كە دلیان ناسكەی یان نەرم ونیانە ، وەبنەمایەكە بۆ سوزداری نەفسی وە دەست پێ دەكات بە میهرەبانی و چاكەو ئەحسان ..؟! .[2]

دەلێن : (الرحمە ) یان بەزەیی هۆكارێكە لە نێوان (خوای گەورە ) و بەندەكانی دا ، وە پێغەمبەرانی – علیە السلام – بۆ رەوانە كردوون ،وە لەگەلیدا كتێبەكانی بۆ دابەزاندوون ، وە رێنموویی كردوون ، وە نیشتەجێ كردوون لە مالی پاداشت دانەوە ،وە خۆش گوزەرانی و رزق رۆزی زۆری بۆ دابین كردوون ، هەر لەم رێگەیەوە نیعمەتەكانی خۆی بە سەر دا باراندن ..؟! .[3]

(الرحمە) لە بەكارهێنانی قورئانی پیرۆز لە سەر چەند باسێك یان بابەتێك هاتووە ئەمانەن :

یەكەم : باسی ئیسلام و ئیمان :

(خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦ﴾ [الإنسَان : ٣١] واتە: ویستی لێ بێ هەر كەسێك ئەخاتە ناو ڕەحمەتی خۆی، یان ناو بەهەشتی خۆی ئەوەی كە شایەنی بێت و هەوڵی بۆ بدات..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةً مِّنۡ عِندِهِۦ﴾ [هُود : ٢٨]واتە: و لەلایەن خۆیەوە ڕەحمەتێكی پێ بەخشیوم كە پێغەمبەرایەتیە..؟!

دووەم : باسی بەهەشت :

(خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١٠٧﴾ [آل عِمۡرَان : ١٠٧]واتە: [ وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ ] بەڵام ئەو كەسانەی كە رووویان سپی ئەبێ لە ڕۆژی قیامەت [ فَفِي رَحْمَةِ اللَّهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ] ئەوانە لەناو ڕەحم و سۆزو بەزەیی و میهرەبانی خوای گەورەدان لە بەهەشتدان وە بە نەمری و هەمیشەیی تیایدا ئەمێننەوە ..؟!

[1] -الراغب الاصفهاني المفردات ص ١٩١.
[2] -الكليات ص ٤٧١.
[3] -ابن القيم في مدارج السالكين (٣٥/١).

**سێ یه‌م : باسی باران :**

**(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت :** قال تعالی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُرۡسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَىۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابًا ثِقَالًا سُقۡنَـٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ۝٥٧﴾ [الأَعْرَاف : ٥٧]واته: [ وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ] وه خوای گه‌وره ئه‌و خوایه‌یه كه با ئه‌نێرێت وه‌كو مژده‌یه‌ك كه بارانی پێیه [ حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا ] وه تا ئه‌و بایه ئه‌و هه‌ورانه هه‌ڵئه‌گرێ كه قورس و پڕ له بارانن [ سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَيِّتٍ ] ئه‌و هه‌ورانه ئه‌نێرین بۆ زه‌ویه‌كی وشك و مردوو كه ڕووه‌كی تیا نیه [ فَأَنْزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ ] وه به‌هۆی ئه‌و هه‌ورانه‌وه باران دائه‌به‌زێنینه سه‌ر ئه‌و زه‌ویه وشكه [ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ ] وه به‌هۆی ئه‌و بارانه‌وه له هه‌موو به‌روبومێك ئه‌ڕوێنین له‌سه‌ر ئه‌و زه‌ویه كه پێشتر وشك و مرد بوو [ كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَى ] چۆن ئه‌و زه‌ویه مردووه‌مان ژیانده‌وه‌و زیندوو كرده‌وه به‌م شێوازه‌ش مرۆڤه مردووه‌كان زیندوو ئه‌كه‌ینه‌وه [ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ] به‌ڵكو ئێوه بیر بكه‌نه‌وه..؟

**چواره‌م : باسی پێغه‌مبه‌ران – علیه السلام – :**

**(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت :** قال تعالی: ﴿أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ ۝٩﴾ [ص : ٩] واته: یاخود ئایا كلیلی خه‌زێنه‌كانی ڕه‌حمه‌تی په‌روه‌ردگار كه زۆر به‌عیززه‌ت و به‌خشه‌ره له‌لای ئه‌وانه تا ئه‌وان پێغه‌مبه‌رایه‌تی به هه‌ر كه‌سێك ببه‌خشن كه خۆیان ویستیان لێ بێت..؟!

**پێنجه‌م : باسی قورئانی پیرۆز :**

**(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت :** قال تعالی: ﴿قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٌ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ۝٥٨﴾ [يونُس : ٥٨] واته : [ قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا ] ئه‌ی محمد - صلی الله علیه وسلم - پێیان بڵێ: با دڵخۆش بن به‌فه‌زڵ و چاكه‌و ڕه‌حمه‌تی خوای گه‌وره، به ئیسلام و قورئان و سونه‌ت كه هیدایه‌تی داون بۆی با به‌م شته دڵی خۆیان خۆش بكه‌ن نه‌ك به شته دونیاییه‌كان [ هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ ] ئه‌م فه‌زڵ و ڕه‌حمه‌ته‌ی خوای گه‌وره كه به‌هه‌ر كه‌سێكی ببه‌خشێ ئه‌مه باشتره له شته دونیاییه‌كان كه كۆی ئه‌كه‌نه‌وه‌و دڵیان پێی خۆشه چونكه ده‌ڕوات و نامێنێت..؟!

**شه‌شه‌م : باسی ڕزق و ڕۆزی :**

**(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت :** قال تعالی: ﴿قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَـٰنُ قَتُورًا ۝١٠٠﴾ [الإِسْرَاء : ١٠٠] واته: ئه‌ی محمد - صلی الله علیه وسلم - پێیان بڵێ: ئه‌گه‌ر خه‌زێنه‌كانی ڕه‌حمه‌تی خوای گه‌وره له ڕزق و ڕۆزی به‌ده‌ست ئێوه بوایه ئه‌وه ئێوه نه‌تانئه‌به‌خشی و ڕه‌زیلیتان ئه‌كرد [ خَشْيَةَ الْإِنْفَاقِ ] له ترسی ئه‌وه‌ی كه ته‌واو بێت [ وَكَانَ الْإِنْسَانُ قَتُورًا ] وه به‌ڕاستی مرۆڤ زۆر ڕه‌زیل و چروكه..؟!

**حه‌وته‌م : باسی سه‌ركه‌وتن و فتح كردن :**

**(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویّت :** قال تعالى: ﴿قُلۡ مَن ذَا ٱلَّذِي يَعۡصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَ بِكُمۡ سُوٓءًا أَوۡ أَرَادَ بِكُمۡ رَحۡمَةً﴾ [الْأَحْزَاب : ١٧]واته: ئه‌ی محمد - صلی الله علیه وسلم - پێیان بڵێ: كێ هه‌یه بتانپارێزێ له خوای گه‌وره ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره بیه‌وێ تووشی خراپه‌یه‌كتان بكات و له‌ناوتان ببات، یاخود ڕه‌حمه‌تی خۆی برژێنێ به‌سه‌رتاندا كێ هه‌یه بیگه ڕێنێته‌وه..؟!

**هه‌شته‌م : باسی رزگار بوون له ده‌رو به‌لاو نه‌خۆشی :**

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویّت :** قال تعالى: ﴿قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ هَلۡ هُنَّ مُمۡسِكَٰتُ رَحۡمَتِهِۦۚ قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ٣٨﴾ [الزُّمَر : ٣٨] واته: [ قُلْ أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ ] ئه‌ی محمد -صلی الله علیه وسلم - پێیان بڵێ: هه‌واڵم پێ بده‌ن ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره بیه‌وێ من تووشی زیانێك بكات ئایا ئه‌و خوایانه‌ی كه ئێوه جگه له خوای گه‌وره ده‌یانپه‌رستن ئه‌توانن ئه‌و زه‌ره‌رو زیانه له‌سه‌ر من لابده‌ن؟ بێگومان نه‌خێر [ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِ ] یاخود ئایا ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره بیه‌وێ من تووشی ڕه‌حمه‌ت و نیعمه‌ت و خۆشیه‌ك بكات ئایا ئه‌وان ئه‌توانن بیگرنه‌وه‌و بیگێڕنه‌وه؟ بێگومان نه‌خێر [ قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ ] ئه‌ی محمد -صلی الله علیه وسلم - بڵێ: من له هه‌موو كاروبارێكمدا ته‌نها خوای گه‌وره‌م به‌سه [ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ الْمُتَوَكِّلُونَ ] پشتبه‌ستوان ته‌نها پشت به خوای گه‌وره ئه‌به‌ستن و هه‌موو كاروباریان ته‌نها به خوای گه‌وره ده‌سپێرن..؟!

**نۆیه‌م : باسی خۆشه‌ویستی و سۆز و به‌زه‌یی :**

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویّت :** قال تعالى: ﴿وَجَعَلۡنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأۡفَةً وَرَحۡمَةً﴾ [الحَدِيد : ٢٧] واته: وه ترسی خۆمان و ڕه‌حم و سۆزو به‌زه‌یی و میهره‌بانیمان خستۆته دڵی ئه‌وانه‌ی كه شوێنی كه‌وتوونه..؟!

**ده‌یه‌م : باسی توفیق یان سه‌ركه‌وتن :**

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٣﴾ [النِّسَاء : ٨٣]واته: وه ئه‌گه‌ر فه‌زڵ و ڕه‌حمه‌تی خوای گه‌وره نه‌بوایه له‌سه‌ر ئێوه ئه‌ی موسڵمانان ئه‌وه ئێوه شوێن شه‌یتان ئه‌كه‌وتن ته‌نها كه‌مێكتان نه‌بێ..؟!

**یانزه‌م : باسی (العصمه ) پاراستن له هه‌بوون :**

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٣﴾ [يُوسُف : ٥٣]واته : وه من نه‌فسی خۆم پاك ناكه‌مه‌وه چونكه نه‌فسی هه‌موو كه‌سێك فه‌رمانی پێ ده‌كات به خراپه‌و نه‌فس زۆر فه‌رمانكاره به خراپه [ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي ] ته‌نها ئه‌وه‌ی كه خوای گه‌وره ڕه‌حمی پێ بكات له‌و نه‌فسانه وه‌كو نه‌فسی پێغه‌مبه‌ران [ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ ] به‌ڕاستی په‌روه‌ردگارم زۆر لێخۆشبوو به‌به‌زه‌ییه..؟!

**تێبینی /ووشه‌ی (رحم ) له قورئانی پیرۆزدا (٣٣٩) جار هاتووه له شوێنی جیاجیادا ..؟!**

## هۆكاره‌كانی نائومێدی و بێ هیوایی له ڕه‌حمه‌تی (خوای گه‌وره ) دا

**یه‌كه‌م : نه‌زانی له فه‌راوانی ڕه‌حمه‌تی (خوای گه‌وره ) :**

**به‌لیٰ بیٰ گومان هه‌ر كه‌سێك (خوای گه‌وره ) ڕێنموویی و زانستێكی گه‌وره‌یی پڕ له به‌ره‌كه‌تی پیٰ به‌خشی بێت ، ئه‌وا به دلنیاییه‌وه هیچ ڕێگه‌یه‌ك نیه بۆ ئه‌وه‌ی بیٰ ئومێد بێت و یان بیٰ هیواو بێت له ڕه‌حمه‌تی فه‌ره‌وانی (خوای گه‌وره) ، چونكه زۆر شت ده‌رباره‌ی فه‌ره‌وانی ڕه‌حمه‌تی (خوای گه‌وره ) ده‌زانێت ، وه زۆر چاك ده‌زانێت هۆكارو شێواز و ئامرازه‌كانی ڕه‌حمه‌تی (خوای گه‌وره ) چیه و چۆنه ..؟! وه چۆن فه‌راهه‌م ده‌بێت ، بۆیه هه‌رگیز بیٰ ئومێد نابێت له ڕه‌حمه‌ت و به‌ركه‌ت به‌خشینه‌كانی (خوای گه‌وره ) ..؟! هه‌روه‌كو پێغه‌مبه‌ر (ابراهيم ) – عليه السلام ) كه فریشته‌كانی موژده‌ی منداليان پیٰ به‌خشی ، هه‌ر چه‌نده كه به ته‌مه‌ن زۆر گه‌وره بوو ، هه‌روه‌ها باردودۆخی هاوسه‌ره‌كه‌ی ناجێگیر بوو ، ئه‌مه‌ش ئه‌گه‌ری مندال بوونی لاواز بوو ، به‌لام ئه‌وان بیٰ ئومێدو هیواو براو نه‌بوون له ڕه‌حمه‌تی فه‌ره‌وانی (خوای گه‌وره ) ، هه‌روه‌ك ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى:** ﴿وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ٥١ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَقَالُواْ سَلَٰمٗا قَالَ إِنَّا مِنكُمۡ وَجِلُونَ ٥٢ قَالُواْ لَا تَوۡجَلۡ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ ٥٣ قَالَ أَبَشَّرۡتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلۡكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ٥٤ قَالُواْ بَشَّرۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡقَٰنِطِينَ ٥٥ قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ٥٦﴾ [الحِجۡر : ٥١ - ٥٦] واته : {میوانه‌كانی ئیبراهیم پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم -} [ وَنَبِّئْهُمْ عَنْ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ] وه هه‌واڵیان پێ بده سه‌باره‌ت به میوانه‌كانی ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - كاتێك كه فریشته‌كان هاتن

بۆ لای لەسەر شێوەی مرۆڤدا..؟! [ إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا ] کاتێك هاتنە ژوورەوە بۆ لای سەلامیان لە ئیبراهیم کرد - صلى الله عليه وسلم - [ قَالَ إِنَّا مِنْكُمْ وَجِلُونَ ] ئیبراهیم - صلى الله عليه وسلم - دوای ئەوەی کە گوێلکێکی بۆ سوور کردنەوەو بۆی هێنان نەیانخوارد، پێی فەرموون: کە ناخۆن من لێتان ئەترسێم نەك نیازی خراپتان هەبێ، وەکو لە سوورەتی (هود) باسمان کرد..؟! [ قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ (٥٣) ] وتیان: مەترسێ ئێمە موژدەت پێ ئەدەین بە منداڵێکی زۆر زانا کە ئیسحاق بووە..؟! [ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَى أَنْ مَسَّنِيَ الْكِبَرُ ] ئیبراهیمیش - صلى الله عليه وسلم - ئەفەرمووێ: ئایا ئێوە موژدە بە من ئەدەن لە کاتێکدا کە من پیاوێکی پیرو بەتەمەنم و چوومەتە ناو ساڵەوە، کە وتراوە خۆی تەمەنی (١٢٠ ساڵ) و خێزانی تەمەنی (٩٠ ساڵ) بووە [ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ] موژدەی چیم پێ ئەدەن؟ پێی سەیر بوو..؟! [ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ ] وتیان: ئەو موژدەیەی ئێمە پێت ئەدەین یەقینەو حەقە [ فَلَا تَكُنْ مِنَ الْقَانِطِينَ] تۆ لەو کەسانە مەبە کە بێ ئومێد بوونە..؟! [ قَالَ وَمَنْ يَقْنَطُ مِنْ رَحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ ] ئیبراهیمیش - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: کێ هەیە بێ ئومێد بێ لە ڕەحمەتی خوای گەورە مەگەر کەسانێکی گومڕا، من بێ ئومێد نیم و بە دووری نازانم کە لەم تەمەنەدا مناڵم ببێ چونکە دەزانم تواناو ڕەحمەتی خوای گەورە چەند فراوانە..؟!

**دووەم : بەندە لە ئەنجاندانی تاوانەکان و زیادەڕەوی کردن لە تاوان زیادەڕەوی لە نەفسی خۆی دەکات :**

**بەلێ بەندە پێ داگری لەسەر دەکات و بریاریداوە بەردەوام بێت لە سەرپێچی کردن یان تاوانکاری ، هەر بۆیە ئومێدو تەماحی خۆی بۆ رەحمەتی (خوای گەورە ) دەپچرێنێ ، چونکە لەسەر ئەم هۆکارە دامەزراوە کە رێگر بێت لە رەحمەت بەزەیی و میهرەبانی (خوای گەورە ) ، هەروەکو بۆ بێ ئومێد بوون لە رەحمەت میهرەبانی و لێ خۆش بوونی گوناهو تاوانەکان ، (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿۞ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥٣﴾ [الزُّمَر : ٥٣]واتە: بێئومێد نەبوون لە ڕەحمەتی خوا [ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ ] (ئیبنو عەبباس) دەفەرمێت: کەسانێك لە هاوبەشبڕیاردەران خەڵکیان کوشتبوو بە زۆری، وە زینایان کردبوو بە زۆری، هاتنە لای پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم - وتیان ئەی محمد -صلى الله عليه وسلم - ئەوەی تۆ دەیڵێیت و بانگەوازی بۆ دەکەیت شتێکی چاکە بەڵام پێمان بڵێ: ئایا ئەو تاوانانەی کە پێشتر کردوومانە دەسڕێتەوەو خوا لێمان خۆش دەبێت؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: ئەی محمد -صلى الله عليه وسلم - بەو بەندانەم بڵێ کە ئیسراف و زیادڕەویان کردووە لە تاوان و سەرپێچیدا: بێئومێد نەبن لە ڕەحمەتی خوا [ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ] بەدڵنیایی خوای گەورە لە هەموو تاوانێك خۆش ئەبێ تەنها شەریك دانان نەبێت بۆی ئیتر لە هەموو تاوانێکی تر خۆش ئەبێت، (ئەمە ئومێدبەخشترین ئایەتە لە کتابی خوای گەورە، وە صەحابە زۆر دڵیان پێی خۆش بووە)، وە (ئەم ئایەتە بانگکردنی سەرجەم کافران و تاوانبارانە بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، وە ئەوەی تەوبە بکات چەندێك تاوانی زۆر بێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، وەکو ئەو کەسەی کە سەد کەسی کوشت و تەوبەی کردو

خوای گه‌وره لێی خۆش بوو)، (ابن عباس) ده‌فه‌رمێت: (هه‌رکه‌سێك له‌ پاش ئه‌م ئایه‌ته‌ خه‌ڵکی بێئومێد بکات له‌ ته‌وبه‌ ئه‌وا باوه‌ڕی به‌ قورئانی پیرۆز نیه) [ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ] وه‌ به‌ دڵنیایی خوای گه‌وره‌ زۆر لێخۆشبوو به‌ڕه‌حم و به‌زه‌ییه‌..؟!

**سێ یه‌م : نه‌بوونی ئارام گرتن یان خۆگری له‌ کاتی هه‌بوونی به‌لاو ناخۆی ، وه‌ یان نه‌بوونی سوپاسگوزرای شکر له‌ کاتی به‌خشی نیعمه‌تێکی (خوای گه‌وره‌ ) :**

**به‌لێ بێگومان ئارام گرتن یان خۆگری هه‌ر هه‌مووی خێری تێدایه‌ ، ئه‌مه‌ش یه‌کێکه‌ له‌ سیفه‌ته‌کانی ئیماندار ، هه‌روه‌کو (خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویت :** قال تعالى: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ۝٩ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ۝١٠ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ۝١١﴾ [هود : ٩ - ١١] واته : [ وَلَئِنْ أَذَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ ] وه‌ ئه‌گه‌ر ئێمه‌ ڕه‌حمه‌ت و نازو نیعمه‌تێك به‌ مرۆڤ ببه‌خشین و دواتر لێی بسه‌نینه‌وه‌ [ إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ ] به‌ دڵنیایی مرۆڤ زۆر بێ ئومێده‌ له‌ ڕه‌حمه‌تی خوای گه‌وره‌ وه‌ زۆر کوفرانه‌بژێری خوای گه‌وره‌ ده‌کات و نیعمه‌ته‌کانی پێشتر له‌بیر ده‌کات..؟! [ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاءَ بَعْدَ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ ] وه‌ ئه‌گه‌ر بێتوو له‌ دوای ناخۆشی و ژیانی ته‌نگ و ته‌سك و نه‌خۆشی و فه‌قیری و هه‌ژاری نیعمه‌تی خۆمانی پێ ببه‌خشین و دواتر له‌شی ساغ بکه‌ین و ڕزق و ڕۆزی زۆری پێ ببه‌خشین [ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي ] به‌ دڵنیایی ئه‌ڵێ: ئه‌وه‌ هه‌رچی خراپه‌و به‌ڵاو موسیبه‌ت و ناخۆشی هه‌بوو ڕۆیشت و له‌سه‌رم لاچوو به‌بێ ئه‌وه‌ی شوکری خوای گه‌وره‌ بکات [ إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ] وه‌ زۆر خۆشحاڵه‌ و فه‌خرو شانازی به‌سه‌ر خه‌ڵکیدا ئه‌کات به‌بێ ئه‌وه‌ی شوکرانه‌بژێری خوای گه‌وره‌ی له‌سه‌ر بکات..؟! [ إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ] ته‌نها که‌سانێك نه‌بێت که‌ ئارامگرن له‌ هه‌ردوو حاڵه‌ته‌که‌داو شوکری خوای گه‌وره‌ ئه‌که‌ن وه‌ کرده‌وه‌ی چاك ئه‌که‌ن [ أُولَئِكَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ] ئا ئه‌مانه‌ لێخۆشبوونی خوای گه‌وره‌ بۆ تاوانه‌کانیان هه‌یه‌، وه‌ ئه‌جرو پاداشتێکی زۆر گه‌وره‌یان بۆ هه‌یه‌..؟!

## ( الخسران ) زەرەرمەند یان مایە پووچ

### پێناسەی ( الخسران )

١-پیناسەی (الخسران ) لەرووی زمانەوانیەوە :

ووتەی (الخسران ) صیغە مبالغەیە بە ووتەی (خسر ) واتە : زیان مەند یان زەرەرمەند یان مایە پووچ ، لەم سێ پیتە پێك دێت : (الخاء ، السین ، والراء ) لە بنچینەدا یەك سەرچاوەیە ، ئاماژەیە بۆ کەم و کوری یان زیان گەیاندن ، هەروەکو (الخسر والخسران ) یان (کالکفر والکفران ) یان (الفرق والفرقان ) وە دەلێن : تەرازووەکەی لە دەستدا یان مایە پووچ بوو ، واتە : کەمی کردۆتەوە ..؟![1]

ووتراوە : زەرەر و مایە پووچی لە سەرمایەکەی کەم دەکات ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤەکان ، وە دەلێن : زیان مەندبوو فلان کەس یان مایە پووچ بوو فلان کەس ، لە سەر ئەم کارەی کردی ، یان ئەم بازرگانەیە مایە پووچ بوو یان زەرەرمەند بوو ..؟! .[2]

---

[1]-ابن فارس في مقاييس اللغة (١٨٢/٢).
[2]-انظر : التوفيق على مهمات التعاريف / المناوي ص ٣١٢.



٢-پێناسه‌ی (الخسران ) له‌رووی شه‌رعیه‌وه :

له (الشنقيطي ) – ره‌حمه‌تی خوا لێ بێت – ده‌ڵێت : (الخسران ) له‌رووی پێناسه‌ی شه‌رعیه‌وه : ئه‌وه گه‌مژه‌یی یان فیڵ و ناداد په‌وه‌ریه‌ی مرۆڤه له به‌دبه‌ختی خۆیه‌وه له به‌رانبه‌ر په‌روه‌ردگای به‌رزو به‌لنده‌وه ، چونکه گه‌مژه‌یی و به‌د به‌ختی له به‌رانبه‌ر په‌روه‌ردگار ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نی که زه‌ره‌مه‌ندو یان مایه پووچ بوونێکی گه‌وره و یه‌کجار روون وئاشکرایه ..؟! [١].

که‌واته‌ووشه‌ی (الخسران ) بریتیه له گومرایی و له ده‌ستدانی سه‌روه‌ت و سامان مال خاو خێزان له دونیا و له دوا رۆژدا ، وه ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌ی مرۆڤ ده‌که‌وێته نێو گومرایه‌کی گه‌وره‌و له سه‌ر رێ لادان و ناره‌حه‌تی هیلاکه‌ت ، ئه‌وه‌یه ده‌بێته له ده‌ستدانی یان مایه پووچ بوونی مال سامان خێزان و کاره‌که‌شی ، هه‌روه‌ها له‌ده‌ست دانی ئه‌جرو پاداشته‌که‌ی له دونیا و له دوارۆژ دا ، ئه‌مه‌ش به هۆی گومرایی و له رێ لادان و له سنوور ده‌رچوون له ئایینی (خوای گه‌وره ) ، که قورئانی پیرۆز و سوونه‌ته‌کانی پیغه‌مبه‌ری خوایه ﷺ ، هه‌ر به‌نده‌یه‌ك له سه‌ر رێچکه‌ی قورئان و سوونه‌ت نه‌روات ئه‌وا له دونیا و له دوارۆژ دا به دلنیایه‌وه مایه پووچ و زه‌ره‌رمه‌ند ده‌بێت..؟!

## بابه‌تی (الخسران ) له قورئانی پیرۆز به پێنج شێوه هاتووه :

١-(النقص ) واته: که‌م کردن :

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموێت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ۝٣﴾ [المُطَفِّفِين : ٣]واته : به‌ڵام کاتێك که شت به خه‌ڵکی بفرۆشن که‌میان پێ ئه‌ده‌ن و فێڵیان لێ ئه‌که‌ن، قه‌ومی (شوعه‌یب)یش له پاش شه‌ریك دانان بۆ خوای گه‌وره ئه‌م سیفه‌ته خراپه‌یان تیابوو له کێشانه‌و پێوانه‌و کڕین و فرۆشتندا فێڵیان له خه‌ڵکی ئه‌کرد خوای گه‌وره له‌ناوی بردن..؟!

٢-(الغبن) واته: نادادپه‌روه‌ی یان فروفێل یان گه‌مژه‌یی:

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموێت: قال تعالى: ﴿فَٱعْبُدُواْ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ۝١٥﴾ [الزُّمَر : ١٥] واته : [ فَاعْبُدُوا مَا شِئْتُمْ مِنْ دُونِهِ ] ئێوه‌ش جگه له خوای گه‌وره هه‌ر شتێك ئه‌په‌رستن بیپه‌رستن، ئه‌مه هه‌ڕه‌شه‌و سه‌رزه‌نشت کردنه [ قُلْ إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ] وه پێیان بڵێ: زه‌ره‌رمه‌ندی ڕاسته‌قینه ئه‌و که‌سانه‌ن که خۆیان و که‌سوکاریان

[١]- العذب المنير من مجالس القنشيطي في التفسير (٣/٨٥).

دۆڕاندووه له ڕۆژی قیامه‌تدا کاتێك که ئه‌خرێنه ئاگری دۆزه‌خه‌وه‌و لێك جیا ده‌کرێنه‌وه‌و له سزادا ده‌بن [ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ ] وه بزانن زه‌ره‌رمه‌ندی ئاشکراو ڕوون ئه‌مه‌یه که مرۆڤ خۆی و که‌سوکاری بدۆڕێنێ و بچێته ناو ئاگری دۆزه‌خه‌وه..؟!

**٣-(العجز) واته: لاوازی یان بێ ده‌سه‌لاتی یان بێ توانایی له‌وه‌ی ده‌یه‌وێت :**

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت** : قال تعالى: ﴿قَالُوا۟ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَـٰسِرُونَ ۝١٤﴾ [يُوسُف : ١٤]واته: وتیان: ئه‌گه‌ر بێتوو گورگ بیخوات و ئێمه‌ش کۆمه‌ڵێك که‌سین [ إِنَّا إِذًا لَخَاسِرُونَ (١٤) ] که‌واته ئێمه که‌سانێکی زه‌ره‌رمه‌ندو بێ سوودو بێده‌سه‌ڵاتین..؟!

**٤-(الضلال) واته : گومرایی یان سه‌رگه‌ردانی یان له لادان له ڕێگای ڕاست و دروست :**

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت** : قال تعالى: ﴿وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَـٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا﴾ [النِّسَاء : ١١٩] واته: وه هه‌ر که‌سێك شه‌یتان بکات به دۆستی خۆی له غه‌یری خوای گه‌وره شوێن شه‌یتان بکه‌وێ و گوێڕایه‌ڵی شه یتان بکات به‌ڕاستی ئه‌مه خه‌ساره‌تمه‌ندو زه‌ره‌رمه‌ندی دونیاو دوارۆژ بووه زه‌ره‌رمه‌ندێکی زۆر ئاشکرا..؟!

**٥-(العقوبة) واته : سزادان :**

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت** : قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ۝٦٥﴾ [الزُّمَر : ٦٥] واته: {هاوه‌ڵ بڕیاردان بۆ خوا کردووه به‌تاڵ ده‌کاته‌وه} [ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ] وه به دڵنیایی ئه‌ی محمد -صلى الله عليه وسلم - وه‌حیمان بۆ تۆ و بۆ پێغه‌مبه‌رانی پێش تۆیش ناردووه ئه‌گه‌ر شه‌ریك بۆ خوای گه‌وره بڕیار بده‌ی ئه‌وه کرده‌وه‌کانت هه‌مووی به‌تاڵ ئه‌بێته‌وه وه له زه‌ره‌رمه‌ندان ده‌بیت، (هه‌ر چه‌نده پێغه‌مبه‌ری خوا -صلى الله عليه وسلم - دوور بووه له شه‌ریك دانان، به‌ڵام ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا -صلى الله عليه وسلم - شه‌ریك بۆ خوا دابنێت کرده‌وه‌ی به‌تاڵ بێته‌وه ئه‌وا ئێمه له پێشترین و هه‌ڕه‌شه‌که بۆ ئێمه‌یه)..؟!

**هه‌روه‌ها ووشه‌ی (ضلال ) یان (ضياع ) ئه‌وا په‌یوه‌ندی داره به ووشه‌ی (الخسران ) چونکه ئه‌م ووشه‌یه (ضلال ) به واتای : گومرایی یان سه‌رگه‌ردن دێت ، وه ووشه‌ی (ضياع ) به واتای : له ده‌ستدان و له ده‌ست چوون یان وون بوون دێت ، هه‌ردوو کیان واته : ڕێگه وون کردنه له سه‌ر ێگای ڕاست و دروست ، ئه‌گه‌ر پێچه‌وانه‌ی ڕێگای**

راست برۆین دەبێتە (الخسران ) واتە : وون کردنی رێگای راست ، ئەمیش دەبێتە زیان و زەرەرو مایەپووچ بوون..؟!

بەلام ووشەی (الفلاح ) پێچەوانەی ووشەی (الخسران) چونکە ووشەی (فلاح ) واتە : رێگای راست و دورست و سەرکەوتن و سەرفرازی ..؟!

تێبینی / ووشەی (خ – س –ر ) واتە: (خسر ) بەم شێوەیە لە قورئانی پیرۆزدا (٦٥) جار هاتووە ..؟!

## هۆکارەکانی زەرەرمەند بوون یان مایە پووچ بوون لە رۆژی قیامەتدا

هۆکارەکانی مایە پووچ بوون لە رۆژی دوایی دا یان لە رۆژی قیامەتدا زۆرن ، بۆ ئەوەی هەر وەستەیان لەسەر بکەین و روونیان بکەینەوە ، بۆ ئەوەی لەرۆژی دوایی دا نەکەوێنە بەر توورەیی (خوای گەورە ) سزاو تۆلەسەندنەوەی (خوای گەورە ) ..؟! دەبێت خۆمانی بۆ ئامادەکەی تووشی زەرەرو زیان و مایە پووچ بوون نەبین بە هۆی گوناهو تاوانەکانمانەوە ، بۆ ئەوەی (خوی گەورە ) لێمان رازی بێت ، وە سەر کەوت و سەرفراز بین ، خۆمان بۆ بەهەشتی پان و بەرین و پر لە باغ و باغات و رووبارەکانی ئامادەبکەین ، دەبێت ووریا بین ، لە دونیادا خۆمان لە تاوان و گوناهەکان بپارێزین فەرمانەکانی (خوای گەورە ) جێ بەجێ بکەین دوور بکەینەوە لە قەدەغەکراوەکانی ، هەروەها گوێرایەلی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەین ، نەوەك لە کەسانی خەسارەمەندان یان مایە پووچان و زەرەرمەندان بین ..؟!

لە (حذیفة بن الیمان ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ((كانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ عَنِ الخَيْرِ، وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي، فَقُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، إنَّا كُنَّا في جَاهِلِيَّةٍ وَشَرٍّ، فَجَاءَنَا اللَّهُ بهذا الخَيْرِ، فَهلْ بَعْدَ هذا الخَيْرِ شَرٌّ؟ قالَ: نَعَمْ، فَقُلتُ: هلْ بَعْدَ ذلكَ الشَّرِّ مِن خَيْرٍ؟ قالَ: نَعَمْ، وَفِيهِ دَخَنٌ، قُلتُ: وَما دَخَنُهُ؟ قالَ: قَوْمٌ يَسْتَنُّونَ بغيرِ سُنَّتِي، وَيَهْدُونَ بغيرِ هَدْيِي، تَعْرِفُ منهمْ وَتُنْكِرُ، فَقُلتُ: هلْ بَعْدَ ذلكَ الخَيْرِ مِن شَرٍّ؟ قالَ: نَعَمْ، دُعَاةٌ علَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ مَن أَجَابَهُمْ إلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا، فَقُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، صِفْهُمْ لَنَا، قالَ: نَعَمْ، قَوْمٌ مِن جِلْدَتِنَا، وَيَتَكَلَّمُونَ بأَلْسِنَتِنَا، قُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، فَما تَرَى إنْ أَدْرَكَنِي ذلكَ؟ قالَ: تَلْزَمُ جَمَاعَةَ المُسْلِمِينَ وإمَامَهُمْ، فَقُلتُ: فإنْ لَمْ تَكُنْ لهمْ جَمَاعَةٌ وَلَا إمَامٌ؟ قالَ: فَاعْتَزِلْ تِلكَ الفِرَقَ كُلَّهَا، ولو أَنْ تَعَضَّ علَى أَصْلِ شَجَرَةٍ حتَّى يُدْرِكَكَ المَوْتُ وَأَنْتَ علَى ذلكَ )).[1] واتە: خەلکی لە بارەی چاکەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری

[1]-صحیح مسلم برقم (١٨٤٧).

خوا ﷺ ده‌کرد ، منیش له باره‌ی خراپه‌وه پرسیارم لێده‌کرد له ترسی ئه‌وه نه ده‌با تووشم ببێت ، ووتم : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئێمه پێشتر له نه‌فامی و خراپه دا بووین ، خوا ئه‌م چاکه‌یه‌ی بۆ هێناین ، ئایا له دوای ئه‌م چاکه‌یه خراپه هه‌یه ..؟!فه‌رمووی : به‌لێ . ئینجا عه‌رزم کرد ، ئایا دوای ئه‌م خراپه‌یه‌ش چاکه هه‌یه ..؟!فه‌رمووی : به‌لێ . هه‌یه به‌لام لێلی تێدایه، ووتم : لێل یه‌که‌ی چیه ..؟! فه‌رمووی : که‌سانێك ره‌فتارێك ده‌که‌ن به‌ده‌ر له ره‌فتارو سوننه‌تی من شوێنی رێنمایه‌ك ده‌که‌ون به‌ده‌ر له رێنمایی من ، هه‌ندێك شتیان پێ چاکه و هه‌ندێتیشیان پێ خراپه ، دووباره ووتم : ئایا له‌دوای ئه‌م چاکه‌یه خراپه هه‌یه ..؟! فه‌رمووی : به‌لێ . بانگه‌واز که‌رانێك هه‌ن له سه‌ر ده‌رگای دۆزه‌خ وه‌ستاون ، هه‌ر که‌س بچێته به‌ده‌م بانگه‌وازه‌که‌یانه‌وه فرێده‌ده‌نه ناوێ ، دووباره ووتم : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ وه‌سفیان بکه بۆمان فه‌رمووی: به‌لێ . که‌سانێکن له خۆمان و به زمانی خۆشمان قسه‌ده‌که‌ن ، ووتم : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ چ ده‌فه‌رمووی پێم بکه‌م ئه‌گه ر ئه‌مه‌م تووش هات ، فه‌رمووی : ده‌ست بگره به کۆمه‌لی موسلمانان و پێشه‌واکه‌یانه‌وه ، ئینجا ووتم : ئه‌گه‌ر نه‌کۆمه‌لیان هه‌بوو نه‌پێشه‌وا ..؟! فه‌رمووی : خۆت به دوور بگره له هه‌موو گروپه‌کان ، با به‌ته‌نها قه‌پ بکه به بن دارێکدا ، هه‌تاکو مردن یه‌خه‌ت ده‌گرێت تۆ له سه‌ر راستی ..؟!

### هۆکاره‌کانی زه‌ره‌رمه‌ند بوون یان مایه پووچ بوون له رۆژی قیامه‌تدا:

### یه‌که‌م:(الكفر بالله تعالى )واته: بێ باوه‌ر بوون به (خوای گه‌وره)

به‌لێ ژیانی مرۆڤه‌کان له دونیادا له سه‌ر بنه‌مای باوه‌ربوون به (خوای گه‌وره ) وه هه‌موو فه‌رمانه‌کان و قه‌ده‌غه‌کراوه‌کانی دا ، وه هه‌ر که‌سێك ئیمان و باوه‌ر به‌ده‌ست بهێنی به ته‌واوی ئه‌وا رزگاری ده‌بێت له رۆژی قیامه‌تدا ، هه‌روه‌ها ره‌زامه‌ندی (خوای گه‌وره ) به‌ده‌ست ده‌هێنی وه ده‌چێته به‌هه‌شته‌وه ، به‌لام ئه‌و که‌سه‌ی که بێ باوه‌ر بێت به (خوای گه‌وره ) وه ئینکاری ئیمان هێنانی بکات ،ئه‌وا تووره‌یی (خوای گه‌وره ) لێ ده‌که‌وێته‌وه‌و ، هه‌روه‌ها تووشی گومرایی و سه‌رگه‌ردان به‌رێ لادانێکی زۆر رۆیشتووه ..؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١٣٦﴾ [النِّسَاء : ١٣٦] واته : [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ] ئه‌ی باوه‌ڕداران ئیمان بێنن به خواو پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - واته: دامه‌زراو بن له‌سه‌ر ئیمانه‌که‌تان وه به‌رده‌وام بن له‌سه‌ری [ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ ] وه ئیمان بێنن به‌و کتابه‌ی که خوای گه‌وره دایبه‌زاندووه بۆ سه‌ر پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی- صلى الله عليه وسلم - که قورئانی پیرۆزه، وه ئیمان بێنن به‌هه‌موو ئه‌و کتێبه ئاسمانیانه‌ی تر که له پێش قورئاندا خوای گه‌وره دایبه‌زاندووه، بۆ قورئان ده‌فه‌رمێت: (نَزَّلَ) چونکه به‌ش به‌ش و سوره‌ت سوره‌ت دابه‌زیوه، به‌ڵام بۆ کتابه ئاسمانییه‌کانی تر ده‌فه‌رمێت: (أَنْزَلَ) چونکه هه‌مووی به یه‌کجار دابه‌زیووه‌و هاتۆته خواره‌وه [ وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ] به‌ڵام هه‌ر که‌سێك کوفر بکات به خوای گه‌وره‌و

مه‌لائیكه‌ته‌كانی و كتێبه ئاسمانیه‌كانی و پێغه‌مبه‌رانی و ڕۆژی دوایی ئه‌وه گومڕاو وێڵ بووه‌و له‌ ڕێگای ڕاست لایداوه گومڕابوونێكی زۆر دوور..؟! هه‌روه‌ها (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ۖ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾﴾ [العَنكبُوت : ٥٢] واته : [ قُلْ كَفَى بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - بڵێ: به‌سه خوای گه‌وره له‌ نێوان من و ئێوه‌دا شایه‌ت بێ به‌سه‌رمانه‌وه [ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ] هه‌رچی له‌ ئاسمانه‌كان و زه‌وی ڕوویدات خوای گه‌وره زانیاری به‌هه‌مووی هه‌یه‌و هیچ شتێكی لێ ناشاردرێته‌وه [ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ ] وه‌ ئه‌و كه‌سانه‌یش كه‌ باوه‌ڕیان به‌ شتی پووچه‌ڵ هێناوه جگه له‌ خوای گه‌وره ئه‌په‌رستن [ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ ] وه‌ كوفریان به‌ خوای گه‌وره كردووه [ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ] ئا ئه‌و كه‌سانه خۆیان زه‌ره‌رمه‌ندی ڕاسته‌قینه‌ن له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا..؟!

**چ مایه پووچ بوونێك هه‌یه به قه‌د مایه پووچ بوونی یان زه‌ره‌رمه‌ند بوونی ئیمان و باوه‌ره ..؟! چونكه گه‌وره‌ترین به‌لاو نصیبه‌ته له سه‌ر خه‌لكی له بوونه‌دا ، چونكه بێ باوه‌ری و هاوبه‌شی په‌یداكردن له گوناهه هه‌ر گه‌وره كانه ، بۆیه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئێمه‌ی موسلمانانی لێ ئاگادار كردینه‌وه كه گوناهو تاوانێكی یه‌كجار گه‌وره‌یه ..؟!**

**له (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌گێرێته‌وه ده‌ڵێت :ده‌رباره‌ی تاوانه گه‌وره كان ، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : ((في الكبائرِ، قال: الشِّرْكُ باللَّهِ، وعقوقُ الوالدينِ، وقتلُ النَّفسِ، وقولُ الزُّورِ)) .[١] واته: گوناهو تاوانه هه‌ره گه‌وره‌كان ئه‌مانه‌ن : هاوه‌ل بریاردان بۆ (خوای تاك و ته‌نها ، ئازاردان و دل ره‌نجاندنی دایك وباوك ، كوشتنی كه‌سێ به ناحه‌ق و ناره‌وا ، ووته‌ی درۆ شایه‌تی ناحه‌ق و ناره‌وا ..؟!**

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت :** قال تعالى: ﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا۟ يَٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾﴾ [الأنعَام : ٣١] واته : [ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ] ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ گه‌یشتنیان به‌ خوای گه‌وره به‌درۆ ئه‌زانی و باوه‌ڕیان به‌زیندوو بوونه‌وه‌و لێپرسینه‌وه نه‌بوو ئه‌وانه‌ به‌ دڵنیایی دۆڕاون [ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً ] تا كاتێك كه‌ قیامه‌ت دێت له‌ ناكاودا [ قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَى مَا فَرَّطْنَا فِيهَا ] په‌شیمان ئه‌بنه‌وه‌و غه‌م و خه‌فه‌ت ئه‌خۆن و ئه‌ڵێن هاوار بۆ خۆمان كه‌ ئێمه‌ چه‌ندێك كه‌مته‌رخه‌میمان كرد له‌ دونیاداو كرده‌وه‌ی چاكمان نه‌كردو خۆمان ئاماده نه‌كرد بۆ ئه‌م ڕۆژی قیامه‌ته‌ [

[١]- سنن الترمذي برقم (٣٠١٨).




وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَى ظُهُورِهِمْ ] وە ئەوان قورسایی تاوانەکانیان هەڵگرتووە لەسەر پشتیان [ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ] بەڕاستی ئەو تاوانانە خراپترین شتە کە هەڵیانگرتووە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾﴾ [البَقَرَة : ١٢١] واتە : [ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ ] ئەوانەی کە ئێمە کتابمان پێیان بەخشیوە لێرە مەبەست پێ ئەوانەی کە موسڵمان بوونە لە جوولەکەو گاور وە لە موسڵمانان خۆیان ئەوانە بە جوانترین شێواز قورئان ئەخوێننەوەو شوێنی ئەکەون و حەڵاڵی بەحەڵاڵ دەزانن و حەرامی بەحەرام دەزانن و شوێنی موحکەمی دەکەون و ئیمان بە موتەشابیهی دێنن [ أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ ] ئەوانە ئیمانی راستەقینەیان پێی هێناوە [ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ] وە هەر کەسێکیش کوفری پێ بکات ئەوانە زەرەرمەندی حەقیقی و ڕاستەقینەن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ۚ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾﴾ [يُونُس : ٤٥] واتە : [وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَنْ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِنَ النَّهَارِ] وە لە ڕۆژی قیامەت کە خوای گەورە کۆیان ئەکاتەوە وەك ئەوە وایە کە تەنها کاتێکی کەمیان لە ژیانی دونیا بەسەر بردبێت [ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ] هەست ئەکەن ژیانی دونیا تەنها ئەوەندە بووە کە یەکترناسینێکیان تیا کردووە، یاخود لە ڕۆژی قیامەت کەسوکارو خزمان یەکتری دەناسنەوە بەڵام کەس نایپەرژێتە سەرکەس [ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ] ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە گە یشتن نەبووە بە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت ئەوانە خەسارەتمەندو زەرەرمەند بوونەو هیدایەتدراو نەبوونە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾﴾ [غَافِر : ٨٥] واتە : [ فَلَمْ يَكُ يَنْفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا ] بەڵام کاتێك کە سزای ئێمە یان بە چاوی خۆیان بینی ئەو کاتە ئیمان هێنانەکەیان سوودی پێ نەگەیاندن لەبەر ئەوەی کاتێك سزای خوای گەورە دابەزێت ئیمان هێنان سوودی نیە، یان کاتێك ڕوح بگاتە گەروو غەرغەرە ئیمان هێنان سوودی نیە، یان کاتێك کە قیامەت هەڵئەستێ ئیمان هێنان سوودی نیە [ سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ ] ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە لەناو بەندەکان و ئوممەتانی پێشتریشدا هەر وابووە [ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ] وە کافرانیش لەوێدا هەموویان زەرەرمەندو خەسارەتمەند بوون و خوای گەورە سزای دان، والله أعلم..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾﴾ [العَنكَبُوت : ٥٢] واتە : [ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ ] وە ئەو کەسانەیش کە باوەڕیان بە شتی پووچەڵ هێناوە جگە لە خوای گەورە

ئەپەرستن [ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ ] وە کوفریان بە خوای گەورە کردووە [ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ] ئا ئەو کەسانە خۆیان زەرەرمەندی ڕاستەقینەن لە ڕۆژی قیامەتدا..؟!

## دووەم :درۆکردن یان ئینکارو نەکۆڵی کردن :

بەڵێ دۆر کردن و ئینکاری کردن یان نەکۆڵی کردن ، جا چ پەیوەندی بە (خوای گەورە) وە بێت ، یان بە نیشانە ئایەتەکانی (خوای گەورە ) ، هەورەها بە پێغەمبەران –علیه السلام – ، یان بە ڕۆژی زیندووبوونەوە ، ئەم درۆ کردن و ئینکاری نەکۆڵی کردنە قێزەون ترین و قبیح ترین جۆرەکانی درۆکردنە یان نەکۆڵی کردنە ، ئەمانەش دەبنە هۆکاری سەرەکی (الخسران ) یان زەرەر مەند بوون یان مایەپووچ بوون لە دونیا و لە دوار ڕۆژ دا ، وە بۆ ڕوون کردنەوەی زیاتر ئەمانەی خوارەوەن :

١–درۆ کردن و نەکۆڵی کردن کە پەیوەندی هەیە بە (خوای گەورە ) :

بێ گومان درۆکردن و ئینکاری و نەکۆڵی کردن بە گویرایەلی نەبوونی فەرمانە کانی (خوای گەورە ) ، گەورەترین زەرەرمەندیە یان مایە پووچ بوونن کە مرۆڤەکان لە ژیانی دونیادا پێ دەگەن..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ۝١١٥ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ۝١١٦﴾ [المُؤْمِنُون : ١١٥ - ١١٦] واتە : ایا ئێوە وا حساب ئەکەن کە ئێوەمان بێهودە بۆ یاری و کات بەسەربردن دروست کردووەو ئێوە ئیهمال کراون و پاداشت و لێپرسینەوەو سزا نیەو بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوە..؟! [ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ ] خوای گەورە زۆر بەرزو بڵندترە لەوەی کارەکانی بۆ گاڵتەو کات بەسەر

بردن بێت [ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ] هیچ په‌رستراوێك به حه‌ق نیه شایه‌نی په‌رستن بێ ته‌نهازاتی پیرۆزی الله نه‌بێ كه په‌روه‌ردگاری عه‌رشی به‌رێزو جوانه..؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ۝٨ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ۝٩﴾ [الطَّلَاق : ٨ - ٩] واته : زۆرێك له خه‌ڵكی دێ و شاره‌كان ئه‌وانه‌ی سه‌ركه‌شی و سه‌رپێچی فه‌رمانی خواو پێغه‌مبه‌ری خوایان كردووه - صلى الله عليه وسلم - وه پشتیان له دینه‌كه‌ی خوای گه‌وره كردووه خوای گه‌وره له دونیادا سزای ئه‌مانه‌ی داوه سزایه‌كی زۆر سه‌خت به نه‌بوونی و وشكه‌ساڵی و برسێتی و ترس و تیاچوون و زاڵ بوونی دوژمن، وه له قیامه‌تیشدا سزایه‌كی زۆر گه‌وره‌و خراپیان ده‌دات به ئاگری دۆزه‌خ - صلى الله عليه وسلم - ..؟! [ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا ] ئه‌مانه سه‌ره‌نجامی سزای قورسی خۆیان چه‌شت به‌هۆی ئه‌و كوفرو سه‌رپێچییه‌ی كه كردیان [ وَكَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا] وه سه‌ره‌نجامی كاره‌كه‌یشیان زه‌ره‌رمه‌ندی بووه له دونیاو قیامه‌تدا خۆیان و ماڵ و منداڵ و سه‌رووه‌ت و سامانیان هه‌مووی دۆڕاندو فه‌وتاند..؟!



٢-درۆكردن یان نه‌كۆڵی كردن به ئایه‌ته‌كانی یان نیشانه‌كانی (خوای گه‌وره):

بێ گومان نه‌كۆڵی كردن یان درۆ كردن به نیشانه و ئایه‌ته‌كانی (خوای گه‌وره ) مه‌به‌ست ئه‌وه‌ی كه كلام فه‌رمووده‌ی (خوای گه‌وره ) ئه‌ویش قورئانی پیرۆزه كه گه‌وره‌ترین نیشانه‌و مموعجیزه‌كانی سه‌ر رووی زه‌مینه ، ئه‌وه‌ش له لایه‌ن (خوای گه‌وره) به وه‌حی و نیگا بۆ پێغه‌مبه‌ری خوای ﷺ كه پێغه‌مبه‌ری ئاخر زمانه هاتۆته خواره‌وه ، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به ئۆمه‌ته‌كه‌ی خۆی گه‌یاندووه ،وه ئاین و شه‌ریعه‌ته‌كه‌ی (خوای گه‌وره)ی پێمان گه‌یاندووه ، بێ گومان ئایه‌ته‌كانی به‌ڵگه و نیشانه‌ی (خوای گه‌وره) یه كه به ئێمه گه‌یشتووه ، تاكو رۆژی قیامه‌ت ده‌بێت په‌یره‌وی ئه‌م رێبازه‌ی قورئانی پیرۆز بكه‌ین ، كه‌ئاخر موعجیزه‌ی (خوای گه‌وره ) بۆ مرۆڤایه‌تی.؟

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ۝٥٣﴾ [فُصِّلَت : ٥٣] واته : [ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ ] ئێمه نیشانه‌ی تاك و ته‌نهایی و گه‌وره‌یی و تواناو ده‌سه‌ڵاتی خوای گه‌وره‌و ڕاستگۆیی قورئانیان نیشان ئه‌ده‌ین له لوتكه‌و ئاسماندا له خۆرو مانگ و ئه‌ستێره‌كاندا، له شه‌و و رۆژدا [ وَفِي أَنْفُسِهِمْ ] وه له نه‌فسی خۆیاندا كه خوای گه‌وره چۆن دروستی كردوون و لاشه ی چۆن پێكهێناون، یاخود (فِي الْآفَاقِ) له‌و شوێنانه‌ی كه لێتان نزیكه وه‌كو (غه‌زای به‌درو فه‌تحی مه‌ككه) یاخود له‌و شوێنه دوورانه‌دا كه فه‌تحی ئه‌كه‌ن و ئیسلامی تێدا بڵاو ده‌بێته‌وه [ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ] تا بۆتان ده‌ركه‌وێ ئه‌م قورئانه پیرۆزه حه‌قه‌و له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه هاتووه [ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ] ئایا خوای گه‌وره

به‌س نیه که شایه‌ته له‌سه‌ر هه‌موو شتێك، وه له‌سه‌ر كرده‌وه‌كانتان، وه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه قورئان له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه دابه‌زیوه‌و حه‌قه..؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾﴾ [الأنعام : ٤] واته : كافران هیچ نیشانه‌و موعجیزه‌یه‌ك له موعجیزه‌كانی خوای گه‌وره‌یان بۆ نایات له‌سه‌ر تاك و ته‌نهایی خوای گه‌وره‌و راستێتی پێغه‌مبه‌رانی ئیلا ئه‌وان پشتی تێ ئه‌كه‌ن..؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾﴾ [يونس : ٩٥] واته : [ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ ] وه له‌و كه‌سانه مه‌به كه ئایه‌ته‌كانی خوای گه‌وره‌یان به‌درۆ زانیوه [ فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ] دوایی تۆ ئه‌بیته كه‌سێكی زه‌ره‌رمه‌ند، (پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - له‌و كه‌سانه نه‌بووه كه ئایه‌تی خوای گه‌وره‌ی به‌درۆ زانیبێ به‌ڵكو بۆ خه‌ڵكیيه).

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ ۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤﴾﴾ [آل عِمرَان : ٤]واته : [ مِنْ قَبْلُ هُدًى لِلنَّاسِ ] كه ئه‌م كتێبانه پێش هاتن و دابه‌زینی قورئانی پیرۆز هیدایه‌ت بوونه بۆ خه‌ڵكی [ وَأَنْزَلَ الْفُرْقَانَ ] وه خوای گه‌وره فورقانیشی دابه‌زاندووه كه قورئانی پیرۆزه كه حه‌ق و باتڵ لێك جیا ئه‌كاته‌وه [ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ] ئه‌و كه‌سانه‌ی كه كوفر ئه‌كه‌ن به ئایه‌ته‌كانی خوای گه‌وره‌و ئیمانی پێ ناهێنن به‌دڵنیایی ئه‌وانه سزایه‌كی زۆر سه‌ختیان بۆ هه‌یه [ وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ ] وه خوای گه‌وره زۆر باڵاده‌سته وه ئینتیقام و تۆڵه‌ی خوای گه‌وره زۆر سه‌خت و قورس و گه‌وره‌یه .؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩﴾﴾ [آل عِمرَان : ١٩] واته : { ته‌نها دینی راست لای خوای گه‌وره ئیسلامه} [ إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ] به دڵنیایی ته‌نها دینێك كه خوای گه‌وره پێی رازی بێ و قبوڵی بكات ئیسلامه [ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ ] وه ئه‌وانه‌ی كه ئه‌هلی كتاب بوون و كتابی ئاسمانیان بۆ هاتبوو له جووله‌كه‌و گاوره‌كان ئیختیلاف و جیاوازی نه‌كه‌وته نێوانیان ئیلا له پاش ئه‌وه نه‌بێ كه عیلم و زانیاریان بۆ هات له كتێبه ئاسمانیه‌كانی خۆیاندا [ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ] كاتێكیش كه ئیمانیان به پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - نه‌هێنا هه‌ر له حه‌سوودیدا بوو، یاخود له‌نێوان یه‌كتریدا حه‌سودیان به‌یه‌كتر برد [ وَمَنْ يَكْفُرْ

بِآيَاتِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ] وە هەر کەسێکیش کوفر بکات بە ئایەتەکانی خوای گەورە و ئیمانی پێ نەهێنێ ئەوا بە ڕاستی حیساب و لێپرسینەوەی خوای گەورە زۆر خێرایە..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ۝٦٣﴾ [الزُّمَر : ٦٣] واتە : [ لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ] وە کلیلی خەزێنەکانی ئاسمانەکان و زەوی هەمووی بەدەستی خوای گەورەیە [ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ] وە ئەو کەسانەی کە کوفریان کردووە بە ئایەتەکانی خوای گەورە ئەوانە زەرەرمەندی ڕاستەقینەن..؟!

**٣-درۆکردن یان ئینکاری کردن و نەکۆلی کردن بە پێغەمبەرانی (خوای گەروە) :**

**بێ گومان بەراست دانی پێغەمبەرانی (خوای گەورە) وە ئیمان هێنان بە هەموو پێغەمبەران ، ئەمە روکنێکە لە روکنەکانی ئیمان ، وە درۆکردن یان نەکۆلی کردن ئەوا نفی ئیمانی کردووە ..؟!**

**(خوای گەورە ) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ۝٣٠﴾ [يس : ٣٠] واتە : [ يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ ] خەفەت و پەشیمانی و هاوار بۆ ئەم بەندە کافرانە [ مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ] هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نایات لەلایەن خوای گەورەوە ئیلا ئەوان گاڵتەی پێ ئەکەن و بە درۆی ئەزانن..؟!

**(خوای گەورە ) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ۝٦٥ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ۝٦٦﴾ [التَّوْبَة : ٦٥ - ٦٦] واتە : {گاڵتە کردن بە خواو ئایەتەکانیو پێغەمبەرەکەی - صلى الله عليه وسلم - کوفرە} [ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ] لە غەزای تەبووکدا کەسێك لە مونافیقان وتی: کەسم نەبینیوە

وەکو پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - ئەم صەحابانە کە بەخەمی سکیانەوە بن، وە لە کاتی قسەکردندا درۆ بکەن، وە لە کاتی رووبەڕووبوونەوەی دوژمن ترسنۆك بن، پیاوێك لە صەحابە فەرمووی: درۆت کرد بەڵکو تۆ مونافیقی ئەبێ هەواڵ بە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بدەم، تا ئەو گەیشتە لای پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، وە کاتێك کە پرسیاریان لێ بکەی بۆچی ئەم قسانەتان کردووەو تانەو تەشەر لە پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - لە صەحابەو لە دین ئەدەن ئەو کاتە ئەڵێن ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - ڕێگا دوور بوو دەمەتەقێمان ئەکرد بۆ ئەوەی دووری ڕێگاکە ببڕین وە گاڵتەمان ئەکردو کاتمان بەسەر ئەبرد [ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ] ئەی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - پێیان بفەرمە: ئایا ئێوە شت نەما گاڵتەی پێ بکەن ئیلا خوای گەورەو ئایەتەکانی خواو پێغەمبەری خوا نەبێ - صلى الله عليه وسلم - ئایا ئێوە گاڵتە بەمانە ئەکەن..؟!

(خوای گەورە ) **دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمۡ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُواْ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ١٠٦﴾ [الكَهۡف : ١٠٦] واتە: سزای ئەم کەسانە دۆزەخە بەهۆی کوفر کردنیان، وە ئایەتەکانی من و پێغەمبەرەکانی منیان کردبوو بە گاڵتەجاری و گاڵتەیان پێ ئەکردن ..؟!

(خوای گەورە ) **دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿لَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ١٠ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ ٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ١١ قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ١٢﴾ [الأَنۡعَام : ١٠ - ١٢] واتە : [ وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبْلِكَ ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - لە پێش تۆدا گاڵتە بە پێغەمبەرانێکی یەکجار زۆر کراوە [ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ] وە سزای خوای گەورە دابەزیوەتە سەر ئەو کەسانە کە گاڵتەیان بەو پێغەمبەرانە کردووە بەهۆی گاڵتە پێ کردنەوە خوای گەورە لەناوی بردن..؟! [ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ ثُمَّ انْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: بەسەر زەویدا بگەڕێن و گەشت بکەن پاشان ببینن سەرەنجامی ئەو کەسانە چی بووە کە پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆ زانیوەو شوێنیان نەکەوتوون سەرەنجامی ئێوەش وا ئەبێ..؟! [ قُلْ لِمَنْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە موڵکی کێیە؟ [ قُلْ لِلَّهِ ] بڵێ: تەنها هی پەروەردگارە [ كَتَبَ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ ] خوای گەورە لەسەر نەفسی پیرۆزی خۆی نووسیوە کە بەڕەحم و سۆزو بەزەیی بێ وە پەلە نەکات لە سزادانی بەندەکانیدا، وە ڕەحمەتی پێش توڕەبوونێتی [ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ] خوای گەورە سوێن دەخوات

به نه‌فسی پیرۆزی كه كۆتان ئه‌كاته‌وه له ڕۆژی قیامه‌تدا كه هیچ گومانێكی تیادا نیه [ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ] ئه‌و كه‌سانه‌ی كه خۆیان دۆڕاندووه به‌وه‌ی كه باوه‌ڕیان به ڕۆژی دوایی نه‌هێناوه ئه‌وان ئیمان ناهێنن..؟!

٤-درۆكردن یان نه‌كۆلی و ئینكاری كردن له ڕۆژی زیندوو بوونه‌وه :

به‌دلنیایه‌وه ئه‌وه‌ی كه موسلمان و ئیمانداره باوه‌ری به‌وه هه‌یه ، كه ئه‌م ژیانه‌ی دونیا كاتێكی كۆتایی هه‌یه ته‌واو ده‌بێت ، و ڕۆژی دوای وه‌كو ئه‌م ڕۆژه‌ی مه نیه كه دێت ، به‌لكو ژیانێكی تره له له ڕۆژی دوایی دا ، ئا له‌م ڕۆژه دا (خوای گه‌وره ) هه‌موو بوونه‌وه‌رێك زیندوو ده‌كاته‌وه ، وه هه‌موویان راپێچ ده‌كات بۆ لیٚ پرسینه‌وه ، وه ئه‌و كه‌سه‌ی له دونیادا چاكه كار بووه ئه‌وا پاداشتیان ده‌داته‌وه به نیعمه‌ته‌كانی به‌هه‌شت ، وه ئه‌وه‌شی كه خراپه‌كار بووه له دونیادا ئه‌وا سزاو ئازاریان ده‌دات له ناو دۆزه‌خدا ..؟! به‌لام هه‌ندێكه‌س له ژیانی ئه‌م دونیایه‌دا نه‌كۆلی ده‌كه‌ن له ڕۆژی زیندوو بوونه‌وه ، هه‌روه‌ها ئه‌م ڕۆژه به درۆ ده‌خه‌نه‌وه له نێو خه‌لك دا ، به‌لكو نكۆلی ده‌كه‌ن ئه‌وان ئیلحاد ئینكاری ده‌كه‌ن ، چونكه پێیان وایه ژیانی ئه‌م دونیا به‌رده‌وام ده‌بێت ژیانێكی تر به دوای دا نایه‌ت ، وه یان ژیانی دوارۆژ بوونی نیه ..؟!

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویّت : قال تعالى: ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧﴾ [التَّغَابُن : ٧] واته : [ زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنْ لَنْ يُبْعَثُوا ] كافران به گومانی خۆیان ئه‌ڵێن: زیندوو بوونه‌وه نیه {سوێند خواردن به خوای گه‌وره} [ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - بڵێ: به‌ڵێ سوێند بێت به په‌روه‌ردگارم به دڵنیایی ئێوه زیندوو ئه‌كرێنه‌وه پاشان هه‌واڵتان پێ ئه‌درێ به‌و كرده‌وانه‌ی كه له دونیادا كردووتانه وه سزا وه‌رئه‌گرن له‌سه‌ری [ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ] وه ئه‌مه‌یش لای خوای گه‌وره زۆر ئاسانه كه زیندووتان بكاته‌وه‌و لێپرسینه‌وه‌تان له‌گه‌ڵدا بكات و سزاتان بدات، ئه‌مه سێیه‌م ئایه‌ته كه خوای گه‌وره فه‌رمان به پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ده‌كات كه سوێند بخوات به خوای گه‌وره له‌سه‌ر زیندوو بوونه‌وه، ئایه‌تی یه‌كه‌م له سووره‌تی (یونس/ ٥٣) [ وَيَسْتَنْبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ (٥٣) ] ئایه‌تی دووه‌م له سووره‌تی (سباء/ ٣) [ وَقَالَ الذين كَفَرُواْ لاَ تَأْتِينَا الساعة قُلْ بلى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ ].

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویّت : قال تعالى: ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ قَالُواْ يَٰحَسۡرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطۡنَا فِيهَا وَهُمۡ يَحۡمِلُونَ أَوۡزَارَهُمۡ عَلَىٰ ظُهُورِهِمۡۚ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ٣١﴾ [الأَنْعَام : ٣١]واته : [ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ

كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ] ئەو کەسانەی کە گەیشتنیان بە خوای گەورە بەدرۆ ئەزانی و باوەڕیان بەزیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە نەبوو ئەوانە بە دڵنیایی دۆڕاون [ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً ] تا کاتێك کە قیامەت دێت لە ناکاودا [ قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَى مَا فَرَّطْنَا فِيهَا ] پەشیمان ئەبنەوەو غەم و خەفەت ئەخۆن و ئەڵێن هاوار بۆ خۆمان کە ئێمە چەندێك کەمتەرخەمیمان کرد لە دونیاداو کردەوەی چاکمان نەکردو خۆمان ئامادە نەکرد بۆ ئەم ڕۆژی قیامەتە [ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَى ظُهُورِهِمْ ] وە ئەوان قورسایی تاوانەکانیان هەڵگرتووە لەسەر پشتیان [ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ] بەڕاستی ئەو تاوانانە خراپترین شتە کە هەڵیانگرتووە..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ۝٢ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ۝٣
يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ۝٤ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ۝٥ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ۝٦ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا
يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨﴾ [الزَّلْزَلَة : ١ - ٨] واتە : [ إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا (١) ] کاتێك کە زەوی ئەهەژێت و ئەجووڵێت و ئەلەرزێت لەرزینێکی زۆر سەخت کە لە ژێرەوەی ئەهەژێت و ئەجوولێت و ئەلەرزێت تا هەرچی لەسەرە هەمووی ئەشکێنێت..؟! [ وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا (٢) ] وە هەرچی لەناو سکی زەویدا هەیە لە مردوو و لە کەنز هەر هەمووی فڕێ ئەداتە دەرەوە، پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ئەفەرمووێ: (زەوی هەرچی کەنزەکانی ناوی هەیە هەمووی فڕێ ئەداتە دەرەوە وەکو کۆڵەکەی گەورە لە ئاڵتوون وە لە زیو تا پیاوکوژ دێت ئەڵێ: لە پێناو ئەمەدا من خەڵکم کوشت، ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندووە ئەڵێ: لەپێناو ئەمەدا من پەیوەندی خزمایەتیم پچڕاند، ئەوەی دزی کردووە ئەڵێ: من لە پێناو ئەمەدا دەستم بڕا، پاشان بانگیان ئەکرێ فەرموو بیبەن کەس نایبات لەبەر ئەوەی ئەمە ڕۆژی قیامەتەو بۆیە زەوی هەرچی کەنزێك لەناویدایە فڕێی داوەو هەرچی مردوویەك هەیە هەمووی فڕێ ئەداتە دەرەوە..؟! [ وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا (٣) ] وە مرۆڤ سەری سوڕ ئەمێنێ بۆچی ئەم زەوییە پێشتر جێگیرو چەسپاو بووە بۆچی ئێستا ئاوای بەسەرهاتووە ئەجووڵێت و ئەهەژێت و هەرچی لەناو سکی دابووە هەمووی هەڵداوەتە دەرەوە..؟! [ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا (٤) ] لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی باس ئەکات ئەویش کە..؟! [ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا (٥) ] پەروەردگار وەحی بۆ ئەنێرێ، واتە: ئیزنی ئەدات و ڕێگای پێ ئەدات ئەی زەوی قسە بکە زەویش بە فەرمانی خوای گەورە قسە ئەکات و دێتە وەڵام وە هەرچی شتێك لەسەری کراوە باسی ئەکات و هەواڵ ئەدات..؟! [ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا ] لەو ڕۆژەدا خەڵکی ئەبنە چەند پۆلێکەوە خەڵکەکە هەموویان وەکو یەك نین بەڵکو جیاوازن خەڵك لەناو گۆڕەکان کە دێنە دەرەوە بەرەو ساحەی مەحشەر بەڕێ ئەکەون هەیانە ئیمانداراەو هەیانە کافرە، هەیانە ئەمینەو هەیانە ئەترسێ، هەیانە ڕووی سپی و گەشە کە بەهەشتییەکانن، وە هەیانە ڕوویان ڕەشە کە دۆزەخییەکانن، واتە: هەموویان بەیەك شێواز نین بەڵکو چەند پارچە پارچەو گروپ گروپ و کۆمەڵ کۆمەڵن هەموویان وەکو یەك وانین هەیانە کردەوەی چاکی کردووە هەیە کردەوەی خراپی کردووە [ لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ (٦) ] تا کردەوەی خۆیان ببینن لەوێ هەر کەسێك هەر کردەوەیەکی کردبێ پێی ئەووترێ و هەواڵی پێ ئەدرێ کە ئەمە کردەوەکانتە..؟! {چاکەو خراپە چەندێك کەم بێت دەیبینیتەوە} [ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) ] لەو ڕۆژەدا هەر کەسێك کردەوەی چاکی کردبێ لە دونیادا بە ئەندازەی مسقالە زەڕەیەك واتە: بچووکترین مێروولە یاخود ئەو گەردەی کە ئەبینرێت تەپو تۆزێك لە پەنجەرەیەکەوە دیارە ئەوەش ئەگرێتەوە، جا کەسێك بە ئەندازەی یەکێك لەو گەردانە چاکەو خێری کردبێ ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەجرو پاداشتەکەی وەرئەگرێ، بۆیە نابێ مرۆڤی موسڵمان چاکەی لەلا کەم بێ، هەر بۆیە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ئەفەرمووێ: (خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت کە کردووتە بەخێر لە پێناو خوای گەورەدا بەکەمی مەزانە، ئەگەر قسەیەکی چاکیش بێ بەکەمی مەزانە، ئەگەر لە دۆلکەکەت ئاو بکەیتە ناو گڵاسی کەسێکی ترەوە بەکەمی مەزانە، ئەگەر بەڕووی خۆش بەرامبەر موسڵمانێك ڕاوەستی و ڕووت لە گەڵیدا خۆشبێ بەکەمی مەزانە، ئەگەر پێی ئاژەڵێك بەدیاری بەری بۆ هاوسێکەت بەکەمی مەزانە)، ئەمانە هەرچەندە خێرو شتێکی یەکجار کەمن، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا هەر کەسێك لەوانە کەمتر بە ئەندازەی گەردێك یان مێروولەیەکی بچووك خێرو چاکە بکات ئەیبینێتەوەو خوای گەورە ئەجرو پاداشتی ئەداتەوە لەسەری، وە چاکەیش یەك بە دەیە تا یەك بە حەوت سەد تا زیاتریش..؟! [ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨) ] وە بە پێچەوانەیشەوە هەر کەسێك ئەگەر بە ئەندازەی مێروولەیەکی بچووك یان گەردێکی بچووك شەڕو خراپە بکات لە ڕۆژی قیامەتدا ئەیبینێتەوە ئەگەر خوای گەورە لێی خۆش نەبێت، ئەگەر لێی خۆشبوو ئەوە هیچ ئەگەر لێی خۆش نەبووبێ ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لێپرسینەوەی

له‌گه‌ڵدا ئه‌كات، بۆیه نابێ مرۆڤی موسڵمان تاوانی بچووكیشی پێ كه‌م بێ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هیچ بچووكێك له‌گه‌ڵ به‌رده‌وامیدا بچووك نیه به‌ڵكو گه‌وره ئه‌بێت، والله أعلم..؟!

## سێ یه‌م : كارو كرداری حه‌رامكراوه‌كان :

**به‌ڵێ بێ گومان (خوای گه‌وره) ئاگادارمان ده‌كاته‌وه به‌وه‌ی كه نزیكی كارو كرده‌وه‌ی حه‌رامكراوه‌كان نه‌بین ، هه‌ر وه‌كو : ( كوشتنی به نه مرۆڤه‌كان به ناحه‌ق و به ناره‌وا ، وه زیناو داوێن پیسی ، وه خواردنه‌وه‌ی مه‌ی ، وه ئه‌نجامدانی كرداری قێزه‌ون وه‌كو نێر بازی ، وه خواردنی مالی خه‌لك به ریباو سوخواردن ، وه خواردنی مالی خه‌لك به ناحه‌قی به شێوه‌یه‌كی به‌رتیل ریشوه وه‌رگرتن ، ...هتد ) چونكه ئه‌مانه ده‌بێته هۆكارێك بۆ ئه‌وه‌ی مرۆڤه ، مایه پووچ و زه‌ره‌رمه‌ند بێت له ژیانی دونیا له ژیانی دوارۆژ دا ..؟! وه هه‌روه‌ها دبێته هۆی تووره بوونی (خوای گه‌وره) به هۆی ئه‌نجامدانی ئه‌و كارو كرده‌وه حه‌رامكراوانه‌وه ..؟!**

١-(قتل النفس ) كوشتنی نه‌فسی مرۆڤ به ناحه‌ق و ناره‌وا :

چونکه ئاینی ئیسلامی پیرۆز ، پارێزگاری له کەرامەت و نەفسی هەموو مرۆڤێك دەكات ، وه كوشتنی نەفسی هەموو مرۆڤێكی به ناحەق حەرامكردووه ..؟! هەروەكو (خوای گەوره ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ [الإِسْرَاء : ٧٠]واته : سوێند به خوا بێگومان ڕێزمان له نەوەی ئادەم گرت..؟!

هەروەها ئاینی ئیسلامی پیرۆز نەهی كردووه یان قەدەغەی كردووه لەوەی كه كەسێك بكوژێ بەناحەق و نارەوا ، بۆیه ئیدانەكردنی توند تر كردۆتەوە ، بۆ ئەو كەسانەی تعدای خەلكی دەكەن به كوشتنیان به ناحەق و نارەوا ، هەر لەبەر ئەمە (خوای گەوره ) ئاگادارمان دەكانەوە بەوەی ئەگەر یەك مرۆڤ یان بەندەی خوا بكوژێ به ناحەق و نارەوا ئەوا یەكسانی كردووه به وه كه هەموو مرۆڤەكانی سەرزەمینی كوشتووه ، یان هەموو سەر زەمینی كردۆته خوێن ڕشتن و ئاشووب فسادی ، هەروەك (خوای گەوره ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًاۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾﴾ [المَائِـدَة : ٣٢] واته : له پێناو ئەم كوشتنەدا كه یەكەم كوشتن بوو لەسەر ڕووی زەوی ڕوویدا، وه لەبەر ئەوەی یەكەم خوێن لەناو ئەواندا ڕژا، وه ئەوان زیاتر خوێنڕێژی لەناویاندا بووەو پێغەمبەرانیان كوشتووه: لەسەر هەموو خەڵكی و بەتایبەتی بەنو ئیسرائیلمان نووسی وه تەشریعمان كردو ڕامانگەیاند كه هەر كەسێك بەناحەق كەسێك بكوژێ كه تۆڵه سەندنەوە نەبێت و كەسێكی به ناحەق نەكوشتبێت، یاخود فەسادی لەسەر زەوی نەنابێتەوە، واته: شەریكی بۆ خوا دانەنابێت، یان كوفری نەكردبێت، یان ڕێگری و چەتەیی نەكردبێت (ئەوەی ئەمانە بكات دەكوژرێت بەڵام حاكمی موسڵمان دە یانكوژێت نەك تاكە تاكی خەڵكی) [ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا ] یەك كەسێك بكوژێت وەكو ئەوە وایە كه هەموو خەڵكت كوشتبێت له تاواندا [ وَمَنْ أَحْيَاهَا ] وه ئەگەر كەسێكیش بژێنێتەوەو ئەتوانی بیكوژێ بەڵام لەبەر خوا لێی خۆش ئەبێت، یان كەسێك ڕزگار ئەكەیت له خنكاندن و سووتاندن و تیاچوون [ فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا ] وەك ئەوە وایە كه هەموو خەڵكی سەر ڕووی زەویت ژیاندبێتەوەو ڕزگار كردبێت له ئەجرو پاداشتدا [ وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ] وه پێغەمبەرانی ئێمە بەبەڵگەی ڕوون و ئاشكرا بۆ لای خەڵكی هاتوون و ناردوومانن [ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ بَعْدَ ذَلِكَ فِي الْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ] پاشان زۆرێك له خەڵكی له دوای ناردنی پێغەمبەران لەسەر زەویدا ئیسراف و خراپەكاری ئەكەن له كوشتندا..؟!

له ( عبدالله بن عمرو ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوه له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((لزوالُ الدُّنيا أَهْوَنُ عندَ اللَّهِ مِن قتلِ رَجُلٍ مُسلمٍ )) . [1] واته: نەمانی دونیا سوكترە و ئاسنترە بەلای (خوای گەوره ) له كوشتنی نەفسێك یان پیاوێكی موسلمان ) واته: كوشتنی پیاوێكی موسلمان به ناحەق و نارەوا ..؟!

[1]-سنن الترمذي برقم (١٣٩٥).

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالی: ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ سَفَهَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفۡتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِۚ قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ۝١٤٠﴾ [الْأَنْعَام : ١٤٠] واته: [ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلَادَهُمْ سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ ] به‌دڵنیایی ئه‌و که‌سانه زه‌ره‌رمه‌ند بوون که مناڵه‌کانی خۆیان ئه‌کوژن به‌نه‌زانی و به‌که‌م عه‌قڵی به‌بێ زانیاری [ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ ] وه ئه‌وه‌ی که خوای گه‌وره وه‌کو ڕزقێك پێی به‌خشیوون ئه‌وان خۆیان له‌سه‌ر خۆیانی حه‌رام ئه‌که‌ن و درۆ هه‌ڵئه‌به‌ستن و به‌ناوی خوای گه‌وره‌وه قسه ئه‌که‌ن، (ئیبنو عه‌بباس) ده‌فه‌رمێت: ئه‌گه‌ر پێت خۆشه نه‌زانی و نه‌فامی عه‌ره‌ب بزانیت و بۆت ده‌ربکه‌وێت ئه‌وا ئه‌م ئایه‌تانه بخوێنه‌وه [ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ] به‌دڵنیایی ئه‌مانه گومڕا بوونه‌و هه‌رگیز ئه‌مانه هیدایه‌تدراو نین و له‌سه‌ر ڕێگای هیدایه‌ت نین..؟!

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ۝٢٧﴾ [البَقَرَة : ٢٧] واته : ئه‌و که‌سانه‌ی که عه‌هدو په‌یمانی خوای گه‌وره هه‌ڵئه‌وه‌شێننه‌وه له دوای ئه‌وه‌ی که عه‌هدو په‌یمانیان داوه‌و خۆیان پێوه په‌یوه‌ست کردووه [ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ ] وه ئه‌و په‌یوه‌ندی خزمایه‌تیه‌ی که خوای گه‌وره ئه‌مری کردووه بیگه‌یه‌نن ئه‌وان ئه‌یپچڕێنن [ وَيُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ ] وه ئاشووب ئه‌نێننه‌وه له‌سه‌ر زه‌وی به خراپه‌کاری [ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ] ئا ئه‌مانه زه‌ره‌رمه‌ندن له دونیاو له قیامه‌تدا..؟!

٢-ڕێگری کردون دوژمنایه‌تی کردن یان دژایه‌تی کردنی به‌رنامه و په‌یامی (خوای گه‌وره )

**بێ گومان ئه‌مه کێشه‌یه‌که ته‌نها له ئێستا دا ڕوویه‌نه‌داوه به‌ڵکو له کاتی دروستی بوونی مرۆڤایه‌تی ، وه هاتنه خواره‌وه‌ی (ئاده‌م ) – علیه السلام – بۆ سه‌ر ئه‌م زه‌مینه ، به‌رده‌وامی دوژمنایه‌تی و ڕێگری کردن دژایه‌تی ئه‌م ئاینه پیرۆزه ی(خوای گه‌وره ) کراوه که ئیسلام ، ئیسلامیش ئاینی سه‌رجه‌م پێغه‌مبه‌رانه ، هه‌روه‌کو (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت :** قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ۝١٩﴾ [آل عِمۡرَان : ١٩] واته : { ته‌نها دینی ڕاست لای خوای گه‌وره ئیسلامه} [ إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ] به دڵنیایی ته‌نها دینێك که خوای گه‌وره پێی ڕازی بێ و قبوڵی بکات ئیسلامه [ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ ] وه ئه‌وانه‌ی که ئه‌هلی کتاب بوون و کتابی ئاسمانیان بۆ هاتبوو له جووله‌که‌و گاوره‌کان ئیختیلاف و جیاوازی نه‌که‌وته نێوانیان ئیلا له پاش ئه‌وه نه‌بێ که عیلم و زانیاریان بۆ هات له کتێبه ئاسمانیه‌کانی خۆیاندا [ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ] کاتێکیش که ئیمانیان به پێغه‌مبه‌ری خوا -

صلی الله علیه وسلم - نه‌هێنا هه‌ر له‌ حه‌سوودیدا بوو، یاخود له‌نێوان یه‌كتریدا حه‌سودیان به‌یه‌كتر برد [ وَمَنْ يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ] وه‌ هه‌ر كه‌سێكیش كوفر بكات به‌ ئایه‌ته‌كانی خوای گه‌وره‌ و ئیمانی پێ نه‌هێنێ ئه‌وا به‌ راستی حیساب و لێپرسینه‌وه‌ی خوای گه‌وره‌ زۆر خێرایه‌..؟! به‌ڵێ بۆیه‌ دوژمانی ئیسلام له‌ ئێستاو له‌ رابردوو دا ، دژایه‌تی ئاینی (خوای گه‌وره‌) یان كردووه‌ ، ئه‌وانه‌ی چاو یان به‌ ئاینی ئیسلام هه‌نایه‌ت ، خه‌ریكی نیشانه‌ دانان و چه‌قۆ وه‌شاندن و پیلان دانان دژی ئیسلام ، هه‌میشه‌ و له‌ هه‌موو سه‌رده‌مێك داو له‌ هه‌موو شوێنێك دا بواریان بۆ بره‌خسێت ، وه‌كو سه‌گ به‌ ئیسلام ده‌رشێنه‌وه‌ ، هه‌روه‌ها خۆیان له‌ مه‌لاس داگرتووه‌ بۆ ده‌ست وه‌ شاندن یان چه‌قۆ وه‌شاندن له‌ ئیسلامدا ، ئه‌م ناكۆكی وصراعه‌ به‌ درێژایی مێژوو تاكو ئێستا هه‌ر به‌رده‌وامه‌، هه‌روه‌كو به‌رانبه‌ر به‌ هه‌موو پێغه‌مبه‌ران و پیاو چاكان ئه‌م دژایه‌تی كردنه‌ به‌رده‌وامه‌ نه‌وه‌ له‌ دوای نه‌وه‌ موسلمانانێكی پاك بێگه‌ردو دامه‌زراوه‌ی له‌ سه‌ر ئیمان و باوه‌ری راسته‌قینه‌ی خۆی ، دژایه‌تی ئه‌م كافر مولحیدو مونافق و دوو رووانه‌ ده‌كه‌ن ، بێ گومان ئه‌م بانگه‌وای كردنه‌ سروشتێكی هه‌موو پێغه‌مبه‌ران بووه‌ ، وه‌ نه‌وه‌ له‌ دوای نه‌وه‌ ئه‌م به‌رگری كردنه‌ له‌ ئاینی پیرۆزی ئیسلام به‌رده‌وامه‌ ، بانگه‌واز كردن بۆ ئاینی (خوای گه‌وره‌ ) هه‌ر به‌رده‌وام هه‌روه‌ها جیهادو تێ كۆشان و كۆشش كردن بۆ ئه‌م ئاینه‌ پاكه‌ به‌رده‌وام بۆ به‌لاو بوونه‌وه‌ی ئاینی (خوای گه‌وره‌ ) ، له‌ پێناوی ئه‌م ئاینه‌ خه‌لكانێك خۆیان به‌خت ده‌كه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م په‌یامه‌ سه‌ربكه‌وێت ، به‌دل و به‌گه‌یان له‌ دژی ناحه‌زانی ئاینی ئیسلام به‌رگری ده‌كه‌ن ، وه‌ بانگه‌وازی ئاینی (خوای گه‌وره‌ ) ده‌كه‌ن ، هه‌روه‌كو پێغه‌مبه‌ران ،وه‌ به‌تایبه‌تی سه‌رووه‌رو پێشه‌واو رۆشنایی چاوی هه‌موو مرۆڤایه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كه‌ ئه‌م به‌رنامه‌ ئه‌م ئاینه‌ به‌رده‌وامه‌ سات به‌ سان و رۆژه‌ به‌رۆژ هه‌ر له‌ زیاد بوون دایه‌ موجاهیدان و تێ كۆشه‌رانی ئاینی ئیسلام ، هه‌ر بۆیه‌ تاكو رۆژی دوایی جیهادو تێ كۆشان و بانگه‌وازی و كۆشش كردن بۆ ئه‌م ئاینه‌ به‌رده‌وامه‌ به‌ پشتیوانی (خوای گه‌وره‌ ) .؟!

(خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ١٩ أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ ٱلسَّمۡعَ وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ ٢٠ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٢١ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ٢٢﴾

[هُود : ١٩ - ٢٢] واته‌ : [ الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ] ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ رێگری ئه‌كه‌ن له‌ دینی خوای گه‌وره‌و نایه‌ڵن خه‌ڵك موسڵمان بێت [ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ] وه‌ ئه‌یانه‌وێت و وه‌سفی دینه‌كه‌ی خوای گه‌وره‌ ئه‌كه‌ن به‌وه‌ی دینێكی گێڕه‌ بۆ ئه‌وه‌ی كه‌ خه‌ڵكی لێ دووربخه‌نه‌وه‌، یاخود ده‌یانه‌وێت خه‌ڵكی له‌سه‌ر رێگاری خوارو گێڕ بن [ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ ] وه‌ ئه‌وانیش بێباوه‌ڕن به‌ رۆژی دوایی..؟! [ أُولَئِكَ لَمْ يَكُونُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ ] ئا ئه‌مانه‌ له‌سه‌ر زه‌ویدا رزگاریان نابێ له‌ سزای خوای گه‌وره‌ [ وَمَا كَانَ لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ] وه‌ جگه‌ له‌ خوای گه‌وره‌ش هیچ دۆست و پشتیوانێكی تریان نیه‌ كه‌ رزگاریان بكات له‌ سزای خوای گه‌وره‌ یان سزای خوای گه‌وره‌یان له‌سه‌ر بگه‌ڕێنێته‌وه‌ [ يُضَاعَفُ لَهُمُ الْعَذَابُ ] سزای ئه‌مانه‌ چه‌ند قاتێكه‌ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی درۆیان هه‌ڵبه‌ستووه‌ بۆ خوای گه‌وره‌و به‌ناو خوای گه‌وره‌وه‌ قسه‌یان كردووه‌و رێگریان كردووه‌ له‌ دینی خوای گه‌وره‌و ئیسلامیان وه‌سف كردووه‌ به‌وه‌ی كه‌ دینێكی نارێك و خراپه‌ (كافران له‌سه‌ر هه‌موو فه‌رمانێك كه‌ نه‌یانكردبێت، وه‌ له‌سه‌ر هه‌موو قه‌ده‌غه‌كراوێك كه‌ كردبێتیان سزا ده‌درێت) [

مَا كَانُوا يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ ] ئا ئەمانە نەیانئەتوانی گوێ لە حەق بگرن لەبەر ئەوەی خۆیان لە ئاست حەقدا کەڕ ئەکرد [ وَمَا كَانُوا يُبْصِرُونَ] وە حەقیشیان نەئەبینی و خۆیان کوێر ئەکرد لە ئاست بینینی حەقدا..؟! [ أُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ ] ئا ئەمانە خۆیان دۆڕاند لەبەر ئەوەی عیبادەتی غەیری خوای گەورەیان کردو چوونە دۆزەخەوە [ وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ] وە ئەو بوهتان و درۆهەڵبەستنانەیش کە کردیان و شەریکیان بۆ خوا دانا هەر هەمووی ئەڕوات و ئەفەوتێ و لە قیامەتدا هیچی نابیننەوە تا فریایان بکەوێ..؟! [ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الْآخِرَةِ هُمُ الْأَخْسَرُونَ] هیچ گومانی تیا نیە کە لە ڕۆژی دواییدا زەرەرمەندی ڕاستەقینە ئەم کەسانەن چونکە بەهەشتیان گۆڕیەوە بە دۆزەخ..؟!

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ۝١٠٣ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا ۝١٠٤﴾ [الكَهْف : ١٠٣ - ١٠٤] واتە : ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەینێ کێ لە هەموو کەس زەرەرمەندترە کە کردەوەشی کردووە..؟! ئەو کەسانەن کە هەوڵ و تێکۆشانیان لە ژیانی دونیادا بەزایە ڕۆیشتووەو کردەوەکانیان بەتاڵ بۆتەوە [ وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ] لە کاتێکدا ئەوان وا ئەزانن کە ئیشی چاکیان کردووە نازانن هەمووی بەتاڵ بۆتەوە لەبەر ئەوەی کردەوەکانیان بە گوێرەی شەرع نەبووە ..؟!

لە( عبدالله بن عمرو ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هل تَدرون مَن المُفلِسُ؟ قالوا: المُفلِسُ فينا، يا رسولَ اللهِ، مَن لا دِرهَمَ له ولا مَتاعَ. قال: إنَّ المُفلِسَ مِن أُمَّتي مَن يَأتي يَومَ القِيامَةِ بِصِيامٍ وصَلاةٍ وزَكاةٍ، ويَأتي قد شتَمَ عِرْضَ هذا، وقذَفَ هذا، وأكَلَ مالَ هذا، فيَقعُدُ، فيَقُصُّ هذا مِن حَسَناتِه، وهذا مِن حَسَناتِه، فإنْ فنِيَت حَسَناتُه قبْلَ أنْ يَقضِيَ ما عليه مِن الخَطايا؛ أَخَذَ مِن خَطاياهم فطُرِحَت عليه، ثم طُرِحَ فى النَّارِ)) .[1] واتە: (ئایا دەزانن موفلیس کێیە ..؟!) ووتیان : موفلیس لای ئێمە ئەو کەسەیە ماڵ و سامان و پارە و شمەکی نەبێ ..! ! فەرمووی : (موفلیسی ڕاستەقینە لە ئۆمەتی مندا ئەو کەسەیە لە ڕۆژی قیامەتدا کە دێت بە نوێژ و ڕۆژوو و زەکاتە کەیەوە واتە خاوەنی ئەو پەرستانەیە ، کە دێت جنێوی داوە بەوە ، بووختانی کردووە بۆ ئەوە ، خوێنی ئەوەی ڕەشووە ، لەوەی داوە بە ناحەق ، موفلیسەکە دادەنیشێنن وەك تۆ لە لێ کردنەوەیە لە کردەوە چاکەی کانی بەشی ئەوانەی لێ دەسێنن کە خراپەی کردووە بەرانبەریان ئەگەر کردەوە چاکەکانی تەواو

[1]-سنن الترمذي رقم (٢٤١٨).

بوون له پێش ئەوەی تۆلەی گوناهەکانی به تەواوی لێ بکرێتەوە ، ئەوا له گوناهی ئەوانه دەخرێتە سەر گوناهەکانی و فرێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ..؟!

له (ابو ذر الغفاري ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕیتەوە له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((ثَلاثَةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَومَ القِيامَةِ، ولا يَنْظُرُ إليهم ولا يُزَكِّيهِمْ ولَهُمْ عَذابٌ أليمٌ قالَ: فَقَرَأَها رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ ثَلاثَ مِرارٍ، قالَ أبو ذَرٍّ: خابُوا وخَسِرُوا، مَن هُمْ يا رَسولَ اللهِ؟ قالَ: المُسْبِلُ، والْمَنَّانُ، والْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بالحَلِفِ الكاذِبِ )) . [1] واته: سێ کەس هەن (خوای گەورە) له رۆژی قیامەتدا قسەیان له گەل ناکات یان نایان دوێنی و سەریان ناخات ، وه پاکیان ناکاتەوە ، وه سزای سەختیان هەیە ..؟! دەلێ . پێغەمبەری خوا سێ جار ئەمەی خوێندەوە..! ! (أبو ذر ) ووتی : رەنجەرۆ خەسارەت مەندو یان زەرەرمەندو مایە پووچ بن ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێن ئەوانە ..؟! فەرمووی : ئەو کەسەیە که جل وبەرگە کەیان یان پۆشاکەکەی درێژ دەکات بۆ بنی پێی یان بۆ دامێنی پێی ، به مەبەستی فیزکردن ، خۆبه زل زانین و له خۆیاوی ، وه ئەو کەسەی منەت بەسەر خەلکی دا دەکات ، وه ئەو کەسەی به سوێندی درۆ رەواج به شمەکەکەی دەدات ..؟!

٣–گوێڕایەل کردنی بێ باوەران یان کافران ئەوانەی مەبەستیانە زیان به موسلمانان بگەیەنن :

بێ گومان (خوای گەورە ) ئاگاداری ئیمانداران دەکاتەوە، لەوەی گوێڕایەلی کافران یان بێ باوەران نەکەن ، هەروەها خۆشەویستی و دلسۆزی و موالاتیان بۆ دەر برێت ، چونکە ئەوە وادەکات که ئیماندار سەرپێچی (خوای گەورە ) بکات ، هەر بۆیە له زۆربەی وەلاتانی ئیسلامی ئەوانەی که گوێڕایەلی کافرانن ، (خوای گەورە ) سزاو تۆلە سەندنەوەی و توورەیی خۆی بۆ رەوانە کردوون ، جا نەمانی رزق رۆزی باران بارین و یان دارمانی ئابووری وەلات و نەبوونی متمانە له نێوان موسلمانان ، هەروەها هاتنی بەلاو نەهامەتی و نارەحەتی یەك لەدوای یەك ، چونکە هۆکارێك بۆ توورەی (خوای گەورە ) که ئەم وەلاتانە گوێڕایەلی کافران دەکەن ، هەرچی کافران بلێن ئەوان گوێڕایەل و خۆشەویسیان بۆ دەردەبرن ، دەچن سیستەم و ئاداب و رەوشتی نارشرینی کافران له سەر خەلکە کەی خۆیان پەیرەو دەکەن ، بۆیە له چەند ئایەتی قورئانی پیرۆز دا (خوای گەورە ) ئاگادارمان دەکاتەوە،

[1] -صحيح مسلم برقم (١٠٦).

بۆیە هەرکاتێك وەلاتان گوێرایەلی کافران و بێ باوەران و دەولەتانی رۆژ ئاوایان کردووە تووشی زەرەمەندو مایە پووچ بوون بووینە ؟! هەروەك (خوای گەورە) لە چەند ئایەتێك ئاگادارمان دەکاتەوە هۆشداری بە موسلمان و ئیماندارانی دەدات بەوەی کە ئەگەر گوێرایەلی کافران بن ، ئەوا سەرپێچی خوا و پێغەمبەری ﷺ خوا تان کردووە.

**(خوای گەورە) دەفەرموویت** : قال تعالى: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةٗۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨﴾ [آل عِمرَان : ٢٨] واتە : نابێ باوەڕداران کافران بکەن بە دۆست و خۆشەویست و سەرخەرو پشتیوانی خۆیان و خۆشیانیان بوێ لە جگە لە ئیمانداران [ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ ] وە هەر کەسێك وابکات ئەوا خوای گەورە بەریە لەو کەسەو شتێکی لای خوای گەورە نامێنێ [ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً ] ئیلا ئەگەر هاتوو ترسان بتانکوژن ئەوکاتە دروستە بە ئاشکرا وەلائی خۆتانیان بۆ دەربڕن بەڵام دڵتان پڕ بێت لە باوەڕ [ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ] وە خوای گەورە ئەتانترسێنێ و ئاگادارتان ئەکاتەوە بە نەفسی پیرۆزی خۆی نەکەن کافران بکەنە وەلی و دۆست و خۆشەویستی خۆتان چونکە سزای سەختتان دەدات [ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ] وە سەرەنجامی گەڕانەوەشتان هەر بۆ لای خوای گەورەیە..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرموویت** : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا ١٣٩﴾ [النِّسَاء : ١٣٩] واتە: ئەوانەی کە بێ باوەڕان بەدۆست و خۆشەویستی خۆیان دادەنێن بێجگە لە ئیمانداران ئایا بەتەمان سەربەرزیان لای ئەوان دەس کەوێت؟ (بۆچونێکی هەڵەیە) چونکە بەڕاستی سەربەرزی و باڵا دەستی هەمووی بۆ خوایە..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرموویت** : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ١٤٩﴾ [آل عِمرَان : ١٤٩] واتە: ئەی باوەڕداران ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی کافران بکەن ئەوە لە دینەکەتان پاشگەزتان ئەکەنەوە وە کافرتان ئەکەنەوە [ فَتَنْقَلِبُوا خَاسِرِينَ] ئەو کاتە زەرەرمەند ئەبن و بە زەرەرمەندی ئەگەڕێنەوە لە دونیاو قیامەت ..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرموویت** : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ ١٣﴾ [المُمۡتَحنَة : ١٣] واتە : {خۆشنەویستنی کافران} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ ] ئەی باوەڕداران ئێوە خۆشەویستی و پشتیوانی و سەرخستنتان بۆ کەسانێك دەرمەبڕن کە خوای گەورە غەزەبی لێ گرتوون کە بەتایبەتی جوولەکەن، وە بە گشتیش هەموو کافرانن [ قَدْ يَئِسُوا مِنَ الْآخِرَةِ ] ئەمانە بێ ئومێد بوونە لە پاداشتی رۆژی قیامەت لەبەر ئەوەی باوەڕیان بە زیندوو بوونەوە نیە [ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ] چۆن کافران بێ ئومێد بوونە لە

مردووەکانیان کە ئەڵێن: زیندوو بوونەوە نیەو مردووەکانمان زیندوو نابێتەوە، یان ناگەڕێنەوە بۆ ناومان، یاخود چۆن کافر کاتێك کە خۆی مردو سزای بینی ئەو کاتە تەواو بێ ئومێد ئەبێ لە گەڕانەوە بۆ دونیاو تەوبە کردن نیە، واتە: ئەوانە بەو شێوازە بێ ئومێدن، والله أعلم..؟!

**(خوای گەورە) دەفەرمووێت** : قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١١﴾ [الحَج : ١١] واتە : [ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ ] دەشتنشینەکان ئەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - وە موسڵمان دەبوون و دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان، ئەگەر باران و بەروبوم و منداڵیان زۆر بوایە دەیانوت دینەکەمان دینێکی چاکەو بەردەوام دەبوون لەسەری، وە ئەگەر وشکەساڵی و بێ بەرهەم و بێ منداڵ بوونایە دەیانوت دینەکەمان خێری تیادا نیەو پاشگەز دەبوونەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: وە لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن کە عیبادەتی خوای گەورە ئەکەن لەسەر گومان و دامەزراو نین [ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ ] ئەگەر خێرێکی دونیایی لە خۆشگوزەرانی و لەشساغی تووش بێت ئەوە جێگیر ئەبێ و دڵنیا ئەبێت لەسەر دینەکەی و بەردەوام ئەبێت [ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انْقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ ] بەڵام ئەگەر تووشی نەخۆشی یان نەبوونی بێت ئەوە هەڵئەگەڕێتەوەو دەستبەرداری دینەکەی ئەبێت و پاشگەز ئەبێتەوەو بەرەو کوفر ئەچێت [ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ] کە بەهۆی ئەمەوە دونیاو قیامەت لەدەست ئەدات و زەرەرمەند دەبێت [ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ ] کە ئەمەش بە دڵنیایی زەرەرمەندیێتی ڕوون و ئاشکرایە..؟!

٤-بێ باوەری بەرانبەر پێغەمبەران - عليهم السلام - :

**بێ گومان باوەر یان ئیمان هێنانی روکنێکە لە روکنە کانی ئیمان هێنان ، چونکە پەیایەکە لە پایەکانی ئیمان ، ئەگەر ئەم روکنە یان پایە بشکێت ئەوا پایەك لە پایەکانی ئیمان دەشکێت ..؟! چونکە پێغەمبەران رەحمەتن بۆ سەرجەم بەندەکانی (خوای گەورە ) ، چونکە ئەوان پێشەوای ئۆمەتەکانیانن ئەوا ئیمان هێنان و گوێرایەلکردنیان دەبێتە رازی بوونی (خوای گەورە ) و بەدەست هێنانی بەهەشت ..؟! بەلام ئەگەر ئیمان یان باوەریان پێ نەهێنرێت ئەوا لە رەحمەتی خوا دوور دەکەوێەوە و ، هەورەها توورەیی خوا سزاو ئازاری بەندە دەدرێت ، دەخرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە ..؟! بۆیە ئیمان یان باوەر نەهێنان بە پێغەمبەران ، هۆکارێکە بۆ مایە پووچ بوون و زەرەرمەند بوون لە دونیاو لە دوارۆژ دا ..؟!**

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾﴾ [البَقَرَة : ٢٨٥] واته : [ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ] پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم وه باوه‌ڕداران ئیمانیان به‌و قورئانه پیرۆزه هێناوه كه له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگاره‌وه بۆیان دابه‌زیوه، وه به هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی كه له‌م قورئانه‌دا هه‌یه [ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ ] هه‌موویان ئیمانیان به خوای گه‌وره‌و مه‌لائیكه‌ته‌كانی و كتێبه ئاسمانیه‌كانی و پێغه‌مبه‌رانی هێناوه [ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ ] ئێمه جیاوازی ناكه‌ین له نێوان هیچ پێغه‌مبه‌رێك له پێغه‌مبه‌ران و ئیمان به هه‌ر هه‌موویان ئه‌هێنین [ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ] وه باوه‌ڕداران وه پێغه‌مبه‌ره‌كان فه‌رموویان: ئه‌ی په‌روه‌ردگار ئێمه به‌گوێ فه‌رمایشتی تۆمان بیست وه لێی تێگه‌یشتین وه گوێڕایه‌ڵی تۆمان كردو وه‌ڵاممان دایته‌وه [ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ] ئه‌ی په‌روه‌ردگار تۆش لێمان خۆشبه وه مه‌صیرو سه‌ره‌نجام و گه‌ڕانه‌وه‌ی ئێمه هه‌ر بۆ لای تۆیه.

## چوارم : وازهێنان له واجبه‌كان :

١-وازهێنان له نوێژه وجبه‌كان : بێ گومان (خوای گه‌وره ) فه‌رمانی به به‌نده‌كانی كردووه هه‌لسن به ئه‌نجامدانی هه‌موو واجبه فه‌رزه كان كه له‌سه‌ر به‌نده واجب و فه‌رزه ، هه‌روه‌ها ئه‌نجامدانی كارو كرده‌وه‌ی چاكه ، چونكه ده‌بێت ووریار نوێژه كانمان وه فه‌رمانه‌كانی (خوای گه‌وره ) بین ، واجبه‌كان وه‌كو خۆی جێ به‌جی بكه‌ین ، نابێت به‌هیچ جۆرێك واز له واجبه‌كان بهێنین ، ئه‌گه‌ر هاتوو به‌نده واز له نوێژه واجبه‌كان بهێنێ ئه‌وا ده‌بێته خه‌سارەت مه‌ند بوون و مایه پووچ بوون له دونیاو له دوارۆژدا ، به‌لێ بێ گومان نوێژ هۆكارێكه بۆ زه‌ره‌رمه‌ند بوون و مایه پووچ بوونێكی روون و ئاشكرا له‌دونیاو له دوارۆژدا ، بۆیه وازهێنانی نوێژه واجبه‌كان ده‌بێته مال وێرانی و له ناچوون له دونیاو له دوارۆژدا ..؟!(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا نَادَيۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوٗا وَلَعِبٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ﴿٥٨﴾﴾ [المَائـِدَة : ٥٨] واته: [ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ] له كاتی نوێژدا كه صه‌حابه هه‌ڵسانایه بۆ نوێژه‌كان له ركوع یان له سجودا

بوونایه هەندێك لە جوولەكە گاڵتەیان پێ ئەكردن و پێیان پێ ئەكەنین، یان كە گوێیان لە بانگ بوایە گاڵتەیان پێ دەكرد [ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ] لەبەر ئەوەی ئەمانە كەسانێكن كەم عەقڵ و عەقڵ سووكن بۆیە گاڵتە بە دروشمەكانی خوای گەورە ئەكەن ئەگەر وانەبوایە چۆن گاڵتەیان بە دروشمی خوای گەورە ئەكرد..؟!(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝﴾ [الماعُون : ٤ - ٥] واتە : هەڕەشەی قورس و سەخت و ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو نوێژخوێنانەی كە لە نوێژەكانیاندا بێ ئاگان، وە گوێی پێ نادەن هەر كاتێك بیكەن كاتی ڕۆیشتبێ و بەسەرچووبێ، یان كە بیشیكەن بۆ ڕیا ئەیكەن و چاوەڕێی پاداشت نین لە خوای گەورە، وە ئەگەر نەیشیكەن لە سزای خوای گەورە ناترسێن، واتە: پەیوەست نین بە نوێژەكانیانەوە، جا هەر نەیكەن ئەوە هەڕەشەكە ئەیانگرێتەوە، وە ئەوانەیشی كە ئەیكەن بەڵام دوای ئەخەن تا كاتەكەی تەواو ئەبێ، یان كەموكوڕی ئەكەنە ڕوكنەكانییەوە یان مەرجەكانییەوە یان خشوعی تیادا نابێت یان بۆ ڕیا ئەیكەن و مەبەستیان پێی ڕیایە هەموو ئەم شتانە ئەگرێتەوەو سیفەتی مرۆڤی دووڕووە..؟!

٢–وازهێنانی فەرزی زەكات : بێ گومان (خوای گەورە ) زەكاتی لە سەر موسلمانان واجب كردووە ، وازهێنان لەم فەرزو واجبە ، كە فەرمانی (خوای گەورە) ی لە سەر ، ئەمە حكمە كەی بێ باوەریە چونكە بەجێ نەهێنانی واجب یان فەرزێك كە فەرمانی (خوای گەورە ) لەسەر ئەمە كوفر كردنە ..؟! بۆیە بەندە دەبات بۆ دۆزەخ ، هەروەها چایە پووچ دەبێت لەدونیا و لە دوارۆژدا ..؟! (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ۝﴾ [فُصِّلَت : ٧] واتە : [ الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ ] ئەو كەسانەی كە زەكاتی ماڵیان نادەن، یاخود خۆیان پاك ناكەنەوە لە شیرك و تاوان و ڕەوشت نزمی [ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ] وە ئەوان باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە نیەو كافرن پێی..؟!

٣–بەجێ نەهێنانی بەڵێن و عەهدو پەیمان (خوای گەورە ) : هەروەكو (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ۝﴾ [البَقَرَة : ٢٧] واتە : ئەوانەی كەپەیمانی خوا دەشكێنن و(هەڵی دەوەشێننەوە) پاش بەستنی وە ئەیپچڕێنن ئەو (پەیوەندیانە) ی كەخوا فەرمانی داوە بەپەیوەستی كردنی وەلەزەویدا خراپە دەكەن هەر ئەوانن زەرەرمەند و ڕەنجەڕۆ..؟!

## پێنجەم : دەبێتە نەهانی لێ خۆش بوون وە ڕەحمەتی (خوای گەورە) بۆ بەندە :

بێ گومان دەزانرێت كە هەموو بەندەیەكی ئیماندار و چاكە كار ، بە سروشتی خۆی تامەزرۆی ئەنجامدانی پەرستنی (خوای گەورە ) وە گوێڕایەلكردنی لە فەرمانەكانی وە دوور كەوتنەوە لە قەدەغەكراوەكانیەتی ، چونكە ئەنجامدانی پشتی هەموو كردەوەیەكی چاكە یان بەجێ هێنانی واجب فەرزەكان ، مەبەستی بەندە ئەوەیە كە بگات بە ڕەزامەندی (خوای گەورە) وە لێ خۆش بوون و ڕەحمەتی (خوای گەورە ) لە ڕۆژی دوای ، هەروەها سەركەتنی گەورەش ئەوەیە بەدەست هێنانی بەهەشتی (خوای گەورە ) یە ..؟! بەلێ ئەگەر مرۆڤ یان بەندەی (خوای گەورە) لە بیر چوونەوەیەك یان هەلەیەكی ئەنجامدان ، ئەوا هەندە عیبدار نابێت ، بەلكو سروشتی مرۆڤ هەروایە هەلە یان لە بیر چوونەوەی دەكات ، هەلبەتە ئەمەش لاوازی مرۆڤ نیشاندەدات بەرانبەر بە شەیتانی

ملعون ..؟! به‌لیٚ ده‌رئه‌نجام و چاره نووسی مایه پووچ بوون ، ئه‌وه‌یه که له ده‌ستدانی گه‌وره‌ترین شته ، ئه‌ویش لیٚ خۆش نه‌بوون و ره‌حمه‌ته ، که (خوای گه‌وره ) بۆ به‌نده‌كانی داناوه له دونیاو له دوارۆژدا ، هه‌لبه‌ته زه‌ره‌مه‌ندو و مایه‌پووچی گه‌وره ئه‌وه‌ی که (خوای گه‌وره ) له به‌نده‌كه‌ی خۆش نه‌بێت ، ره‌حمه‌ته‌كه‌ی نه‌ی گیرێته‌وه له دونیاو له دوارۆژدا ، هه‌روه‌كو (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویٚت : قال تعالی: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ۝٢٣﴾ [الأَعْرَاف : ٢٣] واته : {ئادەمو حەوا تەوبە دەکەنو بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە} [ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا ] هەردووکیان یەکسەر تەوبەیان کرد وەکو ئیبلیس نەبوون کە تاوانی کردو تەوبەی نەکرد، بەڵکو ئەمان یەکسەر دانیان بە تاوانی خۆیاندا نا ئەی پەروەردگار زوڵممان لە نەفسی خۆمان کردو تاوانمان کرد، (پێویستە هەر کەسێك تاوانی کرد وەکو ئادەم و حەوا خێرا تەوبە بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە تا خوای گەورە لێی خۆش بێت) [ وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ] وە ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبی وە ڕەحممان پێ نەکەی ئەوا ئێمە لە زەرەرمەندان ئەبین لە دونیاو قیامەتدا، خوای گەورە لێیان خۆشبوو..؟!



**شه‌شه‌م : بانگه‌وازی كردن بۆ باتل یان كرده‌وه‌ی پووچ  وه وازهیٚنان له حه‌ق و ره‌وا :**

به‌لیٚ بانگه‌وازی كردن بۆ شتی پروپووچ و باتل پیٚچه‌وانه‌ی حه‌ق ره‌وایه ، چونكه دبیٚته هۆكاریٚك بۆ زه‌ره‌رمه‌ند بوونی مرۆڤ ، چونكه باتل واته: تاغووت ، تاغووتیش وه‌كو گویٚرایه‌لی كردنی شه‌یتان ، هه‌روه‌ها په‌رستن صنم و یان په‌رستنی غیری (خوای گه‌وره ) وه یان بیروباوه‌رو معتقداتیٚك دژی ئیمان و باوه‌ر بیٚت به (خوای گه‌وره ) به‌لیٚ چونكه بیرو باوه‌ری باتل یان كارو كرده‌وه‌یٚك دوور له به‌ندایه‌تی كردنی (خوای گه‌ره ) ئه‌مه واده‌كات به‌نده‌ی ئیماندار ، ئاین و ئیمانه‌كه‌ی له ده‌ست بدات ، ئه‌وه‌ش ده‌بیٚته مایه پووچ بوون له دونیاو له رۆژی قیامه‌تدا ..؟!

(خوای گه‌وره) دفه‌رموویٚت : قال تعالی: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ ۚ أَفَبِٱلْبَـٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ۝٧٢﴾ [النَّحْل : ٧٢] واته : [ وَيَعْبُدُونَ مِنْ

دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ شَيْئًا ] وە جگە لە خوای گەورە کەسانێك ئەپەرستن کە هیچ ڕزق و ڕۆزیەکیان بەدەست نیەو ناتوانن ڕزق ئێوە بدەن نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا هیچ شتێکیان نیە [ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ] وە تواناشیان نیە کە هیچ ڕزقێك بە ئێوە بدەن و هیچ هەڵسوکەوتێك بکەن لەبەر ئەوەی مردوون یان لەبەر ئەوەی دارو بەردو بێگیانن..؟!

(خوای گەورە) دفەرموویێت : قال تعالى: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ۝٦٧﴾ [العَنكَبُوت : ٦٧]واتە : [ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا ] ئایا کافرانی قورەیش نابینن ئێمە ئەو کەعبە پیرۆزمان لەوێ بۆ داناون کە بۆتە مایەی ئەمن و ئاسایش بۆیان [ وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ] وە خەڵکی لە دەوروبەری ئەوانەوە ئەڕفێندرێت و ئەدرێت بەسەریانداو ماڵ و سەروەت و سامانیان ئەبرێت، بەڵام ئەمان بەهۆی کەعبەی پیرۆزەوە پارێزراون [ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ ] ئایا ئەوان بە شتی باتڵ و پووچەڵ باوەڕ ئەکەن [ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ ] بەڵام کوفرانەی نیعمەتەکانی خوای گەورە ئەکەن بەسەریانەوە..؟!

## حەوتەم : سووك بوونی کێش لە تەرازووی کردەوە کانی لەرۆژی قیامەت:

**بەلێ بێ گومان سووك بوون لە سەر کێش و تەرازووی کردووە کان ، لەرۆژی قیامەتدا ، ئەمە هۆکارێکە نەبوونی گوێرایەلی کردن و پەرستنی (خوای گەورە ) ، هەروەها بەجێ نەهێنانی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) و دوور نەکردنەوە لە قەدەغەکراوەکان ، ئەمانە دەبێتە دەرئەنجانی سووك بوون کێش کردەوەکان لە سەر تای تەرازوو لەرۆژی قیامەتدا ..؟!**

(خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ۝٩﴾ [الأَعۡرَاف : ٩]واتە : وە هەر کەسێك تای تەرازووی کردەوە چاکەکانی سووك بێ ئا ئەوانە خۆیان دۆڕاندووە بەهۆی ئەوەی سەبارەت بە ئایەتەکانی ئێمە زوڵم و ستەمیان ئەکردو شوێنی نەئەکەوتن و بەگەورەیان

نەئەزانی، لە رۆژی قیامەتدا کردەوەکان و پەڕاوەکان و مرۆڤەکانیش دەکێشرێن، بەڵام سوکی و قورسی مرۆڤەکانیش هەر بە هۆی ئیمان و کردەوەی چاکەوەیە کە قاچە باریکەکانی (عبداللە-ی کوڕی مەسعود) لە تەرازوی قیامەت لای خوای گەورە لە شاخی ئوحود قورستر و سەنگینترە، وە مرۆڤی قەڵەوی گەورە دێنن لای خوای گەورە سوك و بێنرخەو کێشی باڵە مێشولەیەکی نیە، وە تەوحیدو (لا الە الا اللە) قورسترین کردارن لە تەرازوی قیامەت کە لە نەوەدو نۆ سجل تاوان قورستر بوون کە هەر سجلێك چەندێك چاو بڕ بکات ئەوەندە گەورە بوون..؟!

**بەلێ سووك بوونی کیش لە تەرازووی کردەوەکان دەبێتە مایە پووچ بوون یان زەرەرمەند بوون بە هۆی زولم و ستەم کردنەوەیە ، وە دەبێتە هۆی وون بوونی ئەو مایەوەیە کە لە ناو ئاینی ئیسلام دا ، ئەویش ئەوەیە پێ دەلێن : مایە پووچ بوون و یان زەرەمەند بوون و رەنجەڕۆ و سەرگەردانی ،ئەمەش کە دبێتە پالنەر بۆئەوەی شوێنی یەکجارەی لە دەرزەخ کە پێ دەلێن : (الهاوية ) بۆ خۆت ئامادەکەی لە نێو ئاگری دۆزەخدا ..؟!**

**(خوای گەورە) دەفەرموویت** : قال تعالى: ﴿مَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ١٠٣ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ١٠٤﴾ [الْمُؤْمِنُون : ١٠٣ - ١٠٤] واتە : [ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ ] وە هەر کەسێك تای تەرازووی کردەوە چاکەکانی سووکتر بێت لە تای تەرازوی کردەوە خراپەکانی [ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ ] ئەمانە نەفسی خۆیان دۆڕاندووەو زەرەرمەند بوونەو بە نەمری لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە..؟! {حاڵی کافران لە ناو ئاگری دۆزەخدا} [ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ ] ئاگر هەموو دەموچاو و روویان دائەپۆشێ و ئەیگرێتەوە [ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ ] وە ئەوان تیایدا چارەیان گرژەو لێویان شۆڕ ئەبێتەوە لە ماندوو بووندا و ددانەکانیان دەرئەکەوێ.

### ئایەتی (٦٥)

قال تعالى: ﴿وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ٦٥﴾ [البَقَرَةِ : ٦٥]واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێوە (دەنگ وباسی) ئەوانەتان زانیبوو لەخۆتان کەدەست درێژیان کرد لە رۆژی شەممەدا ئەمجا پێمان وتن ببن بەمەیمونی دوور خراوە لەبەزەیی خوا..؟!

بە لێ ئە مە ش کارو کردە وە ی جوولە کە ی فیل باز و دروزن و بی بە لین ، واتە: وە ئێوە (باوك و باپیرانتان) باش بەسەرهات و رووداوی ئەو کەسانە ئەزانن کە لە گوندی ئایلە دەستدرێژیان کردو سنووری خوای گەورەیان بەزاند بەوەی کە خوای گەورە قەدەغەی ڕاوی ماسی لێ کردن لە رۆژی شەممەدا بەڵام ئەوان فێڵیان کردو ڕاوەکەیان کرد، [ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ (٦٥) ] خوای گەورە شێوەیانی گۆڕی بۆ مەیمونی زەلیل و ڕیسوا..؟!

بەلێ دەستدرێژی و سنووربە زاندن لەرۆژی شەمەدا ، هەروەها لەسەر ئەم سەرپێچەی نەوەی جوولەکە ئەنجامیاندا ،ئەوە بوو (خوای گەورە ) لە نەفسیاندا ریسواو زلیلی کردن بە مەیمون و بە بەراز ،هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ﴾ [البَقَرَة : ٦٥] واتە: لە حال بارو دۆخی ئەم کەسانەشتان ئاگاداربوون ، کەوا لە رۆژی شەمەدا لە خۆتان دەست درێژیان کرد ، واتە : ئەی کۆمەلی جوولەکە خۆتان زانیوتانە کەچی بەسەر خەلکی ئەم شارە هات کە سەرپێچی فەرمانی (خوای گەورە) یان کرد و بەلێن و پەیمانەکەیان نەبردەسەر یان شکاندیان کە لێ وەر گرتبوون کە رێزی رۆژی شەمە بگرن و فەرمانی (خوای گەورە ) جێ بەجێ بکەن ، بەلام لە پێشان بۆیان درەست بوو ، فێلیان بەکار هێنان بۆ راوکردنی ماسی لە رۆژی شەمەدا ، کاتێ کە بەو کارە هەلسان ، (خوای گەورە) شێوەی گۆرینە سەر شێوەی مەیموون ، کە شێوەیان دەچێتە سەر شێوەی مرۆڤ لە روخساری دەرەوەیان ، ئەوەندە ریسواو ناشرین بوون کە بەهیچ جۆرێك لە مرۆڤی راتسەقینە ناچن ..؟!هەر بەم جۆرەش هەلسوکەوتی ئەوانە و فێلبازیان لەرووی دەرەوە لەحەق دەچوو، کەچی لەراستی لە رووی ناوەوەیاندا پێچەوانەی حەق راستی بوون ..؟! هەر بۆیە بەلایەنی کەم دەبێت سزاکە شیان لە شێوەی کارەکانیان بێت ، هەر بۆیە قوئانی پیرۆز لە سورەتی (الاعراف ) دا بەروونی باس دەکات.

لە (ابن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ئەوانەی دەستدرێژیەکەیان کرد لە رۆژی شەمەدا ، ماوەیەکی کەم بوونە مەیموون و پاشان لە ناو چوون ، هیچ کەسێ لەوانەی بوونە مەیموون و بەراز وە چەیان نەما ..؟! .[1]

هەروەها لە سورەتی (الاعراف ) (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾﴾ [الأَعۡرَاف : ١٦٣] واتە : {بەسەرهاتی هاوەلانی رۆژی شەمە} [ وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیار لە جوولەکەکانی مەدینە بکە سەبارەت بەو دێ¬یەی کە لە رۆخی دەریا بووە کەدێی (ئەیلە) بووە لە کەناری دەریای (قلزەم)، لە نێوان (مەدیەن و طور) واتە ئەمە بە جوولەکەکان بڵێ و یادیان بخەرەوە: کە باوك و باپیرانیان ئاوایان کردووە [ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ ] کاتێك کە دەستدرێژیان ئەکرد لە رۆژی شەممەدا کاتێك کە خوای گەورە وەکو تاقیکردنەوە قەدەغەی لێ کردن کە لە رۆژی شەممەدا ڕاو بکەن [ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا ] لە ڕۆژی شەممەشدا بەلێشاو ماسی ئەهاتە سەر دەریاکە لە هەموو شوێنێکەوە، وە بەچاوی خۆیان ئەیانبینی و ئەیانتوانی بەئاسانی ڕاوی بکەن [ وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ ] بەڵام جگە لە ڕۆژی شەممە ماسیەکان دەر نەئەکەوتن [ كَذَلِكَ نَبْلُوهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ] بەم شێوازە ئێمە تاقیمان کردنەوە بەهۆی فیسق و لەڕێ دەرچوونی خۆیان کە ئەوانیش فێڵیان کردو لە ڕۆژی

[1] -ابن ابي حاتم (٢٠٩/١).

شەممەدا ڕاوی ماسییان کرد بەوەی تۆڕیان ئەخستە ناوی بەڵام لە شەممە دەریان نەئەکرد لە یەك شەممە دەریان ئەکرد، یان جۆگەلەیان لێ ئەدا دواتر بەریان ئەگرت لە شەممە دەریان نەئەکرد لە یەك شەممە ئەوەی ناو جۆگەکەیان دەرئەکرد..؟!

**هەروەها** (ابن جرير ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەربارەی ئەم ووتەیەی (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم﴾ [الْأَعْرَاف : ١٦٣] دەڵێت :ڕۆژێك کە شەمە نەبوایە ماسیەکان بە دیار نە دەکەوتن ، واتە: ئێمە ئاوا تاقیان دەکەینەوە ..؟! : (ابن جرير ) دەڵێت : ئێمە تاقیان دەکەینەوە ماسیەکانیان بۆ دەخەینە سەر ئاو دەریان دەخەین کە لەو ڕۆژەدا لێیان قەدەغکراوە و لە ڕۆژە حەلالە کانیشدا ماسیە کان لێیان دەشارینەوە دیار ناخەین کە ڕاویان بکەن ..؟! هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣﴾ [الْأَعْرَاف : ١٦٣] واتە: ئەوکەسانەی لە ڕێگەی خودا لادەدەن ئێمە ئاوا تاقیان دەکەینەوە ، واتە: بەهۆی لادانیانەوە لە فەرمانی (خوای گەورە ) دا ..؟!.[1]

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( کارێك مەکەن کە جوولەکان کردیان ، قەدەغەکراوەکانی (خوای گەورە) یان حەلال کرد بە هەندێك فروفێل )) .[2]

لە(ابن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : (خوای گەورە ) شێوەی کۆمەلێك لە نەوەی جوولەکەی گۆرین و کردنیە بە مەیموون بە هۆی ئەو سەرپێچیە کەیانەوە ، دەڵێت :جگە لە سێ ڕۆژ بە زیندووی نەماونەتەوە لە سەر زەوی ، ووتی : هەرگیز ئەوانەی کەشێوەیان گۆراوە سێ ڕۆژ نەماونەتەوە ، نەخواردن و نە خواردنەوە و نە وە چەشیان بوو ، (خوای گەورە ) مەیموون و بەراز و هەموو دروستکراوەکانی تریشی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە ، وە (خوای گەورە) لە کتێبەکەیدا باسی کردووە ، چونکە (خوای گەورە ) شێوەی ئەم کۆمەلە جوولەکەی گۆریوە ویستی خۆیەتی هەرچی بوێت بەهەر کەسێ دەیکا و مەیلی خۆیەتی چۆنیشی دەگۆرێ ..؟! .[3]

**هەروەها** (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿عَذَابٗا شَدِيدٗاۖ قَالُواْ مَعۡذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ١٦٤ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٥ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ١٦٦﴾ [الْأَعْرَاف : ١٦٤ - ١٦٦] واتە : [ وَإِذۡ قَالَتۡ أُمَّةٞ مِّنۡهُمۡ لِمَ تَعِظُونَ قَوۡمًا ٱللَّهُ

[1]-تفسير طبري (١٨٣/١٣).
[2]-الزفاف سند حسن برقم (١٩٢).
[3]-تفسیری الطبري (١٦٧/٢).

مُهْلِكُهُمْ ] خه‌ڵكی بوونه سێ كۆمه‌ڵ: كۆمه‌ڵێك ڕاویان كرد، وه كۆمه‌ڵێك ڕاویان نه‌كرد به‌ڵام فه‌رمانیان پێیان نه‌ئه‌كرد به‌چاكه‌و نه‌هیشیان لێ نه‌ئه‌كردن له خراپه، وه‌كۆمه‌ڵێك ڕاویان نه‌كردو فه‌رمانیشیان پێ ئه‌كردن به‌چاكه‌و نه‌هیان لێ ئه‌كردن له خراپه، كۆمه‌ڵی دووه‌م كه خۆیان راویان نه‌كرد به‌ڵام به‌وانه‌ی كه ئامۆژگاری خراپه‌كارانیان ئه‌كرد پێیان وتن بۆچی ئێوه ئامۆژگاری كه‌سانێك ئه‌كه‌ن كه خوای گه‌وره له‌ناویان ئه‌بات [ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ] یاخود سزایه‌كی به‌ئێش و ئازارو سه‌ختیان ئه‌دات بۆ وازیان لێ ناهێنن [ قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ (١٦٤) ] وتیان: بۆ ئه‌وه‌ی لای خوای گه‌وره عوزرێكمان هه‌بێ كه ئێمه ئامۆژگاری ئه‌مانه‌مان كردووه، وه به‌ڵكو ئه‌وانیش ته‌قوای خوای گه‌وره بكه‌ن و ده‌ست هه‌ڵگرن له‌و سه‌رپێچی كردنه‌ی خوای گه‌وره..؟! {خوای گه‌وره خراپه‌كارانی كرد به مه‌یمونو به‌راز} [ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ ] كاتێك ئامۆژگاری پیاوچاكانیان له‌یاد كردو وه‌ریان نه‌گرت، وه به‌رده‌وام بوون له‌سه‌رپێچی كردنی خوای گه‌وره [ أَنْجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ ] ئه‌وانه‌ی كه قه‌ده‌غه‌ی خه‌ڵكیان ئه‌كرد له خراپه ئه‌وانمان ڕزگار كرد [ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ (١٦٥) ] ئه‌وانه‌شی كه سته‌مكار بوون ڕاویان ئه‌كرد له ڕۆژی شه‌ممه ئه‌وانه‌شمان بردووه به سزایه‌كی زۆر سه‌خت و به‌ئێش و ئازار به‌هۆی فیسق و له‌ڕێ ده‌رچوونی خۆیان، كه خوای گه‌وره كردنی به مه‌یمون و به‌راز، به‌ڵام خوای گه‌وره باسی كۆمه‌ڵی دووه‌می نه‌كرد كه ڕاویشیان نه‌كردو ئامۆژگاری خه‌ڵكیشیان نه‌كرد، (ابن عباس) ئه‌فه‌رمووێ: نازانم ئایا ڕزگار بوون یان نا تا دواتر (عیكریمه) بۆی ئه‌سه‌لمێنێ كه خوای گه‌وره ئه‌وانیشی ڕزگار كردووه، (كه‌واته پێویسته مرۆڤ هه‌ر چاك و صاڵح نه‌بێت بۆ خۆی، به‌ڵكو پێویسته چاكسازو موصڵیح بێت بۆ جگه له خۆی)..؟! [ فَلَمَّا عَتَوْا عَنْ مَا نُهُوا عَنْهُ ] كاتێك ئه‌مانه سه‌ركه‌شی و عینادیان كرد وه خۆیان به‌گه‌وره‌زانی له‌وه‌ی كه قه‌ده‌غه‌یان لێ كراو هه‌ر كردیان [ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ (١٦٦) ] خوای گه‌وره فه‌رمانی پێ كردن ببن به مه‌یمونی زه‌لیل و ڕیسواو ده‌ركراو خوای گه‌وره كردنی به مه‌یمون، له ئایه‌تی تر كردنی به مه‌یمون و به‌رازو ته‌نها سێ ڕۆژ دوای ئه‌وه هه‌موویانی مراند..؟!

## باسێكی كورت ده‌رباره‌ی (أصحاب السبت )

**به‌لێ چیرۆكی (اصحاب السبت ) واته : هاوه‌لانی رۆژی شه‌مه ، ئه‌وانه بوون كۆمه‌لێك له نه‌وه‌ی جووله‌كه بوون ،بێ گومان ئه‌وانه به فێل له‌م رۆژه دا راوه ماسیان كردو فه‌رمانی (خوای گه‌وره ) شكاند سه‌رپێچیان كرد، (خوای گه‌وره ) باسی ئه‌م شاره ده‌كات كه بوون به سێ ده‌سته‌وه ، ئه‌وانه‌ی لێی ئاگاداراكرابوون نه‌یكه‌ن و سه‌رپێچیان كردو فه‌رمانه كه‌یان شكاند ، به فرۆ فێل هه‌ستان به راوكردنی ئه‌و ماسیانه له رۆژی شه‌مه‌دا ، وه‌ك له پێشه‌وه له سوره‌تی (البقره ) باسكرا ، ده‌سته‌یه‌كی تر به‌رگریان له‌وه كردو نزیكی نه بوونه‌وه له راو كردنی ماسیه‌كان ، ده‌سته‌یه‌كی تریشیان بێ ده‌نگ بوون و راو ماسیان نه‌كردو به گریشیان لێ نه‌كرد ، وه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾ [ٱلْأَعْرَاف : ١٦٤] واته: ده‌سته‌یه‌كیش له خۆیان ووتیان : بۆ چی ئێوه ده‌رباره‌ی كه‌سانێك كه خودا ده‌یه‌وێت قریان بكات ، یان به توندی ئازاریان بدات به ئامۆژگاریه‌وه خه‌ریكن ..؟! واته: ووتیان : به‌وانه‌ی كه ناره‌زاییان ده‌ربری پێیان ووتن : قال تعالى: ﴿مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ﴾ [ٱلْأَعْرَاف : ١٦٤] واته : تا لای په‌روه‌ردگارتانه‌وه تووشی شه‌رمه‌زاری نه‌بین ..؟! كه به‌لێنی لێ وه‌ر گرتووین فه‌رمان بكه‌ن به چاكه و به رگری بكه‌ن له خراپه ، به‌لكو ئه‌وانیش پارێزگار بن**

و بترسن قال تعالى: ﴿وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ۝١٦٤﴾ [الْأَعْرَاف : ١٦٤] به‌لام (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ۝١٦٥﴾ [الْأَعْرَاف : ١٦٥] واته: كاتێك ئه‌و ئامۆژگاری كردنه‌یان له‌ بیر خۆیان برده‌وه‌ ، ئه‌و كه‌سانه‌مان رزگار كرد كه‌ دژی خراپه‌ وه‌ستان و به‌رگریان كرد له‌ چاكه‌ ، وه‌ زۆر به‌توندی ئازاری ئه‌وانه‌شماندا كه‌ ناره‌وایان كرد یان ناحه‌قی كار بوون و له‌ رێگه‌ی راست لایاندا بوو ، واته: كاتێك ئه‌وانه‌ی ئه‌و كاره‌یان كردو ئامۆژگاریان وه‌رنه‌گرت سزایه‌كی زۆر توندمان دان ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ۝١٦٥﴾ [الْأَعْرَاف : ١٦٥] واته : ئه‌وانه‌شی كه‌ سته‌مكار بوون ڕاویان ئه‌كرد له‌ ڕۆژی شه‌ممه‌ ئه‌وانه‌شمان برده‌وه‌ به‌ سزایه‌كی زۆر سه‌خت و به‌ئێش و ئازار به‌هۆی فیسق و له‌ڕێ ده‌رچوونی خۆیان، كه‌ خوای گه‌وره‌ كردنی به‌ مه‌یمون و به‌راز، به‌ڵام خوای گه‌وره‌ باسی كۆمه‌ڵی دووه‌می نه‌كرد كه‌ ڕاویشیان نه‌كردو ئامۆژگاری خه‌ڵكیشیان نه‌كرد، (ابن عباس) ئه‌فه‌رمووێ: نازانم ئایا ڕزگار بوون یان نا تا دواتر (عیكریمه‌ ) بۆی ئه‌سه‌لمێنێ كه‌ خوای گه‌وره‌ ئه‌وانیشی ڕزگار كردووه‌، (كه‌واته‌ پێویسته‌ مرۆڤ هه‌ر چاك و صاڵح نه‌بێت بۆ خۆی، به‌ڵكو پێویسته‌ چاكسازو موصڵیح بێت بۆ جگه‌ له‌ خۆی)..؟!



به‌ڵێ ئه‌وه‌ بوو (اصحاب السبت ) هاوه‌ڵانی رۆژی شه‌مه‌ ئه‌و ده‌سته‌ جووله‌كه‌یه‌ی كه‌ رۆژی شه‌مه‌ دا په‌یمانیان شكاند ، هه‌ستان به‌ فرو فێڵ كردن له‌ راوه‌ ماسی ، ئه‌وه‌ بوو كه‌ فه‌رمانی خوا یان شكاندو سنووریان به‌زاند ..!! ئه‌مانه‌ له‌سه‌ر لێواری ده‌ریایی سوو بوون ، شارێك هه‌بوو پێ ده‌ووترا : (ئه‌یلاء ) له‌ نێوان مه‌دیه‌ن و كێوی طور كه‌ ده‌كه‌وێته‌ بیابانی (سیناء) ئه‌م خه‌لكه‌ جووله‌ كه‌یه‌ له‌م شوێنه‌دا نیشته‌ جێ بوون ، ئه‌وان له‌ رێ لایاندا و سنووریان به‌زاندو سه‌رپێچی فه‌رمانی (خوای په‌روه‌ردگاریان ) كرد و ، دوای ئه‌وه‌ی توبه‌یان نه‌كرد (خوای گه‌وره‌) سزایه‌كی توندی دان ، ئه‌وانی كرد به‌ مه‌یمون ، ده‌گێرنه‌وه‌ گه‌نج و لاوه‌كانیان بوون به‌ مه‌یموون ، به‌لام پیرو به‌سالاچووه‌ كانیان بوونه‌ به‌ به‌راز ، پاشان ئه‌و ده‌سته‌ جووله‌ كه‌یه‌ هه‌موویان له‌ ناو چوون ته‌نها سێ رۆژ له‌ ژیان مانه‌وه‌ هیچ وه‌چه‌یه‌كیان نه‌مایه‌وه‌ ..؟! چیرۆكه‌كه‌ ئه‌مه‌یه‌ كه‌ هه‌ندێك له‌ نه‌وه‌ی ئیسرائیل یان جووله‌كه‌ هاتنه‌ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر (مووسا) — علیه السلام — ووتیان : ئه‌ی (مووسا ) تۆ چۆن فه‌رمانی گۆشه‌ گیریمان پێ ده‌كه‌ی ، بۆ په‌رستن و عیباده‌ت كردنی له‌ رۆژی هه‌ینی دا ، وه‌ فه‌زلی ئه‌و رۆژه‌ ده‌ده‌ی به‌ سه‌ر رۆژه‌كانی تر؟!

بەلکو رۆژی شەمە بۆ پەرستن عیبادەت کردن لە هەموو رۆژەکانی تر باشترە ، (خوای گەورە ) ئاسمانە کان و زەوی و هەموو شتیچکی لە ماوەی شەش رۆژدا دروست کردووە ، وە هەموو شتێك لەم رۆژە دا بۆ (خوای گەورە ) ملکەچ و گوێڕایەل بووە و کۆتایەمین رۆژە لەم شەش رۆژە دا ، بەلام کاتێك دەستە جوولەکە کە پێدا گریان کرد بۆ رۆژی شەمە وە خۆیان یەلاکردەوە بۆ پەرستن لە رۆژی شەمە ، ئەوە بۆ (خوای گەورە ) وەحی نارد بۆ (مووسا ) – علیه السلام – بەم دەستە جوولەکەیە یان بە نەوەی ئیسرائیلیە کان رابگەیەنێت ، کە لە رۆژی شەمەدا هیچ کارێك نابێت بکەن وەك چۆن خۆیان ئەم داوایە یان کردووە ، یان وەك چۆن خۆیان ئەم رۆژە یان بۆ پەرستن هەلبژاردووە ..؟! ئەوان کارو پیشە کایان راوە ماسی بوو، بە هۆی ئەوەی هەلکەوتەی شارەکەیان لە سەر لێواری دەریا سوور بوو ، کە گوندێك بوو یان شارێك بوو پێ دەووترا : (ئەیلاء ) ، بەلێ وە کو چۆن خۆیان ئەم داوایەیان کردبوو ، لەم رۆژە دا واتە : رۆژی شەمە هیچ راوەماسیەك ئەنجام نەدەن ، واتە: راوی ماسی وە خواردنی گۆشتی ماسی لەو رۆژەدا لە سەر نەوەی جوولەکە دا قەدەغەو حەرامکرا ..؟! بۆیە (خوای گەورە ) خەلکی ئەم گوندەی (ئەیلاء)ی تاقی کردەوە و لە رۆژی شەمەدا ، لە ناو دەریا ماسەیە کان بە رێژەیەکی یەکجار زۆر بەر چاو یان دەکەوتن ، دەلێن : ئەوەندە زۆر بوون ماسیەکان سەر ئاو دەکەوتن ، ئەوە بوو ماسیەکان دەهاتنە سەر لێواری دەریاکە و گەمەو یاریان دەکرد ، بۆیە راو کردنی ماسیەکان لەم رۆژە دا زۆر سووك ئاسان بوو ..؟! وەکاتێك رۆژی شەمە تێ دەپەری ، ماسیەکانیش نەدەمان ، وە لە بەر چاویان دا وون دەبوون ، واتە : لە رۆژانی تری حەفتە ماسیەکان نەدەمان ، جگە لە رۆژی شەمە نەبێت کە بەرێژەیەکی یەکجار زۆر بەر چاو دەکەوتن ، واتە : رۆژانی وەکو یەك شەمە و دووشەمە سێ شەمە و چوارشەمە و پێنج شەمە هەینی ماسیەکان نەدەمان تەنها و تەنها رۆژی شەمە نەبێت سەر ئاو دەکەوتن بەرێژەیەکی یەکجار زۆر ..؟!

هەر وەکو (خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣﴾ [الأعراف : ١٦٣] واتە : {بەسەرهاتی هاوەڵانی رۆژی شەممە} [ وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیار لە جوولەکەکانی مەدینە بکە سەبارەت بەو دێ-یەی کە لە رۆخی دەریا بووە کەدێی (ئەیلە) بووە لە کەناری دەریای (قلزەم)، لە نێوان (مەدیەن و طور) واتە ئەمە بە جوولەکەکان بڵێ و یادیان بخەرەوە: کە باوك و باپیرانیان ئاوایان کردووە [ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ ] کاتێك کە دەستدرێژیان ئەکرد لە رۆژی شەممەدا کاتێك کە خوای گەورە وەکو تاقیکردنەوە قەدەغەی لێ کردن کە لە رۆژی شەممەدا راو بکەن [ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا ] لە رۆژی شەممەشدا بەلێشاو ماسی ئەهاتە سەر دەریاکە لە هەموو شوێنێکەوە، وە بەچاوی خۆیان ئەیانبینی و ئەیانتوانی بەئاسانی راوی بکەن [ وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ ] بەڵام جگە لە رۆژی شەممە ماسیەکان دەر نەئەکەوتن [ كَذَلِكَ نَبْلُوهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ] بەم شێوازە ئێمە تاقیمان کردنەوە بەهۆی فیسق و لەرێ دەرچوونی خۆیان کە ئەوانیش فێڵیان کردو لە رۆژی شەممەدا راوی ماسیان کرد بەوەی تۆڕیان ئەخستە ناوی بەڵام لە شەممە دەریان نەئەکرد لە یەك شەممە دەریان ئەکرد، یان جۆگەلەیان لێ ئەدا دواتر بەریان ئەگرت لە شەممە دەریان نەئەکرد لە یەك شەممە ئەوەی ناو جۆگەکەیان دەرئەکرد..؟!

کاتێك ماوەیەك بە سەریاندا تێ پەری ، وە حەز و ئارەزوویان زۆر بوو بۆ خواردنی گۆشتی ماسی ، پیاوێك لەم دەستە جوولەکە سەرگەردانە ، لە رۆژی شەمە دا بە نهێنی رۆیشت بۆ سەر لێواری دەریاکە ، بە تۆرێك ماسیەکی گەورەی راو کرد ، لە قەراغ دەریاکە لەناو ئاو بەجێ هێشت و تۆرەزەی لە قەراغ دەریاکە جێگیر کرد و بەستیەوە بۆ ئەوەی ماسیەکە نەروات ، وە لە رۆژی یەك شمە بێت ماسیەکە لە تۆرەکە دەربهێنی ، بیبات بۆ مالەوە سووری بکاتەوە بی خوات ..؟! بزانە ئەم فروفێل شەیتانەی نەوەی جوولەکە ئەنجامیانداوە لە سەردەمەی پێغەمبەر (مووسا ) کە پێغەمبەرەکەیان لە ناو دا بوو بەم جۆرە خیانەت ناپاکی فرو فێل و تەلەکە بازیان دەکرد ،ئێستاش لەم سەردەمە دا هەر وان زۆر شەرانگێزو ناپاك خیانەتکار فسق خراپەکار درەندە و خوێن رێژن ، تەنها تێنوی خوێنی موسلمانان بەناحەق ، لەم سەردەمەدا بۆ مێژوو بەمە دنووسم کە بۆ ماوەی نزیکە سالێك دەبێت قتل عام کوشتاری موسلمانان دەکەن بەو پەری نامرۆڤانە و دەردانە بە بەرچاوی هەموو جیهان شاری (غەزەی ) فەلەستینیان خابوور وایران کرد بە ئاگرو ئاسن چەکی پێشکەوتووی دەولەتانی رۆژئاوا ، ئێستا رێکەوتی ١٤٤٥/١٢/١٠هـ بەرانبەر ٢٠٢٤/٦/١٦مـ کوشتار جەنگ لە شاری غەزە بەردەوامە ، ئەمەرفتار خراپەکاری جوولەکە ..؟! بەلێ بینەوە سەر باسی خۆمان کاتێك خەلکی گوندەکە بۆنی برژاندنی گۆشتی ماسیان کرد ، وە فروفێلی ئەم پیاوە گەیشت بە خەلکی گەندەکە ، هەندێکیان بە هەمان شێوەی ئەم پیاوە ئەم فروفێلەیان ئەنجامدا ، ئەوانیش بە نهێنی بەردەوام بوون لەسەر ئەم کارە بۆ ماوەیەکی زۆر لە کارە قەدەغەکراوە و حەرامکراوە بەردەوام بوون ..؟! هەندێکی تریش خەلکی گەندە کە ئەم کارەیان نەکردو نەهیان لەم کەسانە دەکرد و نەماسیەکانیاشیان دەخوارد !

(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾﴾ [الْأَعْرَاف : ١٦٤ - ١٦٥] واتە : [ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ ] خەڵكی بوونە سێ كۆمەڵ: كۆمەڵێك ڕاویان كرد، وە كۆمەڵێك ڕاویان نەكرد بەڵام فەرمانیان پێیان نەئەكرد بەچاكەو نەهیشیان لێ نەئەكردن لە خراپە، وەكۆمەڵێك ڕاویان نەكردو فەرمانیشیان پێ ئەكردن بەچاكەو نەهیان لێ ئەكردن لە خراپە، كۆمەڵی دووەم كە خۆیان ڕاویان نەكرد بەڵام بەوانەی كە ئامۆژگاری خراپەكارانیان ئەكرد پێیان وتن بۆچی ئێوە ئامۆژگاری كەسانێك ئەكەن كە خوای گەورە لەناویان ئەبات [ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ] یاخود سزایەكی بەئێش و ئازارو سەختیان ئەدات بۆ وازیان لێ ناهێنن [ قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَى رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ] وتیان: بۆ ئەوەی لای خوای گەورە عوزرێكمان هەبی كە ئێمە ئامۆژگاری ئەمانەمان كردووە، وە بەڵكو ئەوانیش تەقوای خوای گەورە بكەن و دەست هەڵگرن لەو سەرپێچی كردنەی خوای گەورە...؟! {خوای گەورە خراپەكارانی كرد بە مەیمونو بەراز} [ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ ] كاتێك ئامۆژگاری پیاوچاكانیان لەیاد كردو وەریان نەگرت، وە بەردەوام بوون لەسەرپێچی كردنی خوای گەورە [ أَنْجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ ] ئەوانەی كە قەدەغەی خەڵكیان ئەكرد لە خراپە ئەوانمان ڕزگار كرد

[ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ (١٦٥) ] ئەوانەشی کە ستەمکار بوون ڕاویان ئەکرد لە ڕۆژی شەممە ئەوانەشمان بردەوە بە سزایەکی زۆر سەخت و بەئێش و ئازار بەهۆی فیسق و لەڕێ دەرچوونی خۆیان، کە خوای گەورە کردنی بە مەیمون و بەراز، بەڵام خوای گەورە باسی کۆمەڵی دووەمی نەکرد کە ڕاویشیان نەکردو ئامۆژگاری خەڵکیشیان نەکرد، (ابن عباس) ئەفەرمووێ: نازانم ئایا ڕزگار بوون یان نا تا دواتر (عیکریمە) بۆی ئەسەلمێنێ کە خوای گەورە ئەوانیشی ڕزگار کردووە، (کەواتە پێویستە مرۆڤ هەر چاك و صاڵح نەبێت بۆ خۆی، بە ڵکو پێویستە چاکسازو موصلّیح بێت بۆ جگە لە خۆی)..؟!

**هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویّت** : قال تعالى: ﴿فَلَمَّا عَتَوْاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ١٦٦﴾ [الْأَعْرَاف : ١٦٦] واتە : [ فَلَمَّا عَتَوْا عَنْ مَا نُهُوا عَنْهُ ] کاتێك ئەمانە سەرکەشی و عینادیان کرد وە خۆیان بەگەورەزانی لەوەی کە قەدەغەیان لێ کراو هەر کردیان [ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ] خوای گەورە فەرمانی پێ کردن ببن بە مەیمونی زەلیل و ڕیسواو دەرکراو خوای گەورە کردنی بە مەیمون، لە ئایەتی تر کردنی بە مەیمون و بەرازو تەنها سێ ڕۆژ دوای ئەوە هەموویانی مراند..؟!

## ئایەتی (٦٦)

قال تعالى: ﴿فَجَعَلْنَـٰهَا نَكَـٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ٦٦﴾ [البَقَرَة : ٦٦]

واتە : وە بەسەرهات و خەڵکی ئەو دێیەمان کرد بە پەندو عیبرەت بۆ دێیەکانی پێش و دوای خۆیان [ وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ ] وە بێ بە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەو کەسانەی کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن تا ڕۆژی قیامەت..؟! **بەڵێ (خوای گەورە) سزای ئەوانەی کردە بە مەیموون بۆ ئەوەی پەندو عیبرەت وەرگرن ئەوانەی یان جیلی دوای ئەوان دێن ، یان ئەوانەی کە هاو سەردەم یان هاو چەرخی ڕووداوەکە بوون و بۆ ئەوانەش لە دوای ئەوان دێن ، هەروەها کردوویەتی بە ئامۆژگارییە بۆ خواناس و پارێزگاران ، هەروەك دەفەرموویّت :** ﴿فَجَعَلْنَـٰهَا نَكَـٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا

خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ۝٦٦﴾ [البَقَرَةِ : ٦٦] هەروەها سزاكان داركاری كردن یان تەمێ كردنی حدود شەرعیەكان پەندو ئامۆژگارییە بۆ كارا و كەسانی تر ، وە سزایی (خوای گەورە) بەسەر نەوەی جوولەكە پەندو ئامۆژگاریە بۆ كەسێك تەقوای خوا بكات ، هەروەك دەفەرمووێت : ﴿ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ۝٦٦﴾ [البَقَرَةِ : ٦٦] چونكە ئەهلی تەقواداری ئەوانەن كە پەندو ئامۆژگاری و سوود وەردەگرن ، لەبەر ئەوە پەند و ئامۆژگاری تایبەتی كردووە بە ئەهلی تەقوا ..؟! ﴿فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ۝٦٦﴾ [البَقَرَةِ : ٦٦] ئینجا ئەو سزایەمان كە ئەوانەمان گێرا بە مەیموون یان كردمان بە پەند و تەمێ بوون ، پەندوەرگرتنی هەموو ئەو خەلكەی ، كە لە دەوروبەریان بوون و هاوچەرخیان بوون ، وە ئەوانەی لە دوای ئەوانیشەوە دێن كە پەندی لێ وەر بگرن ، لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە ، كە جوولەكان وەك لە دەرسەكانی رابردوودا باسمان كرد ، ئەوان قەمێكن (خوای گەورە ) زۆر نیعمەت و نیشانەو موعجیزەی سەیر سەیر پێداون ، بەلاَم دیسان سزای زۆر گەورەشی داون ..! ! جا ئەمە وا دەر دەكەوێت ، كە هەر كەسێك یان هەر قەومێك (خوای گەورە ) نیعمەتی زۆری بداتێ ، ئەگەر شووكرانەی نیعمەتەكەی خوای نەكرد ..؟! ئەوا (خوای گەورە ) زۆر بە توندیش سزای دەدات ، وەك لە لە سورەتی (المائدە ) (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْۖ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝١١٥﴾ [المَائـِدَة : ١١٥] واته : [قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ] خوای گەورە فەرمووی: من ئەو خواردن و سفرەیەتان بۆ دائەبەزێنم، (موجاهیدو حەسەنی بەصری) دەفەرموون: خوای گەورە بۆی دانەبەزاندن، بەلاَم (جمهورو ابن جریرو ابن كثیر) دەفەرموون: خوای گەورە بۆی دابەزاندن [فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ] بەلاَم هەر كەسێك لە ئێوە لە دوای ئەوە كوفر بكات [فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لَا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ] ئەوە من سزایەكی ئەدەم كە سزای هیچ كەسێكم لە جیهانی سەردەمی خۆتاندا بەو شێوازە نەدابێ، (ابن عباس) ئەفەرمووێ: خوای گەورە لە ئاسمانەوە سفرەو خوانێكی بۆیان دابەزاند كە ماسی و نانی لەسەر بوو وە لە هەر شوێنێكەوە لێیان بخواردایە پڕ بوو لەسەری..؟!

راڤەو شی كردنەوەی ئەو ووشانە :

﴿نَكَٰلًا﴾ : (نكلت به : إذا فعلت به ما ينكل به غيره واسم ذلك الفعل النكال )واتە: كە تۆ سزای كەسێكت دا خەلكی دیكەی پێوە تەمێ بێ یان تەمێ بكرێت ، وە پەندی لێ وەربگرێ ، ئەو كردەوەیە كە تۆ لەگەل كەسێكدا دەیكەی پێ عیبرتگرتووەپێی ،وە تەمێ خواردووبێ ، پێی دەوترێ : (نكال )یش لە (نكل ) وە هاتووە وەك (والنكل : قيد الدابة و حديدة اللجام لكونهما مانعين ، والجمع : أنكال ، (نكل ) واتە: بە پەیوەندی پێی ولاخ دەوترێ ، وە بەو ئاسنەش دەوترێ ، كە دەكرێتە لغاوی ولاخەكە بەرزەو دەخرێتە نێو زاری ، چونكە هەم ئەو پەیوەندەی ، كە دەخرێتە پێی ولاخەوە ، قەدەغەی دەكات لەوە كە بەملاو بەولادا بروا ، وە ئەم ئاسنەش كە دەخرێتە دەمی ولاخەكە ، رێی لێدەگیرێ ، لەوە كە گیاو لەوەر بخوات كۆی (نكل )یش (أنكال )ە ..؟!

﴿بَيْنَ يَدَيْهَا﴾ واتە: پێشی ، یان ئەوانەی لە پێشی بوون ..؟!

﴿وَمَا خَلْفَهَا﴾ واته: دوایی ،یان ئه‌وانه‌ی له دوایی بوون ..؟!

﴿وَمَوْعِظَةً﴾ واته: (الوعظ : زجر مقترن بتخويف ) (وعظ ) واته : تێوه خورینێکه یان لیٚ خورینه‌وه‌یه ، وه‌ك په‌ند و عیبره‌ت ، یان که هاوکات له گه‌ل ترساندن ، وه له (خليل کوری الفراهيدی ) ده‌لێت : (الوعظ ) : هو التذكير بالخير فيما يرق له القلب والظلة : اسم ) واته : (وعظ ) ئه‌وه‌یه که تۆ بیری که‌سێك بخیته‌وه ئامۆژگاریی بکه‌یت ، به شێوه‌یه‌ك که دلی نه‌رم بێت ، وه هه‌ر کام له (عظة) و (موعظة ) ناون ، که به کوردی ده‌لێن ك ئامۆژگاریی ..؟!

## باسێك له چیرۆكی چێڵه‌كه‌ی یان مانگاكه‌ی نه‌وه‌ی جووله‌كه یان نه‌وه‌ی ئیسرائیل

### سیٚ /تێبینی :

**یه‌كه‌م** :دووباره كۆشه‌یه‌ك له ئینكاری و لاساری و عینادی ، نه‌وه‌ی جووله‌كه كه ده‌گرێته‌وه ، وه ملنه‌دانی نه‌وه‌ی جووله‌كه یان نه‌وه‌ی ئیسرائیل ئه‌گرێته‌وه بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به رووداوی سه‌ر برینی چێله‌كه یان مانگاكه‌ی نه‌وه‌ی جووله‌كه یان نه‌وه‌ی ئیسرائیل ،چونكه سووره‌تی (البقره)ش هه‌ر به‌م چیرۆكه ناونراوه ، بۆئه‌وه‌ی كه تێبگه‌ن كه چه‌نده سه‌ر سه‌خت و ئینكار ملهوور لاسارن بوونه ، له گه‌ل پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یان (موسى) —عليه‌السلام—،كه‌چیرۆكی ئه‌م مانگایه (خوای گه‌وره )له قورئانه‌كه‌ی بۆمان ده‌گێریته‌وه باسی رووداوه‌كه‌ده‌كات.

**دووه‌م** : كورته‌ی به‌سه‌رهاته‌كه یان چرۆكه‌كه‌ی نه‌وه‌ی جووله‌كه ئه‌وه‌یه كه پیاوێكیان كوشت له نه‌وه‌ی ئیسرائیل له نێوان خۆیاندا ، ئینجا هه‌ر كه‌س كوشتنه‌كه‌ی له‌ملی خۆی ئه‌كرده‌وه‌و ، یه‌یدا به‌سه‌ر یه‌كێتردا ، هه‌روه‌ها له ریوایه‌تێكی تر ئه‌گێرنه‌وه كه له سه‌ره‌می پێغه‌مبه‌ری (موسى) دا — عليه السلم — پیاوێك له ناو

بیستانێك ئه‌كوژرێ له‌ ناوه‌ندی چه‌ند گوندێكا كه‌س نازانێ كه‌ كێ ئه‌م پیاوه‌ی كوشتووه‌ له‌ پاشان داوا ئه‌كه‌ن له‌ پێغه‌مبه‌ری (موسى ) – علیه السلام – كه‌ بكوژی ئه‌م پیاوه‌ یان بۆ بدۆزێته‌وه‌ ..؟! ئینجا (خوای گه‌وره‌) فه‌رمانیدا به‌ سه‌ر برینی ره‌شه‌ولاخێك یان مانگا یان چێلێك ، وه‌ گۆشتی ئه‌و سه‌براوه‌ بده‌ن له‌ مردووه‌كه‌تان به‌هۆی ئه‌وه‌وه‌ (خوای گه‌وره‌) زیندووی ده‌كاته‌وه‌ و راستی بلێ له‌ بكوژه‌كه‌ی و گومان و دوو دلی تێدا نه‌مێنی!

**سێیه‌م** : به‌لێ له‌م چیرۆكه‌ی یان رووداوه‌ی چیله‌كه‌ی یان مانگاكه‌ی نه‌وه‌ی ئیسرائیل یان نه‌وه‌ی جووله‌كه‌ ، (خوای گه‌وره‌) له‌ قورئانه‌ پیرۆزه‌كه‌ی دا ، ئه‌م رووداوه‌مان بۆ باس ده‌كات له‌ چه‌ند ئایه‌تێك دا ، له‌ ئایه‌تی (٦٧) سوره‌تی (البقره) باس ده‌كات تاكو ئایه‌تی (٧٤) سوره‌تی (البقره) دا ، كه‌ ده‌كاته‌ (٨) ئایه‌ت ، وه‌ (خوای گه‌وره‌) به‌ سه‌رهاتی كوژرانی پیاوێك له‌ نه‌وه‌ی ئیسرائیل ده‌گێرێته‌وه‌ ، كه‌ بكوژی ئه‌م پیاوه‌ له‌ نێو نه‌وه‌ی جووله‌كه‌ دیار نیه‌ ، جا كاتێك خزمانی ئه‌م كوژراوه‌ ده‌چنه‌ خزمه‌ت (موسى ) – علیه السلم – بۆ ئه‌وه‌ی بكوژه‌كه‌ی بدۆزنه‌وه‌ ، ئینجا به‌ فه‌رمانی (خوای گه‌وره‌ ) (موسى ) پێیان ده‌فه‌رمووی: كه‌ مانگایه‌ك سه‌ر ببرن و ، گۆشته‌ی یان ئه‌ندامی ئه‌م چێله‌ یان مانگا سه‌ر براوه‌ ، بده‌ن له‌ جسته‌ی جنازه‌كه‌ یان مردووه‌كه‌ یان كوژراوه‌كه‌ ، پاشان زیندوو ده‌بێته‌وه‌ ، وه‌ ناوی بكوژه‌كه‌ی خۆیانیان پێ ده‌لێ ..؟!

به‌لێ ئه‌مه‌ پوخته‌ی یان كورته‌ی چیرۆكه‌كه‌یه‌ یان به‌سه‌ر هاته‌كه‌یه‌ ، ئێمه‌ش لێره‌دا ئایه‌ت به‌ئایه‌ت له‌م (٨) ئایه‌تی به‌ پشتیوانی (خوای گه‌وره‌ ) ته‌فسیری ده‌كه‌ین ...هتد

**ئایه‌تی : (٦٧)**

قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٦٧﴾ [البَقَرَة : ٦٧]

واته: {به‌سه‌رهاتی مانگاكه‌ی به‌نی ئیسرائیل} [ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً ] دوای ئه‌وه‌ی كه‌سێكی ده‌وڵه‌مه‌ند كه‌ منداڵی نه‌بوو له‌ناو به‌نو ئیسرائیلدا كوژرا وه‌ نه‌زانرا كه‌ بكوژه‌كه‌ی كێیه‌ هه‌ر كه‌سێك له‌سه‌ر خۆی لای ئه‌دا خوای گه‌وره‌ ئه‌مری كرد به‌ موسى پێیان بفه‌رمه‌ با مانگایه‌ك سه‌ر ببڕن، موسى صلى الله علیه وسلم به‌ قه‌ومه‌كه‌ی فه‌رمووی په‌روه‌ردگار فه‌رمانتان پێ ئه‌كات كه‌ مانگایه‌ك سه‌ر ببڕن [ قَالُوا أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ] وتیان: ئه‌ی موسى تۆ گاڵته‌و سووكایه‌تی و یاریمان پێ ئه‌كه‌ی [ قَالَ أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ ] موسى صلى الله علیه وسلم فه‌رمووی: په‌نا ئه‌گرم به‌خوای گه‌وره‌ من له‌ نه‌فام و نه‌زانان بم كه‌ به‌ناو خوای گه‌وره‌وه‌ قسه‌ بكه‌م..؟!

بەلێ بەسەرهاتی کوژراوەکەی نەوەی جوولەکە و مانگا یان چێلەکە بەم شێوەیە :

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةًۖ قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾﴾ واتە: بیر لەو کاتەش بکەنەوە کە (موسی ) بە قەومەکەی ووت : (خوای گەورە) فەرمانتان پێدەکات ، کە ئێوە مانگا یان چێل سەر ببرن ، ووتیان : ئایە دەتەوێ گالتەمان پێبکەی ..؟! (موسی ) ووتی : پەنادەگرم بە خودا لە رێزی نەزانان بم ..؟!(خوای گەورە ) ئەفەرمووێت : ئەی نەوەی جوولەکە یان ئیسرائیل نیعمەتەکانی من یان بەهرەکانی من بیری خۆتان بێننەوە ..؟! لە بارەی ئەو موعجیزە و نیشانەی دەربارەی مانگا یان چێلەکە و ئاشکرا کردنی پیاو کوژەکە و کێ هۆکاری کوشتنەگە بوو ،وە زیندوو کردنەوەی کوژراوەکە و قسە کردنی دەربارەی ئەو کەسەی کە کوشتوویەتی لەوان ..!! دەگێرنەوە دەلێن : پیاوێك لە نەوەی جوولەکە یان ئیسرائیل مندالی نەبوو وجاخی کوێر بوو ، مال و سامانێکی زۆری هەبوو ، برازیەکی میرات گیری بوو ، ئەویش لە تەماحی مال و سامانەکەی پیاوەکەی کوشت ..؟! بە شەو هەلی گرت و لەبەر دەرگای مالێکی تری لە نەوەی جوولەکە یان ئیسرائیل دایی نا ..!! پاشان بە یانی لە سەر کوشتنەکەی مامی کردیە هات و هاوار گریان و رۆ رۆ هەتا وای لێهات دەستیان دایە شمشێرو کەرەستەی شەرکردن لە یەکتری ، خەریك بوو پەلاماری یەکیتر بدە ..!! پیاوێکی ژیرو عاقل بە ئاوەزیان ووتی : بۆچی خەریکن یەکتری بکوژن ..!! ئەوە پێغەمبەرێکی خودایە واتە : (موسی ) لە ناوتاندا ..؟!

ئەوانیش هاتنە خزمەت (موسی ) باسەکەیان بۆ گێرایەوە فەرمووی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةًۖ قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾﴾واتە: (خوای گەورە) فەرمانتان پێدەکات کە ئێوە مانگایەك سەر ببرن ..؟! ئەوانیش ووتیان : ئایا دەتەوەێت گالتەمان پێبکەی ..؟! (موسی ) ووتی : پەنا دەبەم بە خودا کە لە رێزی نەزانان بم ..!! خۆ ئەگەر نەوەی جوولەکە زۆر قسەو پرسیاریان نەکرد بوایە هەر مانگایەکیان سەر بریایە دەبوو ، با زۆر چاکیش نەبوایە ..؟! بەلام نەوەی جوولەکە یان نەوەی ئیسرائیل بابەتەکەیان یان کارەکەیان زۆر گەورە کرد وە بەتووند و قورس وەگرت زیاد لە پێویست لێیان کۆلیەوە پرسیاری زۆریان کرد ..!! (خوای گەورە)ش زۆر توندو قورس گرانی کرد کارەکە لەسەریان ..!! تاکو گەیشتە ئەو مانگایە یان ئەو چێلەی کە فەرمانیان پێدرا سەری ببرن ..!! بەلام لە لای پیاوێك جۆری یان وەسفی ئەو مانگایە هەبوو تەنها لە لای ئەو دەستیان دەکەوت ، وە تەنها ئەو ئەم جۆرە مانگایەی هەبوو ..؟! خاوەنی مانگاکەش واتە : پیاوەکە ووتی : سوێند بەخوا بە پری پێستەکەی زێرو ئالتوون نەبێت ئەم مانگایە نایدەم و هیچیشی لێ کەم ناکەم ..؟! ئەوانی واتە : نەوەی جوولەکە بە پری پێستەکەی زێرو ئالتوونیان دا بە پیاوەکە و مانگا کەیان برد ..!! پاشان

**مانگاکه‌یان سه‌ر بری هه‌ندێ له‌ گۆشته‌ی مانگاکه‌یان دا له‌ جسته‌ی کوژراوه‌که‌ بۆ ئه‌وه‌ی بکوژه‌که‌ی بدۆزنه‌وه‌ ، ئینجا کوژراوه‌که‌ هه‌لسایه‌وه‌ واته‌ : زیندوو بوویه‌وه‌ ..!! ئه‌وانیش ووتیان : به‌کوژراوه‌که‌ کێ تۆی کوشتووه‌..؟! کوژراوه‌که‌ ووتی : برازه‌که‌م ، واته‌ : (کوژراوه‌که‌ مامی ئه‌و بکوژه‌ بووه‌ که‌ کوشتویه‌تی ) پاشا کوژراوه‌ لار بوویه‌وه‌ دووباره‌ مرده‌وه‌ ..!! ئه‌وه‌ بوو بکوژه‌که‌ ئاشکرا بوو له‌مالی مامی هیچی له‌ میرات نه‌برد ..!! دوای ئه‌وه‌ هیچ پیاو کوژی میراتی نه‌ ده‌برد ..؟! [1] ئیمامی (ابن قیم ) – ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت – ده‌لێت: نه‌وه‌ی جووله‌که‌ یان ئیسرائیل دوو جار تاقی کرانه‌وه‌ له‌ ناو هه‌موو ئاژه‌له‌کان به‌ مانگا یان چێل ..؟! یه‌که‌میان : تاقی کرانه‌وه‌ به‌ په‌رستنی گوێره‌که‌ یان گۆلك ..؟! دوومیان : تاقی کرانه‌و به‌ فه‌رمان پێکردن به‌ سه‌ر برینی مانگا یان چێل ، هه‌روه‌ها مانگاش له‌ ئاژه‌ل خراپ بێ مێشکه‌کان هه‌تاکو نموونه‌ی پێ بهێنێته‌وه‌ وه‌ك خۆیان واته‌: نه‌وه‌ی جووله‌که‌ یان ئیسرائیل که‌چه‌نده‌ بێ مێشکن ..؟! ئه‌وه‌ی دیار بێت له‌م چیرۆکه‌ دا ئه‌وه‌یه‌ که‌ دوایی چیرۆکی په‌رستنی گوێره‌که‌ دێت ، وه‌ فه‌رمان کردن به‌سه‌ر برینی مانگا رێگری لێ نه‌کردن له‌ سه‌ر برین و کێلان و ئاودان کردن به‌و ئاژه‌له‌ ئاماژه‌یه‌ بۆ ئه‌وه‌ به‌ که‌لکی په‌رستن نایه‌ت..!! به‌لکو بۆ سه‌ر برین و کێلان و ئاودان و کارپێکردن گونجاوه‌ ..؟![2]**

**به‌لێ زۆر به‌ی زانایانی ته‌فسیری قورئانی پیرۆز هێناویانه‌ وه‌کو : (الطبراني ، ابن کثیر ، الرازي ، الشوکاني ،...هتد) وه‌کو به‌ زمانی عه‌ره‌بیه‌که‌ی به‌م شێوه‌ هێناویانه‌ :** ( كان رجل من بنى إسرائيل عقيما لايولود له وكان له ما كثير ، وكان ابن اخيه وارثه فقتله ثم احتمله ليلا فوضعه على باب رجل منهم ، ثم أصبح يدعيه عليهم حتى تسلحوا وركب بعضهم إلى بعض فقال ذووا الرأى منهم : علام يقتل بعضكم بعضا وهذا رسول الله فيكم ..؟! فأتوا موسى فذكروا ذلك له ، فقال : ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾﴾ الاية ، قال : فلو لم يعترضوا لأجزأت عنهم أدنى بقرة ولكنهم شددوا فشدد عليهم ، حتى انتهوا إلى البقرة التى أمروا بذبحها ، فوجدوها عند رجل ليس له بقرة سواها ، فقال : والله لا أنقصها من ملأ جلدها ذهبا فأخذوها بملأ جلدها ذهبا فذبحوها فضرب ببعضها فقام : فقالوا : من قتلك ..؟! فقال : هذا لابن أخيه ، ثم ميتا ، فلم يعط من ماله شيئان ولم يورث قاتل بعده ) **واته‌: پیاوێك هه‌بوو له‌ نه‌وه‌ی جووله‌که‌ وجاغ کوێرو بوو یان نه‌زۆك بوو ، واته‌: مندالی نه‌بوو ، هه‌روه‌ها ملك وسامانێکی زۆری هه‌بوو ، وه‌ برازایه‌کی هه‌بوو که‌ ئه‌و میرات و سامانه‌ی لێده‌گرت ، شه‌وێك کوشتی و جنازه‌که‌شی هه‌لگرت و له‌ به‌ر ده‌رگای مالێك یان پیاوێکی نه‌وه‌ی جووله‌که‌ی دانا ، دوایی که‌ رۆژ بوویه‌وه‌ ، هاواری کرد که‌ ئه‌و ماله‌ یان خه‌لکی ئه‌و گه‌ره‌که‌ مامی ئه‌ویان کوشتووه‌**

[1]-ابن ابي حاتم (١/١١٤-ص٦٩)، الطبرى (٢/١٨٣).
[2]-بدائع التفسير لابن قيم (١/٣١٩-٣٢٠).

..!! هه‌تا خه‌لكی ئه‌و شوێنه یان ئه‌و گه‌ره‌كه كه ئه‌و پیاوه‌ی لێ كوژرا بوو ، خۆیان چه‌كدار كرد و كه‌ره‌سه‌ی چه‌نگیان كرده ده‌ست و سواری ولاخ بوون بۆ یه‌كدی ..! ! به‌لام خاوه‌ن عه‌قل و ژیره‌كانیان ووتیان : باشه بۆ یه‌كدی ده‌كوژین ، ئه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوایه له نێوامان‌دا ، ئیدی چوونه لای (موسی ) پییان ووت : وه بۆیان رووداوه‌كه گێرایه‌وه ، ( دیاره دوای ئه‌وه (موسی ) گفتو گۆی له گه‌ل (خوای گه‌وره) كردووه ) ئینجا پێ ووتن : (خوای گه‌وره ) فه‌رمانتان پێ كردووه كه مانگایه‌ك یان چێلێك سه‌ر برن ، جا ئه‌گه‌ر له سه‌ره‌تا هه‌ر مانگایه‌كیان بهێنابایه سه‌ریان بریبایه قبول ده‌بوو ..! ! به‌لام ئه‌وان له خۆیان قورس گران سه‌خترین كرد ، هه‌ر بۆیه له‌سه‌ریان سه‌خت بووه ، هه‌تا گه‌یشته ئه‌و مانگایه‌ی كه ده‌بێ سه‌ری ببرن ته‌ماشایان كرد ، ئه‌و مانگایه به‌و مواصه‌فاته و جۆر سیفه‌تانه ، ته‌نها لای پیاوێك ده‌ست ده‌كه‌وێت ، كه هه‌ر ئه‌و مانگایه‌شی هه‌یه ، وه هه‌ر ئه‌و مانگایه‌ش هه‌بوو له‌م شوێنه‌دا ، ئه‌ویش ووتی : والله كه‌متر له پری پێسته‌كه‌ی زێرو ئالتوونم به‌ده‌نێ نایفرۆشم ، ئیدی به ناچاریی پری پێسته‌كه‌ی زێرو ئالتوون یان كردو پێ یاندا ، ئینجا مانگاكه‌ی پێدان و ئه‌وانیش سه‌ریان بری ،ئه‌نجا گۆشتی مانگاكه یان ئه‌ندامێكی مانگاكه‌یان له مردووه كه دا ، هه‌لسایه‌وه و ، لێ یان پرسی : كێ تۆی كوشتووه ..؟! ئه‌ویش ووتی : فلان كه‌س ، واته : ئاماژه‌ی بۆ برازاكه‌ی كرد ..!! دوایی مرده‌وه ..!! ئه‌وانیش كابرایان بێ به‌ش كرد له میرات و مولك مال و سامانه‌كه‌ی ، وه له‌دوای ئه‌وه‌ش هه‌ر كه‌سێك كه‌سێكی بكوشتبایه ، مادام خزمی بووایه ، میراتی نه‌ده‌درایێ ، وه له هه‌ندێك ریوایه‌تاندا ئه‌و برازا یه‌یان یان ئه‌و بكوژه‌یه‌یان له‌وێدا كوشتووه ..؟!

## باس و بابه‌تی ووشه‌ی: ﴿ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾

## پێناسه‌ی ووشه‌ی (جهل ) :

یه‌كه‌م : (جهل ) یان (الجاهلیه) واته: نه‌زانی ، له‌رووی زمانه‌وانیدا :

له‌بنچینه‌دا ووشه‌ی (جهل) به واتای نه‌فامی یان نه‌زانی دێت ، ئه‌مه‌ش ئاماژه‌یه بۆ دوو مانا : یه‌كه‌میان : پێچه‌وانه‌ی زانین ، دووه‌میان : بێ ئیراده‌یی و یان گه‌مژه‌یی ، پێچه‌وانه‌ی دلنیا كه‌روه‌یه ..؟! [1]

ووتراوه : ( جهل تێپه‌راندنه بۆ گه‌یشتنی منكر یان خراپه )[2]

---

[1]- مقاييس اللغة ، ابن فارس (٤٩٠/١).
[2]-كشف المشكل من حديث الصحيحين ابن جوزي (٥٩٧/٢).

ده‌لێن : بنچینه‌ی (جهل ) واته: (استجهلت ) واته: ره‌شه با له لقه‌كه‌ی دا جوولاندی و تێكچوو ) واته: وه‌ك ئه‌وه وایه كه نه‌زان حركه‌یه‌ك یان جوولانه‌وه‌یه‌ك بێت كه له راستی یان حه‌قیقه‌ت و مه‌عریفه لابدات ) .[1]

دووه‌م : (جهل ) یان (الجاهلیه) واته: نه‌زانی ، له رووی شه‌رعیه‌وه :

ووتراوه : (جهل یان جاهلیه ) واته: ( داب و نه‌ریت و عاته‌ده‌ی قه‌ومانێك یان خه‌لكانێك پێش هاتنی ئایینی ئیسلام)[2] چونكه خه‌لكی له‌و سه‌رده‌مه ده‌ژیان نه‌فام بوون و یان نه‌زان بوو به ناسینی (خوای گه‌وره ) یاسا و شه‌رعیه‌ته‌كه‌ی ..؟! . هه‌روه‌ها بۆ یه‌كه‌م جار ووشه‌ی (جاهلیه ) له قورئانی پیرۆز دا نازل بوو ، به‌لام (جاهلیه ) یه‌كه‌م جاهلیه یان نه‌فامی و نه‌زانی بێ باوه‌ری یان كوفر بوو پێش هاتنی ئایینی ئیسلام ، به‌لام (جاهلیه ) دواتر كه دوای هاتنی ئایینی ئیسلام ، (جاهلیه ) یان نه‌فامی نه‌زانی (فسوق و فجور ) بوو ، واته : نه‌فامی له خراپه‌كاری و ده‌رچوون و له رێ لادان له سنووره‌كانی ئایینی ئیسلام ) [3]

هه‌روه‌ها ووشه‌ی (جهل ) پێچه‌وانه‌ی ووشه‌ی (العلم ) له زمانه‌وانیدا ، وه له‌رووی شه‌رعیه‌وه به وسفكردنی ئه‌هلی شرك هاوبه‌ش دانه‌ران ، به ره‌تكردنه‌وه‌ی جهل و نه‌فامی ، وه هاندان بۆ زانست وه‌سفكردن ..؟!

تێبینی / ووشه‌ی (جهل ) یان (جاهلیه ) (٢٤)جار له قورئانی پیرۆز دا هاتووه ..؟!

ووشه‌ی (جهل ) واته : نه‌فامی یان نه‌زانی ، له رووی زمانه‌وانیدا ئه‌م سێ نموونه‌یه :

١-(جهل ) واته: به‌تال بوون یان خالی بوونی نه‌فسه له نه‌زانی ، ئا ئه‌مه‌ش ئه‌صله كه‌یه .

٢-(جهل) واته: باور بوون به شتێكی تر جگه له‌وه‌ی كه هه‌یه‌تی كه راست و دروسته .

٣-(جهل ) واته: ئه‌نجامدانی كارێك یان شتێكی تر بكه‌ی به پێچه‌وانه‌ی كه ماف خۆی هه‌بێت ، جا باوری هه‌بێت به باوری راست و یان هه‌له و فاسد ، هه‌روه‌كو ئه‌وه‌ی وازهێنان له نوێژ به ئه‌نقست یان (متعمدا ) وه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةًۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ۝٦٧﴾ [البَقَرَة : ٦٧]واته : وه ئه‌ی نه‌وه‌كانی یه‌عقوب. یادی سته‌می پێشینیانتان بكه‌نه‌وه، و چه‌ند باریان له خۆیان گران ده‌كرد، و ده‌مه‌ده‌میان له‌گه‌ڵ موسادا ده‌كرد. صه‌ڵات و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێت.، كاتێك كه پێی فه‌رمون :

[1]-نظم الدرر ، البقاعي (٥/٢٢٠).
[2]-كشف المشكل ابن جوزي (٢/٣٧٥).
[3]-التحرير والتنوير ابن عاشور (٢٢/١٣)، الكشاف الزمخشري (٣/٥٣٧)

به دڵنیاییه‌وه خوا فه‌رمانتان پێده‌كات مانگایه‌ك سه‌ر ببڕن، ئه‌وانیش . به لوتبه‌رزیه‌وه . وتیان : ئایا ده‌مانكه‌یته جێگه‌ی گاڵته وسوكایه‌تی پێكردن ؟! موساش وه‌ڵامی دانه‌وه و فه‌رمووی : په‌نادەگرم به‌خوای په‌روه‌ردگار له‌وه‌ی له‌گاڵته‌جاڕان بم ..؟!

**ئه‌م دوو ووشه‌یه زۆر په‌یوه‌ندیداره به ووشه‌ی (جاهلیه ) یان (جهل ) :**

**١-(الاسلام ) واته : ته‌سلیم بوون و ملكه‌چی بوون ، توحید و یه‌ك خوا په‌رستی ، وه ملكه‌چی گوێرایه‌لی كردن ، وه خۆ به‌ریی كردن له هاوبه‌شی بڕیاردانان وه خۆ به‌ریی كردن له ئه‌و خه‌لكانه‌ی شرك هاوبه‌شی بۆخوا بڕیارده‌ده‌ن ..!!**

**٢-(شرك ) واته: هاوبه‌شی بۆخوا بڕیاردان ، یان كفر واته : شه‌ریك یان یان هاوبه‌شی دروست كردن له مولكی (خوای گه‌وره ) یان یه‌كسانی كردن دورست كراوه‌كانی خوا به تایبه‌ت مه‌ندیه‌كانی (خوای گه‌وره) .**

**به‌لێ یه‌كێك له‌و شته مه‌ترسیدارانه‌ی كه له سه‌رده‌می (جاهلی )و نه‌فامی و سه‌رده‌می پێش ئیسلام به‌ر بلاو بوو كه په‌یوه‌ندی به باوره‌وه هه‌یه ئه‌ویش(شرك )یان هاوبه‌شی دانان بوو ، كه شه‌یتانه‌كان په‌یوه‌ندیان پێوه هه‌بوو.له (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌لێت :** ((لمَّا افتتح رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم مكَّةَ رنَّ إبليسُ رَنَّةً اجتمعت إليه جنودُه فقال : ايْئَسوا أن تردُّوا أمَّةَ محمَّدٍ على الشِّركِ بعد يومِكم هذا، ولكن افتِنوهم في دينِهم، وأفْشُوا فيهم النَّوحَ)) [1].

## یه‌كه‌م: (جهل ) یان نه‌فامی له سروشتی مرۆڤدا :

**(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى:** ﴿وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ۝٢٨﴾ [النِّسَاء : ٢٨] **واته:** وه خوای گه‌وره مرۆڤی وا دروست كردووه كه لاوازه ناتوانێ به‌رگه‌ی زۆر شت بگرێ بۆیه كارئاسانیتان بۆ ده‌كات..؟!

**له (طاوس ) له (مقاتل ) – ره‌حمه‌تی خویان لێ بێت – ده‌لێن : (صبر و ئارامیان نیه ژنان ) ،هه‌روه‌ها (الحسن ) ده‌لێت : (مرۆڤ دروست بووه له ئاوێكی خراپ یان بێ رێز ) هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى:** ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ۝٢٠﴾ [الْمُرْسَلَات : ٢٠] **واته :** ئایا ئێوه‌مان دروست نه‌كردووه له ئاوێكی بێ ڕێز، مرۆڤ له دڵۆپه ئاوێك دروست بووه كه مه‌نی یه..؟!

**له (الزجاج) – ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت – ده‌لێت : (ئیراده بۆ داگیر كردنی هه‌واو ئاره‌زوو لاواز بوون ).**

---

[1] -الطبراني في المعجم الكبير (١٢/١١).

لە (ابن القیم) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت: ( راستیەکە ئەوەیە کە لاوازی یان (ضعف) درێژ دەبێتەوە بۆ هەموو ئەمانە : وە لاوازیە کەی لە گەورەترەوە بۆ زۆرترو زیاتر ..!! لاوازی لە بنیە کەی یان لە پێکهاتەکەی خۆی ..!! لاوازی هێز ..!! لاوازی لە ئیرادە ..!! لاوازی لە علم و زانست ..!! لاوازی لە صبر یان ئارامی گرتن ..!! نەهامەتیەکانی بۆی بەم لاوازیەوە ، خێراترە لە لافاوێك لەو دیوی سنوورەکانەوە ..؟!.[1]

بەلێ فترەتی مرۆڤ هەر وایە لە سەر سیفەتەمانی کامل نەبوون یان (نقص ) بوون ، ئەوەش تقدیری کەون یان گەردوونە ، بەلام (خوای گەورە ) رێنمایی و رێ نیشاندرەمانە بۆ ئەوەی کەم کورتیە کەمان لا ببات ، هەندێك یان هەر هەمووی ئەوەی دسۆز بێت ئەخلاصی تەواوی تەنها هەمووشتێك لە پێناوی (خوای گەورە ) ئەنجام بدات ، بۆنموونە (خوای گەورە ) مرۆڤی وا دروست کردووە یان وای (طبع) کردووە ، کە کامل نەبێت و هەلە بکات لە ژیانی دا ، پەشیمان بێتەوە ، هەروەك لە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت : ((كلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وخيرُ الخطَّائين التَّوابُون)).[2] واتە: سەر جەم مرۆڤەکان هەر هەموویان هەلەکارن ، چاکترین هەلە کارن ئەوانەن پەشیمان دەبنەوە و تەوبە دەکەن ..؟!

کەواتە خۆی لە خۆیدا سروشتی مرۆڤەکان هەر وایە کە تووشی زولم و ستەم و جهل و نەفامی دەبیت ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾﴾ [الأحزاب : ٧٢] واتە : [ إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ ] ئێمە ئەم ئەمانەتە کە دینە، یان فەرزەکانە، یان سنورەکانە، یان گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورەیە دامان بەسەر ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان [ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا ] بەڵام ئەوان ڕەتیان کردەوە کە هەڵی بگرن و هەڵیان نەگرت [ وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا ] وە داوای شەفەقەو ڕەحمەتی خوای گەورەیان کرد کە خوای گەورە لێیان خۆشبێ [ وَحَمَلَهَا الْإِنْسَانُ ] بەڵام مرۆڤ هەڵی گرت [ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ] مرۆڤیش ئەم دوو سیفەتەی تیایە کە زۆر ستەمکارو زۆر نەزانە، ئیلا ئەگەر کەسێك بە تەقوا زوڵمەکە نەهێڵێ، وە بە زانیاریش نەزانینەکەی نەهێڵێ..؟!

هەروەها بۆ ئەوەی ئەو زولم و ستەم جهل و نەفامی نەزانی لە خۆت دوور بکەیتەوە پێویستی بەم دوو هۆکارەیە:

[1]-ابن القيم ، طريق الهجرتين ص(١٠٨).
[2]-السنن الترمذي برقم (٢٤٩٩).

١-دوور که‌وتنه‌وه‌له‌(زولم و سته‌م ) ده‌بێت دادگه‌ری بکه‌یت وخۆت نزیك بکه‌یته‌وه له ته‌قواداری و خۆپارێزی..؟!

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ [المَائـِدَة : ٨] واته: به‌ڵكو ئێوه دادپه‌روه‌ر بن له نێوان دۆست و دوژمندا ئه‌مه نزیکتره له ته‌قواوه یان نزیکتره له‌وه‌ی که خۆتانی پێ بپارێزن له ئاگری دۆزه‌خ..؟!

٢-دوورکه‌وتنه‌وه له‌(جهل و نه‌فامی و نه‌زانی ) ده‌بێت دوعا ابکه‌یت که (خوای گه‌وره ) زانستت بۆ زیاد بکا یان پرسیاری شه‌رعی له ئه‌هلی زکرو ته‌قواداران بکه بۆ ئه‌وه‌ی خۆی له جهل نه‌فامی رزگاری بێت ..؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ١١٤﴾ [طه : ١١٤] واته: ئه‌وه تۆ بڵێ: ئه‌ی په‌روه‌ردگار زانیاریم زیاد بکه، (فه‌رمانی پێنه‌کرد به داواکردنی زیادکردنی دونیا، به‌ڵکو زیاد کردنی زانست و زانیاری، بۆیه تا وه‌فاتی فه‌رموو زانیاری له زیاد بووندا بوو، ئه‌مه‌یش بێنرخی دونیاو به‌رزی پله‌وپایه‌ی زانست ده‌رده‌خات)..؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣﴾ [النَّحۡل : ٤٣] واته: ئه‌ی موشریکان ئێوه پرسیار له ئه‌هلی زیکر له باوه‌ڕدارانی ئه‌هلی کتاب بکه‌ن ئه‌گه‌ر نازانن ئه‌وان پێتان ئه‌ڵێن که سه‌رجه‌م پێغه‌مبه‌ران مرۆڤ بوونه‌و که‌سیان مه‌لائیکه‌ت نه‌بوونه..؟!

## دووه‌م : هاتنی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بۆ پاکردنه‌وه‌وی ره‌وشتی نه‌فامی یان جاهلی:

ئیمان یان باوه‌ری هێنان به پێغه‌مبه‌ران یه‌کێکه له روکنه کانی باوه‌ر یان ئیمان به (خوای گه‌وره ) ، که‌واته : ئیمان یان باوه‌ر دروست نیه ، ئه‌گه‌ر ئیمان یان باوه‌ر نه‌هێنی به سه‌رجه‌می پێغه‌مبه‌ران – عليه السلام – هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥﴾ [البَقَرَة : ٢٨٥] واته: [ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ] پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم وه باوه‌ڕداران ئیمانیان به‌و قورئانه پیرۆزه هێناوه که له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگاره‌وه بۆیان دابه‌زیوه، وه به هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی که له‌م قورئانه‌دا هه‌یه [ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ ] هه‌موویان ئیمانیان به خوای گه‌وره‌و مه‌لائیکه‌ته‌کانی و کتێبه ئاسمانیه‌کانی و پێغه‌مبه‌رانی هێناوه [ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ ] ئێمه جیاوازی ناکه‌ین له نێوان هیچ پێغه‌مبه‌رێك له پێغه‌مبه‌ران و ئیمان به هه‌ر هه‌موویان ئه‌هێنین [ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ] وه باوه‌ڕداران وه پێغه‌مبه‌ره‌کان فه‌رموویان: ئه‌ی په‌روه‌ردگار

ئێمه به‌گوێ فه‌رمایشتی تۆمان بیست وه لێی تێگه‌یشتین وه گوێڕایه‌ڵی تۆمان کردو وه‌ڵاممان دایته‌وه [ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ] ئه‌ی په‌روه‌ردگار تۆش لێمان خۆشبه وه مه‌صیرو سه‌ره‌نجام و گه‌ڕانه‌وه‌ی ئێمه هه‌ر بۆ لای تۆیه..؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویّت : قال تعالى: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٧] واته : به‌ڵكو چاكه ئه‌وه‌یه كه هه‌ر كه‌سێك ئیمان بێنێ به‌خوای گه‌وره‌و به‌ڕۆژی دوایی و به فریشته‌كان و به كتێبه ئاسمانیه‌كان و به سه‌رجه‌م پێغه‌مبه‌رانی خوای گه‌وره..؟!

(خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویّت : قال تعالى: ﴿ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ٧٥﴾ [الحَج : ٧٥] واته: [ اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا ] خوای گه‌وره خۆی له فریشته‌كان نێردراوی خۆی هه‌ڵئه‌بژێرێ وه‌كو (جبرائیل و ئیسرافیل و میكائیل و ملك الموت) [ وَمِنَ النَّاسِ ] له‌ناو خه‌ڵكیشدا پێغه‌مبه‌ران هه‌ڵئه‌بژێرێ، مه‌لائیكه‌ته‌كان وه‌كو نێردراو بۆ لای پێغه‌مبه‌ران بۆ ئه‌نجام دانی فه‌رمانی خوا، له‌ناو مرۆڤیشدا كه‌سانێك هه لْئه‌بژرێ ئه‌یانكات به پێغه‌مبه‌ری خۆی [ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ] به دڵنیایی خوای گه‌وره زۆر بیسه‌رو بینایه..؟!

كاتێ (موسى ) – علیه السلام – فه‌رمانی كرد به قه‌ومه‌كه‌ی بۆ ئه‌وه‌ی مانگایه‌ك یان چێل سه‌ر ببرن ، به‌ڵام قه‌ومه‌كه‌ی یان نه‌وه‌ی جووله‌كه به شێوه‌یه‌كی بێ ڕه‌وشتانه وه‌ڵامیان دایه‌وه ..!! قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗاۖ﴾ [البَقَرَةِ : ٦٧] واته : وتیان: ئه‌ی موسى تۆ گاڵته‌و سووكایه‌تی و یاریمان پێ ئه‌كه‌ی ..؟! به‌ڵام (موسى) وه‌ڵامی دانه‌وه فه‌رمووی :قال تعالى: ﴿قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٦٧﴾ [البَقَرَةِ : ٦٧] واته: موسى صلى الله علیه وسلم فه‌رمووی: په‌نا ئه‌گرم به‌خوای گه‌وره من له نه‌فام و نه‌زانان بم كه به‌ناو خوای گه‌وره‌وه قسه بكه‌م..؟!

هه‌روه‌ها قه‌ومه‌كه‌ی (موسى ) ئا به‌شێوه‌یه وه‌ڵامێكی بێ ڕه‌وشتیان دایه‌وه ، به‌ڵام (موسى ) پێغه‌مبه‌ری خوایه – علیه السلم ) بریه یان بێ تاوانه به‌دوور بوو له‌گاڵته كردن ، كه ئه‌وان پێیان وابوو گاڵته‌یان پێ ده‌كات ، چونكه (موسى ) – علیه السلام – پاكیان ده‌كاته‌وه له نه‌فامی و نه‌زانی جاهلیه كه تێدا بوون ، ووشه‌ی ﴿هُزُوٗا﴾ واته : گاڵته كردن و گه‌مه‌پێ كردن ، چونكه هه‌رگیز شایه‌نی كه‌سانی عاقل و ژیرو ڕێزدار نیه ..!! هه‌روه‌ها تایبه‌ت تره له گاڵته كردن ، چونكه له گاڵته كردندا گاڵته‌یه‌ك هه‌یه كه بێ ڕێزی و سووكایه‌تی كردنه به كه سه

**دەكات كە گالتەی لەگەل دەكەن ..! !هەروەها گالتە كردن لە كورو كۆبوونەوە و قەسە كردن لە گەل گشتی خەلك گونجاو نیە ،بە هەمان شێوە گالتە كردن شیاوی پێغەمبەران نیە ..؟!ئینجا (موسی ) خۆی بێ تاوان كرد ئینكاری كرد كە گالتەیان پێ ناكات ..! ! هەروەها نفی كرد یان رەتی كردەوە كە یەكێك بێت لە نەفامەكان یان جاهلین ..؟!ئینجا پانای گرت بە (خوای گەورە ) كە لە كەسانی نەفام و نەزان و جاهلین نەبێت ..؟! چونكە ووشەی** ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ﴾ **واتە: پەناگرتنە بە (خوای گەورە ) بەمانای رەتكردنەوە یان نفی كردنە كەو لە دەستەی نەزانان و نەفامان یان جاهلین بێت هەروەك دەفەرموویت :** قال تعالی: ﴿قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٦٧﴾ [البَقَرَةِ : ٦٧] واتە : موسی صلی الله علیه وسلم فەرمووی: پەنا ئەگرم بەخوای گەورە من لە نەفام و نەزانان بم كە بەناو خوای گەورەوە قسە بكەم..؟!

**هەروەها (خوای گەورە ) پێغەمبەرانی – علیهم السلام – رەوانە كردووە ، بۆ قەدەغەكردن و دوور كەوتنەوەی گەل قەوم و نەتەوەكانیان ، لە كردەوەكانی نەفامی و نەزانی جاهیلیدا ..! ! بۆ گەل قەوم و نەتەوەكانیان كتێبەكانیان بخوێنەوە رێنموویان بكەن ، وە لۆمەی ئەو كەسانە بكەن كە لە شەریعەتی خوا نەزان و نەفام و جاهیلن ..؟! هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت :** قال تعالی: ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ﴾ [آل عِمۡرَان : ١٥٤] واتە : وە گومانی ناحەق و نەزانیان بەخوای گەورە ئەبرد كە خوای گەورە سەریان ناخات و موسڵمانان لەناو دەچن..؟!

**هەروەها قەومەكەی یان نەتەوەكەی راگەیان لە قەدەغەكراوەكانی (خوای گەورە ) لە فەرمانرەوایی یان حوكمرانی نەفامی و نەزانی و جاهیلین دا ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویت :** قال تعالی: ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ

يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ۝٥٠﴾ [المَائـِدَة : ٥٠] واته : [ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ] ئایا پشت لە حوکمەکەی خوا ئەکەن و حوکمی جاهیلی و نەزانی و نەفامیان ئەوێ، (جگە لە حوکمی خوای گەورە هەموو حوکم و بڕیارێکی تری پێچەوانەی حوکمی خوا ستەم و نەفامییە) [ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ] کێ هەیە حوکمی باشترو دادپەروەرترو بەرەحم و سۆزو بەزەییتر بێ لە حوکمی خوای گەورە بەڵام بۆ کەسانێك کە یەقینیان هەبێ نەك بۆ کەسانێك کە نەفام و نەزان بن وە شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتبێتن و بەهەواو ئارەزوی خۆیان یاساو ڕێسا دابنێن هەروەکو خەڵکی سەردەمی نەفامی وایان دەکرد..؟!

**هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی بۆ ئافرەتان و ئافرەتانی ئیمانداران خوێندەوە ، کە (خوای گەورە) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ [الأَحۡزَاب : ٣٣] واته : وە وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی پێشوو جوانی خۆتان بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرمەخەن، (کەواتە سفوری و خۆدانەپۆشین و دەرخستنی جوانی پێشکەوتن نیە بەڵکو پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی بووە لە پێش ئیسلامدا)..؟!

**هەروەها ووتەو کردارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەکردنی ڕێچکەی نەفامی و جاهلین پێش ئیسلام کۆتایی پێ هێنا..! ! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ﴾ [الفَتۡح : ٢٦] واته : کافرانی مەککە هێشتا دەمارگیری نەزانی و نەفامی لە مێشکیاندا مابوو، کە لە ڕێککەوتننامەکە نەیاننوسی (بسم الله الرحمن الرحيم و، محمد رسول الله، بەڵکو نوسییان باسمك اللهم و، محمد بن عبدالله) ..؟!

## سێ یەم : جۆرەکانی نەفامی یان جاهلیه :

### أ - نەفامی (عیقدیه)یان بیرو باوەردا :

**بێ گومان ئەم جۆرەیان یەکێکە لە ترسناکترین جۆری نەفامی ، چونکە کاریگەری لە سەر ئایین بیرو باوەری موسلمانان هەیە ، (والعياذ بالله ) .**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویێت:** قال تعالى: ﴿قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ۝٦٤﴾ [الزُّمَر : ٦٤] واته: هاوبەشبڕیاردەران لە نەزانی و نەفامییاندا داوایان لە پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم - کرد کە خوایەکانی ئەوان بپەرستێت و ئەوانیش خوایەکەی ئەم دەپەرستن، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ئەی محمد -صلى الله

علیه وسلم - پێیان بڵێ: ئایا ئێوه فه‌رمانم پێ ئه‌كه‌م كه من عیباده‌ت بۆ جگه له خوای گه‌وره بكه‌م ئه‌ی نه‌زان و نه‌فامان..؟!

(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویت: قال تعالى: ﴿وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ١٣٨﴾ [الأعراف : ١٣٨] واته : {له‌پاش ئه‌و موعجیزه گه‌وره‌یه به‌نی ئیسرائیل داوای گوێره‌كه په‌رستن ده‌كه‌ن!} [ وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ ] وه‌به‌نی ئیسرائیلمان له‌ده‌ریاكه په ڕانده‌وه دوای ئه‌وه‌ی كه موسى - صلى الله علیه وسلم - گۆچانه‌كه‌ی دا به‌ناو ئاوه‌كه‌دا دوانزه ڕێگای وشكی لێ كرایه‌وه به ئیزنی خوای گه‌وره [ فَأَتَوْا عَلَى قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَى أَصْنَامٍ لَهُمْ ] له‌وێ تێپه‌ڕین به‌سه‌ر كه‌سانێكدا كه بتیان هه‌بوو كه په‌یكه‌ر بوو له‌سه‌ر شێوه‌ی مانگاو گوێره‌كه بوو ئه‌یان په‌رستن و له‌سه‌ریان ئه‌مانه‌وه [ قَالُوا يَا مُوسَى اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ ] ئه‌مانه‌ی كه ئه‌م موعجیزه گه‌وره‌یان بینی كه خوای گه‌وره ده‌ریاكه‌ی بۆ له‌ت كردن وتیان: ئه‌ی موسى - صلى الله علیه وسلم - تۆیش خوایه‌ك بۆ ئێمه بڕیار بده‌و بتێكمان بۆ دابنێ له‌سه‌ر شێوه‌ی گوێره‌كه‌یه‌ك هه‌روه‌كو چۆن ئه‌و قه‌ومه بتیان هه‌یه‌و ئه‌یپه‌رستن با ئێمه‌ش بیپه‌رستین [ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ] موسى - صلى الله علیه وسلم - فه‌رمووی: به‌ڕاستی ئێوه قه‌ومێكی زۆر نه‌زان و نه‌فامن له دوای ئه‌و هه‌موو موعجیزه گه‌ورانه داوای ئه‌وه ئه‌كه‌ن كه گوێره‌كه‌یه‌ك بپه‌رستن، وه پێغه‌مبه‌ری خواش - صلى الله علیه وسلم - له غه‌زای (حونه‌ین) دا به‌لای هه‌ندێك داردا تێپه‌ڕی كه موشریكان داریان هه‌بوو شمشێره‌كانیان پیادا هه‌ڵئه‌واسی، ئه‌مانیش وتیان: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله علیه وسلم - تۆیش دارێك بۆ ئێمه دابنێ و بڕیار بده كه شمشێری پێدا هه‌ڵواسین بۆ ئه‌وه ی له جه‌نگه‌كاندا سه‌ر بكه‌وین، پێغه‌مبه‌ر - صلى الله علیه وسلم - الله أكبر كردو فه‌رمووی: سوێند به‌و خوایه‌ی گیانی منی به‌ده‌سته به‌نو ئیسرائیل چیان به موسا - صلى الله علیه وسلم - وت ئێوه‌ش واتان به من وت، پاشان ئه‌و ئایه‌ته‌ی بۆ خوێندنه‌وه، (ئه‌م ئایه‌ته به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه هیچ دارو به‌ردێك سودو زیانیان به ده‌ست نیه‌و سودو زیان ته‌نها به ده‌ست خوای گه‌وره‌یه‌و ده‌بێت ته‌نها باوه‌ڕو متمانه‌مان به خوای گه‌وره هه‌بێت).

## ب - نه‌فامی له ئاكارو ره‌فتارو سلوكی دا :

به‌لێ نه‌فامی یان نه‌زانی له كارو ره‌فتارو سلوكی دا ، وه‌ك نه‌فامی بیرو باوه‌ر نیه ، كه خاوه‌نه‌كه‌ی له بازنه‌ی ئایندا بچێته ده‌وره ، به‌لكو نه‌فامی له ره‌فتارو ئاكاردا یان سلوكی دا ، خاوه‌نه كه به‌روه بێ باوه‌ری ده‌بات ، (والعیاذ بالله ) خوا په‌نامان بدات ، وه‌ك ئه‌و وایه به نه‌فامی نه‌زانی له شه‌ریعه‌تی (خوای گه‌وره) ، هه‌لسێت كارێك یان شتێك حه‌لال بكات ، كه‌چی هیچ زانیاری له سه‌ر نه‌بێت نه‌فام و جهل ی له‌سه‌ر هه‌بێت ، به‌لام ئه‌و پێی وایه یان باوه‌ری وایه ئه‌م شته حه‌لاله ، كه‌چی له بنچینه دا شته‌كه حه‌رام كراوه ..؟! به‌شێوه‌یه‌ك بۆ خۆی فتوا ده‌دات به نه‌فامی و نه‌زانی ئه‌مه حه‌لاله ئه‌مه حه‌رامه ، بێ ئه‌وه‌ی بگه‌رێته‌وه بۆ به‌لگه و زانستی شه‌رعی ..؟!

**ئه‌م جۆره نه‌فامیه یان نه‌زانیه نموونه‌ی زۆره له قورئانی پیرۆزدا :**

**١-ووته‌ی (یوسف ) – علیه السلام – کاتێك ژنی عزیزی مصر ژنانه‌کانی دوای ئه‌و بانگیان کرد بۆ خراپه کردن..؟!**

**(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت** : قال تعالى: ﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ۝٣٣﴾ [يُوسُف : ٣٣] واته : {یوسف پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - به‌ندینخانه هه‌ڵده‌بژێرێت به‌سه‌ر تاواندا} [ قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ ] یوسف - صلى الله عليه وسلم - له ترسی خوای گه‌وره‌و ئومێدی پاداشته‌که‌ی به‌ند کردنی هه‌ڵبژارد به‌سه‌ر تاوان کردندا له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی له‌وپه‌ڕی گه‌نجێتی و جوانێتیدا بوو، وه ئافره‌ته‌که‌یش له‌وپه‌ڕی جوانی و ده‌وڵه‌مه‌ندی و ده‌سه‌ڵاتدا بوو، فه‌رمووی: ئه‌ی په‌روه‌ردگار سجن و به‌ند کردنم له‌لا خۆشه‌ویستره له‌وه‌ی که ئه‌وان بانگی منی بۆ ئه‌که‌ن له خراپه‌کاری، (ئه‌میش به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که ئافره‌تانی تریش به کۆمه‌ڵ داوای ئه‌و کاره خراپه‌یان لێ کردووه‌و له دواتریش که پاشاکه ئه‌ڵێ: [ قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَاوَدْتُنَّ يُوسُفَ عَنْ نَفْسِهِ ] (يُوسُف : ٥١) واته: ئێوه هه‌مووتان به کۆمه‌ڵ داواتان له یوسف - صلى الله عليه وسلم - کرد که کاری خراپتان له‌گه‌ڵدا بکات [ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ ] ئه‌ی په‌روه‌ردگار ئه‌گه‌ر فرِوفێڵ و نه‌خشه‌و پیلانی ئه‌وانم له‌سه‌ر لانه‌ده‌ی له‌وانه‌یه منیش مه‌یلم به‌لایاندا بچێ [ وَأَكُنْ مِنَ الْجَاهِلِينَ (٣٣) ] ئه‌و کاته له خه‌ڵکی نه‌زان و نه‌فام بکه‌م، له خۆی ترساو په‌نای بۆ خوای گه‌وره بردو خوای گه‌وره‌یش په‌نای دا.

**٢-پێغه‌مبه‌ر (لوط ) – علیه السلام– به قه‌ومه‌که‌ی فه‌رموو: وه‌ك (خوای گه‌روه) ده‌فه‌رمووێت** : قال تعالى: ﴿أَئِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهۡوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ۝٥٥﴾ [النَّمل : ٥٥] واته: ئایا ئێوه کاری به‌دره‌وشتی و نێربازی ئه‌که‌ن له‌گه‌ڵ پیاو وه واز له ئافره‌تان دێنن که ئه‌وان بۆ ئێوه‌ن [ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ] به‌ڵكو ئێوه که‌سانێکن که خۆتان نه‌زان و نه‌فام ئه‌که‌ن سه‌باره‌ت به‌و سزایه‌ی که خوای گه‌وره بۆی داناون..؟!

**هه‌روه‌ها قه‌ومه‌که‌ی (لوط) – علیه السلام – ئه‌مه وه‌لامه‌که‌یان بوو بۆی ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت:**
قال تعالى: ﴿۞ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخۡرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٖ مِّن قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ۝٥٦﴾ [النَّمل : ٥٦] واته: [ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ ] وه‌ڵامی قه‌ومه‌که‌ی لوط هیچ شتێك نه‌بوو ته‌نها ئه‌مه نه‌بێ که وتیان: [ إِلَّا أَنْ قَالُوا أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِنْ قَرْيَتِكُمْ ] لوط پێغه‌مبه‌رو - صلى الله عليه وسلم - شوێنکه‌وتوانی له موسڵمانان شاربه‌ده‌ر بکه‌ن [ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ] چونکه به دڵنیایی ئه‌مانه که‌سانێکن خۆیان به پاك ڕائه‌گرن له نێربازی و خراپه‌کاری..؟!

**٣- هه‌ر وه‌ك (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت** : قال تعالى: ﴿وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ۝٣٣﴾

[الْأَحْزَاب : ٣٣] واتە: {سفوریو دەرخستنی جوانی بۆ پیاوانی نامەحرەم پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانیو نەفامی بووە!} [ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ] وە لە ماڵەکانی خۆتاندا جێگیرو نیشتەجێ بن و بۆ جگە لە پێویستی مەچنە دەرەوە، تەنانەت بۆ نوێژکردنی جومعەو جەماعەت و تەراویح باشتر وایەو خێری زیاترە ئافرەت لە ماڵی خۆی نوێژ بکات و دەرنەچێت [ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى ] وە وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی پێشوو جوانی خۆتان بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرمەخەن، (کەواتە سفوری و خۆدانەپۆشین و دەرخستنی جوانی پێشکەوتن نیە بەڵکو پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی بووە لە پێش ئیسلامدا) [ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ ] وە نوێژەکانتان بکەن بە روکن و واجبات و خشوعەوە [ وَآتِينَ الزَّكَاةَ ] وە زەکاتی ماڵتان بدەن [ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ] وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بکەن {خانەوادەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - کێن؟} [ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ] ئەی خانەوادەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - تەنها خوای گەورە ئەیەوێ هەر شتێك کە خراپەو تاوان بێ لە ئێوەی دوور بخاتەوە وە بە تەواوی پاکتان بکاتەوە لە هەموو تاوان و پیسی و خراپەکاریەك، مەبەست پێی خێزانەکانی پێغەمبەرو - صلى الله عليه وسلم - ئال وبەیتی پێغەمبەری خوایە - صلى الله عليه وسلم -، (ئیبنو عەبباس) دەفەرمێت: (ئەم ئایەتە تایبەت لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دابەزی)، چونکە ئایەتەکانی پێشترو دواتریش هەر باسی ئەوانە، وە (عیکریمە) لە بازاڕدا بانگی دەکردو دەیووت: ئەم ئایەتە تایبەت لەسەر هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دابەزیوە، بەڵام تەنها ئەوان مەبەست نین، چونکە عائیشە دەفەرمێت: پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بەیانیانێکی لە ماڵ دەرچوو پۆشاکێکی لەبەردا بوو لە مووی ڕەش دروستکرا بوو، (ئیمامی حەسەن) هات و خستییە ژێریەوە، پاشان (ئیمامی حوسێن) هات و خستییە ژێریەوە، پاشان (فاتیمە) هات و خستییە ژێریەوە، پاشان (ئیمامی عەلی) هات و خستییە ژێریەوەو ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندنەوە، (کەواتە خێزانەکان و خانەوادەو ئال و بەیتی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەگرێتەوە)..؟!

## چوارەم : وێنەی نەفامی یان نەزانی :

### یەکەم : کەوتنە ناو گوناهو تاواندا :

**(خوای گەورە) دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١٧﴾ [النِّسَاء : ١٧] واتە: {تەوبە کردن بۆ کێیە؟} [ إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ ] خوای گەورە قبووڵ کردنی تەوبەی لەسەر خۆی پێویست کردووە کە هەر کەسێ تەوبە بکات خوا تەوبەی لێ قبووڵ دەکات بۆ ئەو کەسانەی کە خراپە ئەکەن بە نەزانی، (ابن عباس) ئەفەرمووێ:

هەر کەسێك خراپەی کرد ئەوە جاهیل و نەزانە [ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِنْ قَرِيبٍ ] پاشان بەنزیکی ئەگەڕێنەوە واتە: پێش ئەوە ی کە ڕوح بگاتە غەرغەرەیان [ فَأُولَئِكَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ ] ئا ئەمانە خوای گەورە تەوبەیان لێ قبووڵ دەکات و لێیان خۆش ئەبێ [ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ] وە خوای گەورە زۆر زاناو کاربەجێیە..؟!

**لە (ابن رجب ) – ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەڵێت : هەر کەسێك گوناهو تاوان و سەرپێچی (خوای گەورە) بکات ئەوا نەفام و نەزانە ، هەرکەسێکیش گویرایەلی (خوای گەورە ) بکات لە فەرمانەکانی ئەوا عالم زانایە..؟!**

**دووەم: نەبوونی پشت ڕاست کردنەوە لە هەواڵ و ئەخبار دا یان گەیاندنی هەواڵ ئەخباری نادروست :**

**(خوای گەورە) دەفەرموویٚت:** قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ۝٦﴾ [الحُجُرَات : ٦] واتە :{دڵنیا بوون لە هەواڵ} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ] ئەی باوەڕداران ئەگەر کەسێکی فاسق و دەرچوو لە گوێڕایەڵی خوای گەورە هەواڵێکی بۆ هێنان ئێوە تەبەیون و تەثەبوت بکەن و پەلە مەکەن لە بڕیارداندا تا دڵنیابن کە ئەو هەواڵە ڕاستە چونکە دواتر لەوانەیە کەسانێك بە نەزانی تووشی زەرەرو زیان بکەن وە هەڵەتان لێ ڕووبدات وە دواتریش پەشیمان ئەبنەوە لەسەر ئەو هەڵەیەی کە کردووتانە، کە وتراوە: لەسەر (وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیط) دابەزیوە کە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ناردوویەتی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی (بەنی موستەلیق)..؟!

## پێنجەم : مەمەلەکردن و هەڵسو کەوت کردن لە گەڵ نەفام و نەزانان :

**یەکەم : (الإعراض ) واتە : پشت کردن لەو کەسانەی کە نەفام و نەزانن :**

**(خوای گەورە) دەفەرموویٚت :** قال تعالی: ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ۝١٩٩﴾ [الأَعۡرَاف : ١٩٩]واتە: [ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆ لێبووردەبە لە خەڵکی، وە فەرمان بکە بە چاکە، یان بە هەر عورف و عادەت و داب و نەریتێك کە پێچەوانەی شەرع نەبێ [ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ] وە پشت بکە لە ئەو کەسانەی کە نەزان و نەفامن..؟!

دووەم: قسەکردنی خۆشەو شیرین چاك پەسەند لە گەڵ نەفامان و نەزاناندا :

(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾﴾ [الفُرْقَان : ٦٣] واتە : {هەندێك لە سیفاتی بەندە تایبەتەكانی خوا} [ وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا ] وە بەندەكانی خوای گەورە ئەو كەسانەن كە بەسەر زەویدا ئەڕۆن بەهێمنی و ئارامی بەبێ ئەوەی كە بە لووتبەرزی و فەخرو شانازی بڕۆن (مەبەست ئەوە نیە بەلاوازی بڕۆن وەكو نەخۆش) [ وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ ] وە كاتێك كەسانی نەزان و نەفام گفتوگۆیان لەگەڵدا بكەن [ قَالُوا سَلَامًا ] ئەڵێن: ئێوە ئەمین و سەلامەتن لە دەست و دەمی ئێمە و بە خراپە وەڵامی خراپی ئێوە نادەینەوە..؟!

لە (االشعراوی ) دەلێت : نەفام یان نەزان ، ئەو گێل و گەمژەیە كە ووشەكان پێوانە یان سەنگ ناكات ..!! وە ووشەكان لە شوێنی خویدا هەر گیز دانانێت ..!! لە پێوەرو مقایسی هیچ شتێك فام ناكات یان تێ ناگات ..!! نە رەوشت و نە ئەدبی هەیە ..!!

جیاوازی نێوان نەفامی و نەخوێندەواری یان جیاوازی نێوان (الجاهل ) و (الامی ) ئەمەیە :

أ–نەخوێندەوار یان (الامی) عەقل و ژیری بە تاڵە لە زانیاری ، چونكە هیچ زانیاریەكی نیە تاوەكو باوەر بهێنی ، وە ئەمەش زۆر ئاسانە كە قناعەتی پێ بهێنی بەراست و دورست ..؟!

ب–بەلام نەفام یان (الجاهل ) ئەمە زانیاری هەیە بەلام دژ و پێچەوانە واقیعە یان راستیە ، بۆیە بۆ ئەوەی كە نەفامێ یان نەزانی ، قناعەت پێ بكەی ئەم زۆر هەوڵ و ماندوو بوونی دەوێت و زۆر قورس گرانە ، چونكە سەرەتا پێویستە هەڵەكان لە عەقل و مێشكی دا دەربهێنیت ، پاشان ئەوەی راستە دەچێتە نێو دل دەروونیەوە ..؟!

**ئایەتی (٦٨):**

قال تعالى: ﴿قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٦٨]

واتە: [ قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّنْ لَنَا مَا هِيَ ] وتیان: ئەی موسى داوا لە پەروەردگارت بكە بۆمان ڕوون بكاتەوە چۆن مانگایەك بێ [ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ ] ئەگەر سەرەتا هەر مانگایەكیان بگرتایەو سەریان بڕیبایە ئەبوو، بەڵام خۆیان لەسەر خۆیان قورس و گرانیان كرد خوای گەورە مەرجی بۆیان دانا كە ئەفەرمووێ: مانگایەك

بێت کە زۆر پیر نەبێت وە زۆر بچووکیش نەبێت کە نەزابێت و سکی نەکرد بێت [ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ ] بەڵکو مام ناوەند بێ واتە سکێ دوانی کردبێت [ فَافْعَلُوا مَا تُؤْمَرُونَ (٦٨) ] دەی ئەوەی کە خوای گەورە ئەمرتان پێ ئەکات ئەمری خوای گەورە جێبەجێ بکەن، دیسان جێبەجێیان نەکردو لەسەر خۆیان قورستریان کرد..؟!

بەڵێ جوولەکە یان نەوەی ئیسرئیل بۆ هەمیشە و بەردەوام لە ئێستادا و لە رابردووش هەر بێ رەوشت و بێ ئەدەب و بێ ئەخلاق بوونە لە دەربرینی دواکاریەکانیان ، ئەگەر سەرنجێك بدەین لەم ئایەتە دەبینین چۆن دوای لە (موسی ) – علیه السلام – دەکەن دەربارەی دەست نیشان کردنی مانگا یان چێلەکە بۆیان ، هەروەك ووتیان : بە (موسی ) – علیه السلام – بەم شێوەیە ، ﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ واتە: دوا لە پەروەردگارت بکە ..؟! ئەم دەربرینەش خۆ بەگەورە دانانی جوولەکە یان نەوەی ئیسرائیل بوو ، وە گفتوگۆکردنی بێ رەوشتیان و بێ ئەدەبانە و بێ ئەخلاقیانە بوو ، هەلبەتە نیان ووت : (ادع لنا ربنا ) واتە: دوا لە پەروەدرگامان بکە ، بەلکو ووتیان : ئەی (موسی) دوا لە پەروەردگارت بکە ..؟! بەم دەربرینە ئاوایە وەکو بلێ تەنها پەروەردگاری (موسی ) بێت ..؟! هەروەها زیادەرەوی کردن و قورس کردن توندکردنی جوولەکە یان نەوەی ئیسرائیل لە سەر نەفسی خۆیان بە پرسیار کردن بە : ١-﴿ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾ ٢- ﴿ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَا﴾ ٣- ﴿ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ٧٠﴾ بەلێ ئەوان هەر مانگایە کیان سەر بری بوویایە دروست بوو ، بەلام ئەوان زۆر قورس و توندیان کرد (خوای گەورە ) ش بە سەر نەوەی جوولەکە یان نەوەی ئیسرائیل قورس و توندتری کرد ، هەر وەك دەفەرموویێت : ١-﴿إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ﴾ ٢- ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ٦٩﴾ ٣- ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ مُسَلَّمَةٞ لَّا شِيَةَ فِيهَا﴾..؟!هەر بۆیە جوولەکە لە بەر زۆری پرسیار کردن کارەکەیان لە سەر قورس و توندو گران بوو ..؟!

بەلێ جوولەکە بە هۆی زۆر پرسیار کردنیان کێشەو گیر گرفتی زۆریان بۆ خۆیادروست کرد ، (خوای گەورە )ش زیاتر لە سەری قورس وگران و توندتر کرد ، بە هۆی زۆر پرسیار کردن لە پێغەمبەرەکەیان (موسی ) – علیه السلام – ، خۆ ئەگەر ئەوەند پرسیاریان نەکردبایە هەر مانگایە هەبووایە سەریان دەبری ، بەلام بە هۆی زۆر پرسیارکردن لێکۆلینەوەیان ، ئەوا (خوای گەورە ) بۆ بەدەست هێنانی ئەو مانگایە مەرجی لە سەردانا ..؟!

لە (عبدالله کوری عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ( بەلام لە سەر خۆیان گران کرد ، (خوای گەورە) زیاتر قورس و گرانی کرد لە سەریان ، ﴿ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾ واتە: وویتان : لە پەر وەردگاری خۆت

پرسیار بکە چ جۆرە مانگایەکە ..؟! یان شێوەی چۆنە ..؟! (خوای گەورە)ش وەلامی دانەوە فەرمووی: ﴿إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكۡرٌ﴾ واتە: فەمووی : دەلێ ئەو مانگایە یان چێلەیە کە نە گەورەو پیرو پەککەوتەیە ، وە نە بچووك کەم تەمەنە ، واتە : زۆر گەورەو بە سالاچوو نیە ، وە ئەوەندەش بچووك کەم تەمەن نیە ،گا بۆی نەچوو بێ ..؟!)[1]

هەر لە (عبداللە کوری عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ( ئەم ووتەیە، ﴿عَوَانٌۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَ﴾ واتە: ناوەندی ، یان مامناوەند لە نێوان گەورەیی و بچووکیدا کە بە توانا ترو بەهێز ترە لە جۆری مانگا یان چێل دا وە باشتر و چاکتریشە ..؟![2] ئینجا (خوای گەورە ) فەرمانی پێ کردن، دەفەرموویێت: ﴿فَٱفۡعَلُواْ مَا تُؤۡمَرُونَ ۝٦٨﴾ واتە: فەرمانتان پێدراوە دەبێ بیکەن ..؟! هەربۆیە وەکو باسمان کرد کە زۆر پرسیاریان کرد لە سەر نەفسی خۆیان قورس و گران و توند کرد ، ئینجا (خوای گەورە ) مەرجی بۆ دانان کردیە فەرمان لەسەریان دەبێ ئەم مەرجانە جێ بەجی بکرێت وەك فەرمانێك بە سەریاندا ، وە جۆری ئەو مانگایە نەپیرو نەبچووکە ، بە لکو مام ناوەند ، هەلبەتە ئەم جۆرە مانگایە لە تەمەندا باشترینە ، وە بەنرخترینە ، وە بەهێزترین جۆری مانگایە ئەمستەمیش دەست دەکەوێت ..؟! ﴿فَٱفۡعَلُواْ مَا تُؤۡمَرُونَ ۝٦٨﴾ واتە: ئەوەی فەرمان پێدراوە ئەنجامی بدەن ، بەمانایەکی تریش بۆ نەوەی جوولەکە ئەوەیە واتە: هێندە پرسیارو سەرەخەریی مەکەن و لە بن بچجەوە هەلی مەکۆلن و هێندە ووردیی مەکەنەوە ، دوایی لە سەر تان قورس و گران و توند بێت ..؟!

تێبینی / سوورەتی (البقرە) بەم بەسەر هاتەوە ناونراوە ، لە راستیدا ئەوە گەورەترین وانەی تێدایە بۆ ئوومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، وانەکەش ئەوە کاتێك فەرمانێکی شەرعی ئاراستەی موسلمان دەکرێ دەبێت یەکسەر فەرمانەکە جێ بەجێ بکات ..؟!زۆر پرسیار نەکات وورد نەبێتەوە یەکسەر جێ بەجێ بکات ، چونکە لە لایەن (خوای گەورە)وە فەرمانکراوە ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ۝١٠١﴾ [المَائـِدَة : ١٠١] واتە : {زۆر پرسیار نەکردن} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ] کەسانێك وەکو گاڵتەپێکردن پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - ئەکرد یەکێك ئەیوت: باوکم کێیە؟ وە یەکێك حوشترەکەی ون بوایە ئەیوت حوشترەکەم لە کوێیە؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، وە

---

[1]- ابن ابي حاتم (٢١٦/١) ص ٦٩.
[2]-ابن ابي حاتم (٢١٧/١).

پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: ئەی خەڵکینە خوای گەورە حەجی لەسەرتان فەرز کردووە حەج بکەن، پیاوێك وتی هەموو ساڵێك؟ سێ جار وتی، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - وەڵامی نەدایەوە، پاشان فەرمووی: ئەگەر بمووتایە بەڵێ ئەوا هەموو ساڵێك لەسەرتان فەرز دەبوو وە نەیشتان دەتوانی، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ئەی باوەڕداران پرسیار لە هەندێك شت مەکەن کە پێویستتان پێ نیەو خوای گەورە خۆی بۆی ڕوون نەکردوونەتەوە ئەگەر بۆتان دەرکەوێ لەوانەیە زەرەرو زیانی بۆتان هەبێت و مەشەقەو ناڕەحەتی تیابێ [ وَإِنْ تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ ] وە لەو کاتەیشدا کە قورئان دائەبەزێ پرسیار بکەن بۆتان دەرئەکەوێ خوای گەورە بەوەحی بۆتان ڕوون ئەکاتەوە [ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا ] هەندێك شت هەیە خوای گەورە لێی بێدەنگ بووەو قورئان باسی نەکردووە تەکلیف لە ئێوە نەکراوە خوای گەورە لەوە بووراوە ئێوە خۆتان پرسیار مەکەن دەربارەی با نەبێتە باری قورس بەسەر شانتان و دواتر بۆتان جێبەجێ نەکرێت، پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - سێ شەو لە مزگەوت تەراویحی کرد، کە بینی خەڵکی لێیکۆدەبنەو تامەزرۆن دواتر نەیکرد نەوەکو فەرز بکرێت لەسەریان و توانایان نەبێت و تاوانبار بن [ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ] وە خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و لەسەرخۆیە پەلە ناکات لە سزادان و عقوبەدانی بەندەکانی..؟!**هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموێت:** قال تعالى: ﴿قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ١٠٢﴾ [المَائـِدَة : ١٠٢]واتە: کەسانێك لە پێش ئێوە پرسیاری هەندێك لەم بابەتانەیان کرد دوای ئەوە نە یانتوانی و لە توانایاندا نەبوو کە جێبەجێی بکەن و پێی کافر بوون، وەکو جولەکە کە داوایان کرد لە ئاسمانەوە کتابێکیان بۆ دابەزێت، وە گاورەکان کە داوایان کرد خوای گەورە لە ئاسمانەوە سفرەو خوانێکیان بۆ دابەزێنێت، وە قورەیش کە داوایان کرد خوای گەورە کێوی صەفایان بۆ بکات بە ئاڵتوون..؟!

**لە (ابو هريرة )– خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((ما نَهَيْتُكُمْ عنْه فاجْتَنِبُوهُ، وما أمَرْتُكُمْ به فافْعَلُوا منه ما اسْتَطَعْتُمْ، فإنَّما أهْلَكَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ، كَثْرَةُ مَسائِلِهِمْ، واخْتِلافُهُمْ علَى أنْبِيائِهِمْ)).[1] **واتە: هەر شتێك ڕێگری یان قەدەغەم کرد خۆتانی لێ بەدوور بگرن ، یان خۆتانی لێ بپارێزن ..! !وە ئەوەی فەرمانم پێکردن بە گوێرەی توانا ئەنجامی بدەن ..! !چونکە بەراستی ئەو شتەی ئوممەتەکانی پێش ئێوەی نە ناوبردووە ، ئەوا زۆر پرسیار کردنیان لە فەرمانی پێغەمبەران دەکرد ، وە زۆریان لە گەل دەکەوتنەو راجیایی و مشت و مڕەوە ..؟!**

**تێبینی/ ئوممەتی ڕێك وپێك ئەوەیە کە باوەڕو متمانەی بە پێغەمبەر و سەرۆك سەردایەتی خۆی هەبێ کاتێك فەرمانێك دەر دەکات ، مادام پێچەوانەی شەرع نەبێت ، یەکسەر دەبێت ئەنجامی بدەن و جێ بەجێ بکەن ، نەك زۆر پرسیاری لە سەر بکەن لە بن وبنچی فەرمانەکە بکۆڵنەوە ، چونکە لە زۆر پرسیار کردن ، دەبێتە هۆی قورسی و گرانی فەرمانەکە ..؟!**

[1]- صحيح مسلم برقم (١٣٣٧).

له‌ (ابو هريرة)- خوا لێ رازی بێت – ده‌گێڕێته‌وه‌ له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌موویه‌تی: ((إنَّ اللَّهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاثًا، ويَكْرَهُ لَكُمْ ثَلاثًا، فَيَرْضَى لَكُمْ: أنْ تَعْبُدُوهُ، ولا تُشْرِكُوا به شيئًا، وأَنْ تَعْتَصِمُوا بحَبْلِ اللهِ جَمِيعًا ولا تَفَرَّقُوا، ويَكْرَهُ لَكُمْ: قيلَ وقالَ، وكَثْرَةَ السُّؤالِ، وإضاعَةِ المالِ. وفي رواية: مِثْلَهُ، غيرَ أنَّه قالَ: ويَسْخَطُ لَكُمْ ثَلاثًا، ولَمْ يَذْكُرْ: ولا تَفَرَّقُوا )).[1] واته‌ : (خوای گه‌وره‌ ) له‌ سێ شتی ئێوه‌ رازیه‌ ، وه‌ له‌ سێ شتی ئێوه‌ نارازیه‌ یان پێ ناخۆشه‌ ..؟! رازی له‌ ئێوه‌ : كه‌ (خوای گه‌وره‌ ) بپه‌رستن هیچ شتێك نه‌كه‌نه‌ هاوه‌ل و هاوبه‌شی ..!!وه‌ هه‌موو تان یه‌ده‌ست بگرن به‌ ئایینی خواوه‌ ..!!وه‌ ناكۆك مه‌بن و به‌ر بلاو مه‌بن له‌گه‌ل یه‌كتری دا ..!! وه‌ (خوای گه‌وره‌ ) زۆری پێ ناخۆشه‌ له‌ ئێوه‌ : (قيل قال ) واته‌ : (قسه‌ی خه‌لك وا ووتراو، فلان كه‌س وای ووت...هتد ) ، وه‌ زۆر پرسیار كردن ، وه‌ مال و سامان به‌ فیرۆدان به‌ شتی پرو پووچ و بێ نرخ ..؟!

كه‌واته‌ : ﴿فَٱفۡعَلُواْ مَا تُؤۡمَرُونَ ۞﴾ واته‌: ده‌ی زوو جێ به‌جێ بكه‌ن ئه‌وه‌ی كه‌ فه‌رمانتان پێدراوه‌ ..؟! واته‌: به‌سه‌ ئه‌وه‌نده‌ پرسیار مه‌كه‌ن ..؟! بابه‌ته‌كه‌ ئه‌وه‌نده‌ له‌ سه‌ر خۆتان قورس و گران مه‌كه‌ن ..؟!وه‌ك باسمان كرد ده‌بوایه‌ نه‌وه‌ی جووله‌كه‌ ئه‌وه‌ند پرسیار نه‌كه‌ن ، مانگایه‌كی مام ناوه‌ندیان یه‌ر بری بایه‌ ، خۆیان رزگار بكه‌ن ، به‌لام چۆن ئه‌بێ وا به‌ ئاسان جووله‌كه‌ فه‌رمانه‌كه‌ زوو جێ به‌جێ بكه‌ن ، خۆ ئه‌وان هاو شێوه‌ی ئاژه‌ل له‌ رابردوودا و له‌ ئێستاش دا مامه‌له‌ده‌كه‌ن ، وه‌ك ئه‌و مانگایه‌ له‌ مێشك ژیری شل وخاوی دا ، بۆیه‌ ئێستا جیهانیان كاول كردووه‌ به‌ خراپه‌كاریه‌كانیان ئه‌وه‌تا تائێستا چه‌نگ له‌ فه‌له‌ستین له‌ شاری غه‌زه‌ به‌رده‌وامه‌ كه‌ رێكه‌وتی ١٤٤٦/٢/٥هیجری به‌رانبه‌ر به‌ رێكه‌وتی ٢٠٢٤/٨/٩زاینی ، هه‌روه‌ها هه‌ر به‌ كاره‌ قێزه‌ونه‌كانیان له‌ رێكه‌وتی ١٤٤٦/٢/١هیجری به‌رانبه‌ر به‌ رێكه‌وتی ٢٠٢٤/٨/١زاینی ، له‌رێگه‌ی ده‌زگا هه‌والگه‌ریه‌خراپه‌كاره‌ قێزه‌ونكه‌ی هه‌ستان به‌ تیرۆر كردنی سه‌ر كرده‌یه‌كی موسلمانان یان سه‌ركرده‌ی حزبی حه‌ماسی فه‌له‌ستین (إسماعيل هنيه)، له‌ شاری تهرانی ولاتی ئێران دا شه‌هیدیان كرد ، (إن شاء الله) خوای گه‌وره‌ به‌ پله‌ی شه‌هیدی سه‌ركرده‌ی پێ ده‌به‌خشی ..؟!

## (السؤال ) یان پرسیار كردن

### پێناسه‌ی : پرسیار كردن

### یه‌كه‌م : له‌رووی زمانه‌ وانیدا :

[1]-صحيح مسلم برقم (١٧١٥).

له (ابن فارس) ده‌لێت: (السين ، الهمزة ، واللام ) يه‌ك ووشه‌يه ، هه‌روه‌ك ده‌لێن : ( سأل يسأل سؤالا ومسالة ، وتساءل الرجال أي سأل بعضهم بعضا ) واته : له پیاوه‌كان پرسیاریان كرد ، كامه پرسیار له یه‌كتریان كرد، وسؤله كهمزة معنى : كثير السؤال ، واته : زۆر پرسیار كردن ..؟![1]

ووتراوه : هه‌ر بۆیه هه‌ژارێك ئه‌گه‌ر پێویستی به شتێك بێت ناوی (سائلا ) واته: به‌كوردی (سوالكه‌ر ) یان پرسیار كه‌ر ، چونكه سروشتی (سوالكه‌ر ) وایه كه زۆر پرسیار ده‌كات ..؟![2] هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ۝١٠﴾ [الضُّحَى : ١٠] واته: وه كه‌سێكیش كه فه‌قیرو هه‌ژاره‌و داوات لێ ئه‌كات به‌ڕوویدا هه‌ڵمه‌شاخێ به‌ڵكو ئه‌گه‌ر نه‌یشت بوو بیده‌یتێ به نه‌رمی و به جوانی ڕه‌تی بكه‌وه، یاخود (السَّائِلَ) كه‌سێك كه پرسیاری دینت لێ ئه‌كات تۆ به‌جوانترین شێواز وه‌ڵامی بده‌وه‌و له‌وه‌ی خوای گه‌وره پێی به‌خشیوویت فێری بكه، چۆن خۆت پێشتر هیچت نه‌زانیوه خوای گه‌وره له ڕێی وه‌حییه‌وه فێری كردوویت تۆیش ئه‌و وه‌حییه به خه‌ڵكی بگه‌یه‌نه به‌جوانترین شێوازو له خه‌ڵكی تووڕه‌مه‌به‌و ڕێنمایی خه‌ڵكی بكه به زانیاری..؟!

## دووه‌م : له‌رووی زاراوه‌ی :

زانایان وا پێناسه‌یان كردووه كه پرسیار كردن بانگ كردنه بۆ زانین ، وه ئه‌وه‌یه ده‌بێته هۆكاری زانین ، یان ئه‌وه‌یه ده‌بێته هۆكارێك بۆ په‌یدا كردنی مال و سامان ، هه‌روه‌ها بانگ كردنی زانست زانین وه‌لامه‌كه‌یه‌تی له‌سه‌ر زمان ، وه له پشت ده‌ست نوو سین ئاماژه كردنه ، بانگ كردنی بۆ مال و سامان وه‌لامه‌كه‌یه‌تی له سه‌ر ده‌ست ، هه‌روه‌ها زمانیشی له پشته‌وه‌یه ، ئینجا یان به‌لێنێك یان به وه‌لامێك ..؟![3]

له (الراغب الاصفهاني ) ده‌لێت : پرسیار كردن دوو نموونه‌یه :

یه‌كه‌م: دوای بابه‌تێك بكه یان داوای ئه‌وه‌ی بكه پرسیارت لێ كردووه ، هه‌روه‌ك ئه‌م نموونه‌یه‌ی قورئانی پیرۆز كه (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿يَـٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِىَ ٱللَّهِ﴾ [الأَحۡقَاف : ٣١] واته: وتیان: ئه‌ی قه‌ومی خۆمان وه‌ڵامی بانگخوازی خوای گه‌وره بده‌نه‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خوایه - صلى الله عليه وسلم -..؟!

[1] -مقاييس اللغة ، ابن فارس ، ص ٥٠١.
[2] -العين ، الفراهيدي (٣٠١/٧).
[3] -المفردات ، الراغب الاصفهاني ص ٤٣٧، والكليات الكفوي (٥٠١/١).

هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویت :قال تعالى: ﴿وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ [ٱلْأَحۡقَاف : ٣٢]واتە : وە هەر کەسێك وەڵامی بانگخوازی خوای گەورە نەداتەوە کە پێغەمبەری خوایە - صلى الله عليه وسلم - ئەوە لەسەر زەویدا لە دەسەڵاتی خوای گەورە ڕزگاری نابێت و توانای ڕاکردن و ڕزگاربوونی نیە..؟!

دووەم : دوا کردنی بەخشین ، وەلامەکەی بەخشینە ، هەروەك ئەم نموونەی قورئانی پیرۆز ، (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۝﴾ [يُونُس : ٨٩]واتە: [ قَالَ قَدْ أُجِيبَتْ دَعْوَتُكُمَا ] خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسى و هارون ئەوە دوعای هەردووکتانم قەبوڵ کرد، کە موسا دوعای ئەکردو هارون ئامینی ئەکرد، (ئامینیش بە دوعا حسابە بۆیە نوێژخوێن لە پاش ئیمام ئامین بکات وەکو ئەوە وایە خۆی فاتیحەی خوێند بێت) [ فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ] ئێوە دامەزراو بن لەسەر دین وە شوێن ڕێچکەو ڕێبازی ئەو کەسە نەزان و نەفامانە مەکەون..؟![1]

تێبینی / بابەتی (السوال ) یان پرسیار کردن ، لە قورئانی پیرۆز (١٢٩) جار هاتووە ..!!

هەروەها ووشەی (السوال ) یان پرسیار کردن ، لە قورئاندا بە دوو شێواز هاتووە :

أ–بەمانایی زمانەوانیدا ، وەك لە سەرەوەدا پێناسەمان کرد ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿يَسۡـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ ...﴾ [ٱلۡأَحۡزَاب : ٦٣] واتە : {تەنها خوای گەورە کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت دەزانێت} [ يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - خەڵکی پرسیاری کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەتت لێ ئەکەن [ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ ] پێیان بڵێ: زانستی هاتنی ڕۆژی قیامەت تەنها لای خوای گەورەیەو، خوا نەبێ کەس نازانێ کەی قیامەت دێت..؟!

ب– لێ پرسینەوە یان کردن لە ڕۆژی کۆبوونەوە یان لە ڕۆژی قیامەتدا ، هەروەك (خوای گەورە) دفەرموویت: قال تعالى: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ۝﴾ [الحِجۡر : ٩٢]: واتە : وە سوێند بێ بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - لە ڕۆژی قیامەت پرسیار لەو کافرانە لە هەر هەموویان ئەکەین لەسەر لا إله الا الله..؟!

## ئەو ووشانەی پەیوەندی هەیە بە (السوال ) یان پرسیار کردن

### یەکەم:(الاستخبار ) واتە: هەواڵگەری :

أ– لەرووی زمانەوانیدا :

[1]-المفردات ، الراغب الصفهاني ص ٢١.

لە (ابن فارس ) دەلێت: (الخاء ، والباء ، والراء أصلان ) یەکەم : لە هەوال ئەوە عیلم زانین زانیاریە ..!! دووەم : لە شارەزایانەوە ، ئەو زەویە نەرمە ،وە ئەوە ئاماژەیە بۆ نەرمی و شلبوونی زۆر ، وە دەوترێت : لێ بپرسە ، واتە : پرساری هەوالەکەی لێکرد ، وە دوای کرد پێ بلێ . وەشارەزایانی یان زانایانی جیهان ..!! هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ۝٥٩﴾ [الفُرْقَان : ٥٩] واتە : تۆ لەم شتە پرسیار لە خوایەك بکە کە زۆر زانایەو زانیاریەکی زۆر وردی هەیە کە خوای گەورەیە..؟!

ب- لەرووی زاروەی :

(الاستخبار ) واتە: دوای هەوالێك بکرێت یان زانیاری یەك بکرێت کە تۆ نەتبێت ..؟!

پەیوەندی نێوان پرسیار و هەوال یان (السوال یان الاستخبار )

لە (ابو هلال العسکری ) دەلێت : (الاستخبار ) یان هەوالگەری تەنها دوای هەوالەکەی یان خبرە کەی لێ کردووە ، بەلام (السوال ) یان پرسیارەکە دوای هەوال خبرو فەرمان کردن قەدەغەکردن یان دوور کردنەوەی لێ دەکات ، ئەوەش کاتێك پرسیار کەر ،پرسیار لە کەسێکی تر بکات ، کە فەرمانی پە شتێك پێ بکات ، یان قەدەغەی بکات لە کارێك ، ئەوا پرسیار فەرمان کردن لە (الصیغە ) دا وەك یەکن ، بەلام لە پلە دا جیاوازن ، پرسیارەکە یان پرسیار کردن لە نزمترین پلە دایە ، بەلام فەرمان کردن لە بەرزترین پلە دایە ..؟! .[1]

لە (الراغب الاصفهانی ) دەلێت : هەموو هەوالگەریەك پرسیارکەرە ، وەهەموو پرسیارکەرێك هەوالگەری نیە ..؟![2]

## دووەم:(الاستفهام ) : واتە: لێ پرسینەوە یان پرس کردن بۆ تێ گەیشتن لە شتێك :

أ-لەرووی زمانەوانیدا :

(الاستفهام ) سەرچاوەی کردارێکە ، یان ئەوەیە بۆ تێ گەیشتن..؟!

---

[1]-الفروق اللغوية ص ٣٧.
[2]-تفسير الراغب الاصفهاني (٤٦٦/٥).

له (ابن فارس ) ده‌لێت : ( الفاء ، الهاء ، والميم علم شيء ) بۆنموونه وه‌ك ئه‌وه‌ی (پرسیار بكه بۆ تێگه‌یشتنی ) یان ( لێم بپرسه له شتێك بۆ تێگه‌یشنی ، وه تێگه‌یشتم ) پرس كردن دوا كردنه بۆ تێ گه‌یشتن ئه‌وه‌ش تایبه‌ت به هه‌واگه‌ری یان هه‌وال پێدان ..؟![1]

ب- له‌رووی زاره‌وه‌ی :

پرسیار كردنه له جێ ناوی كه‌سی دووه‌م ..! ! یان قه‌سه‌كه‌ر دوای له كه‌سی دووه‌م یان ئه‌و كه‌سه كرد كه قسه‌ی له‌گه‌لدا ده‌كات ، له مێشكیدا ده‌رك به‌وه بكات ، كه له‌و شتانه‌ی پرساری لێ كردووه كه ده‌ركی پێ نه‌كردووه..؟![2]

ئامرازه‌كانی الاستفهام یان پرس كردن ئه‌مانه‌ی خواره‌وه‌ن :

( الهمزه الاستفهام ، كيف ، كم ، ما ، هل ، من ،متى ، أين ، ماذا ، ، أي ...هتد)

ئامرازه‌كانی (الاستفهام ) یان پرس له چه‌ند ئایه‌تێك دا :

١-(الهمزة الاستفهام ) قال تعالى: ﴿ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ٢٧﴾ [النَّازِعَات : ٢٧]واته: {تواناو ده‌سه‌لآتی خوای گه‌وره} [ أَأَنْتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا (٢٧) ] ئایا دروست كردنی ئێوه سه‌ختترو قورستره یاخود دروست كردنی ئه‌و ئاسمانانه كه خوای گه‌وره دروستی كردوون؟، ئاسمانێك كه به چاوی خۆتان ئه‌یبینن كه چه‌ندێك گه‌وره‌یه خوای گه‌وره دروستی كردووه‌و له بان سه‌ری ئێوه ڕایگرتووه ئایا ئه‌مه قورسترو سه‌ختتره یاخود دروست كردنه‌وه‌ی ئێوه له دوای مردن؟، بێگومان دروستكردنی ئاسمانه‌كان گه‌وره‌تره ئیتر بۆ باوه‌ڕ به‌وه ناكه‌ن كه خوای گه‌وره له دوای مردن توانای هه‌یه سه‌رله‌نوێ زیندووتان بكاته‌وه..؟!

٢-(هل ) قال تعالى: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾ [الإِنسَان : ١]واته: به دڵنیایی ماوه‌یه‌ك له‌سه‌رده‌م و كات به‌سه‌ر مرۆڤدا تێپه‌ڕیوه كه هیچ شتێك نه‌بووه تا باس بكرێ و وجودو بوونی نه‌بووه، ئاده‌م سه‌ره‌تا پێش ئه‌وه‌ی دروست بكرێ بوونی نه‌بوو وه باس نه‌كراوه، یاخود مه‌به‌ست پێی مرۆڤه پێش ئه‌وه‌ی كه دروست بێ وجودو بوونی نیه..؟!

---

[1]-مقاييس اللغة ابن فارس (٤٥٧/٤)،لسان العرب ، ابن منظور (٤٥٩/١٢) ، تفسير الراغب الاصفهاني (٤٦٦/٥).
[2]-التوفيق على مهمات التعاريف ، المناوى ص٤٩، الكليات الكفوي ص٩٧.

٣-(من ) قال تعالى: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٥٥] واته: هیچ که‌سێك ناتوانێ شه‌فاعه‌ت بكات له‌لای خوای گه‌وره ئیلا به‌ئیزنی خوای گه‌وره نه‌بێ كه ئیزن بدات بۆ تكاكارو تكابۆكراوه..؟!

٤–(ما) قال تعالى: ﴿فَقَالَ مَالِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ﴾ [النَّمۡل : ٢٠] واته : فه‌رمووی: ئه‌وه چیه بۆچی هودهود نابینم..؟!

٥–(ماذا) قال تعالى: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١٥]واته : ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئه‌كه‌ن چی ببه‌خشن له پێناو خوای گه‌وره‌دا؟ وه‌به‌كێ ببه‌خشن؟ تۆ پێیان بڵێ هه‌ر شتێك كه ئه ببه‌خشن له خێرو چاكه ببیه‌خشن به..؟!

٦–(كم ) قال تعالى: ﴿قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ [الكَهۡف : ١٩] واته : یه‌كێك له‌وان وتی: چه‌ندێك لێره ماونه‌ته‌وه‌و خه‌وتوونه؟ [ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ] وتیان: ڕۆژێك یان هه‌ندێك له ڕۆژێك ماوینه‌ته‌وه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به به‌یانی هاتوونه‌و خوای گه‌وره بۆ ئێواره به خه‌به‌ری هێنان بۆیه وتوویانه: ڕۆژێك..؟!

قال تعالى: ﴿سَلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١١] واته : ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم وه ئه ی باوه‌ڕداران پرسیار له به‌نو ئیسرائیل بكه‌ن چه‌نده‌ها به‌ڵگه‌ی ڕوون و ئاشكرامان پێیان به‌خشی كه پێغه‌مبه‌رانیان بۆیان هێنان..؟!

٧–(أين ) قال تعالى: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾﴾ [القَصَص : ٦٢] واته: وه له ڕۆژی قیامه‌ت خوای گه‌وره بانگی هاوبه‌شبڕیارده‌ران ئه‌كات و ئه‌فه‌رمووێ: ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ئێوه له دونیا به گومانی خۆتان كردبووتان به شه‌ریك بۆ من كوا ئه‌وانه له كوێن ئایا سه‌رتان ئه‌خه‌ن و فریاتان ئه‌كه‌ون و شه‌فاعه‌تتان بۆ ئه‌كه‌ن..؟!

قال تعالى: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوٓا۟ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ [الأَعۡرَاف : ٣٧] واته: تا ئه‌و كاته ی كه نێردراوانی ئێمه دێن، واته: فریشته‌ی گیانكێشان و ڕوحیان ئه‌كێشن و پێیان ئه‌ڵێن: كوا ئه‌و خواو په‌رستراوانه ی كه ئێوه جگه له خوای گه‌وره ئه‌تانپه‌رستن..؟!

٨–(متى ) قال تعالى: ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢١٤] واته: تا پێغه‌مبه‌ره‌كه‌و ئه‌و ئیماندارانه‌ی كه له‌گه‌ڵیدا بوون وتیان: خوایه كه‌ی سه‌ركه‌وتنی تۆ دێت داوای سه‌ركه‌وتنیان له خوای گه‌وره كرد [ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ] خوای گه‌وره موژده‌ی پێدان كه بزانن سه‌ركه‌وتنی خوای گه‌وره نزیكه بۆ باوه‌ڕداران..؟!

قال تعالى: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾﴾ [يُونُس : ٤٨] واته: وه كاتێك به كافران بڵێن سزای خوای گه‌وره‌تان بۆ دێت، ئه‌وان په‌له ئه‌كه‌ن و ئه‌ڵێن: ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئه‌م وه‌عدو به‌ڵێنه كه‌ی دێت ئه‌گه‌ر ئێوه ڕاستگۆن..؟!

٩-(كيف) قال تعالى: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨] واته : ئێوه چۆن كوفر ئه‌كه‌ن به خوایه‌ك له كاتێكدا ئێوه له‌سه‌ره‌تادا بوونتان نه‌بووه‌و ئێوه‌ی دروست كردووه [ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ] پاشان ئه‌تانمرێنێته‌وه پاشان له ڕۆژی قیامه‌ت زیندووتان ئه‌كاته‌وه پاشان بۆ لای خوای گه‌وره ئه‌گه‌ڕێنه‌وه..؟!

قال تعالى: ﴿كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ﴾ [آل عِمرَان : ٨٦] واته : چۆن خوای گه‌وره هیدایه‌تی كه‌سانێك ئه‌دات كه كافر بنه‌وه له دوای ئیمان هێنانیان..؟!

١٠-(أي ) قال تعالى: ﴿فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ﴾ [الأَنْعَام : ٨١] واته: ئایا له‌م دوو كۆمه‌ڵه كامیان شایانترن به‌وه‌ی كه ئه‌مین بن له سزای خوای گه‌وره وه نه‌ترسێن؟ ئایا باوه‌ڕداران ئه‌وانه‌ی كه باوه‌ڕیان به خوای گه‌وره هه‌یه یان ئه‌و كافرانه‌ی كه باوه‌ڕیان به‌و بت و دروستكراوه لاوازانه هه‌یه..؟!

قال تعالى: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا﴾ [مَريَم : ٧٣] واته : كافران به باوه‌ڕداران ئه‌ڵێن: ئایا ئه‌م دوو كۆمه‌ڵه: موسڵمانان و كافران كامیان پله‌و پایه‌یان له‌ناو خه‌ڵكدا باشتره‌و ناودارترن و پشتیوانیان زۆرتره ..؟!

## جۆره‌كانی (السؤال ) یان پرسیار كردن له قورئانی پیرۆزدا

### یه‌كه‌م : پرسیار كردنی (الاستفهامی ) پرس یان بۆ تێگه‌یشتن :

**(الاستفهام ) یان پرسه كه به شێوه‌یه‌كی (مجازی ) وه‌لامده‌درێته‌وه نه‌ك له حقیقه‌تدا وایه، وه‌ك نموونه‌ی ئه‌م ئایه تانه‌ی خواره‌وه:**

**١-(الامر ) واته: فه‌رمان كردن** ، قال تعالى: ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ۝٩١﴾ [المَائـِدَة : ٩١]واته : ایا ئێوه كۆتایتان پێ هێناو به یه‌كجاری و هه‌میشه‌یی وازتان لێ هێنا؟ هاوه‌ڵان فه‌رموویان به‌ڵێ وازمان لێ هێناو كوپه‌له عاره‌قه‌كانیان رژاندو به كۆڵانه‌كانی مه‌دینه‌دا ده‌رۆیشت..؟!

**٢-(النهي ) واته: رێگری یان قه‌ده‌غه** ،قال تعالى: ﴿مَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ [الحَشۡر : ٧] واته : وه ئه‌وه‌ی كه پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - بۆی هێناون ئێوه وه‌ری بگرن، وه ئه‌وه‌یشی كه پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - نه‌هی لێكردووه ده‌ستی لێ هه‌ڵبگرن، واته: گوێڕایه‌ڵی پێغه‌مبه‌ری خوا بكه‌ن - صلى الله عليه وسلم - چونكه ئه‌و ته‌نها فه‌رمانتان پێ ده‌كات به چاكه‌و رێگریتان لێده‌كات له خراپه..؟!

**٣-(النفي) واته : نه‌كۆلیكردن** ، قال تعالى: ﴿أَفَمَنۡ حَقَّ عَلَيۡهِ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ۝١٩﴾ [الزُّمَر : ١٩] واته : ئایا كه‌سێك كه وشه‌ی سزای خوای گه‌وره‌ی به‌سه‌ردا جێگیرو جێبه‌جێ بووه‌و چه‌سپاوه وه‌كو ئیبلیس و كافران ئایا تۆ ئه‌ته‌وێ كه‌سانێكی ئاوا له ئاگری دۆزه‌خ رزگار بكه‌یت و هیدایه‌تیان بده‌یت؟ كه پێغه‌مبه‌ر -صلى الله عليه وسلم - زۆر سوور بوو له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه خه‌ڵكی هه‌موویان هیدایه‌ت وه‌ربگرن و ئیمان بێنن، واته: هه‌موویان ئیمان ناهێنن و هیدایه‌ت وه‌رناگرن..؟!

**٤-(الإنكار) واته: ره‌ت كردنه‌وه یان ئینكاری كردن** ، قال تعالى: ﴿أَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَدۡعُونَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ۝٤٠﴾ [الأَنۡعَام : ٤٠] واته : ئایا ئێوه له جگه له خوای گه‌وره ده‌پاڕێنه‌وه ئه‌گه‌ر ڕاستگۆن له‌وه‌ی كه ئه‌ڵێن: بته‌كان سوودو زیانیان به‌ده‌سته‌و وه‌ك خوان به‌گومانی خۆتان..؟!

**٥-(التقرير ) واته : دان پێدانان به فه‌رمان یان دان یان بریاردان** ، قال تعالى: ﴿أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآ﴾ [الأَعۡرَاف : ١٧٢]واته: [ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ] ئایا من په‌روه‌ردگاری ئێوه نیم [ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا ] هه‌رچی نه‌وه‌ی ئادەم هه‌یه هه‌ر هه‌موویان وتیان: به‌ڵێ شایه‌تی ئه‌ده‌ین كه تۆ په‌روه‌ردگاری ئێمه‌ی..؟!

**٦-(التوبيخ ) واته : سه‌ر زنشت كردن** ، قال تعالى: ﴿أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ ۝١٢٥﴾ [الصَّافَّات : ١٢٥] واته: [ أَتَدْعُونَ بَعْلًا ] ئایا ئێوه عیباده‌ت بۆ (به‌عل) ئه‌كه‌ن كه ناوی بتێك بووه، یان ناوی ئافره‌تێك بووه په‌رستوویانه،

یان ناوی په‌روه‌ردگار بووه‌و بتێکتان کردووه به په‌روه‌ردگار [ وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ] وه وازتان له باشترین دروستکار هێناوه که خوای گه‌وره‌یه‌و عیباده‌تی ئه‌و ناکه‌ن، که ته‌نها ئه‌و په‌رستراوی حه‌قه‌و شایانی په‌رستنه‌و په‌رستراوه‌کانی تر پوچه‌ڵ و بێبنه‌مان..؟!

٧-(التعجب ) واته: سه‌ر سورمان ..! ! قال تعالى: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨]واته: ئێوه چۆن کوفر ئه‌که‌ن به خوایه‌ك له کاتێکدا ئێوه له‌سه‌ره‌تادا بوونتان نه‌بووه‌و ئێوه‌ی دروست کردووه..؟!

٨-(التذكير) واته: بیرخستنه‌وه ، قال تعالى: ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٣٣] واته: خوای گه‌وره فه‌رمووی: ئایا من پێتانم نه‌ووت که من نهێنی ئاسمانه‌کان و زه‌وی ئه‌زانم، وه ئه‌وه‌ی که ئاشکرای ده‌که‌ن و ده‌ریئه‌بڕن ئه‌ویش هه‌ر ئه‌زانم که وتتان ئه‌مه‌ی که تۆ دروستی ئه‌که‌یت ئاشوب ئه‌گێڕێ له‌سه‌ر زه‌وی و خوێن ئه‌ڕێژێ، ئه‌وه‌یشی که شاردووتانه‌وه ئه‌ویش ئه‌زانم له‌وه‌ی که ئیبلیس له نه‌فسی خۆیدا ته‌که‌بورو لووتبه‌رزی شاردبۆوه..؟!

٩-(الافتخار ) واته: شانازی کردن ، قال تعالى: ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾﴾ [الزُّخْرُف : ٥١] واته [ وَنَادَى فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِ ] وه فیرعه‌ون له‌ناو قه‌ومه‌که‌یدا بانگی کرد [ قَالَ يَا قَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ ] وتی: ئه‌ی قه‌ومی خۆم ئایا موڵکی میصر هه‌مووی هی من نیه؟ [ وَهَذِهِ الْأَنْهَارُ تَجْرِي مِنْ تَحْتِي ] وه ئه‌م ڕووبارانه‌ی (نیل)یش له ژێر کۆشك و ته‌لارو ده‌سه‌ڵاتی مندا ئه‌ڕوات [ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ] ئایا نابینن که بزانن من چه‌ندێك به‌هێزم وه موسا - صلى الله عليه وسلم - چه‌ندێك لاوازو بێده‌سه‌ڵاته بۆ شوێنی ئه‌که‌ون..؟!

١٠-(الترغيب ) واته : هاندان ، قال تعالى: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ [البَقَرَة : ٢٤٥] واته: کێ هه‌یه قه‌رزێکی باش به‌خوای گه‌وره‌ی ببه‌خشێ که له دڵیه‌وه ده‌رچێ، واته: خێرو صه‌ده‌قه‌و چاکه بکات..؟!

١١-(التجاهل) واته: نه‌زانی یان نه‌فامی ،قال تعالى: ﴿قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ [الفُرْقَان : ٦٠] واته: ئه‌وان ئه‌ڵێن: ئێمه ڕه‌حمان ناناسین..؟!

## دووه‌م : (السؤال الانكاري) یان پرسیارکردن له نکۆڵیکردن یان بێ متمانه کردن :

قال تعالى: ﴿فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ٧١﴾ [الكَهۡف : ٧١] واته: {خدر - صلى الله عليه وسلم - كه‌شتییه‌كه كون ده‌كات!} [ فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ خَرَقَهَا ] به ڕێكه‌وتن تا سوار كه‌شتییه‌ك بوون خضر - صلى الله عليه وسلم - له لایه‌كه‌وه كه‌شتییه‌كه‌ی كون كرد [ قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا ] موساش - صلى الله عليه وسلم - خۆی بۆ نه‌گیرا وتی: ئایا كونت كرد بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵكی ناو ئه‌م كه‌شتییه نوقمی ئاوه‌كه بكه‌ی [ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا ] به‌ڕاستی كارێكی خراپ و سه‌رسوڕهێنه‌رو گه‌وره‌ت كرد، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه خضریان - صلى الله عليه وسلم - ناسی به‌بێ به‌رامبه‌ر سه‌ریان خستن و پاره‌یان لێ وه‌رنه‌گرتن..؟!

قال تعالى: ﴿فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ٧٤﴾ [الكَهۡف : ٧٤]واته: {خدر - صلى الله عليه وسلم - منداڵێك ده‌كوژێت!} [ فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُ ] دیسان به‌ڕێكه‌وتن تا گه‌یشتن به مناڵێك كه له‌گه‌ڵ منداڵانی تردا یاری ئه‌كرد، خضر - صلى الله عليه وسلم - كوشتی [ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ ] دیسان موسى - صلى الله عليه وسلم - خۆی بۆ نه‌گیراو فه‌رمووی: ئایا نه‌فسێكی پاكت كوشت به‌بێ ئه‌وه‌ی كه كه‌سێكی كوشتبێت؟ به‌بێ تۆڵه سه‌ندنه‌وه [ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا ] به‌ڕاستی كارێكی خراپ و مونكه‌رت كرد..؟!

قال تعالى: ﴿قَالَ لَوۡ شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا ٧٧﴾ [الكَهۡف : ٧٧] واته: موسى - صلى الله عليه وسلم - دیسان قسه‌ی كردو وتی: خه‌ڵكی ئه‌م دێ¬یه خزمه‌تی ئێمه‌یان نه‌كردووه بۆچی پاره‌و كرێیان لێ وه‌رناگری له به‌رامبه‌ر ڕاست كردنه‌وه ی دیواره‌كه‌و چاك كردنی ..؟!

## سێ یه‌م : (السؤال الطلبي) یان پرسیار كردنی دواكاری:

**كه‌واته : پرسیاره‌كه كه مانای دواكارییه‌ك ، فه‌رمانێك یان قه‌ده‌غه‌كردنێك له خۆ ده‌گرێت ...**

قال تعالى: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ٥٩﴾ [الفُرۡقَان : ٥٩] واته: تۆ له‌م شته پرسیار له خوایه‌ك بكه كه زۆر زانایه‌و زانیاریه‌كی زۆر وردی هه‌یه كه خوای گه‌وره‌یه..؟!

قال تعالى: ﴿وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ٥٢﴾ [سَبَإ : ٥٢] واته: [ وَقَالُوا آمَنَّا بِهِ ] وه ئه‌و كاته ئه‌ڵێن: ئیمانمان هێناوه به پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - [ وَأَنَّى لَهُمُ التَّنَاوُشُ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ (٥٢) ] ئه‌له‌و كاته و شوێنه دووره‌وه كه ڕۆژی قیامه‌ته ئیمان هێنان چۆن سوودی بۆیان ده‌بێت، واته: ئه‌بوایه له دونیا ئیمانیان بهێنایه ..؟!

قال تعالى: ﴿وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٢٨﴾ [البَقَرَة : ١٢٨] واتە: وە شوێنەکانی حەجمان نیشان بدە ئەو شوێنانەی کە حەجی لێ ئەکرێ وە تەوبەمان لێ قبووڵ بکە [ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ] هەر تۆ تەوبە زۆر قەبووڵ ئەکەی وە زۆر بە ڕەحم و بەزەییت.

## چوارەم : (السوال التوبيخي ) پرسیار کردنی سەر زەنشت کردن :

**(التوبيخ) واتە: هەڕەشە کردن سەرزەنشکردن و تاوانبار کردن ، مخاطبە ی لە سەر کردارێك هە روویداوە ، بۆ چی روویداوە ، یان وازهێنانی لەو فعلە یان کردارە کەئەنجامی داوە ، ئەمەش دوو جۆرە : (التوبيخ ) واتە: سەرزەنشتکردن و لێپرسینەوە ، یان سەرزەنشت کردنی دوژمنانی (خوای گەورە ) ..؟!**

قال تعالى: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ٩٢﴾ [الحِجر : ٩٢]واتە: وە سوێند بێ بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - لە ڕۆژی قیامەت پرسیار لەو کافرانە لە هەر هەموویان ئەکەین لەسەر لا إله الا الله..؟!

قال تعالى: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ٣٩﴾ [الرَّحْمَٰن : ٣٩] واتە: لەو ڕۆژەدا هیچ کەسێك نە مرۆڤ و نە جنی پرسیاریان لێ ناکرێ لە تاوانەکانیان لەبەر ئەوەی کاتێك کە لە قەبر دەرئەچن بە شێوەیان ئەناسرێنەوەو ئەزانرێ کێ دۆزەخیەو کێ بەهەشتیە، یاخود وتراوە: پێشتر پرسیاریان لێکراوە وە ئێستا مۆر دراوە لەسەر دەمیان، یاخود وتراوە: پرسیاریان لێ ناکرێ چیتان کردووەو چیتان نەکردووە بەڵام پێیان ئەووترێ: بۆچی ئەمەتان کردووەو ئەوەتان کردووە؟، یاخود هەر پرسیاریان لێ ناکرێت و ئەناسرێنەوە..؟!

قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ١٥١ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ١٥٢ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ١٥٣﴾ [الصَّافَّات : ١٥١ - ١٥٣] واتە: نەخێر ئەمە تەنها درۆهەڵبەستن و بوهتانێکەو لە بوهتان کردندا ئەوان ئەڵێن: [ وَلَدَ اللَّهُ ] خوای گەورە منداڵی بووە (وَالْعِيَاذُ بِالله) [ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ (١٥٢) ] وە بە دڵنیایی ئەوان درۆ ئەکەن..؟! [ أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ (١٥٣) ] ئایا خوای گەورە کچی هەڵبژاردووە بەسەر کوڕدا لە کاتێك ئێوە خۆتان بە کچ ڕازی نین..؟!

**پێنجه‌م : (السؤال في الجانب العقدي ) پرسیارکردن له لایه‌نی بیرو باوه‌ر :**

**١-(السؤال عن الخالق ) واته : پرسیار کردن ده‌باره‌ی دورست کار :**

قال تعالى: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ [البَقَرَةِ : ١٨٦]واته : [ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ] ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم ئه‌گه‌ر به‌نده‌كانی من پرسیاری منیان لێت كرد ئه‌وه من لێیانه‌وه نزیكم به زانست و زانیاری و بیستن و بینین و تواناو ده‌سه لات و ویست و ئیراده، به‌ڵام زاتی پیرۆزی خوای گه‌وره له‌سه‌ر عه‌رشه [ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ] هه‌ر كه‌سێك له من بپاڕێته‌وه ئه‌وا وه‌ڵامی ئه‌ده‌مه‌وه یان ئه‌وه‌تا بۆی جێبه‌جێ ئه‌كه‌م، یان به ئه‌ندازه‌ی ئه‌وه به‌ڵاو موسیبه‌تی له‌سه‌ر لائه‌ده‌م، یان له قیامه‌تدا پاداشتی ئه‌ده‌مه‌وه [ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ] به‌ڵام به‌و مه‌رجه‌ی ئه‌وانیش با له من بپاڕێنه‌وه، یان وه‌ڵامی بانگه‌وازی من بده‌نه‌وه، وه با ئیمانم پێ بێنن به‌ڵكو خوای گه‌وره بیانخاته سه‌ر ڕێگای ڕاست و هیدایه‌تیان بدات..؟!

له (معاوية بن حيدة القشيري ) – ده‌ڵێت : ((أَنَّ أعرابيًا قالَ : يا رسولَ اللَّهِ أقريبٌ ربُّنا فنُناجيَهُ أَمْ بعيدٌ فنُناديَهُ ؟ فأنزلَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ { وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ } إلى قولِهِ : { فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي } إذا دعاني))[1] واته: پیاوێكی ده‌شته‌كی ووتی : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ، ئایا په‌روه‌ردگارمان نزیكه بۆ ئه‌وه‌ی قسه‌ی له‌گه‌ل بكه‌ین له نه‌فسی خۆمان، یان دووره پێویشته بانگی بكه‌ین ، پاشان پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بێ ده‌نگ بوو، ئه‌م ئایه‌ته دابه‌زی (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموێت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ [البَقَرَة : ١٨٦]

---

[1]-ابن حجر العسقلاني في (العجاب في بيان الأسباب ) (٤٣٤/١)، في (لسان الميزان ) (٣٢٧/٤).

له (ابو هريره) – خوا لێ رازى بێت – ده‌گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی :(( أقربُ ما يَكونُ العبدُ من ربِّهِ، وَهوَ ساجدٌ، فأَكْثروا الدُّعاءَ)) .[1]واته: نزیکترین جێگه یان شوێن که به‌نده له په‌روه‌ردگاریه‌وه نزيك بێت ، ئه‌و كاته‌يه كه له سووجده‌دا بێت ، كه‌واته : له‌و كاته‌دا زۆر دوعاو پارانه‌وه بكه‌ن ..؟!

له (ابو هريره) – خوا لێ رازى بێت – ده‌گێڕێته‌وه له‌فه‌رمووده‌ی قدسی كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی :(( يقولُ اللَّهُ تعالى : أَنا عِندَ ظنِّ عبدى بى وأَنا معَهُ حينَ يذكُرُنى، فإن ذَكَرَنى فى نفسِهِ ذَكَرتُهُ فى نَفسى، وإن ذَكَرَنى فى ملإٍ ذَكَرتُهُ فى ملإٍ خيرٍ منهم ، وإن اقترَبَ إليَّ شبرًا اقترَبتُ منهُ ذراعًا، وإن اقتربَ إليَّ ذراعًا اقترَبتُ إليهِ باعًا، وإن أتانى يَمشى أتيتُهُ هروَلةً)).[2]واته : (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموێ : من له ئاستی دلنیایی به‌نده‌كه‌مدام به من ، وه من له نزیكی دام یان له ته‌كیدام كاتێ یادم ده‌كات ، ئه‌گه‌ر له ده‌روونی خۆیدا یادم بكات ئه‌وه منیش به‌و شێوه‌یه یادی ده‌كه‌م ، خۆ ئه‌گه‌ر له ناو كۆمه‌ڵێكدا یادم بكات ئه‌وه منیش له ناو كۆمه‌ڵێكی چاكتر له‌وان یادی ئه‌و ده‌كه‌م ، ئه‌گه‌ر بستێك لێم نزیك ببێته‌وه گه‌زێك لێی نزیك ده‌بمه‌وه ، ئه‌گه‌ر گه‌زێك لێم نزیك ببێته‌وه شاباڵێ لێی نزیك ده‌مه‌وه ، ئه‌گه‌ر به‌ر ڕۆشیتن بۆ لای به خێرایی و هه‌وڵه‌داوان ده‌ڕۆم به ره‌و پیری ..؟!

له (ابو هريره) – خوا لێ رازى بێت – ده‌گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((لَيَسْأَلَنَّكُمُ النَّاسُ عن كُلِّ شيءٍ حتَّى يقولوا: اللَّهُ خَلَقَ كُلَّ شيءٍ، فمَن خَلَقَهُ..؟! )) .[3] واته: به‌رده‌وام خه‌ڵكی پرسیارتان لێ ده‌كه‌ن له باره‌ی زانسته‌وه ته‌نانه‌ت ده‌ڵێن : ئه‌وه خوایه ئێمه‌ی دروست كردووه ،ئه‌ی كێ خوای دروست كردووه ..؟!

---

[1]-السنن ابو داود برقم (٨٧٥).
[2]- السنن الترمذي برقم (٣٦٠٣).
[3]-صحيح مسلم برقم ( ٣٢٧٦).

٢- (السوال عن يوم القيامه) پر سیارکردن لە رۆژی دوایی دا :

قال تعالى: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۝٤٢ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ۝٤٣ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ۝٤٤﴾ [النَّازِعَات : ٤٢ - ٤٤]
واتە: تەنها خوای گەورە کاتی هاتنی قیامەت دەزانێت [ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا (٤٢) ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیارت لێ ئەکەن کەی ڕۆژی قیامەت دێت..؟!

لە( ابن عادل الحنبلي ) – رەحمەتی خوا لیٚ بێت – دەلێت : کاتێك بیٚ باوەران گوێیان لە هەوالی رۆژی دوایی بوو ، کە وەسف کراوە بە وەسفێکی گەورە ناوازە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝١٨٧﴾ [الْأَعْرَاف : ١٨٧]واتە: {کاتی هاتنی قیامەت غەیبەو خوا نەبێت کەس نایزانێت } [ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلَّا هُوَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - قورەیش پرسیاری ڕۆژی قیامەت لە تۆ ئەکەن کەی خوای گەورە جێگیری ئەکات وە ئەیهێنێت و ڕوو ئەدات؟ بڵێ: هاتنی قیامەت کاتەکەی تەنها لای پەروەردگارەو کاتەکەی ئاشکرا ناکات و تەنها خۆی نەبێ کەس نایزانێ [ ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ] زانینی کاتی هاتنی قیامەت قورسە لەسەر خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی و کەسیان نایزانن نە پێغەمبەرێکی نێردراو، وە نە فریشتەیەکی نزیك لە خوای گەورە، یان هاتنی قیامەت قورسە لەسەر ئاسمانەکان و زەوی ئەوان توانای خۆڕاگرتنیان نیەو هەمووی وێران ئەبێ [ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ] قیامەت نایات ئیلا لە ناکاو و کتوپڕدا نەبێ کاتێك کە ئێوە بێ ئاگان [ يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - وا پرسیارت لێ ئەکەن وەك ئەوەی کە تۆ کاتی هاتنی قیامەت بزانی [ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ ] تۆ بڵێ: زانیاری کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت تەنها لای خوای گەورەیەو تەنها خۆی ئەیزانێ [ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ] بەڵام زۆربەی زۆری خەڵك نایزانن..؟!

بەلیٚ هەروەك (ابن عادل الحنبلي ) دەلێت : بیٚ باوەران یان موشریکان پرسیارەیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد بە شێوەیەکی گالتە جاری ، ووتیان : کەی رۆژی قیامەت دادێت ..؟! .[1]

[1]-اللباب في علوم الكتاب ابن عادل الحنبلي (٢٠/١٤٩).

له‌(أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌گێریته‌وه له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((بُعِثتُ أنا والسَّاعةُ كهاتَيْنِ – وأشارَ أبو داودَ بالسَّبابةِ والوُسطَى – فما فضَّل إحدَاهما علَى الأخرَى)).[1] واته: ره‌وانه كردنی من و كاتی یان به‌رپا بوونی رۆژی قیامه‌ت وه‌ ئه‌م دووانه وان ..! ! هه‌روه‌ها پێشه‌وا (ابو داود ) ئاماژه‌ی كرد بۆ په‌نجه‌ی شایه‌تمان و نێوه‌راستی فه‌زلی هیچیانی نه‌دا به‌سه‌ر ئه‌وی تریاندا ..؟!

### ٣–پرسیار كردن له‌سه‌ر چاره‌نووسی به‌نده‌كانی له رۆژی دوایی یان له رۆژی دوای مردنی

قال تعالى: ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ۝ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ ۝﴾ [الصَّافَّات : ٥٠ - ٥١]واته: {خۆپاراستن له هاورێی خراپ} [ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ] ئینجا به‌هه‌شتیانیش روو له یه‌كتری ده‌كه‌ن و هه‌ندێكیان پرسیار له هه‌ندێكی تریان ئه‌كه‌ن: ئه‌وه ئێوه له دونیا چۆن بوونه..؟! [ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ] یه‌كێكیان ئه‌ڵێ: من له دونیادا هاورێیه‌كی كافرم هه‌بوو..؟!

قال تعالى: ﴿إِلَّآ أَصْحَـٰبَ ٱلْيَمِينِ ۝ فِى جَنَّـٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ۝﴾ [المُدَّثِّر : ٣٩ - ٤٠]واته: ته‌نها ئه‌وانه‌ی كه كتابیان به ده‌ستی ڕاستیان پێ ئه‌درێ كه باوه‌ڕدارانن..؟! ئه‌مانه له‌ناو به‌هه‌شتدا پرسیار ئه‌كه‌ن..؟!

قال تعالى: ﴿وَقَالُواْ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ۝﴾ [ص : ٦٢] واته: بۆ جیاكردنه‌وه‌ی سوره‌ته‌كانه، وه پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم نه‌یده‌زانی سوره‌ته‌كان لێك جیابكاته‌وه تا بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ داده‌به‌زی، واته: به‌ناوی خوای به‌خشنده‌ی به‌سۆزی میهره‌بان..؟!

قال تعالى: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ۝ قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ۝ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ۝ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ۝﴾ [الطُّور : ٢٥ - ٢٨] واته: {گفتوگۆی به‌هه‌شتییه‌كان} [ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ (٢٥) ] وه هه‌ندێك له به‌هه‌شتییه‌كان روو ئه‌كه‌نه هه‌ندێكیان وه پرسیار له یه‌كتری ئه‌كه‌ن ده‌رباره‌ی كرده‌وه‌كانی دونیایان..؟! [ قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ] ئه‌ڵێن: ئێمه به‌ڕاستی پێشتر له‌ناو كه‌سوكاری خۆماندا له دونیادا له سزای خوای گه‌وره ئه‌ترساین..؟! [ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ ] وه خوای گه‌وره نیعمه‌تی خۆی ڕژاند به‌سه‌رماندا وه لێمان خۆشبوو وه ڕه‌حمی پێ كردین و پاراستمانی له سزای ئاگری دۆزه‌خ كه سزایه‌كه چۆن بایه‌كی گه‌رم هه‌ڵئه‌كات به‌و شێوازه گه‌رمییه‌كه‌ی یه‌كجار سه‌خته..؟! [ إِنَّا كُنَّا مِنْ قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ] ئێمه پێشتریش له دونیادا خوای گه‌وره‌مان به‌تاك و ته‌نها ئه‌په‌رست و ته‌نها له‌و ده‌پاڕاینه‌وه‌و دوعامان له كه‌سی تر نه‌ئه‌كرد، به‌ڕاستی خوای گه‌وره‌ش وه‌ڵام و پاداشتی داینه‌وه‌و لێمان خۆشبوو هه‌ر خوای گه‌وره زۆر چاكه‌كاره وه زۆر به‌ره‌حم و سۆزو به‌زه‌ییه به به‌نده‌كانی..؟!

[1]-السنن الترمذي برقم (٢٢١٤) حديث صحيح .

قال تعالى: ﴿يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾﴾ [القِيَامَة : ١٣]واتە: لەو ڕۆژەدا مرۆڤ هەواڵی پێ ئەدرێ سەبارەت بە هەموو کردەوەیەك کە لە دونیادا کردوویەتی: بچووك و گەورەی، کۆن و تازەی، ئاشکراو نهێنی، سەرەتاو کۆتایی..؟!

قال تعالى: ﴿وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾﴾ [هُود : ١٠٩]واتە: وە ئێمە سزای خۆیان پێ ئەبەخشین بەتەواوی هیچ شتێکیش لە سزایان کەم ناکەین..؟!

قال تعالى: ﴿ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ﴾ [ص : ٤٩]واتە: [ هَذَا ذِكْرٌ ] ئەمانە هەمووی یادخستنەوەیەکەو یادی تۆی ئەخەینەوە [ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَآبٍ] وە ئەوانەیشی کە تەقوای خوای گەورە بکەن کاتێك کە ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە باشترین گەڕانەوەیان بۆ هەیە کە بەهەشتی خوای گەورەیە..؟!

قال تعالى: ﴿هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾﴾ [ص : ٥٥]واتە: بەڵام بۆ ئەو کەسانەیشی کە سەرکەشیان کردووەو سنووری خوای گەورەیان بەزاندووە بەتاوان خراپترین گەڕانەوەیان بۆ هەیە کە ئاگری دۆزەخە..؟!

قال تعالى: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۚ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾﴾ [الكَهْف : ٣١]واتە: {ڕازاندنەوەی بەهەشتییەکان} [ أُولَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ ] ئەوانە بەهەشتیان بۆ هەیە کە شوێنی مانەوەی هەمیشەییە [ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ ] ئاو بە ژێر دارو ماڵەکانیاندا ئەڕوات [ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ ] وە بازنی ئاڵتوونیان لە دەست ئەکرێت [ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِنْ سُنْدُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ ] وە پۆشاکی سەوزیش لەبەر ئەکەن لە ئاوریشمی تەنك و ناسك و لە ئاوریشمی ئەستوورو درەوشاوە [ مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ ] پاڵیان داوەتەوە لەسەر ئەو شوێنانەی کە بۆیان دانراوە کە جێگای لەسەر ڕاخراوەو بەرزە وەکو جۆلانی [ نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ] کە ئەمە باشترین پاداشتە کە خوای گەورە پاداشتیان ئەداتەوە وە باشترین شوێنی پاڵدانەوەیشە کە پاڵی لێ ئەدەنەوەو لێی دەمێننەوە..؟!

قال تعالى: ﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾﴾ [الكَهْف : ٢٩]واتە: [ وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - بەو بێ ئاگایانە بڵێ: ئەم دینەی کە من هێناومە حەقەو هیچ گومانی تێدا نیەو لە لایەن خوای گەورەوەیەو لە لایەن کەسی ترەوە نیە [ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ ] جا هەر کەسێك ویستی لێیە با ئیمان بێنێ [ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ] وە هەر کەسێکیش ویستی لێیە با کوفر بکات، بەڵام [ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ] ئێمە بۆ ستەمکاران ئەوانەی کە کوفر هەڵئەبژێرن ئاگرێکمان بۆ داناون کە دەوری ماڵیانی گرتووە، (سورادق): خانوو ماڵێك لە قوماش دروست کرابێ وەکو خێمە چۆن ئاگری پێوە بنێیت بە یەکجار هەموو لایەکانی ئەیگرێ بەو شێوازە ئاگر ئەیانگرێتەوەو دەوریان ئەدات و ڕزگاربوونیان نیە [ وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ ] وە ئەگەر داوای فریاکەوتن و ئاو بکەن ئەوە ئاوێکیان پێ ئەدرێ وەکو زەیت و مسی تواوە وایە، وە ڕەش و خەست و بۆگەنە بەئاگری دۆزەخ کوڵێنراوە لەوپەڕی گەرمیدایەو دەموچاو و ڕوویان ئەسووتێنێ لەبەر گەرمی [ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا ] کە ئەمە خراپترین خواردنەوەیە وە خراپترین شوێنە کە تیایدا پشوو بدەن..؟!

٤-پرسیار کردن لە (الروح)

لە ( عبداللە بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت –دەڵێت : ((بيْنَما أنَا أمْشِي مع النبيّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ في حَرْثٍ، وَهو مُتَّكِئٌ علَى عَسِيبٍ، إذْ مَرَّ بنَفَرٍ مِنَ اليَهُودِ، فَقالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَقالوا: ما رَابَكُمْ إلَيْهِ، لا يَسْتَقْبِلُكُمْ بشيءٍ تَكْرَهُونَهُ، فَقالوا: سَلُوهُ، فَقَامَ إلَيْهِ بَعْضُهُمْ فَسَأَلَهُ عَنِ الرُّوحِ، قالَ: فأسْكَتَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَلَمْ يَرُدَّ عليه شيئًا، فَعَلِمْتُ أنَّهُ يُوحَى إلَيْهِ، قالَ: فَقُمْتُ مَكَانِي، فَلَمَّا نَزَلَ الوَحْيُ قالَ: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِن أَمْرِ رَبِّي وَما أُوتِيتُمْ مِنَ العِلْمِ إلَّا قَلِيلاً}.[1] واتە: لە کاتێکدا من لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو کێڵگەیەك یان پارچە زەویەك دا ، دەرۆیشتم ، خویدا بەسەر دار دەستێکی دار خورما دا ، بەلای چەند جوولە کە یان یهودیەك دا تێپەری و ، ئەوان لە ناوە خۆیدا بە یەکتریان دەووت : پرسیاری لێ بکەن دەربارەی (الروح ) ..؟! ووتیان : چی بەد گومانی کردوون لە بێتوانایی ئەو پیاوە ..!! کێ دەلێ وەلامێکی واتان ناداتەوە کە پێتان ناخۆش بێ..؟! ووتیان : پرسیاری لێ بکەن ، هەندێکیان لە لایدا وەستان و پرسیاریان لێکرد دەربارەی (الروح ) ..؟! (عبدالله بن مسعود ) دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو هیچ وەلامێکی نەدانەوە ..!! منیش زانیم کە نیگا یان وەحی بۆ دێت لە شوێنی خۆم راوەستام ، کاتێ نیگا یان وەحی دابەزی (خوای گەورە) دەفەرمووێت: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِن أَمْرِ رَبِّي وَما أُوتِيتُمْ مِنَ العِلْمِ إلَّا قَلِيلًا}واتە: پرسارت لێدەکەن لە بارەی (الروح ) ، بەلێ . (الروح) تایبەتە بە زانستی پەروەردگارمەوە ، ئێوە تەنها کەمێك زانیاریتان پێدراوە !؟..

قال تعالى: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٨٥﴾ [الإِسۡرَاء : ٨٥]واتە: {کەس نازانێت حەقیقەتی روح چییەو چۆنە} [ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي ] (عبداللە¬ی کوڕی مەسعود) دەفەرمێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - لەناو کێڵگەیەك دەڕۆیشتین لە مەدینە، کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - خۆی دابووە سەر لقە دارێکدا، بە لای کۆمەڵێك جولەکە تێپەڕی، هەندێکیان وتیان پرسیاری لێ بکەن سەبارەت بە روح، وە هەندێکیان وتیان پرسیاری لێ مەکەن نەوەکو شتێك بڵێت پێتان ناخۆش بێت، پرسیاریان لێ کرد دەربارەی روح و وتیان ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - روح چیە؟ دەفەرمێت بەردەوام خۆی دابوو بەسەر دارەکە گومانم دەبرد وەحی بۆ دابەزێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو خوێندیەوە، هەندێکیان وتیان: وتمان پرسیاری لێ مەکەن، واتە: ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی روح و حەقیقەتی روح چیە؟ بڵێ: روح کاری خوای گەورەیەو خوای گەورە خۆی نەبێ کەس نازانێ حەقیقەتی روح چیەو چۆنە، ئەم ئایەتە لە مەککەیش دابەزیوە کە قورەیش بە جولەکەیان وت شتێکمان پێ بڵێن تا پرسیاری لە محمد پێ بکەین، ئەوانیش وتیان پرسیاری لێ بکەن سەبارەت بە روح، ئەوانیش پرسیاریان لێ کردو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو دواتریش لە مەدینە دووبارە دایبەزاندەوە [ وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ] وە ئێوە لە زانیاری شتێکی کەم نەبێ هیچتان پێ نەدراوەو نایزانن..؟!

[1]-صحيح مسلم برقم (٢٧٩٤) ، صحيح البخاري برقم (٤٧٢١).

**شه‌شه‌م:(السؤال عن الجانب التشريعي )پرسیارکردن سه‌باره‌ت به‌لایه‌نی فقه یان شه‌رعی:**

به‌ڵێ قورئانی پیرۆز قسه یان ووته‌ی (خوای گه‌وره)یه ، هیچ ووته‌یه‌کی باتل تێدا نیه هه‌رگیز نه له کاتی دابه‌زینی دا یان نه له ئێستاش دا ، وه نه له داهاتووشدا ..؟!چونکه دابه‌زیوه له لایه‌ن (خوای گه‌وره )ی (حكيم و حميد ) واته : سوپاس کراو کار به‌جێ و شایسته ، وه کاربه‌جێ و لێزان بێ هه‌له له کاره کانیدا ..؟! هه‌ر بۆیه ئایه‌ته‌کانی قورئانی پیرۆز ئه‌وه‌ند ووردن له ده‌قه ئه‌حکامیه و شه‌رعی یه‌کان دا ، به‌لگه‌ی روونه بۆ جیاکردنه‌وه ده‌قه شه‌رعیه‌کان ، چونکه له لایه‌ن خوای زانا و شاره‌زاو دانا دابه‌زیوه ..؟! ئه‌مه‌ش بۆ یارمه‌تی دانی مرۆڤه‌کان ، چونکه قورئانی پیرۆز یه‌که‌م سه‌رچاوه‌ی شه‌رعی ئاینی پیرۆزی ئیسلام له‌دوای ئه‌ویش فه‌رمووده یان (السنه ) ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ که پێشه‌وایانی فه‌رمووده‌وانی بۆ ئێمه‌یان گێراوه ته‌وه وه‌ك سه‌رچاوه‌ی شه‌ریعه‌تی پیرۆزی ئیسلام هه‌ژمار ده‌کرێت ، به‌لام کاتێك بۆ روون کردنه‌وه‌ی ده‌قه شه‌رعیه‌کان ده‌بێت سه‌رتا له ئایه‌ته‌کانی قورئان ده‌ست پێ بکه‌ین ئینجا بۆ روون کردنه‌وه‌ی زیاتر فه‌رمووده‌کانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ که زیاتر روون تر ده‌بێت یان دواتری ش له هاوه‌لانی پێغه‌مبه‌ری که قورئانیان ته‌فسیر کردووه ، یان له شوێنکه‌وتوان بۆ روون کردنه‌وه ئه‌حکامه‌کانی شه‌رعی یان ته‌شریعات ..؟! به‌ڵێ هه‌ر له به‌ر ئه‌مه‌ش قورئانی پیرۆ کۆمه‌ڵێك پرسیار بۆ لایه‌نی ئه‌حکامی شه‌رعی ئایینی ئیسلام باس کردووه ، وه‌ك : (الإنفاق الرزق والمال والخراج والإرث ) واته: خه‌رجی بژێوی مال وسامان میرات ، هه‌روه‌ها پرسیارکردن ده‌رباره‌ی (اليتامى ) واته: هه‌تیوو ..؟! وه ده‌رباره‌ی (الخمر والميسر والحيض ) واته : ئاره‌ق یان شه‌راب ، وه قومار کردن ، وه سووری مانگانه‌ی ئافره‌تان ، هه‌روه‌ها پرسیار کردن ده‌رباره‌ی (الحلال والحرام ) ، وه پرسیار کردن ده‌رباره‌ی جه‌نگ و شه‌ر کردن و جیهادو تێ کۆشان ، وه یان پرسیار کردن ده‌رباره‌ی دابه‌ش کردنی ده‌ست که‌وتی جه‌نگی (الغنائم ) ...هتد ..؟!

١-پرسیار کردن له باره‌ی (الانفاق )

قال تعالى: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ٢١٥﴾ [البَقَرَة : ٢١٥]واته : [ يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلْ مَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ خَيْرٍ ] ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئه‌كه‌ن چی ببه‌خشن له‌ پێناو خوای گه‌وره‌دا؟ وه‌به‌كێی ببه‌خشن؟ تۆ پێیان بڵێ هه‌ر شتێك كه‌ ئه‌یبه‌خشن له‌ خێرو چاكه‌ ببیه‌خشن به‌ [ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ ] دایك و باوكتان و خزمی نزیكتان و بێ باوكان و هه‌ژاران و ڕێبواران [ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ ] وه‌هه‌ر خێرو چاكه‌ یه‌ك ئێوه‌ بیكه‌ن به‌دڵنیایی خوای گه‌وره‌ زۆر زانایه‌ پێی، وه‌ ئه‌جرو پاداشتتان ده‌داته‌وه‌ له‌سه‌ری..؟!

قال تعالى: ﴿۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَاۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلِ ٱلۡعَفۡوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ ٢١٩﴾ [البَقَرَة : ٢١٩]واته : { قۆناغی یه‌كه‌می حه‌رامكردنی مه‌ی} [ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ ] ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئه‌كه‌ن ده‌رباره‌ی عه‌ره‌ق خواردنه‌وه‌و مه‌ی خواردنه‌وه‌و قومار كردن [ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ] ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بفه‌رمه‌: تاوانێكی زۆر گه‌وره‌یان تیایه‌ وه‌ سوودیشی بۆ خه‌ڵكی هه‌یه‌ كه‌ كڕین و فرۆشتنی پێوه‌ ئه‌كه‌ن یاخود قوماره‌كه‌ ئه‌به‌نه‌وه‌ [ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا ] به‌ڵام تاوانه‌كه‌یان زۆر زۆر گه‌وره‌تره‌ له‌ سووده‌كه‌یان له‌به‌ر په‌یوه‌ندیان به‌ دین و عه‌قڵه‌وه‌ [ وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ ] وه‌ ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئه‌كه‌ن چ شتێك ببه‌خشن [ قُلِ الْعَفْوَ ] پێیان بفه‌رموو: لێبوورده‌یی و لێبووردەبن، یاخود ئه‌وه‌ی له‌ خۆتان زیاده‌ ئه‌وه‌ ببه‌خشن [ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ] به‌م شێوازه‌ خوای گه‌وره‌ ئایه‌ته‌كانی خۆیتان بۆ ڕوون ئه‌كاته‌وه‌ به‌ڵكو بیر بكه‌نه‌وه‌..؟!

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤﴾ [آل عِمۡرَان : ١٣٤]واته: {هه‌ندێك له‌ سیفاتی مرۆڤی خۆپارێزو موتته‌قی} [ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ ] ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ ئه‌به‌خشن له‌ پێناو خوای گه‌وره‌ له‌ كاتی هه‌بوونی و نه‌بوونیاندا، له‌ نه‌خۆشی و له‌شساغیاندا [ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ ] وه‌ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ ڕقی خۆیان ئه‌خۆنه‌وه‌و له‌به‌ر خوا ده‌رینابڕن خوای گه‌وره‌ له‌ پێش چاوی خه‌ڵكی بانگی ده‌كات له‌ ڕۆژی قیامه‌ت تا به‌ ئاره‌زووی خۆی حۆری هه‌ڵبژێرێت [ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ ] وه‌ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ له‌ خه‌ڵك ئه‌بوورێن وه‌ سزای خه‌ڵكی نادەن [ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ] وه‌ به‌ دڵنیایی خوای گه‌وره‌ ئه‌و كه‌سانه‌ی خۆش ئه‌وێ كه‌ چاكه‌كارو لێبووردەن ..؟!

**٢-پرسیار كردن ده‌رباره‌ی (میراث ) واته: میران به‌ش كردن**

قال تعالى: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾﴾ [النِّسَاء : ١٧٦] واته: {دابه‌شكردنی میراتی} [ يَسْتَفْتُونَكَ ] ئه‌ی محمد- صلى الله عليه وسلم - خه‌ڵكی داوای ڕوون كردنه‌وه‌ت لێ ئه‌كه‌ن [ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ ] بڵێ: خوای گه‌وره خۆی سه‌باره‌ت به (كه‌لاله) ڕوونكردنه‌وه‌تان بۆ ئه‌دات كه له سه‌ره‌تای ئه‌م سووره‌ته‌دا ئایه‌تی (دوانزه) باسی (كه‌لاله)مان كرد كه‌سێك كه ئه‌مرێ كوڕو كچ و مناڵ له دوای خۆی به‌جێ ناهێڵێ به‌ڵكو مامه‌و ئامۆزاو ئه‌وانه ئه‌بن به میراتگری، (جابری كوڕی عبدالله) ده‌فه‌رمێت: پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - سه‌ردانی كردم من نه‌خۆش بووم ئاگام له خۆم نه‌بوو، ده‌ستنوێژی شوشت پاشان ئاوی كرد به سه‌رمدا، یان فه‌رمووی ئاو بكه‌ن به‌سه‌ریدا، منیش هاتمه‌وه هۆش خۆم و وتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - كه‌س میراتگرم نیه ته‌نها (كه‌لاله) نه‌بێت میراتیه‌كه‌م چۆنه؟ خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند [ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ ] ئه‌گه‌ر هاتوو كه‌سێك بمرێت وه كوڕو كچ و مناڵ و باوكی نه‌بێت، وه خوشكی له دایك و باوكه‌وه هه‌بێ نه‌ك ته‌نها له دایكه‌وه [ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ] ئه‌وا خوشكه‌كه‌ی نیوه‌ی میراتی براكه‌ی ئه‌بات [ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ ] وه ئه‌گه‌ر ئه‌و خوشكه بمرێت و مناڵی نه‌بێ وه باوكی نه‌بێت ئه‌و برایه میراتی خوشكه‌كه‌ی ئه‌بات، ئه‌گه‌ر ئه‌و خوشكه مێردی هه‌بێ ئه‌وه مێرده‌كه‌ی نیوه‌ی ئه‌بات وه نیوه‌كه‌ی تریشی براكه‌ی ئه‌یبات [ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ ] وه ئه‌گه‌ر هاتوو دوو خوشك یاخود زیاتر بوون [ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ] ئه‌وه دوو له‌سه‌ر سێی میراتی براكه‌یان ئه‌به‌ن ئه‌گه‌ر ئه‌و برایه كوڕی نه‌بوو [ وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً ] وه ئه‌وانه‌ی كه میراتی ئه‌به‌ن ئه‌گه‌ر خوشك و برا تێكه‌ڵ بوون [ فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ ] ئه‌و كاته كوڕ دوو به‌ش ئه‌بات و كچ به‌شێك ئه‌بات، كوڕ دوو ئه‌وه‌نده‌ی كچ ئه‌بات، چونكه كوڕ نه‌فه‌قه‌و ماره‌یی له‌سه‌ره‌وله‌سه‌ر ئافره‌ت نیه [ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا ] خوای گه‌وره ئه‌م ئه‌حكامانه‌تان بۆ ڕوون ئه‌كاته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی كه ئێوه گومڕا نه‌بن وه له ڕێی ڕاست ده‌رنه‌چن [ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (١٧٦) ] وه خوای گه‌وره خۆی به هه‌موو شتێك زانایه‌و زانیاری به‌هه‌موو شتێك هه‌یه، والله أعلم..؟!

**هۆكاری دابه‌زینی ئه‌م ئایه‌ته‌ی (١٧٦)سوره‌تی (النساء ) دوو رای جیاوازی هه‌یه:**

یه‌كه‌م : له (جابر ی كوری عبدالله ) – خوا لیّ رازی بیّت – ده‌لیّت: ((دَخَلَ عَلَيَّ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ وَأَنَا مَرِيضٌ لا أَعْقِلُ، فَتَوَضَّأَ، فَصَبُّوا عَلَيَّ مِن وَضُوبِهِ، فَعَقَلْتُ، فَقُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، إنَّما يَرِثُنِي كَلَالَةٌ، فَنَزَلَتْ آيَةُ المِيرَاثِ. فَقُلتُ لِمُحَمَّدِ بنِ المُنْكَدِرِ: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى الْكَلَالَةِ}، قالَ: هَكَذَا أُنْزِلَتْ)).[1] واته: (جابری كوری عبدالله ) ده‌لیّت : پیّغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هات بۆ سه‌ر دانم كه من نه‌خۆش بووم ، هۆشم نه‌بوو ، پیّغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌ست نویّژی گرت ، له ئاوی ده‌ست نویّژه كه‌یان پرژاند به سه‌رما منیش هۆشم هاته‌وه ، ووتم : ئه‌ی پیّغه‌مبه‌ری خوا ﷺ من میرات گرانم (الكلاله ) واته : كور و باوك ، ئیتر ئایه‌تی میرات هاته خواره‌وه ، به (محمد ی كوری المنكدر ) ووت : {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى الْكَلَالَةِ}ووتی : هه‌ر وا دابه‌زیوه ..؟!

یه‌كه‌م : له (جابر ی كوری عبدالله ) – خوا لیّ رازی بیّت – ده‌لیّت: ((خرجْنا معَ رسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ حتَّى جِئنا امرأةً منَ الأنصارِ فى الأسواقِ، فجاءتِ المرأةُ بابنتينِ لَها، فقالت : يا رسولَ اللَّهِ، هاتانِ بنتا ثابتِ بنِ قيسٍ قُتِلَ معَكَ يومَ أحدٍ، وقد استفاءَ عمُّهما مالَهما وميراثَهما كُلَّهُ، فلم يدَعْ لَهما مالاً إلاَّ أخذَهُ، فما ترى يا رسولَ اللَّهِ ؟ فواللَّهِ لا تُنكَحانِ أبدًا إلاَّ ولَهما مالٌ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ : يَقضى اللَّهُ فى ذلِكَ، قالَ : ونزلت سورةُ النِّساءِ : يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِى أَوْلَادِكُمْ الآيةَ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ : ادعوا ليَ المرأةَ وصاحبَها فقالَ لعمِّهما : أعطِهما الثُّلُثَيْنِ وأعطِ أُمَّهُما الثُّمُنَ، وما بقىَ فلَكَ)) .[2] واته: له خزمه‌ت پیّغه‌مبه‌ری خوا دا ﷺ ده‌رچووین بۆ حه‌ره‌می مه‌دینه ، ئافره‌تیّك دوو مندالی خۆی هیّنا ووتی : ئه‌ی پیّغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌م دوو كچه كچی (ثابت كوری قیس ) راستیه كه‌ی باوكیان له رۆژی ئوحدا له گه‌ل تۆ دا كوژرا ، ئیّستا مامه كه‌یان هه‌رچی مال و سامانیان هه‌یه بردوویه‌تی بۆ خۆی ..! ! هیچی بۆ ئه‌مان نه هیّشتۆته‌وه ، ئه‌ی پیّغه‌مبه‌ری خوا ﷺ تۆ ده‌لیّی چی ..؟! سویّند به (الله ) به‌بیّ مال و دارایش كه‌س نایانخوازیّت ، پیّغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : بۆ ئه‌م باسه یان بابه‌ته (خوای گه‌وره ) خۆی بریاری شه‌رعی له سه‌ر ده‌دات ، ئیتر سووره‌تی (النساء) هاته خواره‌وه ، ده‌فه‌رموویّت : ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوۡلَٰدِكُمۡ...﴾ [النِّسَاء : ١١]واته: خودا سه‌باره‌ت به منداله كانتان وه‌سیه‌تتان بۆ ده‌كات و ریّنوماییتان ده‌كات له بابه‌تی میراتگیرتاندا كه به‌شی نیّرینه یه‌ك به ئه‌ندازه‌ی به‌شی دوو میّینه‌یه...هتد تاكوتایی ئایه‌ته‌كه ، پاشان پیّغه‌مبه‌ری خوا ﷺفه‌رمووی:ئافره‌ته‌كه‌و مامی منداله‌كانم بۆ بانگ بكه‌ن ، به مامه‌كه‌یانی فه‌رموو : دوو سیّ یه‌كی مال سامانه‌كه بده به‌دوو كچه‌كه، هه‌شت یه‌كیش بده به دایكیان ، هه‌رچی له‌وان مایه‌وه بۆ تۆ ..؟!

---

[1]-صحيح مسلم برقم (١٦١٦).
[2]السنن ابو داود برقم (٢٨٩١).

### ٣-پرسیار کردن له باره‌ی بێ باوك یان هه‌تیم :

قال تعالى: ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ ٱلۡمُفۡسِدَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعۡنَتَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٢٠﴾﴾ [البَقَرَة : ٢٢٠]واته: [ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ] بۆ ئه‌وه‌ی بیر له دونیاو قیامه‌تی خۆتان بکه‌نه‌وه چی بۆتان باشه، یان بیر له له‌ناوچونی دونیاو هاتنی دوارۆژ بکه‌نه‌وه [ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى ] وه پرسیارت لێ ئه‌که‌ن ده‌رباره‌ی بێباوکان و هه‌تیوان [ قُلْ إِصْلَاحٌ لَهُمْ خَيْرٌ ] ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ ئه‌گه‌ر چاکسازی له‌واندا بکه‌ن باشتره له‌وه‌ی که وازیان لێ بێنن [ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ ] وه ئه‌گه‌ر بێتوو تێکه‌ڵیشیان بن ئه‌وه برای ئێوه‌ن، واته ئه‌گه‌ر که‌سێك نه‌یتوانی ماڵ و خواردنیان جیابکاته‌وه له‌گه‌ڵ خۆیدا بخۆن به‌چاکه ئه‌وه براتانن و دروسته [ وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ ] خوای گه‌وره‌ش خۆی ئه‌زانێ که كێ له‌و تێکه‌ڵ کردنی خواردنه‌یه مه‌به‌ستی چاکسازیه‌وه‌و کێیش مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه که ماڵی هه‌تیوان به‌ناحه‌ق بخوات و مه‌به‌ستی ئاشووب گێڕانه [ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ] ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره ویستی لێ بوایه ئێوه‌ی تووشی مه‌شه‌قه ئه‌کرد ئاوا بۆی ئاسان نه‌ئه‌کردن [ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ] به‌ڕاستی خوای گه‌وره زۆر باڵاده‌ست و به‌عیززه‌ت و کاربه‌جێیه..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ﴿١٠﴾﴾ [النِّسَاء : ١٠]واته: به دڵنیایی ئه‌و که‌سانه‌ی که ماڵی هه‌تیو ئه‌خۆن به زوڵم و سته‌م ئه‌وه ئاگریان خواردووه‌و له ڕۆژی قیامه‌تدا خوای گه‌وره ئاگر ئه‌خاته ناو سکیانه‌وه، وه ئه‌خرێنه ناو ئاگری دۆزه‌خ که گڕو بڵێسه‌ی هه‌یه‌و ئه‌یانگرێته‌وه..؟!

قال تعالى: ﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥ﴾ [الأَنْعَام : ١٥٢] واته: وه نزیك ماڵی هه‌تیو مه‌که‌ونه‌وه ئیلا به باشترین شێواز نه‌بێ که چاکسازی له ماڵه‌که‌یاندا بکه‌ن وه سوودیان پێ بگه‌یه‌نن تا بالغ ده‌بن و چاك و خراپی خۆیان لێك جیا ئه‌که‌نه‌وه..؟!

قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا﴾ [الكَهْف : ٨٢] واته: {حیکمه‌ت له چاك کردنه‌وه‌ی دیواره‌که} [ وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ ] وه دیواره‌که‌ش که چاکم کرده‌وه هی دوو منداڵی بێ باوك بوو له‌م شاره‌دا [ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمَا ] وه له ژێر دیواره‌که‌دا که‌نزو ماڵێکی زۆری لێ بوو باوكی له‌وێ بۆی دانابوون [ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا ] وه باوکیشیان پیاو چاك بووه..؟!

### ٤-پرسیار کردن له باره‌ی (قومار ) و (شه‌راب یان ئاره‌قه‌وه )

قال تعالى: ﴿* يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَاۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلِ ٱلْعَفْوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢١٩] واتە: { قۆناغی یەکەمی حەرامکردنی مەی} [ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ ] ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی عەرەق خواردنەوەو مەی خواردنەوەو قومار کردن [ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ] ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بفەرمە: تاوانێکی زۆر گەورەیان تیایە وە سوودیشی بۆ خەڵکی هەیە کە کڕین و فرۆشتنی پێوە ئەکەن یاخود قومارەکە ئەبەنەوە [ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا ] بەڵام تاوانەکەیان زۆر زۆر گەورەترە لە سوودەکەیان لەبەر پەیوەندیان بە دین و عەقڵەوە [ وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ ] وە ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئەکەن چ شتێك ببەخشن [ قُلِ الْعَفْوَ ] پێیان بفەرموو: لێبووردەیی و لێبووردەبن، یاخود ئەوەی لە خۆتان زیادە ئەوە ببەخشن [ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ] بەم شێوازە خوای گەورە ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە بەڵکو بیر بکەنەوە..؟!

### ٥-پرسیار کردن لە بارەی سووری مانگانەی ئافرەتان

قال تعالى: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢٢]واتە : [ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى ] وە ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی حەیزو خوێنی بێنوێژی و سووڕی مانگانەی ئافرەتان تۆ پێیان بڵێ: ئەو کاتە ئافرەت تووشی ئازار ئەبێ وە ئەو خوێنە پیسە [ فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ ] بۆیە لە کاتی سووڕی مانگانەدا دوورکەونەوە لە ئافرەت و جیماع و سەرجێییان لەگەڵدا نەکەن، نەك دوورکەوتنەوە لە دانیشتن و ڕاکشان و خواردن بەڵکو تەنها لە جیماعدا، کە جولەکە ئافرەتیان بکەوتایەتە حەیزەوە لێیان دوور دەکەوتنەوە، هاوەڵن پرسیاریان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کرد خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند [ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ ] وە لێیان نزیك مەبنەوە بە جیماع کردن تا سووڕی مانگانە و خوێنەکەیان کۆتایی پێ دێت و پاك ئەبنەوە [ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ] ئەگەر غوسلیان دەرکردو خۆیان شووشت ئەوکاتە بچنە لایان بەو شێوازەی کە خوای گەورە فەرمانی پێتان کردووە واتە: لە شوێنی منداڵ بوونەوە [ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ ] بە ڕاستی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە تەوبەکارن و لە تاوان ئەگەڕێنەوە [ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ ] وە ئەو کەسانەیشی خۆش دەوێت کە خۆیان پاك ئەکەنەوە لە تاوان، یان غوسل دەرئەکەن..؟!

**٦-پرسیار کردن ده‌رباره‌ی حه‌لال و حه‌رام**

قال تعالى: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَٱذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ٤﴾ [المَائِـدَة : ٤] واته: [ يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ ] ئه‌ی محمد- صلى الله عليه وسلم - پرسیارت لێ ئه‌كه‌ن چ شتێك بۆ ئه‌وان حه‌ڵاڵ كراوه [ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ ] بفه‌رمه ئه‌وانه‌ی كه پاك و به‌تام و چێژه ئه‌وه‌ی كه باسكراوه به‌شێوازێكی گشتی بۆتان حه ڵاڵ كراوه ته‌نها ئه‌وانه‌ی كه وتمان: خوای گه‌وره حه‌رامی كردووه باسی كرد [ وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ ] وه ئه‌و ڕاو كردنانه‌شتان بۆ حه‌ڵاڵه كه به سه‌گی ڕاو (تانجی) ده‌یكه‌ن و خۆتان فێری ڕاوتان كردوون، یاخود ئه‌و باڵندانه‌ی كه فێره ڕاوتان كردوون وه‌كو بازو هه‌ڵۆ و ئه‌وانه ئه‌گه‌ر له ڕاوه‌كه‌ی نه‌خواردو فێرتان كردبوو بۆ ئێوه‌ی بگرێ، وه ناوی خوای گه‌وره بهێنن كه سه‌گه‌كه به‌ر ئه‌ده‌ن ئه‌وه ئه‌و ڕاوه حه‌ڵاڵه [ مُكَلِّبِينَ ] ئه‌و سه‌گانه موعه‌له‌م و فێركراون كه چۆن ڕاو بكه‌ن [ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ ] به‌و شێوازه‌ی كه خوای گه‌وره عه‌قڵی به ئێوه داوه‌و فێری كردوون ئێوه‌ش به‌و شێوازه سه‌گه‌كان فێربكه‌ن و ڕایانبێنن كه نێچیره‌كان بۆ ئێوه بگرن و خۆیان لێی نه‌خۆن، نیشانه‌ی فێر كردنیش ئه‌وه‌یه كه پێی بڵێیت بڕۆ بڕوات، وه بڵێیت ڕاوه‌سته ڕاوه‌ستێت، وه نێچیره‌كه بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی بگرێت و خۆی نه‌یخوات، (ابن القيم) ده‌فه‌رمێت: (ئه‌م ئایه‌ته فه‌زڵی زانست و زانیاری و فێركردنی تێدایه: كه ئه‌و سه‌گانه‌ی فێركراو بن ڕاوه‌كانیان حه‌ڵاڵه بۆمان، به‌ڵام ئه‌وانه‌ی فێرنه‌كرابێتن ڕاویان حه‌رامه بۆمان) [ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ ] ئه‌وه‌ی كه بۆ ئێوه‌یان گرت وتمان: ئه‌گه‌ر لێی خوارد دیاره ئه‌و سه‌گه بۆ خۆی گرتوتی نابێ بیخۆی به ڵام كه گرتی و لێی نه‌خوارد وه ناوی خوای گه‌وره‌تان هێنا كاتێك كه سه‌گه‌كه به‌ر ئه‌ده‌ن ئه‌وه بیخۆن و حه‌ڵاڵه بۆتان، وه هه‌یشه له زانایان ده‌فه‌رموون ئه‌گه‌ر لێیشی خواردبوو هه‌ر دروسته بیخۆن [ وَاتَّقُوا اللَّهَ ] وه ته‌قوای خوای گه‌وره بكه‌ن [ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ] به‌ڕاستی لێپرسینه‌وه‌ی خوای گه‌وره زۆر خێرایه..؟!

**٧-پرسیار کردن له باره‌ی جه‌نگ کردن له مانگی حه‌رام**

قال تعالى: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾﴾ [البَقَرَة : ٢١٧] واته: {کوشتار کردن له مانگه حه‌رامه‌کاندا} [ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ] دیسان ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئه‌که‌ن ده‌رباره‌ی کوشتار کردن له مانگه حه‌رامه‌کاندا (أشهر الحرم) که (ذو القعدة و ذو الحجة و موحه‌ره‌م و ڕه‌جه‌به) [ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ] ئه‌ی محمد صلى الله عليه وسلم بڵێ: شه‌ڕ کردن له‌و مانگانه‌دا تاوانێکی گه‌وره‌یه، ئه‌مه کاتێك که پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم که‌سانێکی نارد که بشتن به (عه‌مری حه‌زره‌می) که له (طائیفه‌وه) هات کافر بوو نه‌یانزانی که مانگی ڕه‌جه‌به‌و مانگی حه‌رامه یه‌کێك له موسڵمانه‌کان کوشتی دوای ئه‌وه موشریکه‌کان تانه‌یان له پێغه‌مبه‌ری خوادا صلى الله عليه وسلم ئایا کوشتار کردن له مانگی حه‌رامدا حوکمی چیه؟ خوای گه‌وره فه‌رمووی: بڵێ تاوانێکی گه‌وره‌یه به‌ڵام [ وَصَدٌّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ] ئێوه ڕێگری ئه‌که‌ن له بڵاو بوونه‌وه‌ی دینی خوا وه کوفر ئه‌که‌ن به‌خوای گه‌وره وه ڕێگری ئه‌که‌ن له (مسجد الحرام) له که‌عبه‌ی پیرۆز که خه‌ڵك عیباده‌تی تیا بکات [ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ ] وه خه‌ڵکی موسڵمانی مه‌ککه ده‌رئه‌که‌ن ئه‌م هه‌موو تاوانانه ئه‌که‌ن ئه‌مانه هه‌مووی لای خوای گه‌وره گه‌وره‌تره، به‌ڵام به‌سه‌ر خۆتانی ناهێنن که ئه‌م هه‌موو شته ئه‌که‌ن له مانگی حه‌رامیشدا ئه‌یکه‌ن [ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ ] وه لێره فیتنه واته: کوفر، که ئه‌تانه‌وێ موسڵمانان تووشی فیتنه بکه‌ن له دینداو بیانگه‌ڕێننه‌وه بۆ کوفر ئه‌مه گه‌وره‌تره له کوشتن، ئێوه فیتنه‌تان تیایه [ وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا ] وه به‌رده‌وام کافران کوشتاری ئێوه ئه‌که‌ن تا له ئیسلام هه‌ڵتانگه‌ڕێننه‌وه ئه‌گه‌ر بتوانن و بۆیان بگونجێ [ وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ ] به لام هه‌ر که‌سێك له ئێوه ئه‌ی موسڵمانان له دینی خۆی پاشگه‌ز بێته‌وه وه به کافری بمرێت [ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ] ئه‌وانه کرده‌وه‌کانیان به‌تاڵ ئه‌بێته‌وه له دونیاو له قیامه‌تیشدا [ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ] وه‌ئه‌وانه هاوه‌ڵی ئاگری دۆزه‌خن و به نه‌مری تێیدا ئه‌مێننه‌وه..؟!

**پرسیار كردن ده‌رباره‌ی ده‌ست كه‌وته‌كانی جه‌نگ یان (الغنائم)**

قال تعالى: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ قُلِ ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ۝١﴾ [الأنفال : ١] واته : سووره‌تی (ئه‌نفال) سووره‌تێكی مه‌ده‌نی یه‌و (٧٥) ئایه‌ته (ئیبنو عه‌بباس) ده‌فه‌رمێت له (به‌در) دابه‌زی بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ [ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیارت لێ ئه‌كه‌ن سه‌باره‌ت به‌ ئه‌نفال، (ئه‌نفال) واته: ئه‌و غه‌نیمه‌ت و ماڵانه‌ی كافران كه‌ له‌ جه‌نگدا ده‌ستی موسڵمانان ئه‌كه‌وێت [ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئه‌و غه‌نیمه‌ت و ماڵه‌ ی كافران كه‌ ده‌ستی موسڵمانان ئه‌كه‌وێ ئه‌مه‌ خوای گه‌وره‌ بڕیاری له‌سه‌ر ئه‌دات وه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - به‌ فه‌رمانی خوای گه‌وره‌ بڕیاری له‌سه‌ر ئه‌دات [ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ ] ئێوه‌ ته‌قوای خوای گه‌وره‌ بكه‌ن وه‌ ئیصڵاحی نێوانتان بكه‌ن، دوای غه‌زای به‌در ئه‌م ئایه‌ته‌ دابه‌زی كه‌ موسڵمانان سه‌ركه‌وتن به‌سه‌ر كافرانی قوره‌یشدا كۆمه‌ڵێك له‌ موسڵمانان ده‌وری پێغه‌مبه‌ری خوایان دابوو - صلى الله عليه وسلم - ده‌یانپاراست، وه‌ كۆمه‌ڵێكیش دوای كافران كه‌وتن و ڕاویاننان، كۆمه‌ڵێكیش غه‌نیمه‌یان كۆ كرده‌وه‌ ئه‌وانه‌ی غه‌نیمه‌یان كۆ كرده‌وه‌ وتیان: ئه‌مه‌ ته‌نها بۆ ئێمه‌یه‌ ئێمه‌ كۆمان كردۆته‌وه‌، ئه‌وانی تر وتیان: نه‌خێر ئێمه‌ش دوایان كه‌وتین ئێمه‌ ڕاومان نان، ئه‌وانی تریش وتیان: ئێمه‌ پێغه‌مبه‌ری خوامان پاراست - صلى الله عليه وسلم - هه‌موومان به‌شدارین تیایدا، خوای گه‌وره‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند، وه‌ (سه‌عدی كوڕی مالك) ده‌فه‌رمێت: له‌ غه‌زای به‌در شمشێرێكم ده‌ست كه‌وت هێنام بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - وتم پێمی ببه‌خشه‌، ئه‌ویش فه‌رمووی: بیكه‌ره‌وه‌ شوێنی خۆی نه‌ هی منه‌ نه‌ هی تۆیه‌، دووجار وای فه‌رموو، وتم له‌وانه‌یه‌ ئه‌م شمشێره‌ بدرێت به‌ كه‌سێك وه‌كو من شه‌ڕی پێ نه‌كات، پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - هات بۆ لام و فه‌رمووی: پێشتر وام وت به‌ڵام ئێستا موڵكی منه‌و بۆ تۆ، خوای گه‌وره‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند، كه‌ خواو پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - بڕیار ئه‌ده‌ن كه‌ ئه‌و غه‌نیمه‌تانه‌ بۆ كێیه‌، بۆ ئه‌و كه‌سانه‌یه‌ كه‌ به‌شداریان كردووه‌ بۆ هه‌موویانه‌و له‌ نێوان هه‌موویاندا دابه‌ش كرا، ئێوه‌ ته‌قوای خوای گه‌وره‌ بكه‌ن وه‌ ئیصڵاحی نێوانتان بكه‌ن [ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ] وه‌ گوێڕایه‌ڵی خواو پێغه‌مبه‌ری خوا بكه‌ن ئه‌گه‌ر ئێوه‌ باوه‌ڕدارن، غه‌نیمه‌ت یه‌كێكه‌ له‌ تایبه‌تمه‌ندێتیه‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - بۆ خۆی و ئوممه‌ته‌كه‌ی حه‌ڵاڵ كراوه‌ و بۆ ئوممه‌ته‌كانی تر حه‌ڵاڵ نه‌بووه‌.

قال تعالى: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٤١﴾ [الأنفال : ٤١] واتە: {دابەش کردنی غەنیمە} [ وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى ] وە بزانن ئەی موسڵمانان ئەو غەنیمەت و ماڵەی کافران کە لە جەنگدا دەستتان ئەکەوێ ئەوا ئەکرێتە پێنج بەشەوە لەو پێنج بەشەدا چوار بەشی ئەدرێتە ئەو کەسانەی کە بەشداری غەزاکەیان کردووەو ئەو بەشەی تریشی دەکرێتەوە پێنج بەش و بەشێکی بۆ خوای گەورەو پێغەمبەری خوایەو - صلى الله عليه وسلم - بەشێکی بۆ خزمانی پێغەمبەری خوایە - صلى الله عليه وسلم - کە (بەنو هاشم و بەنو موتەڵیبە) لە جیاتی زەکات چونکە زەکات وەرگرتن بۆ ئەوان حەرام بووە [ وَالْيَتَامَى ] وە بەشێکی بۆ ئەو کەسانەیە کە هەتیو و بێ باوکن [ وَالْمَسَاكِينِ ] وە بەشێکی بۆ ئەو کەسانەیە کە فەقیرو هەژارو نەدارن [ وَابْنِ السَّبِيلِ ] وە بەشێکی بۆ ئەو کەسانەی کە ڕێبوارن و لە شارو وڵاتی خۆیان دوورکەوتوونەتەوەو پارەیان لێ بڕاوە، ئەو بەشەی بۆ خوای گەورەیە بۆ کەعبە خەرج دەکرێت، یاخود وتراوە ناوی خوای گەورە لەسەرەتاوە بۆ بەرەکەت باسکراوەو بەشی خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - یەك بەشە، بەڵام ئێستا بەشی خواو پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - خزمانی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دابەش دەکرێتەوە بەسەر هەتیو هەژارو ڕێبواراندا، یاخود لە بەرژەوەندی موسڵماناندا خەرج دەکرێت [ إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ ] ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخوای گەورە هەیە [ وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا ] وە ئیمانتان بە هەموو ئەو شتانە هە یە کە بۆ سەر عەبدی خۆمان دامانبەزاند کە پێغەمبەری خوایە - صلى الله عليه وسلم - لە جەنگی بەدرا لە مەلائیکەت و سەرکەوتن و دابەش کردنی غەنیمەت و ئەو هەموو موعجیزانەی کە لەوێ ڕوویدا [ يَوْمَ الْفُرْقَانِ ] ڕۆژی فورقان ڕۆژی جیا کردنەوەی حەق و باتڵ لە یەکتری کە جەنگی بەدر بوو کە حەق و باتڵ لێك جیا بۆوە [ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ] ئەو ڕۆژەی کە هەردوو کۆمەڵەکە: کۆمەڵی موسڵمانان و کۆمەڵی کافران بەیەك گەشتن وە بە یەکیاندادا کە ڕۆژی جومعە بوو حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دووی کۆچی [ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ] وە خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە هەروەکو چۆن موسڵمانانی سەرخست..؟!

**هەوتەم: پرسیار كردن لەبارەی هەواڵ یان ئەخباری ڕابردوودا**

### ١-پرسیار كردن دەربارەی هەواڵی ( أصحاب الكهف )

قال تعالى: ﴿أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا ۝٩ إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ۝١٠ فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ۝١١ ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَى لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا ۝١٢ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ۝١٣ وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَنْ نَدْعُوَ مِنْ دُونِهِ إِلَٰهًا لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا ۝١٤﴾ [الكهف : ٩ - ١٤] واتە:

{بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشكەوت} [ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا (٩) ] ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - تۆ وا گومانت بردو واتزانی كە هاوەڵانی ئەشكەوتەكە و (ڕەقیم) شتێكی سەیرو سەرسوڕهێنەرن، نەخێر هەر ئەمانە نیە بەڵكو ئیشی خوای گەورە زۆر لەمە سەیرو سەرسوڕهێنەرترە، وە ئەو بەڵگەو موعجیزانەی كە ئاشكرام كردووە بۆ بەندەكانم زۆر لەمە گەورەترو سەرسوڕهێنەرترە، (ڕەقیم) ناوی ئەشكەوتەكە بووە، یان ناوی دۆڵەكە بووە، یان ناوی دێیەكە بووە، یان ناوی ئەو شاخە بووە كە ئەشكەوتەكەی تێدا بووە، یان ئەو لەوحە بووە كە ناویانی لێ نووسراوەو لە دەرگای ئەشكەوتەكەیان داوە ..؟! [ إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً ] كاتێك ئەو كۆمەڵە گەنجە باوەڕدارە بۆ پاراستنی دینەكەیان لەدەستی قەومەكەیان رایانكردو چوونە ناو ئەشكەوتەكەوەو وتیان: ئەی پەروەردگارمان لەلایەن خۆتەوە ڕەحممان پێ بكە وە بمانپارێزە لە دوژمن و سەرەنجاممان باش بكە [ وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا (١٠) ] وە كارەكەشمان چاك بكە كە ڕائەكەین لەدەست كافران و لێیان دوور ئەكەوینەوە..؟! [ فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا (١١) ] ئێمەش دامان بە گوێیاندا بۆ ئەوەی هیچ نەبیستن و چەند ساڵێكی زۆر خەواندمانن لەناو ئەشكەوتەكەدا ..؟! [ ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَى لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا (١٢) ] پاشان بەخەبەرمان هێنان لەو خەوە تا بزانین كام لەم دوو حیزب و كۆمەڵە لە باوەڕداران و كافران كە جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە دەزانن چەندێك لەناو ئەشكەوتەكەدا بە خەوتوویی ماونەتەوە..؟! {ئەوان گەنجانێكی باوەڕدار بوون} [ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ ] ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - ئێمە هەواڵی ئەوانت بە حەق بۆ باس ئەكەین و بۆت ئەگێڕینەوە نەك وەك ئەو هەواڵانەی لەلای ئەهلی كتاب هەیە كە ڕاست نیە [ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ ] بەدڵنیایی ئەمانە كۆمەڵێك گەنج بوون ئیمانیان بە خوای خۆیان هێنا (هەمیشە گەنجان زیاتر روو لە حەق دەكەن، وە ئەوانیشی باوەڕیان بە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - هێنا زۆربەیان گەنج بوون و كەمێك لە پیرەكان موسڵمان بوون و زۆربەیان لەسەر شەریك دانان بۆ خوا مردن) [ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى (١٣) ] وە ئێمەش زیاتر هیدایەتمان دان و دامەزراومان كردن (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئیمان زیادو كەم دەكات، بە گوێڕایەڵی و كردەوەی چاك زیاد دەكات و بە تاوان و سەرپێچی كەم دەكات) ..؟! [ وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ ] وە دڵیانمان جێگیرو بەهێز كرد و ئارامگرمان كردن بەوەی كە لە كافران دووركەونەوە هەرچەندە زۆر خۆشگوزەران بوون و لە نەوەو خزمە نزیكەكانی پاشای ڕۆم بوون، وە تەواوتر ئەوەیە ئەم بەسەرهاتە پێش هاتنی عیسى - صلی الله علیه وسلم - بووە، چونكە زاناكانی جولەكە بایەخیان داوە بە پاراستنی بەسەرهاتەكەیان و لە كتابی ئەواندا باسكراوەو ئەوانیش پێش عیسى - صلی الله علیه وسلم - بوونە [ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ] كاتێك كە هەستان و كۆبوونەوە لە پشت شارەوەو بڕیاریان دا كە بڕۆن و وتیان: پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەویە [ لَنْ نَدْعُوَ مِنْ دُونِهِ إِلَٰهًا ] جگە لە خوای گەورە عیبادەت بۆ هیچ خوایەكی تر ناكەین، كە ئەوان خوایان هەبووەو پەرستوویانن [ لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا (١٤) ] ئەگەر ئێمە عیبادەت بۆ جگە لە خوای گەورە بكەین ئەوە بەدڵنیایی زیادڕەویمان كردووەو سنوورمان بەزاندووەو لە حەق دووركەوتووینەتەوەو قسەیەكی پوچەڵ و بەتاڵمان كردووە..؟!

قال تعالى: ﴿وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا ١٩﴾ [الكَهۡف : ١٩]واته: [ وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ ] وه به‌م شێوازه به‌خه‌به‌رمان هێنان كه له‌شساغ و ته‌ندروست بوون تا له‌ناو خۆیاندا پرسیار بكه‌ن چه‌ندێك ماوینه‌ته‌وه؟ [ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ] یه‌كێك له‌وان وتی: چه‌ندێك لێره ماونه‌ته‌وه‌و خه‌وتوونه؟ [ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ] وتیان: رۆژێك یان هه‌ندێك له رۆژێك ماوینه‌ته‌وه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به به‌یانی هاتوونه‌و خوای گه‌وره بۆ ئێواره به خه‌به‌ری هێنان بۆیه وتویانه: رۆژێك [ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ ] وه هه‌ندێكی تریان وتیان: خوای گه‌وره خۆی ئه‌زانێ ئێوه چه‌ندێك ماونه‌ته‌وه [ فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ ] یه‌كێكتان به‌م پاره‌یه‌ی كه پێتانه كه پاره‌ی زیو بووه بینێرن بۆ شاره‌كه [ فَلْيَنْظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُمْ بِرِزْقٍ مِنْهُ ] با بزانێ كام خواردنه له هه‌مووی پاكترو حه‌ڵاڵتره بۆمان بێنێت [ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ] وه با به نهێنی بڕوات تا كه‌س نه‌یناسێته‌وه‌و كه‌س هه‌ستی پێ نه‌كات و شوێنه‌كه‌مان نه‌زانێت ..؟!

**هه‌روه‌ها ئه‌م باروده‌خه یان ئه‌م حاله ته هاوشێوه‌ی یان وه‌ك چیرۆكی (عزیره ) هه‌ر وه‌ك (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت : قال** تعالى: ﴿أَوۡ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ قَالَ كَمۡ لَبِثۡتَۖ قَالَ لَبِثۡتُ يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۖ قَالَ بَل لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٥٩﴾ [البَقَرَة : ٢٥٩] واته: {زیندوو كردنه‌وه‌ی مردوو} [ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ ] یاخود ئه‌و كه‌سه‌ی كه به‌لای دێیه‌كدا تێپه‌ڕی كه (عوزێر) پێغه‌مبه‌ر بووه یه‌كێ بووه له پێغه‌مبه‌رانی به‌نی ئیسرائیل له لای (بيت المقدس) تێپه‌ڕی له دوای ئه‌وه‌ی كه پاشا (نه‌بوخوتنه‌صر) وێرانی كردبوو [ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا ] وه سه‌قفی خانووه‌كان هه‌مووی رووخا بوو به‌سه‌ر دیواره‌كانیدا و كه‌سی تیا نه‌مابوو [ قَالَ أَنَّى يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ] فه‌رمووی: چۆن ئه‌مه له دوای وێران كردن و كاول كردن خوای گه‌وره زیندووی ئه‌كاته‌وه، یاخود ئه‌و كه‌سانه‌ی كه له‌ناویدا مردوون چۆن خوای گه‌وره زیندوویان ئه‌كاته‌وه [ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ] خوای گه‌وره سه‌د ساڵ له‌وێدا مراندی پاشان زیندووی كرده‌وه [ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ] پێی فه‌رموو: ئایا تۆ چه‌ندێك لێره مایته‌وه چه‌ندێك مردبوویت؟ [ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ] وتی: رۆژێك یان به‌شێك له رۆژو كه‌متر له رۆژێك مامه‌وه[ قَالَ بَلْ لَبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ ] خوای گه‌وره فه‌رمووی: به‌ڵكو تۆ سه‌د ساڵه لێره ماویته‌وه‌و مردویت [ فَانْظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ] ته‌ماشای خواردن و خواردنه‌وه‌كه‌ت بكه كه له‌گه‌ڵ ئه‌و ماوه زۆره‌دا هیچ گۆڕانێكی به‌سه‌ردا نه‌هاتووه به تواناو ده‌سه‌ڵاتی خوای گه‌وره [ وَانْظُرْ إِلَى حِمَارِكَ ] وه ته‌ماشای گوێدرێژه‌كه‌ت بكه چۆن پارچه پارچه بووه وه ئێسكه‌كانی رزیوه‌و خوای گه‌وره زیندووی ده‌كاته‌وه [ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِلنَّاسِ ] بۆ ئه‌وه‌ی تۆ بكه‌ینه نیشانه‌یه‌ك بۆ خه‌ڵكی له‌سه‌ر زیندووبوونه‌وه‌یان [ وَانْظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنْشِزُهَا ] وه ته‌ماشای ئێسكه‌كانت بكه چۆن هه‌ندێكی به‌رز ئه‌كه‌ینه‌وه بۆ سه‌ر هه‌ندێكی [ ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ] پاشان به گۆشت دای ئه‌پۆشین [ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ] كاتێك كه ئه‌مه‌ی بۆ ده‌ركه‌وت و به چاوی خۆی ئه‌م شته‌ی بینی فه‌رمووی: ئه‌زانم و به‌ڕاستی دڵنیام كه خوای گه‌وره تواناو ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌یه..؟!

**٢-پرسیار كردن ده‌رباره‌ی (ذي القرنين )**

قال تعالى: ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ قُلۡ سَأَتۡلُواْ عَلَيۡكُم مِّنۡهُ ذِكۡرًا ٨٣ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ٨٤ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ٨٥﴾ [الكَهۡف : ٨٣ - ٨٥]واته : {به‌سه‌رهاتی (ذو القرنين)} [ وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ ذِي الْقَرْنَيْنِ ] ئه‌ی

محمد - صلى الله عليه وسلم - كافرانی مەككە پرسیارت لێ ئەكەن دەربارەی (ذي القرنين)، كە پیاوچاكێك بووە، بۆیە پێی وتراوە: (ذو القرنين) لەبەر ئەوەی لە بان سەری شوێنی دوو شاخ هەبووە، یاخود لەبەر ئەوەی كە موڵكی ڕۆم و فارسی بەدەست بووەو هەردووكی گرتووە، یاخود وتراوە: لە خۆرهەڵاتەوە گەیشتۆتە لای ئەو شاخەی كە خۆری لێ هەڵدێت، وە لە خۆرئاوایشەوە گەیشتۆتە لای ئەو شاخەی كە خۆری لێ ئاوا ئەبێت، گەیشتووە بە هەردوو شاخەكە [ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُمْ مِنْهُ ذِكْرًا (٨٣) ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیاری (ذي القرنين)ت لێ ئەكەن تۆ پێیان بڵێ: ئێستا شتێكتان لە بەسەرهاتی ئەو پیاوە بۆ ئەگێڕمەوە ..؟! [ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ ] ئێمە لەسەر زەویدا جێگیرمان كردو موڵك و تواناو دەسەڵاتمان پێ بەخشی [ وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا (٨٤) ] وە لە هەموو شتێكدا ئەوەی كە مەبەستی بێ لە هۆكاری سەركەوتن و نیشانەكانی ڕێگاو زانیاری و فێر بوونی زمانمان پێ بەخشی..؟! [ فَأَتْبَعَ سَبَبًا (٨٥) ] ئەویش ئەو ڕێگاو هۆكارانەی ئەگرتە بەر ..؟!

## هەشتەم:پرسیار کردن دەربارەی دروست کراوەکانی گەردوون

**١-پرسیار کردن له ده‌رباره‌ی (الأهلة) واته: مانگی یه‌ك شه‌وه**

قال تعالی: ﴿۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ وَلَيۡسَ ٱلۡبِرُّ بِأَن تَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِنۡ أَبۡوَٰبِهَاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٨٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٨٩]واته: [ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ ] ئه‌ی محمد صلی الله علیه وسلم پرسیارت لێ ئه‌كه‌ن ده‌رباره‌ی مانگی یه‌ك شه‌وه تۆ پێیان بڵێ: ئه‌وه میقات و كاتی دیاریكراوه بۆ خه‌ڵكی بۆ به‌رۆژوو بوونیان و بۆ هاتنی ڕه‌مه‌زان و جه‌ژن و حه‌ج و بۆ عیدده‌ی خێزانه‌كانیان [ وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَى ] وه‌ چاكه‌ ئه‌وه‌ نیه‌ كه‌ له‌ پشته‌وه‌ بچنه‌ ناو ماڵه‌كانی خۆتانه‌وه‌ به‌ڵكو چاكه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌سێك ته‌قوای خوای گه‌وره‌ بكات [ وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا ] ئه‌نصاریه‌كان سه‌ره‌تا وابوون له‌ پاش ئه‌وه‌ی كه‌ حه‌جیان ته‌واو ئه‌كرد له‌ پشته‌وه‌ ئه‌چوونه‌وه‌ ناو ماڵی خۆیان، پیاوێك له‌ ده‌رگاوه‌ چووه‌ ماڵی خۆیان ڕه‌خنه‌یان لێ گرت، خوای گه‌وره‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند، واته‌: وه‌ له‌ ده‌رگاوه‌ بچنه‌ ژووره‌وه‌، یان هه‌موو ئیشێك له‌ شوێنی دیاریكراو تایبه‌تی خۆیه‌وه‌ بكه‌ن [ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ] وه‌ ته‌قوای خوای گه‌وره‌ بكه‌ن به‌ڵكو خوای گه‌وره‌ سه‌رفرازتان بكات..؟!

## هۆكاری دابه‌زینی ئایه‌تی (١٨٩) سوره‌تی (البقره)

قال تعالی: ﴿۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ وَلَيۡسَ ٱلۡبِرُّ بِأَن تَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِنۡ أَبۡوَٰبِهَاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٨٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٨٩] **واته: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری ﷺ ! پرسیارت لێ ده‌كه‌م بۆچی كه‌ مانگ ده‌رده‌كه‌وێت سه‌ره‌تا یه‌ك شه‌وه‌یه‌و ، ئینجا ده‌بێته‌ دوو شه‌وه‌و سێ شه‌وه‌و دواتر وورده‌ وورده‌ گه‌وره‌تر ده‌بێت ..؟! تۆ له‌ وه‌لامیاندا بلێ : مانگ كاته‌ كانتان بۆ ده‌رده‌خات ..!! وه‌كو كاتی كشتوكال كردن و كرین و فرۆشتن و بازرگانی و قه‌رز دانه‌وه‌ و به‌ رۆژوو بوون و كاتی چوون به‌ حه‌ج كردن ... هتد**

له‌ (معاذ بن جبل ) – خوا لێ رازی بێت – ووتی : (( يا رسول الله إن اليهود تغشانا ويكثرون مسألتنا عن الأهلة فأنزل الله تعالى هذه الاية )).[١] واته: **ووتی : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ جووله‌كه‌كان زۆر دێن بۆ لامان زۆر پرسیارمان لێ ده‌كه‌ن ده‌رباره‌ی مانگ ، (خوای گه‌وره‌ )ش ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند ،**قال تعالی: ﴿۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِ...﴾ [البَقَرَةِ : ١٨٩]

[١]-أسباب النزول القران به کوردی (١/١٥٠).

**٢-پرسیار كردن ده‌رباره‌ی چیاو كێوه‌كان**

قال تعالى: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾﴾ [طه : ١٠٥ - ١٠٧]واته: [ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیاری شاخه‌كانت لێ ئه‌كه‌ن له‌ ڕۆژی قیامه‌ت ئایا ده‌مێنێت یان له‌ناو ده‌چێت [ فَقُلْ يَنْسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا (١٠٥) ] تۆ بڵێ: په‌روه‌ردگارم له‌ ناخی زه‌وی هه‌ڵیانئه‌كێشێ و ئه‌یانته‌قێنێته‌وه‌و به‌ هه‌وادا ئه‌ڕۆن..؟! [ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا (١٠٦) ] خوای گه‌وره‌ ئه‌و زه‌ویه‌ وا لێ ئه‌كات هه‌ر هه‌مووی ئه‌بێته‌ زه‌ویه‌كی لووس هیچ ڕووه‌ك و خانوویه‌كی تیا نه‌بێت و هه‌مووی ڕێك و صاف ئه‌بێ..؟! [ لَا تَرَى فِيهَا عِوَجًا وَلَا أَمْتًا (١٠٧) ] هیچ گێڕی و دۆڵ و شیو و شاخ و به‌رزی و نزمی تیا نابینیت و ڕێك و ته‌خت ئه‌بێ..؟!

## هۆكاری دابه‌زینی ئه‌م ئایه‌تانه

**له‌ (مقاتل بن سليمان ) – ره‌حمه‌تی خوا لێ بێت – ده‌ڵێت : پیاوانی هۆزی (ثقيف ) هاتنه‌ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پرسیاریان لێكرد ده‌رباره‌ی چیاو كێوه‌ كان ، ووتیان : ئه‌ی محمد چیاو كێوه‌كان چۆن ده‌بن له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا ..؟! ئینجا ئه‌م ئایه‌تانه‌ دابه‌زی كه‌ (خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى:** ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ ...﴾ .[١]

[١]-تفسير مقاتل بن سليمان (٤١/٣).

## نۆیه‌م : پرسیار کردنی به مه به‌ست و بێ ئه‌ده‌ب و ره‌وشت

**که‌واته ئێمه مه‌به‌ستی باسه‌که‌مان ئه‌وه‌یه که چۆن پرسیار بکه‌ین ، هه‌لبه‌ته ده‌بێت له پرسیار کردن ئه‌ده‌ب و ره‌وشت ره‌چاو بکرێت ، ئینجا پرسیاره‌که له که‌سی به‌رانبه‌ر بکه‌یت ، لێره‌دا کرۆکی بابه‌ته‌که‌مان ئه‌وه‌یه له‌سه‌ر نه‌وه‌ی جووله‌که یان نه‌وه‌ی ئیسرائیل که چۆن پرسیاری نالۆژیك یان نامنطق ، هه‌روه‌ها پرسیاره‌کانیان له پێغه‌مبه‌ران بۆ احتجاج و ئازاردان و گالته پێ کردن بووه یان پرسیاری بێ شه‌رم و بێ ره‌وشتیان ده‌کرد ..؟!**

### ١-پرسیار کردنی (التعنت ) واته: به‌مه به‌ست و ئازاردانی به‌رانبه‌ر

### أ-پرسیار کردن ده‌رباره‌ی (الروح ) ..؟!

قال تعالی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ٨٥﴾ [الإِسْرَاء : ٨٥]واته: {که‌س نازانێت حه‌قیقه‌تی روح چییه‌و چۆنه} [ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي ] (عبدالله‌ی کوڕی مه‌سعود) ده‌فه‌رمێت: له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - له‌ناو كێڵگه‌یه‌ك ده‌ڕۆیشتین له مه‌دینه، كه پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - خۆی دابووه سه‌ر لقه دارێكدا، به لای كۆمه‌ڵێك جوله‌كه تێپه‌ڕی، هه‌ندێكیان وتیان پرسیاری لێ بكه‌ن سه‌باره‌ت به روح، وه هه‌ندێكیان وتیان پرسیاری لێ مه‌كه‌ن نه‌وه‌كو شتێك بڵێت پێتان ناخۆش بێت، پرسیاریان لێ كرد ده‌رباره‌ی روح و وتیان ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - روح چیه؟ ده‌فه‌رمێت به‌رده‌وام خۆی دابوو به‌سه‌ر داره‌كه گومانم ده‌برد وه‌حی بۆ دابه‌زێت، خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاندو خوێندیه‌وه، هه‌ندێكیان وتیان: وتمان پرسیاری لێ مه‌كه‌ن، واته: ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیارت لێ ئه‌كه‌ن ده‌رباره‌ی روح و حه‌قیقه‌تی روح چیه؟ بڵێ: روح كاری خوای گه‌وره‌یه‌و خوای گه‌وره خۆی نه‌بێ كه‌س نازانێ حه‌قیقه‌تی روح چیه‌و چۆنه، ئه‌م ئایه‌ته له مه‌ككه‌یش دابه‌زیوه كه قوره‌یش به جوله‌كه‌یان وت شتێكمان پێ بڵێن تا پرسیاری له محمد پێ بكه‌ین، ئه‌وانیش وتیان پرسیاری لێ بكه‌ن سه‌باره‌ت به روح، ئه‌وانیش پرسیاریان لێ كردو خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاندو دواتریش له مه‌دینه دووباره دایبه‌زاندوه‌وه [ وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ] وه ئێوه له زانیاری شتێكی كه‌م نه‌بێ هیچتان پێ نه‌دراوه‌و نایزانن.

ب-پرسیار كردنی نابه‌جێ ده‌ڵێن : بۆچی (خوای گه‌وره ) فریشته‌ی نه‌نارد تاكو پێمان بلێ . محمد  پێغه‌مبه‌ری خوا ..؟!

قال تعالى: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٢١﴾﴾ [الفُرۡقَان : ٢١]واته: {كافران پێشنیاری نابه‌جێ ده‌كه‌ن} [ وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا الْمَلَائِكَةُ ] وه ئه‌وانه‌ی كه باوه‌ڕیان به گه‌یشتن به خوای گه‌وره‌و به قیامه‌ت نیه‌و ئومێدی زیندووبونه‌وه‌یان نیه ئه‌ڵێن: باشه بۆچی خوای گه‌وره مه‌لائیكه‌تی دانه‌به‌زاندۆته سه‌رمان تا پێمان بڵێ كه محمد پێغه‌مبه‌ری خوایه‌و - صلى الله عليه وسلم - ڕاستگۆیه [ أَوْ نَرَى رَبَّنَا ] یاخود بۆچی به چاوی خۆمان خوای گه‌وره نابینین تا پێمان بڵێ محمد پێغه‌مبه‌ره‌و - صلى الله عليه وسلم - له لایه‌ن منه‌وه هاتووه [ لَقَدِ اسْتَكْبَرُوا فِي أَنْفُسِهِمْ ] به‌ڕاستی ئه‌مانه له نه‌فسی خۆیاندا زۆر خۆیان به گه‌وره زانی و لووتبه‌رز بوون [ وَعَتَوْا عُتُوًّا كَبِيرًا (٢١) ] وه عینادی و سه‌ركه‌شیه‌كی زۆر گه‌وره‌یان كرد به‌وه‌ی كه ئیمانیان نه‌هێناو ئه‌م داواكاریانه‌یان كرد..؟!

ج–پرسیاركردنی به مه‌به‌ست نابه‌جێ له پایی ئه‌م هه‌موو نیشانه‌یه دوای جی ده‌كه‌ن بۆئازاردان وبیانوو گرتن..؟!

قال تعالى: ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥۗ قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٣﴾﴾ [الإِسۡرَاء : ٩٠ - ٩٣]واته: {په‌ڵپه‌و بیانووه بێ بنه‌ماكانی كافران!} [ وَقَالُوا لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنْبُوعًا (٩٠) ] وه كافره ناودارو گه‌وره‌گانی مه‌ككه وتیان: ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئیمانت پێ ناهێنین تا له‌م زه‌ویه‌وه كانیمان بۆ هه‌ڵنه‌قوڵێنیت و ئاوه‌كه‌ی به‌به‌رچاومانه‌وه نه‌ڕوات..؟! [ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِنْ نَخِيلٍ وَعِنَبٍ ] یاخود باخت نه‌بێت له دار خورماو ترێ [ فَتُفَجِّرَ الْأَنْهَارَ خِلَالَهَا تَفْجِيرًا (٩١) ] وه له‌ناو ئه‌وانیشدا كانی هه‌ڵبقوڵێنی وه به‌خێرایی ئاو له ناوه‌ڕاستیاندا هه‌ڵبقوڵێت و ده‌ربه‌ڕێ..؟! [ أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا ] یاخود ئاسمان پارچه پارچه بكه‌یت و به‌ری بده‌یته‌وه بان سه‌رمان چۆن ده‌ڵێیت له قیامه‌تدا وای لێدێت [ أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ قَبِيلًا (٩٢) ] یان خوای گه‌وره‌و مه‌لائیكه‌ته‌كان كۆمه‌ڵ كۆمه‌ڵ بێنی تا به‌چاو خۆمان بیانبینین..؟! [ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِنْ زُخْرُفٍ ] یان ئه‌بێ ماڵێكت هه‌بێ له زێڕو ڕازاوه بێت [ أَوْ تَرْقَى فِي السَّمَاءِ ] یاخود به‌رز بیته‌وه بۆ ئاسمان [ وَلَنْ نُؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّى تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَقْرَؤُهُ ] كه به‌رزیش بوویته‌وه بۆ ئاسمان و هه‌ڵفڕیت ئه‌وا ئیمان به به‌رز بوونه‌وه‌كه‌تیش ناهێنین تا له‌و سه‌ره‌وه گه‌ڕایته‌وه كتابێكمان بۆ نه‌هێنی له لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه به‌ڵگه بێ له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌رایه‌تیت و خۆمان كتابه‌كه بخوێنینه‌وه، ئه‌بێ ئه‌وه‌نده شته بكه‌ی ئه‌و كاته ئیمانت پێ دێنین [ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: پاك و مونه‌ززه‌هی بۆ خوای گه‌وره كه توانای هه‌موو شتێكی هه‌یه [ هَلْ كُنْتُ إِلَّا بَشَرًا رَسُولًا] به‌ڵام من هیچ شتێك نیم ته‌نها مرۆڤێكم و پێغه‌مبه‌ری خوام و توانای هیچ شتێك له‌مانه‌م نیه‌و مه‌لائیكه‌ت نیم تا به‌رز ببمه‌وه بۆ ئاسمان..؟!

٢-پرسیار کردنی (الاحتجاج ) واتە : بۆ هەموو شتێك نارەزایی دەردەبرن

ئەم دیاردەیە بەردەوام لە ناو کافرو بێ باوەران بەردەوام ، جا بە لەبەر چاوگرتن ، یان لە روانگەی ئەو شتە وە بێت کە مرۆڤ هەولی زانینی دەدات ، یان بۆ روانگەی مەبەستێکی تر کە خۆیان مەبەستیان بۆ هەموو شتێك بەردەوام نارەزایی دەر برن ئەمەش پیشەی هەمیشەی کافرو منافق دوو رووان و مولحیدەکانە بەردەوام نارەزایان هەیە بۆ هەموو شتێك،هەر کارێکی چاك بێت ئەوان نارەزایی دەردەبرن،لەخراپەکانیش خۆیان کەرو کوند دەکەن، زۆربەی جار لە لایەن بێ باوەران و موشریکان ئەم برو بیانوو نارەزایەیان دەر دەبری دژی پێغەمبەری خوا ﷺ.

قال تعالی: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ ...﴾ [البَقَرَةِ : ٢١٧]واتە: {کوشتار کردن لە مانگە حەرامەکاندا} [ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ] دیسان ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی کوشتار کردن لە مانگە حەرامەکاندا (أشهر الحرم) کە (ذو القعدة و ذو الحجة و موحەرەم و ڕەجەبە)

قال تعالی: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيۡكُمۡ حُجَّةٌ﴾ [البَقَرَةِ : ١٥٠]واتە: بۆ ئەوەی کە خەڵکی واتە: جوولەکەکان حوجەو بەڵگەیان نەمێنێ کە بڵێن: محمدیش صلى الله عليه وسلم ڕووی کردۆتەوە قیبلەو ڕووگەکەی ئێمە..؟!

لە (النواس بن سمعان الانصاری ) -خوا لێ رازی بێت - دەگێریتەوە دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((...إنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ، فأنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ، وإنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ، فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ، وَاللَّهُ خَلِيفَتي علَى كُلِّ مُسْلِمٍ ...)) .[١] واتە: ئەگەر دەرچێت من تان لە ناو دابم ئەوا من لەبری ئێوە چارەی دەکەم ، بەلام ئەگەر دەرچێت من تان لە ناو دا نەبم ، ئەوا با هەر کەس چارەسازی خۆی بێت ، (خوای گەورە)ش سەرو کاری من و هەموو موسلمانێکە ..؟!

[١]-صحيح مسلم برقم (٢٩٣٧).

## ٣-پرسیار کردنی (الاستهزاء ) واته: گالته پێ کردن یان گه‌مه پێ کردن

**(خوای گه‌وره) هه‌والمان پێ ده‌دات ده‌رباره‌ی گالته پێ کردن یان گه‌مه پێ کردنی بێ باوه‌رانی قوره‌یش به‌رانبه‌ر به موسلمانان ئه‌نجامیانده‌دا،به‌شێوه‌یه‌ك كه‌خۆیان به‌زانا‌ده‌زانی ویان خۆیان به‌گه‌وره ده‌زانی،به‌لام موسلمانانیان به نه‌زان وبچووكتر له‌خۆیان ده‌زانی،به شێوه‌یه‌كی زۆر بێ ره‌وشتانه گالته یان به موسلمانان ده‌كرد..؟!**

قال تعالى: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾﴾ [الأَنْعَام : ٥٣]واته : [ وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ ] به‌م شێوازه هه‌ندێك له كافرانمان به هه‌ندێكیان تاقیكردۆته‌وه، واته: خۆبه‌گه‌وره‌زان و ده‌سه‌ڵاتدارانمان به لاوازه‌كان تاقیكردۆته‌وه، یاخود كافران كه ده‌سه‌ڵاتدارو خۆبه‌گه‌وره‌زانن تاقیمان كردونه‌ته‌وه به‌و موسڵمانه لاوازانه [ لِيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا ] تا كافران بڵێن: ئایا له‌ناو ئێمه‌دا خوای گه‌وره ڕێزی له‌مانه ناوه‌و ئه‌مانه‌ی كردووه به موسڵمان به‌وه‌ی كه ئه‌مان له‌سه‌ر حه‌ق بن و ئێمه له‌سه‌ر باتڵ بین خوای گه‌وره‌ش ده‌فه‌رمووێ: [ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ] ئایا خوای گه‌وره خۆی زاناتر نیه كه كێ شوكرانه‌بژێری خوای گه‌وره ده‌كات و كێ شایه‌نی هیدایه‌ته وه كێیش ئینكاری فه‌زڵ و چاكه‌ی خوای گه‌وره ده‌كات بۆ ئێوه‌و ره‌خنه ئه‌گرن و گله‌یی ئه‌كه‌ن..؟!

قال تعالى: ﴿ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾﴾ [البَقَرَةِ : ١٥]واته: [ اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ ] دیسان خوای گه‌وره له‌سه‌ر صه‌حابه دێته وه‌ڵام كاتێك ئه‌وان گاڵته به صه‌حابه ئه‌كه‌ن له‌به‌رامبه‌ر ئه‌و گاڵته پێكردنه خوای گه‌وره‌ش گاڵته به‌وان ئه‌كات وه سووك و ڕیسوایان ئه‌كات و تۆڵه‌یان لێ ئه‌سه‌نێ بۆ به‌نده باوه‌ڕداره‌كانی [ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ] وه بۆیان درێژ ئه‌كاته‌وه له‌ناو توغیان گومڕایی و كوفری خۆیاندا بگه‌وزێن و به‌رده‌وام بن چونكه شایه‌نی ئیمان نین..؟!

قال تعالى: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْۚ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾﴾ [التَّوْبَة : ٦٥ - ٦٦]واته: {گاڵته كردن به خواو ئایه‌ته‌كانی‌و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ كوفره} [ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ] له غه‌زای ته‌بووكدا كه‌سێك له مونافیقان وتی: كه‌سم نه‌بینیوه وه‌كو پێغه‌مبه‌ری خواو ﷺ ئه‌م صه‌حابانه كه به‌خه‌می سكیانه‌وه بن، وه له كاتی قسه‌كردنیشدا درۆ بكه‌ن، وه له كاتی ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی دوژمن ترسنۆك بن، پیاوێك له صه‌حابه فه‌رمووی: درۆت كرد به‌ڵكو تۆ مونافیقی ئه‌بێ هه‌واڵ به پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بده‌م، تا ئه‌و گه‌یشته لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند، وه كاتێك كه پرسیاریان لێ بكه‌ی بۆچی ئه‌م قسانه‌تان كردووه‌و تانه‌و ته‌شه‌ر له پێغه‌مبه‌ری خواو ﷺ له صه‌حابه‌و له دین ئه‌ده‌ن ئه‌و كاته ئه‌ڵێن ئه‌ی محمد ﷺ ڕێگا دوور بوو ده‌مه‌ته‌قێمان ئه‌كرد بۆ ئه‌وه‌ی دووری ڕێگاكه ببڕین وه گاڵته‌مان ئه‌كردو كاتمان به‌سه‌ر ئه‌برد [ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ] ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێیان بفه‌رمه: ئایا ئێوه شت نه‌ما گاڵته‌ی پێ بكه‌ن ئیلا خوای گه‌وره‌و ئایه‌ته‌كانی خواو پێغه‌مبه‌ری خوا نه‌بێ ﷺ ئایا ئێوه گاڵته به‌مانه ئه‌كه‌ن..؟! [ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ] ئه‌و كه‌سه خۆی هه‌ڵواسی بوو به ڕه‌شمه‌ی ئه‌سپه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هه‌ر ئه‌یوت: ئێمه گاڵته‌مان ئه‌كردو كاتمان به‌سه‌ر ئه‌برد، پێغه‌مبه‌ریش ﷺ ئه‌یفه‌رموو: عوزر مه‌هێننه‌وه ئه‌وه ئێوه كافر بوون، واته: كوفره‌كه‌تان ئاشكرا كرد له دوای ئه‌وه‌ی كه پێشتر ئیمانتان ئاشكرا كردبوو [ إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ ] ئه‌گه‌ر له كۆمه‌ڵێكیشتان خۆش بین ئه‌وانه‌ی كه واز له نیفاق دێنن و ته‌وبه ئه‌كه‌ن [ نُعَذِّبْ طَائِفَةً ] ئه‌وا كۆمه‌ڵێكتان سزا ئه‌ده‌ین ئه‌وانه‌ی كه به‌رده‌وام بن له‌سه‌ر نیفاق و كوفری خۆیان [ بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ] له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌مانه به‌رده‌وامن له‌سه‌ر جه‌ریمه‌و تاوان..؟!

## ده‌یه‌م : ئاداب و ره‌وشتی پرسیار کردن

**١-به‌له‌به‌رچاو گرتنی پرسیاره‌که به‌شێوه‌ی مناسب ، نه‌بێته ئازاردان یان هه‌ره‌سانکردنی زانایان یان به فیرۆدانی کاتی زانایان ، ده‌بێت کاته که‌ی و شوێنه‌که‌شی زۆر گونجاو باش بێت بۆ پرسیار کردن ..؟!**

به‌لێ هه‌لبژاردنی کاته‌که یان شوێنه‌که بۆ پرسیار کردن له زانایان ئه‌م ئه‌ده‌ب و ره‌وشتی پرسیار کردن ، چونکه ناکرێت کاتی نوێژی به‌یانی یان کاتێکی نه‌گونجاو پرسیار له زانایان بکرێت ..؟! هه‌روه‌ها له شوێنکی تایبه‌ت و به‌ته‌نها ئه‌صول تر له‌وه‌ی له نێو کۆمه‌لێك خه‌لك دا یان له شوێنێکی گشتی پرسیار بکرێت ، وا جائزه له مه‌زگه‌وت یان له شوێنی وانه ووتنه‌وه ، یان له شوێنی فتوادانی زانایان پرسیاری شه‌رعی بکرێت ..؟! هه‌لبه‌ته ئه‌مه بۆ زانایان شه‌رعی راسته ، هه‌روه‌ها بۆ که‌سانێك که کار به‌ده‌ست و ئیش کاری خه‌لکی راده‌په‌رێنن ئه‌ویش هه‌روا ده‌رسته پرسیاریان لێ بکرێت به ره‌چاو کردنی کات و شوێنی گونجاو دا ، چونکه ئه‌مه ره‌وشتی پرسیا کردنه..؟!

قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُواْ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَـٰثَ مَرَّٰتٍ﴾[النُّور : ٥٨] واته: {منداڵان فێر بکه‌ن به‌بێ ئیزن نه‌چنه ژووری تایبه‌تی دایكو باوك} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ] (ئه‌سمائی کچی مه‌رثه‌-د)و هاوسه‌ره‌که‌ی خواردنیان بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - دروست کردو خه‌ڵکیش به‌بێ ئیزن ده‌هاتنه ژوره‌وه، (ئه‌سماء) وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - چه‌ند ناشیرینه ژن و پیاو له ژێر یه‌ك جێگایه‌كدان و منداڵه‌كه‌یان دێته سه‌ریان به‌بێ ئیزن، خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند: ئه‌ی باوه‌ڕداران ئه‌و كه‌سانه‌ی كه كۆیله‌و خزمه‌تكاری ئێوه‌ن [ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ] وه ئه‌وانه‌یشی كه منداڵن و بالغ نه‌بوونه [ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ] له شه‌وو و ڕۆژێكدا سێ جار داوای ئیزن و ڕوخسه‌تتان لێ بكه‌ن له كاتی هاتنه ژووری تایبه‌تی خۆتان كه كاتی پشوودانه‌و مرۆڤ له‌و كاتانه خۆی ئه‌گۆڕێ..؟!

٢-دەبێت پرسیار کردن نەکە دەبێت (الاستفهام) یان بەشێوەی پرس بێت ، نابێت پرسیارەکەی ئینکاری و نەکۆلی کردن یان نالە باری و ناوازەی وەکو ئەوەی مەحال بێت ، نابێت بە شێوەی (التعجیزیە ) بێت ..؟!

هەروەك پرسیار کردنی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بە شێوەیەکی (الاستفهام ) پرسیاریان دەکرد ، نە بە شێوەی (التعجیزیە ) واتە: بێ توانایی لە پرسیار کردن ..؟! کەواتە : هاوەڵان بێ توانا نە بوون لە پرسیار کردن ..؟!

هەروەك ئەم نموونانەی خوارەوە کە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز (خوای گەورە ) باسی دەکات :

قال تعالى: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَـٰمَىٰۖ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢٠]

قال تعالى: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢٢]

قال تعالى: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١٥]

قال تعالى: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِ﴾ [البَقَرَةِ : ١٨٩]

قال تعالى: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ﴾ [المَائـِدَة : ٤]

٣-زانین و زانیاری ده‌رباره‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی كه پرسیاری لێ ده‌كه‌ی ،به‌لام ئه‌گه‌ر پرسیار كه‌ر پێگه‌ی كه‌سی پرسیار لێكراو بزانێ ئه‌و به‌ر پرس ده‌بێت له پرسیاره‌كه‌ی ، ره‌نگه كه‌متر به ئه‌ده‌ب و ره‌وشت بێت به‌رانبه‌ری ، به‌لێ ته‌نانه‌ت قوره‌یشه‌كان و یهودیه جووله‌كه‌كانیش پێگه‌ی (خوای گه‌وره ) و پێغه‌مبه‌ری ئیسلامیان ده‌زانی چۆنه ، بۆیه ده‌یان ووت : ئێمه پرسیارمان له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كرد كه كتێبێك له ئاسمانه‌وه بێ نێته‌خواره‌وه ، هه‌ر بۆیه قورئانی پیرۆز هاته خواره‌وه ئه‌م شێوه‌یه پرسیار كردنه ئیدانه ده‌كات كه زۆر پرسیار كردنێكی بێ توانا بووه ..؟!

قال تعالى: ﴿يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾﴾ [النِّسَاء : ١٥٣] واته : {په‌ڵپه‌و بیانووی ناڕه‌وای جووله‌كه} [ يَسْأَلُكَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَنْ تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَابًا مِنَ السَّمَاءِ ] ئه‌ی محمد- صلى الله عليه وسلم - ئه‌هلی كیتاب جووله‌كه‌كان داوات لێ ئه‌كه‌ن كه كیتابێكیان له ئاسمانه‌وه بۆ دابه‌زێنی، كه داوایان كرد له پێغه‌مبه‌ر- صلى الله عليه وسلم - به‌رز به‌ره‌وه بۆ ئاسمان به‌چاو خۆمان بتبینین كیتابێكمان بۆ دابه‌زێنه له‌لایه‌ن خواوه كه ئه‌وه‌ی تیا نووسرابێ تۆ ڕاستگۆیت و تۆ پێغه‌مبه‌ری خوای- صلى الله عليه وسلم - [ فَقَدْ سَأَلُوا مُوسَى أَكْبَرَ مِنْ ذَلِكَ فَقَالُوا أَرِنَا اللَّهَ جَهْرَةً ] به‌دڵنیایی داوای له‌مه گه‌وره‌تریان له موسى كرد- صلى الله عليه وسلم - كه وتیان: ئه‌ی موسى خوای گه‌وره‌مان نیشان بده با به‌چاوی خۆمان بیبینین [ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ] له ئاسمانه‌وه ئاگرێك هات و هه‌موویانی له‌ناو برد به‌هۆی زوڵم و سته‌می خۆیانه‌وه كه داوای بینینی خوای گه‌وره‌یان كرد كه له دونیادا كه‌س ناتوانێ خوای گه‌وره ببینێ ته‌نانه‌ت پێغه‌مبه‌رانیش مه‌گه‌ر له خه‌ودا به‌ڵام له قیامه‌تدا فه‌رمووده‌كان موته‌واتیرن كه باوه‌ڕداران خوای گه‌وره ئه‌بینین له ڕۆژی قیامه‌ت وه له به‌هه‌شتیشدا [ ثُمَّ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ ] وه له‌دوای ئه‌وه‌ی به‌ڵگه‌ی ڕوون و ئاشكرایان بۆ هات كه خوای گه‌وره ئه‌و موعجیزانه‌ی به موسى- صلى الله عليه وسلم - دا له دوای ئه‌وه ئه‌مان چوون گوێره‌كه‌یه‌كیان په‌رست و كردیان به‌خوا بۆ خۆیان وه‌كو له سووره‌تی (ئه‌عراف) و (طه) دا خوای گه‌وره به‌درێژتر بۆمان باس ئه‌كات [ فَعَفَوْنَا عَنْ ذَلِكَ ] له‌مه‌یشیان بووراین كه شیركیان بۆ خوای گه‌وره دانا [ وَآتَيْنَا مُوسَى سُلْطَانًا مُبِينًا ] وه حوجه‌و به‌ڵگه و موعجیزه ی زۆرو ئاشكرامان به موسى به‌خشی- صلى الله عليه وسلم - بۆ ئه‌وه‌ی كه ئێوه ئیمان بێنن..؟!

٤-کورت کردنەوەی پرسیارە کردن

**کاتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو کاتی موسلمانان نەبوو ، چونکە کاتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام لە دیالۆك و گفتو گۆ زۆر و ، وە پرسیار کردنی زۆر لە سەر بابەتەکان و راسپاردەی زۆری موسلمانان خەلکانی غیری موسلمانیش ، هەر بۆیە بارگرانی زیاترو دەبوو سەختیشی زیاتر بووە ..؟!**

**لە(ابن عباس ) – خوا لیێ رازی بێت – دەلێت : موسلمانان زۆر ترین پرسیاریان دەکرد ، هەتاکو وایان لیێ دەکرد هیلاك بێت ، وە ویستی (خوای گەورە ) وا بوو لە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ سووك ئاسان دەکرد ..؟!**

**وەکاتێك ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە خەلکی زۆر دلتەنگ بوون ،وازیان لە پرسیار کردن هێنا ..؟!**

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَـٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةًۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُۚ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝١٢﴾ [المُجَادلَة : ١٢] واتە : ئەی باوەڕداران ئەگەر ئێوە بە نهێنی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا - صلی اللە علیه وسلم - قسەتان کرد وە کاری تایبەتتان هەبوو ئەوە پێش ئەوەی کە بەتایبەتی لەگەڵ پێغەمبەردا - صلی اللە علیه وسلم - قسە بکەن ئەوە صەدەقەیەك بکەن، لەبەر ئەوەی صەحابە زۆر پێغەمبەری خوایان - صلی اللە علیه وسلم - ماندوو ئەکرد وە زۆر پرسیاریان لێ ئەکرد وە زۆر ڕایانئەگرت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆ ئەوەی کە لەسەر پێغەمبەری خوای - صلی اللە علیه وسلم - سووك بکات [ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ] ئەمە بۆ ئێوە باشترو پاکترە [ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ] وە ئەگەر کەسێکیش توانای نەبوو صەدەقە بکات و ئیشی تایبەتی بە پێغەمبەری خوا بوو - صلی اللە علیه وسلم - ئەوە ئاساییە بەبێ صەدەقەیش بیکات بەڕاستی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و بەڕەحم و سۆزو بەزەیی و میهرەبانە..؟!

٥-دەستەواژەیەکی جوان و ڕێك و پێك لە پرسیار کردن بە ڕێگایەکی نەرم و نیان و شێوازێکی ناياب

بەلێ دەربرینی پرسیارەکە دەبێت جوان ڕێك و پێك و بێگەرد بێت ،پر لە میهرەبانی و رەوشت و ئەدەب بێت ، بەپرس بە لە رەچاوکردنی پرسیارە کە لە نەفسی خۆت ،هیبەت دانێ بۆ ئەو زانایەی کە پرسیاری لێ دەکەیت ، وە دوور بە لە دەستەواژەی ناشرین و قسەی ناو بازارەکان ، بەلکو بە پێ ئەوەی کە چ پێگەیەك بۆی دەگونجێت بانگی موفتی یان پرسیار لێکراو بکە ، ئەوەی کە شیاویەتی بانگی بکە بۆ پرسیار کردن ئەمەش پێگەی خۆیەتی بۆ موفتی شیاوە شایستەیەتی ، هەروەك ئەوەی کە دەربارەی چیرۆکی (موسی ) – علیه السلام – کە پیاوە زاناکە ئەویش (خدر ) بوو ، وەکو مامۆستاو زانا و شارەزا و ڕێ نیشاندەری (موسی ) وابوو ، بەلام (موسی ) زۆر بە میهرەبانیەوە کاتێك کە پرسیاری لە ڕێبەرو زاناو کەی خۆی دەکرد بۆ فێربوونی زانست زانیاری کە هەیبوو.

قال تعالى: ﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ۝٦٦﴾ [الكَهۡف : ٦٦]واتە: موسى - صلى الله عليه وسلم - پێی فەرموو: ئایا ڕێگام ئەدەی کە هاوەڵایەتیت بکەم وە شوێنت بکەوم تا لەوەی کە خوای گەورە فێری کردوویت منیش فێر بکەی؟ (لێرە ئیزنی لێ وەرگرت) ..؟!

قال تعالى: ﴿قَالَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ۝٦٧ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ۝٦٨ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ۝٦٩ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ۝٧٠﴾ [الكَهۡف : ٦٧ - ٧٠]واتە : خضریش - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا ئارام بگری لەبەر ئەوەی شتی زۆر سەیر ئەبینی کە پێچەوانەی شەریعەتەکەی تۆیە ..؟! وە چۆن ئەتوانی ئارام بگری لە شتێك کە زانیاریت پێی نیەو حەقیقەتی نازانی ..؟! موسى - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: (إن شاء الله) بە ئارامگری ئەمبینی [ وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا (٦٩) ] وە هیچ سەرپێچیت ناکەم و گوێڕایەڵیت ئەکەم ..؟! خضر - صلى الله عليه وسلم - پێی فەرموو: ئەگەر شوێنم کەوتیت پرسیاری هیچ شتێکم لێ مەکە لەوەی کە ئەیبینی [ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ] تا خۆم بۆت باس ئەکەم..؟!

### ٦-روون کردوەی پرسیار و دوور کەوتنەوە لە ناروونی و نادیار پرسیارەکە

بەڵێ زۆر جاران خەلکی پرسیاری نا روون و نادیار دەوژێنێت یان دەخاتە بەر باسکردن بێ ئەوەی پرسیارەکە دیارو روون بێت ، بەلکو تەنها بۆ ئەوەیە باسە کە بشێوێنێت ، خۆی لە بابەتەکە بدزێتەوە ، بۆیە پرسیار کەر لە گەیاندنی پرسیارەکەی تەنها بۆ مەبەستی احراج کردن و شەرمەزار کردنی پرسیار لێکراوە ..؟!ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پرسیار لێکراوە وەلامی شتێکی تر بداتەوە ، جگە لەوەی پرسیار کەر مەبەستی بووە ، چونکە دەرئەنجامی پرسیار ناروون ئاشکراو نادیار حەتمەن هەر وەلامی دروستی نادرێتەوە ، بۆ نموونە : ئەگەر پرسارێکی ناروون و نادیار لە زانایەك بکەیت ، ئەویش بەم شێوەیە وەلامی پرسیارەکە دەداتەوە کە تۆ بە ناروونی پرسیارت کردووە ، بەلام پرسیارکە کە پرسیارەکە دەکات بۆ ئەوەی شتێکی تری دەست کەوێت ، بۆیە پرسیارەکەی ناروون و نادیارە لە پرسیار لێکراو کردووە ..؟! هەر بۆیە لە ناروونیش دروست دە بێت لە وەلامدانەوەی پرسیارەکە ..؟!هەروەك ئەم پرسیارەی کە جوولەکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾﴾ [الإِسْرَاء : ٨٥] واتە: {کەس نازانێت حەقیقەتی روح چییەو چۆنە} [ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي ] (عبداللە¬ی کوڕی مەسعود) دەفەرمێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - لەناو کێڵگەیەك دە ڕۆیشتین لە مەدینە، کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - خۆی دابووە سەر لقە دارێکدا، بە لای کۆمەڵێك جولەکە تێپەڕی، هەندێکیان وتیان پرسیاری لێ بکەن سەبارەت بە روح، وە هەندێکیان وتیان پرسیاری لێ مەکەن نەوەکو شتێك بڵێت پێتان ناخۆش بێت، پرسیاریان لێ کرد دەربارەی روح و وتیان ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - روح چیە؟ دەفەرمێت بەردەوام خۆی دابوو بەسەر دارەکە گومانم دەبرد وەحی بۆ دابەزێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو خوێندیەوە، هەندێکیان وتیان: وتمان پرسیاری لێ مەکەن، واتە: ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی روح و حەقیقەتی روح چیە؟ بڵێ: روح کاری خوای گەورەیەو خوای گەورە خۆی نەبێ کەس نازانێ حەقیقەتی روح چیەو چۆنە، ئەم ئایەتە لە مەککەیش دابەزیوە کە قوڕەیش بە جولەکەیان وت شتێکمان پێ بڵێن تا پرسیاری لە محمد پێ بکەین، ئەوانیش وتیان پرسیاری لێ بکەن سەبارەت بە روح، ئەوانیش پرسیاریان لێ کردو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو دواتریش لە مەدینە دووبارە دایبەزاندەوە [ وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا (٨٥) ] وە ئێوە لە زانیاری شتێکی کەم نەبێ هیچتان پێ نەدراوەو نایزانن..؟!

٧-نابێت ووته‌ی ئه‌هلی ذکر زانایان له‌ گه‌ل یه‌كتری دا تێكه‌ل نه‌كرێن

كه‌واته‌ نابێت ووته‌ی كه‌سێكی تر بێنی بكه‌یته‌ پرسیار ته‌نها بۆ مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ی كه‌ تێكه‌ل و پێكه‌لی ووته‌ی زانایان بكه‌ی ..؟! یان نابێت ده‌سته‌واژه‌ی پرسیاره‌كه‌ ته‌نها بۆ مه‌به‌ستی لێدان بێت له‌ زانایان ، یان كار به‌ده‌ستان بۆ ئه‌وه‌ی بلێن : والله‌ پرسیاری كاریگه‌ر بوو ، یان بلیٰ : من به‌ م زانایه‌ معقنع نه‌بوومه‌ ، به‌لكو فلان كه‌س وه‌لامێكی باشتر لابیٰ ، به‌لام بیٰ گومان زانایانی ئه‌هلی ته‌قواو یان هاوه‌لانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ متمانه‌ پێكراوه‌ی مرۆڤی سه‌ر زه‌وین ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ رَسُولَكُمۡ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٠٨﴾ [البَقَرَة : ١٠٨]واته‌: [ أَمْ تُرِيدُونَ أَنْ تَسْأَلُوا رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَى مِنْ قَبْلُ ] یاخود ئایا ئه‌تانه‌وێ پرسیار له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا بكه‌ن صلى الله عليه وسلم هه‌روه‌كو چۆن پێشتر پرسیارتان له‌ موسى صلى الله عليه وسلم كرد كه‌ داواتان لێی كرد كه‌ خوای گه‌وره‌مان نیشان بده‌ ئێستاش داوا له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ئه‌كه‌ن صلى الله عليه وسلم ئه‌ڵێن: با خوای گه‌وره‌و مه‌لائیكه‌ت هه‌موویان بێن و بیانبینین ئایا ئه‌تانه‌وێ ئاوا پرسیار بكه‌ن [ وَمَنْ يَتَبَدَّلِ الْكُفْرَ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ] جا هه‌ر كه‌سێك واز له‌ ئیمان بهێنێ و بیگۆڕێته‌وه‌ به‌ كوفر ئه‌وه‌ به‌ڕاستی گومڕا بووه‌و له‌ ڕێگای ڕاست لایداوه‌..؟!

٨-ئامانج له‌ پرسیار كردن ده‌ست نیشانكردنی حكمی شه‌رعی بێت بۆ تێگه‌یشتن نه‌ك جیاواز له‌مه‌به‌ستی پرسیاره‌كه‌ بێت ، به‌لكو ده‌بێت په‌یوه‌ندی به‌ مه‌ستی پرسیاره‌كه‌ بێت بۆ تیٰ گه‌یشتنی حكمی شه‌رعی ..؟!

به‌لیٰ هه‌روه‌ك هاوه‌لانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پرسیاریان له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌كرده‌ بۆ مه‌به‌ستی حكمی شه‌رعی و زانینی ده‌قه‌ شه‌رعیه‌كانی ده‌رباره‌ی حه‌لال و حه‌رام كردن له‌ هه‌ر بابه‌تێكی شه‌رعی ، بۆنمونه‌ی پرسیاری له‌ حكمی شه‌رعی حه‌رامیه‌تی (ئاره‌ق و قومار ) كردن ، كه‌ئه‌حكامه‌كانی شه‌رعی له‌ سه‌ر ئه‌م حه‌رام كراوانه‌ چۆنه‌و بۆ سوود وه‌رگرتنی زیاتر له‌ تێگه‌یشتنی حه‌رامیه‌تی هه‌ر بابه‌تێك دا ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره‌) ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَاۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلِ ٱلۡعَفۡوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ ٢١٩﴾ [البَقَرَة : ٢١٩]

**٩- دەبێت پرسیار کەر نیەت و دلسۆزی تەواوی هەبێت بۆ (خوای گەورە ) لە کاتی پرسیار کردن دا ، تەنها مەبەستی بۆ زیاد کردنی زانستی شەرعی بێت یان سوود گەیاندنی زانستێکی تری دونیا بێت ..؟!**

**بەلیٚ نابێت کەسی پرسیارکە مەبەستی تاقی کردنەوەی پرسیار لێکراو بێت یان تەشهیر کردنی پرسیار لێکراوە بێت ، بەلکو تەنها دەبێت ئەخلاص نیەتی فێر بوون و زانیاری وەرگرتنی زانستی شەرعی بێت بۆ خوا بێت ..؟!**

قال تعالى: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ١١٤﴾ [طه : ١١٤]واتە: ئەوە تۆ بڵێ: ئەی پەروەردگار زانیاریم زیاد بکە، (فەرمانی پێنەکرد بە داواکردنی زیادکردنی دونیا، بەڵکو زیاد کردنی زانست و زانیاری، بۆیە تا وەفاتی فەرموو زانیاری لە زیاد بووندا بوو، ئەمەیش بێنرخی دونیاو بەرزی پلەوپایەی زانست دەردەخات).

**١٠-دەبێت پرسیار کەر صبرو ئارامی جوان باشی هەبێت**

**بۆ ئەوەی گوێی بە جوانی لە وەلامی پرسیار لێکراو هەبێت ، بە تایبەتی ئەو زانایەی کە پرسیارەکەی لیٚ کردووە ، یان ئارام بگری لەوەی کە وەلامی پرسیارەکِەی پێچەوانەی پێش بینی یەکەی بێت ، بەلکو دەبێت هەمیشە چاوەریٚ وەلامی خێر لە پرسیار لێکراو بکات ، وە سوپاسی وەلامە کەشی بکات ..؟!**

**هەرەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ٧٠﴾ [الكَهۡف : ٧٠]واتە: خضر - صلى الله عليه وسلم - پێی فەرموو: ئەگەر شوێنم کەوتیت پرسیاری هیچ شتێکم لێ مەکە لەوەی کە ئەیبینی [ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ] تا خۆم بۆت باس ئەکەم..؟!

**١١–پرسیار كەر پێویستە خۆی لە پرسیارێك بە دوور بكەرێت كە خۆی پێویستی پێ نیە یان هیچ سوودی بۆی نیە بۆ دین و دنیایی ..؟!**

قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٠١﴾ [المَائـِدَة : ١٠١]واته: {زۆر پرسیار نه‌كردن} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ] كه‌سانێك وه‌كو گاڵته‌پێكردن پرسیاریان له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - ئه‌كرد یه‌كێك ئه‌یوت: باوكم كێیه‌؟ وه‌ یه‌كێك حوشتره‌كه‌ی ون بوایه‌ ئه‌یوت حوشتره‌كه‌م له‌ كوێیه‌؟ خوای گه‌وره‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند، وه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - فه‌رمووی: ئه‌ی خه‌ڵكینه‌ خوای گه‌وره‌ حه‌جی له‌سه‌رتان فه‌رز كردووه‌ حه‌ج بكه‌ن، پیاوێك وتی هه‌موو ساڵێك؟ سێ جار وتی، پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - وه‌ڵامی نه‌دایه‌وه‌، پاشان فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر بمووتایه‌ به‌ڵێ ئه‌وا هه‌موو ساڵێك له‌سه‌رتان فه‌رز ده‌بوو وه‌ نه‌یشتان ده‌توانی، خوای گه‌وره‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند: ئه‌ی باوه‌ڕداران پرسیار له‌ هه‌ندێك شت مه‌كه‌ن كه‌ پێویستتان پێی نیه‌و خوای گه‌وره‌ خۆی بۆی ڕوون نه‌كردوونه‌ته‌وه‌ ئه‌گه‌ر بۆتان ده‌ركه‌وێ له‌وانه‌یه‌ زه‌ره‌رو زیانی بۆتان هه‌بێت و مه‌شه‌قه‌و ناڕه‌حه‌تی تیابێ [ وَإِنْ تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ ] وه‌ له‌و كاته‌یشدا كه‌ قورئان دائه‌به‌زێ پرسیار بكه‌ن بۆتان ده‌رئه‌كه‌وێ خوای گه‌وره‌ به‌وه‌حی بۆتان ڕوون ئه‌كاته‌وه‌ [ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا ] هه‌ندێك شت هه‌یه‌ خوای گه‌وره‌ لێی بێده‌نگ بووه‌و قورئان باسی نه‌كردووه‌ ته‌كلیف له‌ ئێوه‌ نه‌كراوه‌ خوای گه‌وره‌ له‌وه‌ بووراوه‌ ئێوه‌ خۆتان پرسیار مه‌كه‌ن ده‌رباره‌ی با نه‌بێته‌ باری قورس به‌سه‌ر شانتان و دواتر بۆتان جێبه‌جێ نه‌كرێت، پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - سێ شه‌و له‌ مزگه‌وت ته‌راویحی كرد، كه‌ بینی خه‌ڵكی لێیكۆده‌بنه‌و تامه‌زرۆن دواتر نه‌یكرد نه‌وه‌كو فه‌رز بكرێت له‌سه‌ریان و توانایان نه‌بێت و تاوانبار بن [ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ] وه‌ خوای گه‌وره‌ زۆر لێخۆشبوو و له‌سه‌رخۆیه‌ په‌له‌ ناكات له‌ سزادان و عقوبه‌دانی به‌نده‌كانی.

**بەڵێ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كە پێویست ناكە كە پرسیارێك پێویست پێ نەبێت پرسیار بكەیت ، بەلكو نەهی كردووە لە كەسانە كە پێویستیان نیە بە شتێك كە پرسیاری لێ بكەن ، یان وەكو نەوەی جوولەكە یان نەوەی ئیسرائیل پێویستان بە شتێك نەبوو پرسیاریان زۆر دەكرد لە پێغەمبەرەكەیان ، هەروەها (خوای گەورە ) ئاگاداری ئیماندارانی كردۆتەوە بەوەی كە شتێك پەیوەندی بە ئەوان نیە پێویست ناكە پرسیاری لە سەر بكرێت ..؟! یان شتانێك (خوای گەورە ) نەهی كردووە یان قەدەغەی كردووە پرسیاری لە سەر بكرێت ..؟! هەروەك گاوەركان پرسیاریان لە (عیسی ) كرد كە پەروەردگار لە ئاسمانەوە ئاومان بۆ بنێرێتە خوارەوە ..؟!**

له (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ووتاری بۆ داین فەرمووی : ((أنَّ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم خطَب فقال ( يا أيُّها النَّاسُ إنَّ اللهَ قد افترَض عليكم الحجَّ ) فقام رجلٌ فقال أكُلَّ عامٍ يا رسولَ اللهِ ؟ قال: فسكَت عنه حتَّى أعادها ثلاثَ مرَّاتٍ قال: ( لو قُلْتُ: نَعم، لوجَبَت، ولو وجَبَت ما قُمْتُم بها ذَرُونى ما تُرِكْتُم فإنَّما هلَكَ الَّذينَ قبْلكم بكثرةِ سؤالِهم واختلافِهم على أنبيائِهم فإذا نهَيْتُكم عن شيءٍ فاجتنِبوه وإذا أمَرْتُكم بشيءٍ فأتوا منه ما استطَعْتُم ) وذكَر أنَّ هذه الآيةَ الَّتي في المائدةِ نزَلت في ذلك: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ} [المائدة: ١٠١] )) .[1] واتە : خەلكینە (خوای گەورە) حەجی بۆ فەرز كردوون حەج بكەن ،پیاوێك ووتی : هەموو سالێك ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ..؟!پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو ..!!هەتا پیاوەكە سێ جار دوو بارەی كردووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەگەر بم ووتایە بەلێ . فەرز دەبوو لەسەر تان و ، وە نەشتان دەتوانی ئەنجامی بدەن ..!!پاشان فەرمووی : وازم لێ بێنن ئەوەندە لە شت مەكۆلنەوە ، چونكە ئەوانەی پێش ئێوە تیا چوون ، بەهۆی پرسیاری زۆر كردن و لە فەرمان دەرچوونی پێغەمبەرانیانەوە ..!! ئەگەر فەرمانی شتێكم پێ كردن چەندتان توانی ئەنجامی بدەن ، ئەگەر رێگری شتێكم پێ كردن دەست بەرداری بن وازی لێ بهێنن ..؟! ئینجا ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزیە خوارەوە {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ} [المائدة: ١٠١] ...؟!

له(سعد بن ابی وقاص ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((إنَّ أعظَمَ المُسلِمِينَ في المُسلِمِينَ جُرْمًا مَن سأَل عن أمرٍ لم يُحرَّمْ، فحُرِّمَ على النَّاسِ مِن أجْلِ مسألتِهِ )) .[2] واتە : گەورەترین تاوان كە موسلمان لە حەقی موسلماناندا ئەنجامی بدات بریتیە لەوەی : دەربارى شتێ كە زۆر پێویست نەبێ پرسیار بكات كە هێشتا ئەو شتە حەرام و نەكرابێ ، بەلام بە هۆی پرسیارەكەی ئەوەوە حەرام ببێ خەلك و موسلمانان ..؟!

[1]- صحيح ابن حبان برقم (٣٧٠٤).
[2]- السنن ابو داود برقم (٤٦١٠).

## ئایەتی (٦٩)

قال تعالى: ﴿قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٦٩]

واته : [ قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّنْ لَنَا مَا لَوْنُهَا ] وتیان: ئەی موسى داوا بكە لە پەروەردگارت با پێمان بڵێ ڕەنگی چۆن بێت، خوای گەورە داوای ڕەنگی نەكردبوو خۆیان زیادیان كرد [ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاءُ ] فەرمووی: پەروەردگار ئەفەرمووێ: با مانگایەك بێ كە ڕەنگی زەرد بێ [ فَاقِعٌ لَوْنُهَا ] بەڵام زەردێكی تۆخ و زۆر جوان [ تَسُرُّ النَّاظِرِينَ ] ئەوەندە جوان بێ كە هەر كەسێك سەیری بكات پێی سەرسام بێ وە ڕەنگەكەی پێ جوان بێ وە دڵی خۆش بكات..؟!

سەرنجێك بۆ جوولەكەی بێ مێشك ..؟! هەروەها دەبوایە لەمە زیاتر پرسیار نەكەم ، وە چێلێك یان مانگایەكی نە گەورە بە تەمەن نە بچووك بە تەمەن واتە : مامناوەندیان سەر بڕی بایە خۆیان ڕزگار بكردایە لەو كێشەیە كە ڕوو بەڕوویان بە بۆوە ، بەلام سەیرە چۆن دەبێت جوولەكە زوو بەزوو فەرمانەكانی (خوای گەورە ) جێ بەجی بكەن ، ئەوەندە بێ مێشكی ملهووری نەكەن ، وە ئەوەندە پرسیار لە سەر شتە كان نەكەن بۆ ئەوەی بە خۆیان باری خۆیان قورس گران بكەن ، فەرمانی زیاتریان پێ بدرێت ، كەچی ئەو ولاتانەی كە لە ژێر سێبەری و فەرمانی جوولەكە وەلاتەكەیان حوكمرانی دەكەن ، بەهەمان شێوەی جوولەكە وەلاتەكەیان ڕۆژ بەڕۆژ بەرەوە وێرانی و خراپەكاری نەهامەتی دەچێت ، زۆر وەلاتان لە لێواری ڕووخان تیاچ چوونن بەهۆی ئەوەی فەرمان لە جوولەكە وەردە گرن ، لە ئەنجامدا ئەم وەلاتانە چارەنووسی بەرەو نەمان دەچێت ، دە كەونە بەر تووڕەی (خوای گەورە ) غەزەب لەدوای غەزەب و نسیبەت لە دوای نسیبەت بەسەر خەلك و وەلاتەكەیان دەێت ، زۆر بەیان هەزمەی یان هەلواسانی ئابووری تێدا ڕوودەدات ، خەلك زیاتر بەرەو برسیەتی نەهامەتی دەبەن ، مرۆڤ بە هاو ڕێزی نامێنی و ، لەو پەری نادادگەری وەلات بەڕێوەدەبەن ، گەورە بچووك دەخوات ، هەروەك زمانی نەفامی پێش ئیسلام..؟!

بەلێ جوولەكە دووبارە بە هۆی نەفامی بێ مێشكیانەوە پرسیار دەكەن ، چونكە بەو وەلامەی كەپێشت دلیان ئاوی ناخواتەوە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٦٩]واتە : وتیان: ئەی موسى داوا بكە لە پەروەردگارت با پێمان بڵێ ڕەنگی چۆن بێت، خوای گەورە داوای ڕەنگی نەكردبوو خۆیان زیادیان كرد..؟! ئینجا (خوای گەورە ) چاكتر لە سەریان توندو قورس دەكات ، كە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٦٩]واتە: فەرمووی: پەروەردگار ئەفەرمووێ: با مانگایەك بێ كە ڕەنگی زەرد بێ [ فَاقِعٌ لَوْنُهَا ] بەڵام زەردێكی تۆخ و زۆر جوان [ تَسُرُّ النَّاظِرِينَ ] ئەوەندە جوان بێ كە هەر كەسێك سەیری بكات پێی سەرسام بێ وە ڕەنگەكەی پێ جوان بێ وە دڵی خۆش بكات..؟!

بەڵێ جوولەکە هەر چەند پرسیاری زیاتریان بکردایە ئەوا (خوای گەورە ) لە سەریانی قورس توونت تر دەکرد ، هەروەك ووتیان : قال تعالی: ﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَا﴾ واتە: ووتیان : ئەی (موسی ) بە پەروەردگاری خۆت بلێ . چ رەنگ بێت ..؟! (موسی) ووتی : (خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ٦٩﴾ واتە: زەردێکی تێر یان تۆخ دڵی تەماشاکەران خۆش بکات ..؟!

لە (ابن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : ﴿فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا﴾ واتە: زۆر زەرد ، واتە : ئەوندە زەرد مەیلی سپی دەنوێنی ..؟! .[1]

لە(سوددی) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەڵێت :﴿تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ٦٩﴾ واتە: تەماشاکەرانی سەر سورمان دەکات یان سەرج رادەکێشێ ..؟! .[2]

لە (وهبی کوری مونەبە ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەڵێت : ﴿تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ٦٩﴾ واتە : کاتێ سەیری پێستەکەیت کرد وا دەزانی تیشکی رۆژە یان خۆرە لە پێستەکەی دەر دەچێت ..؟! .[3]

لە ( قتادە کوری دعامە ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەڵێت : ﴿تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ٦٩﴾ واتە: سەر سوورهێنەر بووە بۆ تەماشاکەرانی ..؟! .[4]

لە (مقاتل کوری سلیمان ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەڵێت : ﴿تَسُرُّ﴾ مانای : (تعجب ) واتە: سەسورهێنەر ..؟! وە دەڵێت : ﴿ٱلنَّٰظِرِينَ ٦٩﴾ مانای : (راها ) واتە: تەماشا کەران ..؟! .[5]

کەواتە: (خوای گەورە) سێ مەرجی بۆ نەوەی جوولەکە دانان بۆ رەنگی مانگا کە :

١-دەبێت مانگاکە زەرد بێت ، وە رەنگی تر بێجگە لە رەنگی زەرد نابێت ..؟!

٢-رەنگی زەردکە زەردێکی تۆخ و صاف بێت ..؟!

٣-دەبێت تەماشاکارانی پێی سەرسام و دڵخۆش بکات ..؟!

[1]-ابن ابي حاتم (٢٢١/١).
[2]-ابن ابي حاتم (٢٢١/١).
[3]- ابن ابي حاتم (٢٢١/١).
[4]-ابن جرير (٩٦/٢).
[5]-تفسير مقاتل بن سليمان (١١٤/١)

## ئایه‌تی (٧٠)

قال تعالى: ﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ٧٠﴾ [البَقَرَةِ : ٧٠]

واته : [ قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّنْ لَنَا مَا هِيَ ] دیسان داوایان كردەوە ئەی موسى داوا بكە لە پەروەردگارت بۆمان ڕوون بكاتەوە ئەم مانگایە چۆن مانگایەك بێت [ إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا ] نزیكە ئەم مانگایەمان لێ تێكئەچێت و دەستمان ناكەوێت [ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ] وە إن شاء الله ئەیدۆزینەوە كە چۆن مانگایەكە..؟!

بەڵێ ئەوەی كە لە ئایەتی پێشو تر باسمان كرد ، واتە : ئایەتی (٦٩) كە جوولەكە ووتیان : ئەی ڕەنگە كەی چۆن بێت ..؟! ئەوام مەبەستیان بوو فەرمانەكە جێ بەجێ نەكەن ، یان ئەوەندە دڵ ڕەق پیسكەن كە گومان و بیری زۆریان دەكردەوە ، بۆئەوەی ملهووری بكەن ، دەنا هیچ پێویستی بە دووبارە پرسیار كردنەوە نە دەكرد ، ئەوەی كە فەرمانیان پێكراو بوو دەبوایە دەست بەجێ فەرمانەكە جێ بەجێ كەن ، ئینجا لە نێوان خۆیانەوە كەوتنە دەمە دەمو بۆڵە بۆڵ و قسە كردن و پرسیان لە یەكتری كردن ..؟! ئەوە بوو هەریەكەیان قسەیەكی دەكرد ، دەی ووت : دەبێ چێڵەكە یان مانگا كە ئاوا و ئەو ها بێت ..!! بەڵێ جوولەكە ئەو هەموو پرسیارەیان دەكرد تەنها بۆ ئەوە بوو ، فەرمانەكەی (خوای گەورە ) جێ بەجێ نەكەن ..!! دووبارە چوونەوە لای پێغەمبەرەكەیان كە (موسى ) – علیه السلام – بوو ، دووبارە پرسیاریان كردەوە ووتیان : قال تعالى: ﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾ واتە: وویتان پرسیارمان بۆ بكە لە پەروەردگاری خۆت ، پێی بڵێ چۆن بێت ئەو مانگایە ..؟! بەڵێ بێ گومان دیسان جوولەكە بێ ئەدەبیەكی یان بێ ڕەوشتیەكی تریان لە پرسیار كردن ئەنجامدا ، بێ ئەدەبی و بێ شەرمی جوولەكە بەرانبەر بە پێغەمبەر (موسى ) ئەوەیە كە دەیان ووت : بە پەروەردگارت بڵێ ..؟! وەك ئەوەیە كە پەروەردگاری ئەوان نەبێت ..؟! بەڵكو تەنها پەروەردگاری پێغەمبەر (موسى ) بێت – علیه السلام – ..؟! بەڵێ لە باسەكانی پێش تر باسی ئەدەب و ڕەوەشتی پرسیار كردنمان كرد كە دەبێت بەرانبەر بە پێغەمبەران و زانایان چۆن بێت ، چۆن ئەدەبی پرسیار كردن بزانین بەرانبەر بە پرسیار لێكراوان یان زانایان ،یان ئەو كەسانەی كە فێر كارن یام مامۆستان وانەی شەرعی دەڵێنەوە ، هەروەها ئەدەبی پرسیار كردن بۆ كاربەدەستانیش ڕاستە ، نابێت لە پێگەو مەقامی هیچ كەسێك و زانایەك پرسیاری نا لۆژیك نامنتق ئەنجام بدری ، یان پرسیارێك ڕوون و ئاشكرا نەبێت ، بروژێنی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆت ، یان ئەگەر شتێك پێویستی نەكرد بزانین با ئەوەندە پرسیاری لێ نەكرێت چونكە پەیوەندی ، بۆنموونە دەكرێت بڵێن : بۆچی ئاژەڵی زەرافە ملی درێژە یان بزن بۆچی شاخی هەیە ..؟! یان بۆچی مرۆڤی كورت دەرێژ هەیە ، یان بۆچی ڕووح نابینرێت ، جا ئەگەر بە پرسیاری نا لۆژیك بكەوین زۆرە...هتد ، پرسیار كردنی زۆر مرۆڤی تووشی گومرایی دەكات ..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا﴾واته: ووتیان : به‌راستی ئه‌و مانگایه یا چێله له باره‌ی ره‌نگ و گه‌وره‌و بچووکیه‌وه ، سه‌رمان لێ شێواوه یان سه‌رمان لێ تێك چووه ، واته : نازانین ئه‌و مانگایه ئیشکه‌ر بێت واته: له کێلگه دا ئیش بكات یان به‌ره‌ڵای ناو گارانی چێڵان بێ ..؟! واته: ووتیان : ئه‌ی (موسى) ئه‌م جۆره مانگایه سه‌ری لێ تێك داوێن ، زۆر به باشی بۆ مان جیابكه‌وه كه چۆن بێت و وه‌سفی ئه‌م جۆره مانگایه‌مان بۆ بكه ..؟!هه‌روه‌ها پاشان ووتیان : قال تعالى: ﴿وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ۝٧٠﴾ واته: ئێمه ئه‌گه‌ر خوا ویستی لێ بێت یان خوا حه‌ز بكات ، له‌و كه‌سانه ئه‌بین كه مانگایه‌كی وا بدۆزینه‌وه كه (خوای گه‌وره) وه‌سفی كرد بێ ئه‌بێ وابێ ..؟!

به‌لێ نه‌وه‌ی جووله‌كه به‌ستنه‌وه‌ی كاره‌كان به ویستی (خوای گه‌وره ) له به‌ر ووته‌ی ﴿وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ۝٧٠﴾ كه‌واته: هیچ شتێك رووناداتت ئیلا ویستی (خوای گه‌وره ) نه‌بێت ، له‌وانه‌یه ئه‌مه هۆكار بێت بۆ به هیدایه‌ت هات و مانگا سه‌ر برین ، به‌لام سه‌ره‌رای ئه‌مه‌ش نابێت ویستی (خوای گه‌وره) بكه‌یته به‌ڵگه له‌سه‌ر كرده‌وه یان ته‌رك كردن ، هه‌روه‌ك بێ باوه‌ران ووتیان : قال تعالى: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ﴾ [الأنعام : ١٤٨]واته : موشریكان ئه‌یانووت: ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره ویستی لێ بوایه نه ئێمه‌و نه باوك و باپیرانیشمان شه‌ریكمان بۆ خوا دانه‌ئه‌نا [ وَلَا حَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ ] وه هیچ شتێكیشمان له‌سه‌ر خۆمان حه‌رام نه‌ئه‌كرد هه‌موو ئه‌و خراپانه‌ی كه ئه‌یان كرد دایانه پاڵ خوای گه‌وره..؟!

هه‌ربۆیه ئه‌وه‌نده پرسیار كردنیان له سه‌ر مانگاكه (خوای گه‌وره ) ئه‌م سێ مه‌رجه‌ی له سه‌ر واجب كردن :

١- قال تعالى: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ۝٦٨﴾ [البَقَرَةِ : ٦٨]

٢- قال تعالى: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ۝٦٩﴾ [البَقَرَةِ : ٦٩]

٣- قال تعالى: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٧١]

## بابه‌تی (الهديه) یان رێنمۆیی کردن

**پێناسه: (الهدايه )**

**(الهدايه ) له‌رووی زمانه‌وانیدا :**

(الهدايه ) : واته : کرداری یان فعلی رێنماییه ، یان (الهدايه ) واته: پێچه‌وانه‌ی گومرایی و چه‌واشه‌کاریه .؟![1]

ووتراوه : (الهدايه ) یان هیدایه‌ت واته: رێگای روون و به‌لگه و شاهید بۆ رێ نیشاندان ..؟! [2]

هه‌روه‌ك ده‌ڵێن : رێنمایم کرد بۆ رێگای راست و دروست ، واته : ئه‌وه‌ی پێشه‌نگه رێ نیشانده‌ره بۆ رێگای راست ، هه‌روه‌ك هه‌موو پێشه‌وایه‌ك ئه‌وا رێنمایی کاره ..؟!

ووتراوه : (الهدى) واته : بیانه و روونکردنه‌وه‌یه بۆ ئاراسته کردنی شتێك بۆ شتێك ، یان گوێرایه‌لی و دوور که‌تنه‌وه‌یه له گوناهو تاوان یان ته‌قواداریه ..؟!

تێبینی / ووشه‌ی (هدى ) له قورئانی پیرۆز دا (٣١٦) جار هاتووه ..؟![3]

---

[1]-تهذيب اللغة ، الازهری (٣٧٨/٦).
[2]-القاموس المحيط ، الفيروز آبادی ، ص ١٣٤٥.
[3]-المعجم المفهرس الشامل الألفاظ القرآن الكريم ، عبداللة جلغوم ، باب الهاء ص ٢١٥.

## ووشه‌ی (الهدیه ) له‌ به‌كارهێنانی قورئاندا به‌ چوارده‌ شێواز هاتووه‌

١-(البیان) واته‌: روون و ره‌وان ، قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥﴾ [البَقَرَة : ٥]واته‌: [ أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ ] ئه‌م كه‌سانه‌ی كه‌ ته‌قواو ئیمانیان كۆ كردۆته‌وه‌ وه‌ فه‌رزه‌كان ئه‌نجام ئه‌ده‌ن له‌سه‌ر هیدایه‌ت و ڕێنمایی و رووناكین له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگاریانه‌وه‌ [ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٥) ] وه‌ ئه‌م كه‌سانه‌ سه‌ربه‌رزو سه‌رفرازو سه‌ركه‌وتوون له‌ دونیاو دوارۆژدا، پاشان خوای گه‌وره‌ دێته‌ سه‌ر باسكردنی كافران..؟!

٢-(دین الاسلام ) واته‌ : له‌سه‌ر ئایینی ئیسلام ، قال تعالى: ﴿ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدٗى﴾ [الحَج : ٦٧]واته‌: به‌ دڵنیایی تۆ له‌سه‌ر هیدایه‌ت و ڕێگای ڕاستی خوای گه‌وره‌ی..؟!

٣-(الایمان والتوحید) واته‌: باوه‌رو یه‌ك خوا په‌رستی ، قال تعالى: ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗى﴾ [مَريَم : ٧٦]واته‌: وه‌ خوای گه‌وره‌ ئه‌وانه‌ی كه‌ ئه‌هلی هیدایه‌ت بوونه‌ زیاتر هیدایه‌تیان ئه‌دات..؟! قال تعالى: ﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآ﴾ [القَصَص : ٥٧]واته‌ : وه‌ كافرانی قوره‌یش ئه‌یانووت: ئه‌ی محمد - صلى الله علیه وسلم - ئه‌گه‌ر بێتوو ئێمه‌ شوێن ئه‌و هیدایه‌ت و دینه‌ی تۆ بكه‌وین ئه‌وه‌ عه‌ره‌ب دێن و ئه‌ده‌ن به‌سه‌رماندا وه‌ ئێمه‌ش شه‌ڕی هه‌موو عه‌ره‌بمان پێ ناكرێ، وه‌ له‌ زه‌وی خۆمان ده‌رمان ئه‌كه‌ن و شاربه‌ده‌رمان ده‌كه‌ن..؟!

٤-(الداعی ) واته‌: بانگه‌وازی ، قال تعالى: ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٞۖ وَلِكُلِّ قَوۡمٍ هَادٍ ٧﴾ [الرَّعۡد : ٧] واته‌: [ إِنَّمَا أَنْتَ مُنْذِرٌ ] ئه‌ی محمد - صلى الله علیه وسلم - ئه‌و شتانه‌ به‌ده‌ست تۆ نیه‌ و تۆ ته‌نها ترسێنه‌ری و ئه‌یانترسێنی و ئاگاداریان ئه‌كه‌یته‌وه‌ [ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ] وه‌ بۆ هه‌موو قه‌ومێكیش پێغه‌مبه‌رێك هه‌یه‌ كه‌ هیدایه‌تیان ئه‌دات و ڕێنماییان ئه‌كات بۆ ڕێگای ڕاست..؟!

٥-(المعرفه ) واته‌: زانین ، قال تعالى: ﴿وَعَلَٰمَٰتٖۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ١٦﴾ [النَّحل : ١٦]واته‌: [ وَعَلَامَاتٍ ] وه‌ جۆره‌ها نیشانه‌ی داناوه‌ كه‌ ڕێی خۆتانی پێ بدۆزنه‌وه‌ [ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ] وه‌ به‌هۆی ئه‌ستێره‌یشه‌وه‌ به‌ شه‌وان ئه‌توانن ڕێگای خۆتان بدۆزنه‌وه‌ له‌ گه‌شته‌كانتاندا..؟!

٦-(الرسل والكتب ) واته‌: پێغه‌مبه‌ران و كتێبه‌كانیان ، قال تعالى: ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ١٢٣﴾ [طه : ١٢٣]واته‌: [ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى ] هه‌ر كاتێك له‌ لایه‌ن منه‌وه‌ هیدایه‌تتان بۆ هات به‌ ناردنی پێغه‌مبه‌ران و دابه‌زینی كتێبه‌كان [ فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى ] ئه‌وا هه‌ر كه‌سێك شوێن ئه‌و هیدایه‌ته‌ی من بكه‌وێ له‌ دونیادا گومڕا نابێت و له‌ قیامه‌تیش به‌دبه‌خت نابێت، به‌ڵكو به‌خته‌وه‌ر ئه‌بێت..؟!

٧-(الرشد ) واته‌: رێ نیشاندان یان رێ به‌ریكردن ، قال تعالى: ﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلۡقَآءَ مَدۡيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهۡدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ٢٢﴾ [القَصَص : ٢٢]واته‌: وه‌ كاتێك كه‌ رووی كرده‌ (مه‌دیه‌ن) ڕێگای نه‌ئه‌زانی، وتی: به‌ڵكو خوای گه‌وره‌ ڕێگای ڕاستم نیشان بدا بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌م به‌ (مه‌دیه‌ن) و ڕێگاكه‌ ون نه‌كه‌م (ده‌وترێت خوای گه‌وره‌ فریشته‌یه‌كی ناردووه‌ ڕێی نیشان داوه‌)..؟!

٨-(القران ) واتە: قورئانی پیرۆز ، قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾﴾ [النَّجْم : ٢٣]واتە: لە کاتێکدا کە بە دڵنیایی لەلایەن خوای گەورەوە هیدایەتتان بۆ هاتووە کە قورئانە..؟!

٩-(التورات) واتە: پەرتووکی تەورات ، قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾﴾ [غَافِر : ٥٣]واتە: وە بە دڵنیایی ئێمە هیدایەتمان بە موسى - صلى الله عليه وسلم - بەخشی، واتە: تەورات و پێغەمبەرایەتی کە هیدایەتی تیادا بووە، وە لە دوای موسى - صلى الله عليه وسلم - بەنی ئیسرائیلمان کرد بە میراتگری ئەو کتابە کە تەورات بووەو لەناویان مایەوە..؟!

١٠-(لا يفق إلى الحجة ولا يهدي من الضلال ) واتە : سەرکەوتوو نابێت بۆ بیانوو گرتن ،وە لە گومرایی دا ڕێنمایی ناکرێت ، واتە: بە بیانوو گرتن هیدایەت نادرێت ، قال تعالى: ﴿فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾﴾ [البَقَرَة : ٢٥٨]واتە: (نەمرودی) کافری دەمکوت کرد وە هیچ بەڵگەی پێ نەما وە سەرسام بوو [ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ] بەڕاستی خوای گەورە هیدایەتی کەسانی زاڵم و ستەمکار نادات، خوای گەورە بە مێشێك سزای دا کە چووە ناو لوتیەوە دەبوایە بە چەکوشی ئاسن لەسەری خۆی بدایا تا هێور بوایەتەوە وە هەر بەو مێشە کوشتی..؟!

١١-(السنه) واتە: لاسایی کردنەوە ، قال تعالى: ﴿بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾ [الزُّخْرُف : ٢٢]واتە: {حەرامێتی لاسایی کردنەوەی کوێرانە} [ بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ ] بەڵکو ئەیانووت: ئێمە باوك و باپیرانی خۆمان لەسەر جۆرە عیبادەتێك بینیوە [ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُهْتَدُونَ (٢٢) ] وە ئێمەیش بە شوێنەواری ئەواندا ئەڕۆین و لاسایی ئەوان دەکەینەوەو کوێرانە چاو لەوان ئەکەین و هیدایەت لەوان وەرئەگرین، (باوك و باپیرانیان خۆیان گومڕا بوونە ئیتر چۆن هیدایەتی خەڵکی دەدەن!؟ قسەیەکی بێ بەڵگەو بێ بنەمایە)..؟!

١٢-(لا يهدى : معنى : لا يصلح ) واتە: ئەوەی هیدایەت نەدرێت ، کاری چاکەش ئەنجام نادات ، یان ئەوەی هیدیەت نەدرێت چاکە کار نیە ، یان واتە: کرداری داوێن پیسی باش نیە بەڵکو خراپەکاریە ، یان کرداری ناپاکی هیدایەت و ڕێنمۆیی ناکرێت ، قال تعالى: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾﴾ [يُوسُف : ٥٢] واتە : وە خوای گەورەش هیدایەتی نەخشەو پیلانی ناپاکان و خائینان نادات.؟!

١٣-(الالهام ) واتە: (خوای گەورە ) شتێکی چاکەکار لە دل و سینگی دا جێگیر دەکات ، بەمانای بیرکردنەوە یان افکار دەدرێتە دل و سینگیەوە ، قال تعالى: ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾﴾ [طه : ٥٠] واتە: موسى - صلى الله عليه وسلم - وتی: پەروەردگاری ئێمە ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی دروست کردووە پاشان ڕێنمایی کردوون بۆ ئەو شتەی کە سوودو بەرژەوەندی خۆیانی تێدابێت..؟!

١٤-(هدنا ) یعنی (تبنا) واتە: تووبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای (خوای گەورە ) دوور کردنەوە لە گوناهو تاواندا،

قال تعالى: ﴿إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ﴾ [الْأَعْرَاف : ١٥٦] واتە: ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاینەوەو تەوبەمان کرد..؟!

## ئەو ووشانەی پەیوەندی دارە بەووشەی (الهدایه)

١-(الصلاح) واته: چاكه یان راست و دروست

أ-(الصلاح ) لەرووی زمانەوانی دا واتە: پێچەوانەی خراپەو فسادیە ، كەواتە: چاكە بەدەست هێنانی بارێكی راست و دروست و سوودبەخش ، چاكە پێچەوانەی فسادە و گەدەلیە ، ئەمەش ئاماژەیە بۆ پاك كردن یان لابردنی فساد و خراپەكاری گەندەلی ، هەروەك دەلێن : پیاوەكە لە نەفسی خۆیدا چاكە كارە ، یان كردارێكی چاكەی ئەنجامداوە ..؟! .[1]

ب- (الصلاح ) لەرووی زاراوەی شەرعیەوە واتە: پاكردن لابردنی عیب و عارو فسادیە كە لە شتێكدا روودەدات ..؟! .[2]

٢-(الإرشاد)واته: ڕێ نموویی كردن یان ڕێ نیشاندان

أ-(الارشاد ) لە رووی زمانەوانیدا : واتە: ڕێ نیشاندان یان ڕێنموویی بەر بەكار هێنانی هیداتیە بەكار دەهێنیت ، وە ئەمەش پێچەوانەی لە ڕێ دەرچوون یان تاوانە ..؟![3]

ب-(الارشاد ) لەرووی زاراوەی شەرعیەوە : واتە : ڕێنموویی كردنی شتێك بۆ روونكردنەوەی ڕێگایەكی راست و دورست ..؟! .[4]

[1]-مقاييس اللغة ابن فارس (٣/٣٠٣)، العين الفرهيدي (٣/١١٧)، لسان العرب ابن منظور (٢/٥١٧).
[2]-الفقة على مذاهب الأربعة ، الجزيري (٥/٢٣٩).
[3]-المفردات ، الراغب الاصفهاني ص ٢٠٢ .
[4]-الفوق اللغوية ، ابو هلال العسكري ص٤٢.

٣-(السداد) واتە: مەبەستی راست و دروست

أ-لە رووی زمانەوانیدا واتە : (الاستقامە) وەك دەلێن : راست و مەبەست دار لە ووتە و كردار دا ، یان ئەوەی حەق و رەوایە كە كرداری چاكەی لەسەر دەكات بۆ رزگار بوونی ، وە حەق و راستی ئەوەیە كە هەر كەسێك پێچەوانەی كاری پێ بكات لە ناو دەچێت..؟!.[1]

ب-لەرووی زاراوەی شەرعیەوە واتە : مەبەست لە فەرمانێك كە دادپەروەری تێدا بەدی بكرێت ..؟! .[2]

٤-(الضلال ) واتە: سەر لێ شێواوی یان گومرای

أ- رووی زمانەوانیدا : لە سەر چاوەی (ضل ) هاتووە واتە : بە لاریدا رۆیشت ، كە بە واتای لە دەست دان و رۆیشتن و دواكەوتن دێت ، واتە: هەر كەسێك لە مەبەستی دیاری كراوە لابدات پێ دەوترێت (ضالا) واتە: گومرایی و سەرلێ شێواوی..؟!.[3]

ب- لەرووی زاراوەی شەرعیەوە : واتە: هەر لادانێك لە مەنهج دا ، جا بە ئەنقەست بێ یان بە هەلە بێ ، جا بەكەمی بێت یان بە زۆری بێت ، ئەمە پێ دەوترێت (ضلال) واتە: گومرایی یان سەر لێ شێواوی ..؟! .[4]

[1]-مختار صحاح ، الرازي ص١٤٧،الفروق اللغوية ، ابو هلال العسكري ص ٤٢.
[2]-لسان العرب ،ابن منظور (٢١٢/٦).
[3]-مقاييس اللغة ، ابن فارس (٣٥٦/٣)، لسان العرب ، ابن منظور (٣٩٠/١١).
[4]-الكليان=ت ، الكفوي ، ص ٥٦٧.

## گونجاندنی (الهدیه ) یان ڕێنمووی له‌ قورئانی پیرۆز دا

**له‌ قورئانی پیرۆز دا ووشه‌ی (الهدیه ) گونجاندوه‌ به‌ چه‌ند بابه‌تێكه‌وه‌ یان چه‌ندباسێكه‌وه‌ كه‌ له‌گه‌ڵی گونجاوه‌ :**

**وه‌ك : (الرحمة ) ، (النور ) ، (الموعظة ) ، (البشرى ) ، (الشفاء) ، (البركة )**

**یه‌كه‌م : (الهدیه بالرحمة ) واته‌: هیدایه‌ت یان ڕێنموویی به‌ به‌زه‌یی و میهره‌بانی ، له‌ (١٢) جێگا باسكراوه‌ له‌ قورئانی پیرۆز دا ، به‌ڵام له‌ (٩) شوێندا باسی بابه‌تی قورئانی پیرۆز ده‌كات ، هه‌روه‌ها له‌ (٣) شوێندا باسی بابه‌تی كتابی (ته‌ورات )ده‌كات ..؟!**

١-قال تعالى: ﴿أَوْ تَقُولُواْ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ [الأَنْعَام : ١٥٧]واته: یاخود بۆ ئه‌وه‌ی نه‌ڵێن ئه‌گه‌ر بهاتایه‌ ئێمه‌ش كتابمان بۆ دابه‌زیایه‌ ئه‌وا ئێمه‌ هیدایه‌تدراوتر ئه‌بووین له‌ جووله‌كه‌و گاوره‌كان، بۆ ئه‌وه‌ی عوزرتان نه‌مێنێ [ فَقَدْ جَاءَكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ ] ئه‌وه‌تا به‌ڵگه‌ی ڕوون و ئاشكراتان له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه‌ بۆ هات و ئه‌و قورئانه‌ی بۆتان دابه‌زاند [ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ] وه‌ هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ ئێوه‌..؟!

٢-قال تعالى: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ۝٥٢﴾ [الأَعْرَاف : ٥٢]واته: وه‌ ئێمه‌ كتابێكمان بۆ ناردوون كه‌ قورئانی پیرۆزه‌ كه‌ به‌ زانیاری هه‌موو شتێكی تیادا ڕوون كراوه‌ته‌وه‌ [ هُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ] وه‌ هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ كه‌سانێك كه‌ ئیمانیان هێنابێ به‌خوای گه‌وره‌..؟!

٣-قال تعالى: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّي ۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ۝٢٠٣﴾ [الأَعْرَاف : ٢٠٣]واته: ئه‌ی محمد - صلى الله علیه وسلم - بڵێ: من ته‌نها شوێنی ئه‌و وه‌حیه‌ ئه‌كه‌وم كه‌ له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارمه‌وه‌ بۆم دێت و به‌ده‌ست خۆم نیه‌ [ هَذَا بَصَائِرُ مِنْ رَبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ] ئه‌م قورئانه‌ی كه‌ خوای گه‌وره‌ بۆی دابه‌زاندووم چاوڕۆشنیاییه‌كه‌ له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارتانه‌وه‌ یه‌ وه‌ هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ كه‌سانێك كه‌ ئیمان بێنن، وه‌ گه‌وره‌ترین موعجیزه‌یه‌..؟!

٤-قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۝٥٧﴾ [يُونُس : ٥٧]واته: {قورئان شیفاو هیدایه‌تو ره‌حمه‌ته‌} [ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ ] ئه‌ی خه‌ڵكی به‌دڵنیایی له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگاره‌وه‌ په‌ندو ئامۆژگاریتان بۆ هاتووه‌ كه‌ قورئانی پیرۆزه‌ [ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ ] وه‌ شیفایه‌ بۆ ئه‌و دڵه‌ی كه‌ له‌ناو سینگه‌كانه‌ بۆ هه‌ر دوودڵی و گومانێك كه‌ ڕووبه‌ڕووتان بێته‌وه‌ قورئان شیفایه‌ بۆی [ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ] وه‌ هیدایه‌ت و ڕێنمایی و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ باوه‌ڕداران..؟!

٥-قال تعالى: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ۝١١١﴾ [يُوسُف : ١١١]واته: [ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ] به‌ دڵنیایی چیرۆك و به‌سه‌رهاتی پێغه‌مبه‌ران له‌گه‌ڵ ئوممه‌تانیان، یان ئه‌م چیرۆكه‌ی یوسف له‌گه‌ڵ براكانی و باوكیدا په‌ندو عیبره‌ت و ئامۆژگاری تیایه‌ بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ خاوه‌ن عه‌قڵێكی سه‌لیمن و تێده‌گه‌ن [ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى ] ئه‌م قورئانه‌ قسه‌یه‌ك نیه‌ هه‌ڵبه‌سترابێ [ وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ ] به‌ڵكو به‌ڕاستدانه‌ری كتێبه‌ ئاسمانیه‌كانی پێش خۆیه‌تی له‌ ته‌ورات و ئینجیل و زه‌بور [ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ ] وه‌ درێژه‌ی هه‌موو شتێكی تیایه‌و شه‌ریعه‌تی به‌درێژی تیادا باسكراوه‌ [ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ] وه‌ هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ كه‌سانێك كه‌ ئیمان بێنن، والله أعلم..؟!

٦-قال تعالى: ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٦٤﴾﴾ [النَّحۡل : ٦٤]واته: {هه‌ندێك له‌ به‌خششه‌كانی خوای گه‌وره} [ وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ ] وه‌ ئێمه‌ ئه‌و قورئانه‌ پیرۆزه‌مان بۆ دانه‌به‌زاندووی ته‌نها بۆ ئه‌وه‌ نه‌بێت ئه‌و شته‌ی كه‌ ناكۆكی و جیاوازی له‌ نێوانیاندا هه‌یه‌ له‌ بابه‌تی یه‌كخواپه‌رستی و زیندوو بوونه‌وه‌ تا تۆ بۆیان ڕوون بكه‌یته‌وه‌ [ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ] وه‌ ئه‌و قورئانه‌ پیرۆزه‌ هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ كه‌سانێك كه‌ ئیمانیان هه‌بێت و ده‌ستی پێوه‌ بگرن و شوێنی بكه‌ون..؟!

٧-قال تعالى: ﴿وَإِنَّهُۥ لَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾﴾ [النَّمۡل : ٧٧]واته: وه‌ به‌ دڵنیایی ئه‌م قورئانه‌ هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ باوه‌ڕداران..؟!

٨-قال تعالى: ﴿هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣﴾﴾ [لُقۡمَان : ٣]واته: وه‌ هیدایه‌ت و ڕێنمایی و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ چاكه‌كاران..؟!

٩-قال تعالى: ﴿هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾﴾ [الجَاثِيَة : ٢٠]واته: ئه‌م قورئانه‌ به‌ڵگه‌ی ڕوون و ئاشكراو چاوڕۆشنایی و هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ كه‌سانێك كه‌ یه‌قینیان هه‌بێ و گومانیان نه‌بێ..؟!

**هه‌روه‌ها (٣) ئایه‌ته‌ی تر له‌ سه‌ر وه‌سفی باسكردنی كتابی (ته‌ورات ) :**

١-قال تعالى: ﴿ثُمَّ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٤﴾﴾ [الۡأَنۡعَام : ١٥٤]واته : [ ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ تَمَامًا عَلَى الَّذِي أَحْسَنَ ] پاشان ئێمه‌ ته‌وراتمان به‌ موسى به‌خشی به‌ته‌واوی ئه‌وه‌ی كه‌ پێویستی بێت له‌شه‌ریعه‌ته‌كه‌ی تایدایه‌، یان نیعمه‌تی خۆمان ته‌واو ڕژاند به‌سه‌ریدا، چونكه‌ موسا چاكه‌كار بوو وه‌ گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره‌ی ئه‌كرد [ وَتَفْصِيلًا لِكُلِّ شَيْءٍ ] وه‌ ته‌وراتیش ڕوون كردنه‌وه‌و درێژه‌پێدانی ئه‌حكامی هه‌موو شتێكی تیا بوو بۆ ئه‌وان [ وَهُدًى وَرَحْمَةً ] وه‌ هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌ت بووه‌ بۆ كاتی خۆی [ لَعَلَّهُمْ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ] به‌ڵكو ئیمان بێنن به‌ گه‌یشتن به‌ خوای گه‌وره‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌ت..؟!

٢-قال تعالى: ﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾﴾ [الۡأَعۡرَاف : ١٥٤]واته: [ وَلَمَّا سَكَتَ عَنْ مُوسَى الْغَضَبُ ] وه‌ كاتێك كه‌ موسى - صلى الله عليه وسلم - تووڕه‌ییه‌كه‌ی هێورو ئارام بۆوه‌ [ أَخَذَ الْأَلْوَاحَ وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ] ئه‌و له‌وحانه‌ی كه‌ ته‌وراتی تیا نووسرا بوو كه‌ فڕێی دا هه‌ڵیگرته‌وه‌ بینی كه‌ هیدایه‌ت و ڕه‌حمه‌تی تیایه‌ بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ ترسی په‌روه‌ردگاریان له‌ دڵدایه‌و ملكه‌چن..؟!

٣-قال تعالى: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾﴾ [القَصَص : ٤٣]واته: [ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ ] وه‌ به‌دڵنیایی ئێمه‌ ته‌وراتمان به‌ موسى - صلى الله عليه وسلم - به‌خشی [ مِنْ بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَى ] له‌ دوای ئه‌وه‌ی كه‌ چه‌نده‌ها ئوممه‌تانی كافری پێشترمان له‌ناو برد (ئه‌بو سه‌عیدی خودری) ده‌فه‌رمێت: له‌ دوای دابه‌زینی ته‌ورات خوای گه‌وره‌ هیچ ئوممه‌تێكی به‌ تێكرا له‌ناو نه‌بردووه‌و فیرعه‌ون و شوێنكه‌وتوانی دوا ئوممه‌ت بوون كه‌ هه‌موویان پێكه‌وه‌ له‌ناوبران، ته‌نها خه‌ڵكی ئه‌و گونده‌ نه‌بێت كه‌ خوای گه‌وره‌ كردیانی به‌ مه‌یمون و به‌راز) [ بَصَائِرَ لِلنَّاسِ ] كه‌ ئه‌و ته‌وراته‌ چاوڕۆشنایی بوو بۆ خه‌ڵكی سه‌رده‌می خۆی كه‌ حه‌قیان پێی ئه‌دۆزیه‌وه‌ [ وَهُدًى وَرَحْمَةً ] وه‌ هیدایه‌ت بوو بۆ حه‌ق و ڕه‌حمه‌ت بوو له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه‌ بۆ خه‌ڵكی [ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ (٤٣) ] به‌ڵكو خه‌ڵكی یادی خوای گه‌وره‌و شوكرانه‌بژێری نیعمه‌ته‌كانی بكه‌ن..؟!

دووەم: (الهدیە بالبشری ) واتە: ڕێنموویی و مژدە

**بەڵێ گونجاندنی هیدایەت یا ڕێمایی کردن بۆ مژدەیەك ، لە (٣) ئایەتی دا باسی کراوە هەر هەمووی وەسف کردنی قورئانی پیرۆزە ..؟!**

١-قال تعالى: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٩٧]واتە : [ قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ ] ئەمە وەڵامێکە بۆ جوولەکە کە ئەیانووت: ئێمە بۆیە ئیمان ناهێنین چونکە جبرل وەحی دێنێ و ئێمەیش ڕقمان لەوەو دوژمنمانە چونکە جەنگ و کوشتارو سزا دێنێت، بەڵام میکائیل دۆستمانە، چونکە ڕەحمەت و ڕووەك و باران دادەبەزێنێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: ئەی محمد صلى الله علیە وسلم پێیان بفەرموو هەر کەسێك دوژمنی جبریل بێت ئەوە خوای گەورە جبریلی دابەزاندۆتە سەر دڵی تۆ بە ئیزنی خوای گەورە دابەزیوە، کە ئەمە زیادە ڕێزێکە بۆ جبریل صلى الله علیە وسلم [ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ] وە ئەم قورئانەیشی کە بۆ تۆی هێناوە بە ڕاستدانەری کتێبەکانی پێشترە [ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ ] وە هیدایەت و مژدەیە بۆ باوەڕداران..؟!

**لەم ئایەتەدا پیرۆزە وسفکردنی قورئانی پیرۆز کە تاکە سەر چاوەی ڕێنموویی و هیدایەتە ، و وە هەول دەدات بەئیمانداران کە هیدایەت و ڕێنمووی و ، وە موژدە بەخشە بۆ ئیمانداران خیری دونیاو قیامەتی دەبەخشی بە خاوەنەکەی ئەوەی دەستی پێوە بگرێت ، هەر بۆیە لەم ئایەتەدا هیدایەت و موژدە هاتووە ، چونکە قورئانی پیرۆز دوو کردار لە خۆ دەگرێت :**

**یەکەم : بیانێکە کە تکلیف یان ئەرکێکی پێ سپێدراوە یان دیاری کراوە ، لە کردارەکانی دڵ یان (أعمال القلوب ) ، وە کردارەکانی ئەندامەکانی لاشە یان(أعمال الجوارح ) ئەمەش جۆرێکە یان شێوازێکە لە هیدایەت ..؟!**

**دووەم : وە لەنێوان ئەم کردەوە چاکانەدا ئەم پاداشتە بەدەست دەهێنێت ئەویش هیدایەت و موژدەیە بۆ دونیاو دوارۆژدا ..؟!**

٢-قال تعالى: ﴿قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾﴾ [النَّحۡل : ١٠٢]واتە: [ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِنْ رَبِّكَ بِالْحَقِّ ] ئەی محمد - صلى الله علیە وسلم - پێیان بڵێ: ئەم قورئانە پیرۆزە جبریل دایبەزاندووە لەلایەن خوای گەورەوەو حەق و ڕاست و دادپەروەرەو هیچ هەڵەیەکی تیا نیە [ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا ] بۆ ئەوەی باوەڕداران جێگیرو دامەزراو بکات لەسەر باوەڕەکەیان [ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ ] وە هیدایەت و موژدەیە بۆ موسڵمان..؟!

٣-قال تعالى: ﴿هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾﴾ [النَّمۡل : ٢]واتە: وە ئەم ئایەتانە یان ئەم قورئانە پیرۆزە هیدایەت و موژدەیە بۆ ئەو باوە ڕدارانەی کە: ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾﴾ [النَّمۡل : ٣]واتە: [ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ ] نوێژەکانیان ئەنجام ئەدەن بە ڕوکن و واجبات و خشوعەوە [ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ ] وە زەکاتی ماڵەکانیان ئەدەن [ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ (٣) ] وە ئەوان یەقینیان هەیە بە ڕۆژی دوایی..؟!

سێ یه‌م: (الهدایة بالموعظة ) واته :ڕێنموویی له ڕێگای حیکمه‌ت و دانایه‌وه

به‌ڵێ له دوو ئایه‌تی قورئانی پیرۆز دا هاتووه ، (الهدایة بالموعظة )

١–قال تعالى: ﴿هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ۝١٣٨﴾ [آل عِمرَان : ١٣٨]واته : ئه‌م قورئانه ڕوون کردنه‌وه‌ی هه‌موو شتێکی تێدایه بۆ خه‌ڵکی، وه هیدایه‌ته‌و په‌ندو ئامۆژگاریشه به‌تایبه‌تی بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی که ته‌قوای خوای گه‌وره ئه‌که‌ن ..؟!

٢–قال تعالى: ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ۝٤٦﴾ [المَائـِدَة : ٤٦]واته: [وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ] وه له‌دوای پێغه‌مبه‌رانی تر عیسای کوڕی مه‌ریه‌ممان- صلى الله عليه وسلم - نارد [ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ ] که ئینجیلیش به ڕاستدانه‌ری ئه‌و ته‌وراته بووه که له پێش خۆی هاتبوو [ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ ] وه ئینجیلیشمان به عیسى- صلى الله عليه وسلم - به‌خشیووه که ئه‌میش هیدایه‌ت و نوورو ڕووناکی تیادا بووه بۆ کاتی خۆی وه موژده‌دانی تیادا بووه به هاتنی پێغه‌مبه‌ر- صلى الله عليه وسلم - وه ئه‌مری تیا بووه که شوێن ئه‌و پێغه‌مبه‌ره- صلى الله عليه وسلم - بکه‌ون هه‌ر کاتێك ده‌رکه‌وت [ وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ ] وه ئینجیل به‌ڕاستدانه‌ری ته‌ورات بووه که له پێش ئینجیل هاتووه [ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ] وه هیدایه‌ت و ئامۆژگاری بووه بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی که ته‌قوای خوای گه‌وره ئه‌که‌ن..؟!

چواره‌م : (الهدایة بالنور ) واته :ڕێنموویی و ڕۆشنایی یان ڕووناکی

له چه‌ند ئایه‌تێکی قورئانی پیرۆز هاتووه : بۆ وسف کردنی :(ته‌ورات ) و (ئینجیل ) و (قورئان )

١–وسف کردنی (ته‌ورات ) ،قال تعالى: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟﴾ [المَائـِدَة : ٤٤]واته: [ إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ] ئێمه ته‌وراتمان دابه‌زاندووه که هیدایه‌ت و نوورو ڕووناکی تیا بووه پێش ئه‌وه‌ی که قورئان دابه‌زێ، وه موژده‌ی هاتنی تیا بووه به پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - وه پێویسته شوێنی بکه‌ون [ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا ] کۆمه‌ڵێك پێغه‌مبه‌ر له دوای موسا هاتن حوکمیان به ته‌ورات ئه‌کردو له‌سه‌ر ئه‌و شه‌ریعه‌ته ئه‌ڕۆیشتن ئه‌و پێغه‌مبه‌رانه‌ی که موسڵمان بوونه‌و خۆیان ته‌سلیمی خوای گه‌وره کردووه که ئه‌میش لووتشکاندنی جووله‌که‌ی تیایه که پێغه‌مبه‌رانی ئه‌وانیش له‌سه‌ر دینی ئیسلام بوونه جووله‌که و گاور نه‌بوونه به‌ڵکو هه‌موویان موسڵمان بوونه..؟!

٢–وسف کردنی (ئینجیل ) ، قال تعالى: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ﴾ [المَائـِدَة : ٤٦]واته: وه ئینجیلیشمان به عیسى- صلى الله عليه وسلم - به‌خشیووه که ئه‌میش هیدایه‌ت و نوورو ڕووناکی تیادا بووه بۆ کاتی خۆی وه موژده‌دانی تیادا بووه به هاتنی پێغه‌مبه‌ر- صلى الله عليه وسلم - وه ئه‌مری تیا بووه که شوێن ئه‌و پێغه‌مبه‌ره- صلى الله عليه وسلم - بکه‌ون هه‌ر کاتێك ده‌رکه‌وت..؟!

٣–وسف کردنی (قورئان ) قال تعالى: ﴿وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ [الشُّورَى : ٥٢]واته: به‌ڵام ئه‌و قورئانه پیرۆزه‌مان کردووه به نوورو ڕووناکیه‌ك که هیدایه‌تی هه‌ر که‌سێکی پێ ئه‌ده‌ین له به‌نده‌کانی خۆمان که ویستمان لێ بێت و شایه‌نی هیدایه‌ت بێ..؟!

**پێنچەم : (الهدیة بالشفاء) واتە: ڕێنموویی و چاك بوونەوە لە نەخۆشی**

**بەلێ هیدایەت یان ڕێنمایی بە شیفا و چاك بوونەوە بە یەكەوە هاتووە لە قورئانی پیرۆز دا**

قال تعالى: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدًى وَشِفَآءٌ﴾ [فُصِّلَت : ٤٤]واتە : ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - بلێ: ئەم قورئانە هیدایەت و شیفایە بۆ ئەو كەسانەی كە باوەڕدارن..؟!

**شەشەم : (الهدیة بالبركة ) واتە: ڕێنمایی پیرۆز و خێرو نیعمەت**

**بەلێ ئەویش دەربارەی شاری مككە بە پیرۆز و خێر و نیعمەت وهیدایەت دان وسف دەكات لەم ئایەتەدا**

قال تعالى: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ۝٩٦﴾ [آل عِمْرَان : ٩٦]واتە: { یەكەم ماڵ خوداپەرستی تێدا كرابێت مەككە بووە} [ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ ] بەدڵنیایی یەكەم ماڵێك كە بۆ خوداپەرستی خەڵكی دروست كرابێ لەسەر ڕووی زەویدا (بەككە) بووە واتە: مەككە [ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ ] كە شوێنێكی پڕ خێرو بەرەكەت بووە وە هیدایەتیشە بۆ هەموو جیهان ڕووی تێ ئەكەن بۆ تەوحیدی خوای گەورە، باشترین و چاكترین و خۆشەویسترین زەویە لای خوای گەورە..؟!

## ئاسته‌كانی (الهدیه ) یان ڕێنموویی

**هەروە ئاستەكانی هیدایەت كە (ابن قیم الجوزی) – رەحمەتی خوا لێ بێت – بەگشتی كردوویەتی بە (١٠) ئاست ئێمە بەكورتی لە پەرتووكە كەی (المدارج السالكین ) باسی ئاستە كانی هیدایەت یان رێنموویی دەكەین كەم ئەمانەی خوارەوەن :**

**یەكەم : ئاستی قەسە كردنی (خوای گەورە ) لە گەل بەندەكەی دا**

**بەلێ بەلكو راستە و خۆ (خوای گەروە ) قەسە و ئاخافتنی لە گەل بەندەكەی خۆی دا دەكات ، ئەم جۆرە ئاستەی هیدایەت یان رێنموویی بەرزترین ئاستی هیدایەتە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت :** قال تعالى:

﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤﴾ [النِّسَاء : ١٦٣ - ١٦٤]واتە: [ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - ئێمە وەحیمان بۆ تۆ ناردووە هەروەكو چۆن وەحیمان بۆ نوح و بۆ پێغەمبەرەكانی دوای نوحیش ناردووە، كە ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوح یەكەم پێغەمبەر بوو بۆیە باسی دەكات و پێغەمبەرانی تر لەدوای ئەو باس دەكات وە لە لە فەرموودەی شەفاعەتدا هاتووە كە نوح یەكەم پێغەمبەر بووە خوای گەورە ناردوویەتی [ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ ] وە وەحیمان بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و هۆزەكانی تر لە نەوەی یەعقوب پێغەمبەر لە پێغەمبەرانیان وە بۆ عیسى و ئەیوب و یونس و هارون و سولەیمان ناردووە [ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ] وە زەبوریشمان بە داود پێغەمبەر بەخشیوە- صلى الله عليه وسلم - كە ئیمامی (قورتوبی) دەفەرمووێ: (سەدو پەنجا) سوورەت بووە حوكم و حەڵاڵ و حەڕامی تیا نەبووە بەڵكو هەمووی پەندو ئامۆژگاری بووە (صەڵات و سەلامی خوای گەورە لەسەر هەموویان بێت)...؟! [ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ ] وە چەندەها پێغەمبەری تر كە لە پێشتردا یان لە پێش ئەم سوورەتەدا چیرۆك و بەسەرهاتیمان بۆ تۆ گێڕاوەتەوە ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - لە قورئانی پیرۆزدا [ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ] وە چەندەها پێغەمبەرانی تریش هەیە كە چیرۆك و بەسەرهاتیمان بۆ تۆ نەگێڕاوەتەوە وەكو لە فەرموودەدا هاتووە كە پێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم - ئەفەرمووێ: ژمارەی پێغەمبەران سەدو بیست و چوار هەزار (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەر بووە [ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا] وە خوای گەورە قسەی لەگەڵ موسادا كردووە بە دڵنیایی و بە حەقیقەت كە ئەمەیش رێزێكە بۆ موسى هەر بۆیە پێی وتراوە: (كەلیم الله)، (ئەم ئایەتەیش بەڵگەیە لەسەر قسە كردنی خوای گەورە كە هەر كاتێك ویستی لێبێت قسە دەكات، بەڵام لە قسە كردنی دروستكراوەكانی ناچێت و چۆنێتیەكەیشی خوای گەورە نەبێت كەس نایزانێت)..؟!

**هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٤٣ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٤ ﴾ [الأعراف : ١٤٣ - ١٤٤]واته: موسا پێغەمبەر – صلى الله عليه وسلم - داوای بینینی خوای گەورە دەکات لە دونیادا!} [ وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا ] وە کاتێك کە موسى - صلى الله عليه وسلم - هات بۆ مەوعیدی دیاریکراوی لەگەڵ خوای گەورە بۆ ئەوەی خوای گەورە قسەی لەگەڵ بکات [ وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ ] وە پەروەردگار قسەی لەگەڵ موسادا کرد بەبێ واسیتە موسا - صلى الله عليه وسلم - قسەی خوای گەورەی بیست، (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە قسە دەکات و سیفەتی قسە کردنی هەیە) [ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ ] کاتێك کە موسى - صلى الله عليه وسلم - گوێی لە قسەی خوای گەورە بوو ئەمجا تامەزرۆی بینینی خوای گەورە بوو، بۆیە فەرمووی: ئەی پەروەردگار ڕێگام بدە با بتبینم [ قَالَ لَنْ تَرَانِي ] خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسى - صلى الله عليه وسلم - لە دونیادا تۆ ناتوانی من ببینی، (بەڵام فەرموودەکان موتەواتیرن لەسەر ئەوەی کە باوەڕداران لە قیامەت و بەهەشتدا خوای گەورە ئەبینن) [ وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي ] خوای گەورە فەرمووی: بەڵام تەماشای ئەو شاخە بکە ئەگەر لە جێی خۆیدا مایەوە ئەوە تۆیش ئەتوانی من ببینی [ فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ ] کاتێك کە پەروەردگار خۆی دەرخست بۆ شاخەکە [ جَعَلَهُ دَكًّا ] شاخەکە وردو خاش بوو، بوو بە خۆڵ [ وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا ] وە موساش - صلى الله عليه وسلم - لەهۆش خۆی چوو [ فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ ] وە کاتێك هاتەوە هۆش خۆی وتی: ئەی پەروەردگار پاك و مونەززەهی بۆ تۆ لەوەی کە داوا بکەم لە دونیادا تۆ ببینم [ تُبْتُ إِلَيْكَ ] من تەوبە ئەکەم و بۆ لای تۆ ئەگەڕێمەوەو جارێکی تر داوای بینینی تۆ ناکەم لە دونیادا [ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ (١٤٣) ] وە من یەکەم باوەڕدارم لە بەنی ئیسرائیلدا، یان من یەکەم باوەڕدارم لەسەر ئەوەی کە کەس تا ڕۆژی قیامەت لە دونیادا ناتبینێت..؟! [قَالَ يَا مُوسَى إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالَاتِي وَبِكَلَامِي ] خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسى - صلى الله عليه وسلم - من تۆم هەڵبژاردووە بەسەر خەڵکی سەردەمی خۆتدا بەوەی کە پەیامی خۆم بۆت ناردووە، وە ڕاستەوخۆ قسەم لەگەڵدا کردووی بەبێ واسیتە [ فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ (١٤٤) ] ئەوەی کە پێم بەخشیویت بەجوانی وەری بگرە، وە لەو کەسانە بە کە شوکرانەبژێری خوای گەورە ئەکەن لەسەر ئەم نیعمەتانە..؟!

قال تعالى: ﴿ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ٥١ ﴾ [الشورى : ٥١]واته : {شێوازەکانی وەحی} [ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ ] وە بۆ هیچ مرۆڤێك نیە کە خوای گەورە قسەی لەگەڵدا بکات تەنها بە وەحی نەبێت، (ئەمیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە قسە دەکات و سیفەتی قسە کردنی هەیە)، یاخود لە پشت پەردەوە نەبێت، یاخود فریشتەیەك ئەنێرێ و بەو فریشتە یەدا وەحی بۆ ئەنێرێ بە ئیزنی خۆی بۆ هەر شتێك کە ویستی لێ بێت کە جبریل تایبەتە بە هێنانی وەحی بۆ پێغەمبەران [ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ (٥١) ] بەڕاستی خوای گەورە زۆر بەرزە لە زات و ناوەکان و سیفاتەکان و کردەوەکانیدا، وە زۆر داناو کاربەجێیە..؟!

## دووەم : ئاستی نیگا یان وەحی تایبەت بە پێغەمبەران بە گشتی

**هەروەك لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٦٣–١٦٤)وە لە سورەتی (الشورى ) ئایەتی (٥١) دا هاتووە..هتد**

## سێ یەم : ئاستی ناردنی پایەبەرێکی ملائیکە یان فریشتە بۆ پێغەمبەرێکی مرۆڤ

ئه‌م وه‌حی و نیگایه له (خوای گه‌وره )وه فه‌رمانی پێكراوه پێی ده‌گه‌یه‌نێت ئه‌م سێ ئاستی هیدایه‌ته تایبه‌تن به پێغه‌مبه‌ران و كه‌سی تر جگه له پێغه‌مبه‌ران ئه‌م وه‌حی هیدایه‌ته وه‌رناگرن ، ئه‌و په‌یام هێنه ملائیكه یان فریشته‌یه به شێوه‌ی خۆی هه‌ندێك جار په‌یام و هیدایه‌ت بۆ پێغه‌مبه‌ران ده‌هێنێ هه‌ندێك جاریش له سه‌ر شێوه‌ی مرۆڤ یان پیاوێك په‌یام وه‌حی هیدایه‌ت ده‌هێنێ ، هه‌روه‌ك ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كه باسی جبریل – علیه السلام – ده‌كات ، كه ده‌رباره‌ی ئیمان و ئیسلام پرسیار له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌كات ..؟!

له (عمر بن الخطاب ) – خوا لێ رازی بێت – ده گێڕێته‌وه ده‌لێت : ((بينَما نحنُ ذاتَ يومٍ عندَ نبيِّ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ إذ طلعَ علَينا رجلٌ شَديدُ بياضِ الثِّيابِ، شديدُ سوادِ الشَّعرِ لا يُرى قالَ يزيدُ : لا نَرى عليهِ أثرَ السَّفرِ، ولا يعرفُهُ منَّا أحدٌ، حتَّى جلسَ إلى نبيِّ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ، فأسندَ رُكْبتيهِ إلى رُكْبتيهِ، ووضعَ كفَّيهِ على فَخِذَيهِ، ثمَّ قالَ : يا مُحمَّدُ أخبرني عنِ الإسلامِ، ما الإسلامُ ؟ فقالَ الإسلامُ أن تشهدَ أن لا إلَهَ إلاَّ اللَّهُ، وأنَّ محمَّدًا رسولُ اللَّهِ، وتقيمَ الصَّلاةَ، وتُؤْتيَ الزَّكاةَ، وتَصومَ رمضانَ، وتحجَّ البيتَ إنِ استطعتَ إليهِ سبيلاً قالَ : صدقتَ. قالَ : فعجِبنا لَهُ، يسألُهُ ويصدِّقُهُ. قالَ : ثمَّ قالَ : أخبرني عنِ الإيمانِ. قالَ : الإيمانُ أن تُؤْمِنَ باللَّهِ وملائِكَتِهِ وَكُتبِهِ ورسلِهِ واليومِ الآخرِ، والقدرِ كلِّهِ خيرِهِ وشرِّهِ قالَ : صدَقتَ. قالَ : فأخبرني عنِ الإحسانِ، ما الإحسانُ ؟ قالَ يَزيدُ : أن تعبدَ اللَّهَ كأنَّكَ تراهُ، فإن لم تَكُن تَراهُ، فإنَّهُ يراكَ قالَ : فأخبِرني عنِ السَّاعةِ، قالَ : ما المَسؤولُ عنها بأعلمَ بِها منَ السَّائلِ قالَ : فأخبِرني عن أماراتِها. قالَ : أن تلدَ الأمةُ ربَّتَها ، وأن تَرى الحفاةَ العراةَ رعاءَ الشَّاءِ يتطاولونَ في البناء قالَ : ثمَّ انطلقَ فلبِثَ مليًّا - قالَ يزيدُ : ثلاثًا - فقالَ لي رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ : يا عمرُ أتدري منِ السَّائلُ ؟ قالَ : قلتُ : اللَّهُ ورسولُهُ أعلمُ. قالَ : فإنَّهُ جبريلُ، أتاكم يعلِّمُكُم دينَكُم )) .[١] واته: جارێ كیان له خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دانیشتبووین ، كاتێ زانیمان پیاوێك ده‌ركه‌وت بۆشاكی سپی بلورین بوو ، موو ره‌شی تۆخ بوو ، ماندوێتی رێگای پێوه ئه بینرا ، هیچ كه‌س له ئێمه نه‌ده‌ناسی ، هاته پێشه‌وه‌و هه‌تا له به‌رانبه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دانیشت و هه‌ردوو ئه‌ژنۆی نا به هه‌ر دوو ئه‌ژنۆیه‌وه‌و ، هه‌ردوو ده‌ستی نایه سه‌ر هه‌ردوو زانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ و ، وه فه‌رمووی : ئه‌ی محمد ئیسلام چیه ..؟! پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : ئیسلام ئه‌وه‌یه كه شایه‌تی بده‌یت هیچ په‌رستراوێك نیه به حه‌ق جگه له (الله) محمدیش پێغه‌مبه‌ری خوایه ، نوێژ بكه‌یت و ، زه‌كات بده‌یت و ، رۆژووی مانگی ره‌مه‌زان بگریت و ، ئه‌گه‌ر توانای مادی و مه‌عنه‌وه‌یت هه‌بوو حه‌جی مالی خوا بكه‌یت ..!! پاشان فه‌رمووی : راست ده‌كه‌یت ..!! ئێمه لامان سه‌یر بوو كه پرسیاری لێ ده‌كردو ده‌ی فه‌رموو : راست ده‌كه‌یت ..!! پاشان فه‌رمووی : ئه‌ی ئیمان چیه ..؟!پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : ئیمان ئه‌وه‌یه كه باوه‌ر بهێنی به (خوای گه‌وره ) و به فریشته‌كانی و كتێبه‌كانی و به پێغه‌مبه‌ره‌كانی و به رۆژی قیامه‌ت و به قه‌زاو قه‌ده‌ر و به خێرو شه‌ریه‌وه ..!! فه‌رمووی : راست ده‌كه‌یت ..!!پاشان فه‌رمووی : ئه‌ی (الاحسان) یان چاكه

[١]- السنن الترمذي برقم (٢٦١٠).

چیە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوەیە بە شێوەیە (خوای گەورە ) بپەرستی وەك ئەوەی لە بەر چاوتە و دەیبینی ، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەو تۆ دەبینێت .!! فەرمووی : راست دەکەیت ..!! پاشان فەرمووی : جا چ کاتێك ئەم جیهانە کۆتایی دێت و رۆژی قیامەت بەر پا دەبێ ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : پرسیار لێکراو زاناتر نیە لە پرسیار کەر ..؟! فەرمووی : راست دەکەیت ..!! پاشان فەرمووی : ئەی نیشانەکانی رۆژی قیامەت چین ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوەیە کە مندال بە چاوی نۆکەرو کارەکەر خزمەتکار تەماشای دایك و باکی خۆیان بکەن ، یان ئافرەتی کۆیلە وەك گەورەکەی خۆی لێ بێت ، پێ پەتی و هیچ لە بارانەبوو رەش و رووت رەجال شوان و گاوان بیسکە ببن بە خاوەن مولك و کۆشك و تەلاری بەرز بینا بکەن فیزو لاف پێوە بکەن ..؟! ئینجا پێشەوا (عمر ) ووتی : لە پاشاندا پیاوەکە دەرچوو ، منیش ماوەیەك مات بێ دەنگ بووم ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پێ فەرمووم : ئەی (عمر ) دەزانی ئەو پرسیارکەرە کێ بوو ..؟! منیش ووتم : نەخێر . خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەزانن ، فەرمووی : ئەوە (جبريل )بوو – عليه السلام – هاتە ناوتان کاروباری ئایینە کەتان فێر بکات ..؟!

چوارەم : ئاستی (محدث) واتە :رازگر

بەلێ ئەم ئاستە لە خوار ئاستی وەحی نیگایەوە ، کە کەسێکی رازگر کە بۆ چوونێك دەبینی گومانێك دروست دەکات کەواتە وەك خۆی بە چاکە بینیوەیەتی بیری لێ کردۆتەوە ئەگەر لە ئوومەتی ئیسلام ئیلهام بەخشێك هەبێت ئەوا (عمري کوری خطاب )– خوا لێ رازی بێت– بەلێ هیدایەت دان لە ئاستی رازگر لە خواری وەحی یان نیگایەوە یە ، یان لە خوار پلەی (صديقين )ەوەیە وە چۆن (عمري کوری خطاب ) – خوا لێ رازی بێت– روودواە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت : (( إنه كان في الأمم قبلكم محدثون ، فإن يكن في هذه الأمة فعمر بن الخطاب )) [1]

---

[1]-ابن تيمية مجموع الفتاوى (٤٦/١٧).

## پێنچه‌م: ئاستی (فهم ) یان ئاستی تێگه‌یاندن

قال تعالى: ﴿وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾﴾ [الأنبياء : ٧٨ - ٧٩]واته : {سوله‌یمان پێغه‌مبه‌ر - صلی الله علیه وسلم - تێگه‌یشتووتر بوو} [وَدَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ ] وه‌ داودو سوله‌یمان پێغه‌مبه‌ر (صه‌ڵات و سه‌لامی خوای گه‌وره‌یان لێ بێت) كاتێك بڕیاریاندا سه‌بارەت به‌ كشتوكاڵ و كێڵگه‌یه‌ك [ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ ] كاتێك كه‌ به‌شه‌و مه‌ڕی كه‌سانێك چووه‌ ناو كێڵگه‌و زه‌رعاتی كه‌سانێكی تره‌وه‌ خوارديان و له‌ناويان برد [ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ ] وه‌ ئێمه‌ش ئاگاداری بڕیاردانی ئه‌وان بووین..؟! **به‌ڵێ باسی ئه‌و دوو پێغه‌مبه‌ر به‌رێزه‌ی كرد ، وه‌سفی هه‌ردووكیان به‌ زانست و حیكمه‌ت ، پێغه‌مبه‌ر سلیمان – علیه السلام – له‌م رووداوه‌ دیاریكراوه‌ به‌ تێگه‌یشتن (فهم) تایبه‌ت كردووه‌ ، هه‌روه‌ها (علی كوري ابي طالب )– خوا لێ رازی بێت – پرسیاری لێكرا : ئایا پێغه‌مبه‌ری ئێوه‌ی به‌ شتێك جیا له‌ خه‌لكی تایبه‌ت كردووه‌ ..؟! فه‌رمووی: نه‌خێر . سوێند به‌و كه‌سه‌ی تۆو ده‌روێنیٚ و روح به‌ به‌ردا ده‌كات ، جگه‌ له‌ تێگه‌یشتنێك له‌ قورئان خودا به‌ به‌نده‌یه‌كی بدات و ئه‌وه‌ی لاپه‌ره‌دایه‌ ،ئه‌وه‌ی له‌ ناویدا بوو بریتی بوو له‌ ماف خوێنی كه‌سی كوژراو و كردنه‌وه‌ی كۆت و به‌ندی دیل و نه‌كوشتنی موسلمان به‌ بێ باوه‌ر ..؟!**

**هه‌روه‌ها له‌ نووسراوه‌كه‌ی (عمري كوری خطاب ) – خوا لێ رازی بێت –بۆ (ابو موسى الاشعرى ) – خوا لێ رازی بێت – (( والفهم الفهم فيما أدلى إليك )) واته :تێگه‌یشتن تێگه‌یشتن له‌و شتانه‌ی ده‌خرێته‌ به‌ده‌مت و رووت تێده‌كات ..؟!**

## شه‌شه‌م: ئاستی به‌یانی گشتی

**بریتیه‌ له‌ رۆشن كردنه‌وه‌ و جیاكردنه‌وه‌ی حه‌ق له‌ باتل به‌ به‌ڵگه‌و شایه‌تی و راو بۆ چوونی گه‌وره‌ پیاوانی ، تا وای لێ دێت به‌دل ببینرێت ، وه‌ك بینینی چاو بۆ شته‌ بینراوه‌كان ..؟! چونكه‌ ئه‌م ئاسته‌ بریتیه‌ له‌ به‌ڵگه‌ی خودا به‌ سه‌ر دروستكراوه‌كانییه‌وه‌ ، خودا هیچ كه‌س سزا نادات تا ئه‌و به‌ڵگانه‌ یان پێ نه‌گات ..؟!**

قال تعالى: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾ [التَّوۡبَة : ١١٥]واته: [ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّى يُبَيِّنَ لَهُمْ مَا يَتَّقُونَ ] وه‌ خوای گه‌وره‌ هیچ كه‌سانێك گومڕا ناكات له‌ دوای ئه‌وه‌ی كه‌ هیدایه‌تی دان و رێی ڕاستی نیشان دان تا ئه‌و شته‌یان بۆ ڕوون نه‌كاته‌وه‌ كه‌ خۆیانی پێ بپارێزن بۆ ئه‌وه‌ی نه‌كه‌ونه‌ ناو گومڕاییه‌وه‌ [ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ] به‌ڕاستی خوای گه‌وره‌ زۆر زانایه‌ به‌ هه‌موو شتێك..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٤﴾ [إبراهيم : ٤]واته: { پێغەمبەران بە زمانی قەومەکانیان نێردراون} [ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ] وە ئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە ئیلا بە زمانی قەومەکەی خۆی نەبێ بۆ ئەوەی لێی تێ بگەن تا دینەکەی خوای گەورەیان بۆ ڕوون بکەنەوە [ فَيُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ] خوای گەورە بە ویستی خۆی هەر کەسێك گومڕا ئەکات کە شایەنی هیدایەت نەبێت، وە بە ویستی خۆی هیدایەتی هەر کەسێك ئەدات کە شایەنی هیدایەت بێت و ڕێگای هیدایەت بگرێت [ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ] وە خوای گەورە زۆر بە عیززەت و کاربەجێیە..؟!

حەوتەم : ئاستی ڕۆشن کردنەوەو ڕوونکردنەوەی تایبەت

**بریتیە لە بەیانی پێویست بۆ هیدایەتی تایبەت ، ئەو بەیانەیە کە چاودێری کردن و کۆمەك کردن و هەڵبژاردن و لە ئامێز دەگرێت ، هەروەها بنبر کردنی هۆکارەکانی ڕیسوایی و سەر شۆی و ئامرازەکانی دڵی مرۆڤ ، ئەو دڵە هەرگیز هیدایەت و ڕێنموویی لێ دواناکەوێت ..؟!**

قال تعالى: ﴿إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ۝٣٧﴾ [النَّحل : ٣٧]واته : [ إِنْ تَحْرِصْ عَلَى هُدَاهُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئەگەر تۆ سووریش بیت لەسەر هیدایەت دانیان و چەندێك هەوڵ بدەیت و کۆشش بکەیت [ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ يُضِلُّ ] ئەوا بە دڵنیایی خوای گەورە هیدایەتی کەسانێك نادات کە گومڕای کردبێتن و شایەنی هیدایەت نەبن [ وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ ] وە کەسیش نیە سەریان بخات و لە سزای خوای گەورە ڕزگاریان بکات..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ۝٥٦﴾ [القَصَص : ٥٦]واته: {هیدایەتدان بەدەست خوایە} [ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ] پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - (ئەبو طاڵیب)ی مامەی لەسەرەمەرگدا بوو پێی فەرموو: ئەی مامە بڵێ: لا إله إلا الله شایەتیت بۆ دەدەم لە ڕۆژی قیامەت، زۆر هەوڵیدا کە موسڵمان بێت بەڵام (ئەبو جەهل و عبداللە¬ی کوڕی ئەبی ئومەییە) لەوێ بوون و وتیان: ئایا واز لە دینی (عبدالمطلب) دێنی!، پێغەمبەری خوایش - صلى الله عليه وسلم - دەیفەرموو: ئەی مامە، بڵێ: لا إله إلا الله شایەتیت بۆ دەدەم لە ڕۆژی قیامەت، ئەوانیش دەیانووت نەکەیت موسڵمان نەبیت، ئەویش موسڵمان نەبوو بە کافری مرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - بە دڵنیایی تۆ ناتوانی هیدایەتی کەسێك بدەی کە خۆشت ئەوێ خۆشەویستی سروشتی نەك شەرعی، چونکە زۆر بەرگری لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەکرد، یان پێت خۆشە ئیمان بێنێ [ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ] بەڵکو خوای گەورە خۆی هیدایەتی هەر کەسێك ئەدات کە ویستی لێ بێت و ئەو کەسە شایەنی هیدایەت بێت [ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ (٥٦) ] وە خوای گەورە زاناترە بەوەی کە کێ شایەنی ئەوەیە کە هیدایەت وەربگرێ..؟!

**هه‌شته‌م : ئاستی پێ بیستن (الاسماع )**

**ئه‌م پێ بیستنه تایبه‌تره له پێ بیستنی به لگه و پێراگه‌یاندن ، ئه‌و به‌لگه‌یه بۆ یان به‌ده‌ست هاتووه و به هۆیه‌وه به‌لگه‌و حجه یان به سه‌ردا خوێنراوه‌ته‌وه ، به‌لام ئه‌وه هیدایه‌تێکه به گوێ ده‌بیسترێت و ئه‌مه‌ش هیدایه‌تیکه به دل ده‌بیسترێت ، قسه و ووشه و مانای هه‌یه ، یان بریتیه له به‌شی دل و بیستنی ووشه بۆ جێگیر کردوون به شی گوێیه ..؟! هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رموویێت :** قال تعالى: ﴿مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ۝٢ لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ هَلۡ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡۖ أَفَتَأۡتُونَ ٱلسِّحۡرَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ ۝٣﴾ [الأنبياء : ٢ - ٣]واته : هیچ زیکرو یادو وه‌حی و قورئانێکیان بۆ نایات له لایه‌ن په‌روه‌ردگاریانه‌وه که تازه دابه‌زیوه ئیلا که گوێی لێ ئه‌گرن ئه‌وان یاری ئه‌که‌ن وه گرنگی و بایه‌خی پێ نادەن، (ئیبنو عه‌بباس) به کافرانی قوره‌یش ده‌فه‌رمێت: (ئه‌وه چیتانه قورئانی پیرۆز تازه‌ترین کتابه ئێوه شوێنی ناکه‌ون که‌چی ئه‌ڕۆن پرسیار له جوله‌که ده‌که‌ن که ته‌وراته‌که‌یان ده‌ستکاری کراوه‌و زیادو که‌م کراوه..؟! [ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ ] دڵیشیان بێئاگایه‌و ئاوڕی لێ نادەنه‌وه [ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا هَلْ هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ ] وه سته‌مکاران قسه‌و چپه چپی نهێنی خۆیان شارده‌وه‌و به شاراوه‌یی وتیان: ئه‌م محمده - صلى الله عليه وسلم - هیچ شتێك نیه ته‌نها مرۆڤێکه وه‌کو ئێوه ئه‌خوات و ئه‌خواته‌وه‌و ژن دێنێت و ئه‌مرێت چۆن ئه‌بێ ئه‌مه پێغه‌مبه‌ر بێت؟! [ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنْتُمْ تُبْصِرُونَ (٣) ] وه وتیان ئه‌مه‌ی که محمد - صلى الله عليه وسلم - هێناویه‌تی سیحره، ئێوه چۆن شوێنی سیحر ئه‌که‌ون له کاتێکدا که خۆتان ئه‌یبینن..؟!

قال تعالى: ﴿وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ۝٢٣﴾ [الأنفال : ٢٣]واته : [ وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَأَسْمَعَهُمْ ] ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره بیزانیایه خێر له‌مانه‌دا هه‌یه ئه‌وه وای لێ ئه‌کردن که بیبیستن بیستنێك که سوودیان پێ بگه‌یه‌نێ [ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوْا ] وه ئه‌گه‌ر وایشی لێ بکردنایه که‌حه‌ق ببیستن هه‌ر پشتیان هه‌ڵده‌کرده‌وه‌و سوودیان لێ نه‌ئه‌بینی [ وَهُمْ مُعْرِضُونَ ] وه پشتیان هه‌ڵئه‌کردو ئه‌ڕۆیشتن خوای گه‌وره ئه‌یزانی که ئه‌وانه ئیمان ناهێنن و زانیاری هه‌بوو..؟!

قال تعالى: ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُواْ مِنۡ عِندِكَ قَالُواْ لِلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ ۝١٦﴾ [مُحَمَّد : ١٦]واته: [ وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ] وه هه‌یانه له مونافیقان گوێ له تۆ ئه‌گرن ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - [ حَتَّى إِذَا خَرَجُوا مِنْ عِنْدِكَ ] تا له مه‌جلیسی تۆ ده‌رئه‌چن [ قَالُوا لِلَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مَاذَا قَالَ آنِفًا ] به زانایانی صه‌حابه ئه‌ڵێن: ئه‌وه ئێستا پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - باسی چی ئه‌کرد؟ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی تێناگه‌ن، یاخود وه‌کو گاڵته‌پێکردن وا ئه‌ڵێن [ أُولَئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ ] ئا ئه‌مانه خوای گه‌وره مۆری داوه به‌سه‌ر دڵیاندا له هیچ شتێك تێنه‌گه‌ن [ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ ] وه شوێنی هه‌واو ئاره‌زووی خۆیان که‌وتوون..؟!



**نۆیەم: ئاستی ئیلهام**

**ئەم ئاستە بریتیە لە پلەی ئیلهام بەخشین ، کەواتە : ئیلهام گشتگیرترە لە (محدث ) یان رازگر ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت :** قال تعالى: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۞ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۞ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۞﴾ [الشَّمس : ٧ - ٩]واتە : [ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) ] وە سوێند بێت بە نەفس کە چۆن خوای گەورە مرۆڤی رێکخستووە، یاخود سوێند بێت بە نەفس کە خوای گەورە سەرەتا مرۆڤی دروست کردووە لەسەر نەفسێکی پاك و لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلام دروستی کردووە..؟! [ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) ] وە خوای گەورە رێنمایی مرۆڤی کردووە بۆ هەردوو رێگاکە: رێگای خراپ و رێگای چاك، کامە خراپەکاریەو کامە تەقوای خوای گەورەیە رێگای خێرو شەڕی بە مرۆڤ ناساندووەو بۆی روون کردۆتەوە، وە فەرمانی پێ کردووە کە رێگای چاك بگرێتەبەرو خۆی لە رێگای خراپ دوور بگرێ..؟! {پاك کردنەوەی دڵ و دەرون} [ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا (٩) ] بەدڵنیایی هەر کەسێك تەزکیەی نەفسی خۆی بکات و دەروونی خۆی پاك بکاتەوە لە هەموو تاوان و سەرپێچی و خراپەکاریەك ئەو کەسانە بەدڵنیایی سەربەرزو سەرفراز بوونە، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - خۆی دوعای ئەکردو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا) واتە: خوایە تەقوا بە نەفسم ببەخشەو نەفسم پاك بکەوە هەر تۆی کە بە باشترین شێواز پاکی ئەکەیتەوە، وە هەر تۆی کە سەرپەرشتی ئەکەیت..؟!

**لە (الحصين کوری منذر الخزاعي ) — خوا لیّ رازی بێت — فەرمووی :** (( أللهم ألهمني رشدي ، وقني شر نفس )) **واتە: بلێ : خودایە ئیلهامی روشد و کەمالم بکە و لە شەری نەفسم بم پارێزە ..؟! بەلێ ئیلهام بۆ هەموو ئیمانداران یان باوەڕدارانە بە پێ باوەڕە کەیان ئیلهام و روشدی کردووە بە پێ باوەڕە کەی بۆی بەدەست هاتووە ، بەلام رازگر یان راز وە (محدث ) پێغەمبەر ی خوا ﷺ تەنها دەفەرمووێت :** (( إنه كان فى الأمم قبلكم محدثون ، فإن يكن فى هذه الأمة فعمر بن الخطاب ))[١] **کەواتە : راز گر یان (محدث ) ،وە ئیلهام هیدایەتێکی تایبەتە ، برتیە لە وەحی کە سانێك کە پێغەمبەران نین ..؟! یان بۆ داوا لێکراوان ، کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾ [القَصَص : ٧]واتە : وەحی لێرە بەمانای ئیلهام دێت نەك سروش، چونکە پێغەمبەران هەموویان پیاو بوونەو هیچ ئافرەتێك پێغەمبەر نەبووە، وە هەموویان مرۆڤ بوونەو کەسیان جنی نەبوون، وە ئیلهامامان بۆ دایکی موسا ناردو خستمانە دڵیەوە کە دووگیان بوو بە موسا - صلى الله عليه وسلم - کاتێك کە لە دایك دەبێت شیری پێ بدە، (کە دووگیان بوو بە موسا - صلى الله عليه وسلم - پێوەی دیار نەبوو وە مامانەکان هەستیان پێ نەکرد) قال تعالى: ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ۞﴾ [المَائـِدَة : ١١١]واتە: وەحی لێرە واتە: ئیلهام دێت، وە ئیلهامم خستە دڵی حەوارییەکانەوە شوێنکەوتوانی عیسى- صلى الله عليه وسلم - کە ئیمان بە من و بە پێغەمبەرەکەی من بێنن کە عیسایە- صلى الله عليه وسلم -، یاخود لەسەر زمانی پێغەمبەر عیسى وە- صلى الله عليه وسلم - پێم وتن [ قَالُوا آمَنَّا ] وتیان: ئیمانمان هێناو وەڵامی خوای گەورەو دەعوەو بانگەوازی عیسى پێغەمبەریان دایەوە- صلى الله عليه وسلم - [ وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ] ئەی پەروەردگار شایەت بە کە ئێمە موسڵمانین و موسڵمان بووینە..؟!

---

[١]-ابن تيمية مجموع الفتاوى (٤٦/١٧).

دەیەم : ئاستی هیدایەتی خەونی راست

بەلێ ئەم ئاستەە لە هیدایەت بەشێکە لە چەند بەشی پێغەمبەرایەتی وەك چۆن ئەم فەرموودەیە باسی دەکات

لە (عبادە بن صامت ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((رُؤْيا المُؤْمِنِ جُزْءٌ مِن سِتَّةٍ وأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ)). [1]

واتە: خەونی باوەردار برتیە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی ..؟!

بەلێ خەون سەرەتا دەست پێ کردنی وەحیە ، راست و دروستی خەونەکە بە پێ راستگۆیی تەقواداری کەسەکەیە ، بێ گومان راسترین خەون ئەو خەونەیە کەسێکە کە زۆر لە خوا ترس و تەقوادارو ئەخلاص و دلسۆزی تەنها بۆ خوایە ، وە راست گۆیە لە گەل نەفسی خۆی بۆ خوا خۆی یەك لای کردۆتەوە ، هەر وەك ئەم فەرموودەیە..؟!

لە (عبدالله بن عباس )– خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلێت : ((كَشَفَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ السِّتَارَةَ والنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أبِي بَكْرٍ، فَقالَ: أيُّها النَّاسُ، إنَّه لَمْ يَبْقَ مِن مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا المُسْلِمُ، أوْ تُرَى له، ألَا وإنِّي نُهِيتُ أنْ أقْرَأَ القُرْآنَ رَاكِعًا، أوْ سَاجِدًا، فأمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فيه الرَّبَّ عزَّ وجلَّ، وأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا في الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ )). [2]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەکەی لادا ، لە کاتەدا خەلکی لە دوای (ابو بکر ) وە ریز بوون ، فەرمووی : ئەی خەلکینە هیچ لە مژدەکانی پێغەمبەرایەتی نەماوە جگە لە خەون چاك یان (الرویا الصالحە ) نەبێت ، موسلمان دەیبینێ ، یان پێوە دەبینرێت ، ئایا نازانن من نەهی لێکراوە کە لە رکوع سووجدە دا قورئان بخوێنم ، لە رکوعدا پەروەردکاری تێدا بە گەورە و مەزن رابگرن ، ل سووجدەشدا کۆشش بکەن لە دوعاو پارانەوەدا ، شایەنی ئەوەیە کە لێ تان وەربگرێت ..؟!

[1] -صحيح مسلم برقم (٢٢٦٤).
[2] - صحيح مسلم برقم (٤٧٩).

## (الهدایه) له فیتره‌ته‌وه واته: له دروست بوونه‌وه یان له سروشته‌وه

قال تعالى: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ [الرُّوم : ٣٠]واته : [ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆ ڕووی خۆت به پاكی ڕابگره‌و دامه‌زراو به له‌سه‌ر دین و ته‌وحیدی خوای گه‌وره [ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ] ئه‌م دینه پاكه ئه‌و فیتره‌ته پاكه‌یه كه خوای گه‌وره خه‌ڵكی خستۆته سه‌ری، واته: خه‌ڵكی كه له دایك ده‌بن له‌سه‌ر فیتره‌تی پاكی ئیسلامن، دواتر دایك و باوك و ده‌وروبه‌ر ده‌یانگۆڕن و كاریگه‌ریان لێده‌كه‌ن [ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ] هیچ گۆڕانێك به‌سه‌ر دروستكراوی خوای گه‌وره‌دا نایات، واته: ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر فیتره‌ته‌كه‌ی خۆی بمێنێته‌وه له‌سه‌ر ته‌وحیده، یاخود خه‌ڵكی له‌سه‌ر فیتره‌تی پاكی ئیسلام و یه‌كخواپه‌رستی لامه‌ده‌ن و وازیان لێبێنن [ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ ] ئا ئه‌مه دینی ڕێك و ڕاست و دامه‌زراوه [ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (٣٠) ] به‌ڵام زۆربه‌ی خه‌ڵكی نازانن..؟!

له (البراء بن عازب)—خوا لیٰ رازی بێت — ده‌لێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((... فإنْ مُتَّ مِن لَيْلَتِكَ، فأنْتَ علَى الفِطْرَةِ ...)).[1] واته: ئه‌گه‌ر له شه‌و دا بمریت له سه‌ر سروشتی پاك ده‌مریت ..؟!

ووتراوه : مانای (فیتره‌ت ) یان سروشت ، بریتیه له و مه‌رجه‌ی كه ئاماده‌كراوه بۆ په‌سه‌ند كردنی ئایین ..؟!.[2]

ووتراوه: مانای (فیتره‌ت) یان سروشت ، بریتیه له‌و دروست بوونه‌ی كه مندال له زگی دایكی دا به سروست له‌دایك ده‌بێت ..؟!

له(ابو هريره ) — خوا لیٰ رازی بێت — ده‌لێت : له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((كلُّ مولودٍ يولَدُ على الفطرةِ فأبواه يُهوِّدانِه ويُنصِّرانِه ويُمجِّسانِه )) .[3] واته: هه‌ر مندالێك كه له دایك ده‌بێت له سه‌ر فیتره‌ت و سروشتی پاك له دایك ده‌بێت ، پاشان دایك و باوكی ده‌یكه‌ن به جووله‌كه یان گاور یان مه‌جوس ئاگر په‌رست..؟!

[1]- صحيح البخاري برقم (٢٤٧) ، صحيح مسلم برقم (٢٧١٠)
[2]-التعريفات الجرجاني ص٢١٥.
[3]-صحيح البخاري برقم (١٣٨٥) ، صحيح مسلم برقم (٢٦٥٨)، السنن الترمذي برقم (٢١٣٨) ، السنن ابو داود برقم (٤٧١٤).

له( علی بن ابي طالب )– خوا لیٚ رازی بیٚت – ده‌لیٚت : ((كُنَّا فِى جِنَازَةٍ فِى بَقِيعِ الغَرْقَدِ ، فأتَانَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ، وَمعهُ مِخْصَرَةٌ فَنَكَّسَ فَجَعَلَ يَنْكُتُ بمِخْصَرَتِهِ ، ثُمَّ قالَ: ما مِنكُم مِن أَحَدٍ، ما مِن نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ ، إلاَّ وَقَدْ كَتَبَ اللَّهُ مَكَانَهَا مِنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، وإلاَّ وَقَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً، أَوْ سَعِيدَةً، قالَ فَقالَ رَجُلٌ: يا رَسُولَ اللهِ، أَفلا نَمْكُثُ علَى كِتَابِنَا، وَنَدَعُ العَمَلَ؟ فقالَ: مَن كانَ مِن أَهْلِ السَّعَادَةِ، فَسَيَصِيرُ إلى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَمَن كانَ مِن أَهْلِ الشَّقَاوَةِ، فَسَيَصِيرُ إلى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَقالَ: اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ، أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ، ثُمَّ قَرَأَ: {فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بالحُسْنَى ، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى، وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بالحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى} [الليل: ٥- ١٠] )) .[١]

واته : له به‌جیٚ هیٚنانی کاری جه‌نازه‌یه‌ك بووین ، له ( بقيع الغرقه ) دا ، پیٚغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ته‌شریفی هیٚناو دانیشت و ئیٚمه‌ش به‌ده‌وریدا دانیشتین ، پیٚغه‌مبه‌ر ﷺ گۆپالیٚکی پیٚ بوو ، سه‌ری داخست به گۆپاله که‌ی خه‌تی یان هیٚلی ده‌کیٚشا له سه‌ر زه‌وه‌یه‌که‌دا ، پاشان فه‌رمووی : هیچ که‌سیٚك له ئیٚوه نیه‌و ، هیچ نه‌فسیٚکی دروست کراو نیه ، مه‌گه‌ر (خوای گه‌وره ) شویٚنی له به هه‌شت و دۆزه‌خدا دیاری کردووه ، وه نووسراوه ئه‌گه‌ر یاخی یان خراپه‌کار بیٚت، وه یان خۆش به‌خت و چاکه کار بیٚت ، پیاویٚك ووتی : ئه‌ی پیٚغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئایا ده‌کریٚت پشت ببه‌ستین به‌وه‌ی که بۆمان نووسراوه‌و واز له‌کارو کرده‌وه بهیٚنین ..؟! پیٚغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی : ئه‌و که‌سه‌ی که له ده‌سته یان کۆمه‌له‌ی خۆشبه‌ختان بیٚت ، ئه‌وا به‌ره‌و کاری خۆش به‌ختان ده‌روات ، ئه‌وه‌شی له ده‌سته‌ی یان له کۆمه‌له‌ی یاخی بووان بیٚت ، ئه‌وا به کاری یاخی بووان یان خراپه‌کاران ده‌روات ، وه فه‌رمووی : کارو کرده‌وه بکه‌ن هه‌مووکه‌س (خوای گه‌وره ) هۆکاری بۆ ئاسان کردووه ، که به‌ره‌وه ئه‌و ریٚگایه بروات که خۆی هه‌لبیٚژاردووه ، ئه‌وه‌شی له کۆمه‌ل و تاقمی خۆش به‌ختان بیٚت ، ئه‌وا به‌ره‌و ئه‌و ریٚگایه یان ئاقاره ده‌بریٚت و وای لیٚده‌کریٚ که کاری چاکه خوازی بکات ..!! کومه‌ل یان تاقمی یاخی بووان یان خراپه‌کارانیش وایان لیٚده‌کریٚ که کاری خراپه کاری ئه‌نجام بده‌ن ..!! پاشان ئه‌م ئایه‌ته‌ی خویٚنده‌وه ، {فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بالحُسْنَى ، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى، وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بالحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى} [الليل: ٥- ١٠]واته: به‌لاٚم ئه‌وه‌ی که له ماڵه‌که‌ی ببه‌خشیٚت، و له‌و به‌خشینه‌یدا له‌خوا بترسیٚت، وه ( لا إله إلا الله ) و واتاکه‌ی ..؟!و ئه‌و پاداشتانه‌ش که له‌سه‌ری ده‌دریٚته‌وه به‌ڕاست بزانیٚت و باوه‌ڕی پیٚهیٚنیٚت ..؟!ئه‌وا ڕێنموی و سه‌رکه‌وتوی ده‌که‌ین بۆ هۆکاره‌کانی چاکه و چاکسازی، و کاره‌کانی بۆ ئاسان ده‌که‌ین ..؟! به‌ڵام ئه‌وه‌ی که چروکی و ده‌ست بگریٚته‌وه له ماڵه‌که‌ی، و خۆی بێ پیٚویست ده‌رببڕیٚت له پاداشتی په‌روه‌ردگاری، و ( لا إله إلا الله )، و واتاکه‌ی ..؟!و ئه‌و پاداشته‌ش که له‌سه‌ری ده‌دریٚته‌وه به‌درۆ بزانیٚت ..؟!ئه‌ وا ڕێنموی ده‌که‌ین بۆ هۆکاره‌کانی سه‌رگه‌ردانی .

[١]-صحيح مسلم برقم (٢٦٤٦).

# هۆکارەکانی بەدەست هێنانی (الهدایە ) یان ڕێنموویی

قورئانی پیرۆز کتێبێکی ڕێنموویی و ڕێ نیشاندەرە کە ئاراستەی باوەرداران کراوە ، بۆ گەیشتن بە ڕێگای ڕاست و دروست و سەرکەوتن و سەرفەرازی و بەختەوەری لە دونیاو لە قیامەتدا ، وە ئەم خاڵانەی خوارەو هۆکاری بەدەست هێنانی (الهدایە ) و یان ڕێنمووی و ڕێ نیشاندانە بۆ سەرکەوتن و سەر فەرازای ..؟!

## یەکەم : دەست گرتن بە ئایینەکەی (خوای گەورە )

هەر بۆیە لە قورئانی پیرۆز دا دوا لە موسلمانان دەکات دەست بە ئایینەکەی (خوای گەورە ) وە بگرن ، چونکە هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە (الهدایە ) یان ڕێنمووی و ڕێ نیشاندانی ڕاست و درست ڕێگای بەختەوەری و سەرفرازی.

قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ١٧٥﴾ [النِّسَاء : ١٧٥] واتە : جا ئەوانەی بە بیروباوەڕ و بەزمان و بەکرداریش باوەڕیان بەخوای پەروەردگار هێناوە و بەڕاستیان زانیوە، و دەستیان گرتووە بەو نورەی کە بۆیان دابەزێنراوە، ئەوا خوای پەروەردگار بە فەزڵ وچاکە وڕەحمی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە، و سەرکەوتوویان ئەکات بۆ گرتنەبەری ئەو ڕێگا ڕاستەی کە ئەیانگەیەنێت بە باخچەکانی بەهەشت ..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٠١﴾ [آل عِمۡرَان : ١٠١] واتە : هە هەر کەسێ دەست بگرێ بە دینەکەی خوای گەورە ئەوە هیدایەتدراوە وە دامەزراوە لەسەر ڕێگای ڕاستی خوای گەورە..؟!

قال تعالى: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ﴾ [آل عِمۡرَان : ١٠٣] واتە:{فەرمانکردن بەیەکریزیو قەدەغە کردنی پەرتەوازەیی} [ وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا ] وە ئێوە هەر هەمووتان دەست بگرن بە حەبل و پەتی خوای گەورەوە واتە: بە دینی خواو بە ئیسلام و بە قورئان [ وَلَا تَفَرَّقُوا ] وە بەڵام تەفرەقە مەکەن و پارچە پارچەو بەش بەش و پەرتەوازە مەبن..؟!

لە( زید بن أرقم ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((... ثُمَّ قالَ: أَمَّا بَعْدُ، أَلَا أَيُّهَا النَّاسُ، فإنَّما أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسولُ رَبِّي فَأُجِيبَ، وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ: أَوَّلُهُما كِتَابُ اللهِ، فيه الهُدَى وَالنُّورُ، فَخُذُوا بكِتَابِ اللهِ، وَاسْتَمْسِكُوا به، فَحَثَّ علَى كِتَابِ اللهِ وَرَغَّبَ فِيهِ... )) .[1] واتە : فەرمووی : دوای ئەمە ، ئاگادار بن ئەی خەلکینە ، من مرۆڤێکم نزیکە نێدراوی خوا بێت و وەلامی بدەمەوە ، من دوو شتی گەورە تان بۆ جێ دەهێلم : یەکەمیان : کتابی (خوای گەورە ) واتە: قورئانی پیرۆز ، کە ڕێنموویی نوور یان ڕۆشنایی تێدایە ، وە کتابی (خوای گەورە ) دەستی پێوە بگرن و باوەشی پێدا بکەن ،هانی دان بۆ پابەند بوون بە قورئانەوە ..؟!

---

[1]-صحیح مسلم برقم (٢٤٠٨).

## دووه‌م : وورد بوونه‌وه بیرکردنه‌وه و شوێن که‌وتنی قورئانی پیرۆز

**ده‌ست گرتن به کتابه‌که‌ی (خوای گه‌وره ) ، ده‌بێت خوێنه‌وه‌ی رێك و پێك ، وه بیر کردنه‌وه له ئایه‌ته‌کانی قورئانی پیرۆز ، هه‌روه‌ها کار پێکردنی ببێته ره‌نگانه‌وه‌ی ژیانی رۆژنه له کاتی خوێندنه‌وه‌ی قورئان و بیرکردنه‌وه له ئایه‌ته‌کان و وورد بوونه‌وه‌ی له فهم و تێگه‌یشتن له ئایه‌ته‌کاندا ، وه کار پێ کردن له کارو کرده‌وه‌کاندا ..؟!**

قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢﴾ [البَقَرَة : ٢]واته : [ ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ ] ئه‌م په‌رتووکه که قورئانی پیرۆزه هیچ گومانێکی تیادا نیه که له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه دابه‌زیووه [ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ ] هیدایه‌ت و رووناکی و رێنماییه بۆ ئه‌و که‌سانه ی که ته‌قوای خوای گه‌وره ئه‌که‌ن و خۆیان له تاوان ئه‌پارێزن..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَبِيرٗا ۝٩﴾ [الإسۡرَاء : ٩] واته :[ إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ ] به‌دڵنیایی ئه‌م قورئانه پیرۆزه هیدایه‌تی خه‌ڵکی ئه‌دات بۆ دامه‌زراوترین بیروباوه‌ڕو ڕه‌وشت و ئاکار [ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا] وه موژده ئه‌دات به‌و باوه‌ڕدارانه‌ی که کرده‌وه‌ی چاکیان کردووه که ئه‌جرو پاداشتێکی زۆر گه‌وره‌یان بۆ هه‌یه (کرده‌وه‌ی چاك ئه‌وه‌یه که نیه‌تت بۆ خوا بێت و ریای تیا نه‌بێت، وه له‌سه‌ر سوننه‌ت بێت و بیدعه نه‌بێت)..؟!

قال تعالى: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ۝٢٩﴾ [ص : ٢٩] واته: [ كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئه‌م قورئانه پیرۆزو پڕ خێرو به‌ره‌که‌ته کتابێکه بۆ تۆمان دابه‌زاندووه [ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ ] بۆ ئه‌وه‌ی له ئایه‌ته‌کانی تێبگه‌ن و تێبفکرن و بیربکه‌نه‌وه [ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ ] وه ئه‌وانه‌یشی که خاوه‌ن عه‌قڵ و ژیرن تا یادبکه‌نه‌وه‌و په‌ندو ئامۆژگاری وه‌ربگرن..؟!

قال تعالى: ﴿قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ۝١٥ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝١٦﴾ [المَائـِدَة : ١٥ - ١٦]واته : [ قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ ] بۆیه له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه نوورێکتان بۆ هاتووه که پێغه‌مبه‌ری خوایه- صلى الله عليه وسلم - یان ئیسلامه یان قورئانه [ وَكِتَابٌ مُبِينٌ (١٥) ] وه کتابێکی ئاشکراش که قورئانی پیرۆزه..؟! [ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ ] به‌هۆی ئه‌و قورئانه‌وه خوای گه‌وره هیدایه‌تی هه‌ر که‌سێك ئه‌دات که شوێن ڕه‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌و ڕێگای سه‌لامه‌تی و پارێزراوی له سزای خوا وه ڕێگای گه‌یشتن به (دار السلام) که به‌هه‌شته بکه‌وێت [ وَيُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ ] وه ده‌ریان ده‌کات له تاریکییه‌کانی کوفرو شیرك و گومڕایی بۆ رووناکی ئیسلام و ئیمان و سوننه‌ت و چاکه به ئیزنی خوای گه‌وره [ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (١٦) ] وه هیدایه‌تیان ئه‌دات بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گه‌وره..؟!

سێ یەم : شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ

**بەلێ (خوای گەورە ) کرامەت و شەرەفی بەخشیوە بە ئوومەتی ئیسلام بە هاتنی کۆتا پێغەمبەر ﷺ ، وە فەرمانی پێ کردووین کە گوێڕایەلی بکەین و شوێنی بکەوین ، چونکە شوێن کەوتنی هۆکارێکە لە (الهدایە ) ..؟!**

قال تعالى: ﴿قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٥٤﴾﴾ [النّور : ٥٤] واتە : [ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بکەن - صلى الله عليه وسلم -، واتە شوێن قورئان و سوننەت بکەون [ فَإِنْ تَوَلَّوْا ] وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد [ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ ] ئەوە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - تەنها گەیاندنی دینەکەی لەسەرە کە بە جوانترین و تەواوترین شێواز جێبەجێی کردووە [ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ ] وە ئێوەش لێپرسینەوەتان لەگەڵدا ئەکرێ لەسەر ئەو ئەرکەی لەسەر شانتانە کە گوێڕایەڵی کردن و ئیمان هێنانە [ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا ] وە ئەگەر بێتوو ئێوە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بکەن - صلى الله عليه وسلم - ئەوە هیدایەت وەرئەگرن و دێنە سەر ڕێگای ڕاست [ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ] وە هیچ شتێکیش لەسەر پێغەمبەری خوا نیە - صلى الله عليه وسلم - تەنها گەیاندنێکی ئاشکرا نەبێ کە دینەکەتان پێ بگەیەنێت..؟!

قال تعالى: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ﴿٨٠﴾﴾ [النِّسَاء : ٨٠]واتە: [ مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ ] هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بکات- صلى الله عليه وسلم - بەدڵنیایی ئەوە گوێڕایەڵی خوای گەورەی کردووەو سەرفراز دەبێت [ وَمَنْ تَوَلَّى ] وە هەر کەسێ پشت هەڵکات لە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - [ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا] ئەوە تۆمان نەناردووە کە کردەوەکانیان بپارێزی تەنها ئەوەندەت لەسەرە کە دینەکەی خوای گەورەیان پێ بگەیەنی، وە خۆیان زەرەرمەند دەبن..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ [الأَحْزَاب : ٧١] واتە : وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بکات بە دڵنیایی بردنەوەیەکی زۆر گەورە ئەیباتەوە لە دونیاو قیامەت..؟!

قال تعالى: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣١﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ٣١]واتە: {شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نیشانەی خۆشویستنی خوایە} [ قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بفەرمە: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن خوای گەورەتان خۆش ئەوێ ئەوە شوێن من بکەون ئەوە ئەو کاتەش خوای گەورە ئێوەی خۆش ئەوێ وە لە تاوانەکانتان خۆش ئەبێ، کەسانێك بانگەشەی خۆشەویستی خوایان کرد خوای گەورە بەم ئایەتە تاقیکردنەوە، کەواتە هەرکەسێك شوێن پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نەکەوێت و بیدعە بکات ئەوە ڕاستگۆ نیە لە خۆشەویستی بۆ خوای گەورە، وە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی خوای گەورەو هۆکارە بۆ دەستخستنی خۆشەویستی خوای گەورەو لێخۆشبوونی تاوانەکان [ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ] وە خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و بەڕەحم و بەزەییە ..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ [النِّسَاء : ٦٩]واتە : پیاوێك لە ئەنصاریيەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - کە غەمبار بوو، پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - پێی فەرموو: ئەی فڵانە کەس بۆچی دەتبینم خەفەتباریت؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - شتێکە بیرم لێ کردەوە، فەرمووی چیە؟ وتی: ئێمە بەیانی و ئێوارە دێین بۆ خزمەتی تۆ و تەماشات دەکەین و لە خزمەتتدا دادەنیشین، بەڵام لە قیامەتدا تۆ پلەت بەرزە لەگەڵ پێغەمبەراندایت ئێمە پێت ناگەین، پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - هیچ وەڵامی نەدایەوە یەکسەر جبریل ئەم ئایەتەی بۆ هێنا، پێغەمبەری خوایش- صلی الله علیه وسلم - ناردی بە شوێن پیاوەکەداو موژدەی پێدا: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکات- صلی الله علیه وسلم - ئەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان [ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا] کە ئەمانەیش باشترین ڕەفیق و هاوەڵن کە مرۆڤ هاوڕێیەتی وهاوەڵێتیان بکات.؟!

**بەلێ هەتاکو شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبی ، کردەوە عیبادەتەکانیش پەسەندو قبول نابێت ، لە لای (خوای گەورە ) ، تەنها دەبێت شوێن کەوتەی پێغەمبەری خوا ﷺ..؟!**

**لە (عائشە دایکی ئیمانداران )– خوا لێ رازی بێت – دە گێڕێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :(( مَن عَمِلَ عَمَلًا ليسَ عليه أمْرُنا فَهو رَدٌّ )) .[١] واتە: هەر کەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات ، کە ملکەچی فەرمانی ئێمە نەبێت رەتدەکرێتەوە ..؟!**

**لە (ابو هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێریتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((كُلُّ أُمَّتي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ إلَّا مَن أَبَى، قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَن يَأْبَى؟ قالَ: مَن أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَن عَصَانِي فقَدْ أَبَى)).[٢] واتە: هەموو ئوومەتێك دەچنە بەهەشتەوە جگە لەوانە نەبێت رەت دەکرێنەوە ، ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کاما ئوومەت رەت دەکرێنەوە ..؟! فەرمووی : هەر کەسێك گوێرایەلی من بێت دەچێتە بەهەشتەوە ، وە هەر کەسێکیش سەرپێچی فەرمانەکانی من بکات ئەوا رەت دەکرێتەوە ..؟! واتە ناچێتە بەهەشتەوە ..؟!**

---

[١]- صحيح مسلم برقم (١٧١٨).
[٢]-صحيح البخاري برقم (٧٢٨٠).




## چواره‌م : دوعاو پارانه‌وه كردن له (خوای گه‌وره )

(خوای گه‌وره ) ڕێنمایی حه‌ق به‌نده‌كانی ده‌كات بۆ ئه‌وه‌ی داوای هیدایه‌ت و توفیق و یان كار ئاسانی بكه‌ن .

هه‌روه‌ك له یه‌كه‌م سوره‌تی قورئانی پیرۆز كه (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت : قال تعالى: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۞﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦] واته: ئه‌ی په‌روه‌ردگار هیدایه‌تمان بده‌و ڕێنماییمان بكه بۆ ڕێگای ڕاست وه به‌رده‌وامیمان پێ ببه‌خشه له‌سه‌ر ڕێگای ڕاست كه ئیسلامه، وه ئه‌بو عالیه فه‌رموویه‌تی: ڕێگای ڕاست پێغه‌مبه‌ری خواو صلى الله عليه وسلم ئه‌بو به‌كرو عومه‌ره (خوایان لێ رازی بێت) ..؟!

له (ابو هريره ) — خوا لیٚ رازی بێت — ده گێرێته‌وه ده‌ڵێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : ((مَن صَلَّى صَلاةً لَمْ يَقْرَأْ فيها بأُمِّ القُرْآنِ فَهي خِداجٌ ثَلاثًا غَيْرُ تَمامٍ. فقِيلَ لأَبِي هُرَيْرَةَ: إنَّا نَكُونُ وراءَ الإمامِ؟ فقالَ: اقْرَأْ بها في نَفْسِكَ ؛ فإنِّي سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يقولُ: قالَ اللَّهُ تَعالَى: قَسَمْتُ الصَّلاةَ بَيْنِي وبيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، ولِعَبْدِي ما سَأَلَ، فإذا قالَ العَبْدُ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمِينَ}، قالَ اللَّهُ تَعالَى: حَمِدَنِي عَبْدِي، وإذا قالَ: {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}، قالَ اللَّهُ تَعالَى: أثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، وإذا قالَ: {مالِكِ يَومِ الدِّينِ}، قالَ: مَجَّدَنِي عَبْدِي، وقالَ مَرَّةً فَوَّضَ إلَيَّ عَبْدِي، فإذا قالَ: {إيَّاكَ نَعْبُدُ وإيَّاكَ نَسْتَعِينُ} قالَ: هذا بَيْنِي وبيْنَ عَبْدِي، ولِعَبْدِي ما سَأَلَ، فإذا قالَ: {اهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقِيمَ صِراطَ الَّذِينَ أنْعَمْتَ عليهم غيرِ المَغْضُوبِ عليهم ولا الضَّالِّينَ} قالَ: هذا لِعَبْدِي ولِعَبْدِي ما سَأَلَ )) .[1] واته : هه‌ر كه‌سێك نوێژ بكات (أم القران )واته: سوره‌تی (الفاتحه ) تێدا نه خوێنێ ئه‌وا نوێژه‌كه‌ی ناته‌واوه ، سێ جار دوو باره‌ی كرده‌وه ، واته : باتل و كه‌موكوری تێدایه ، جا به (ابو هريره ) ووترا: ئێمه له پشت ئیمامه‌وه‌ین ..؟! له دڵی خۆتدا بیخوێنه ، من له پێغه‌مبه‌ری خوام ﷺ بیستووه فه‌رموویه‌تی : (خوای گه‌وره ) فه‌رموویه‌تی : نوێژم له نێوان خۆم و به‌نده‌كه‌م دا كردووه به دوو به‌شه‌وه ، به‌نده‌كه‌ش داوای چیٚ كرد ده‌یده‌میٚ ، هه‌ر كاتیٚ ووتی : (الحمد الله رب العالمين ) خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێت : به‌نده‌كه‌م سوپاسی كردم ، هه‌ر كاتیٚ ووتی : (الرحمن الرحيم ) خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێت : به‌نده‌كه‌م ستایشی كردم ، هه‌ر كاتیٚ ووتی : (مالك يوم الدين ) خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێت : به‌نده‌كه‌م گه‌وره‌و مه‌زن سه‌یری كردم ، جارێكیش فه‌رمووی : به‌نده‌كه‌م هه‌موو شتێكی خۆی دایه ده‌ست من ، هه‌ر كاتیٚ ووتی : (اياك نعبد وياك نستعين ) خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێت : ئه‌مه له نێوان من و به‌نده‌كه‌م دایه ، به‌نده‌كه‌م هه‌رچی بویت بۆی ده‌كه‌م ، هه‌ر كاتیٚ ووتی : (اهدنا الصراط المستقيم . صراط الذين انعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا ضالين ) خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێت : ئه‌مه تایبه‌ته به به‌نده‌كه‌م داوای هه‌رچیش بكات بۆی ده‌كه‌م ..؟!

قال تعالى: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ۞﴾ [آل عِمۡرَان : ٨]واته: [ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا ] ئه‌مه هه‌ر قسه‌ی زانا چه‌سپاو و دامه‌زراوه‌كانه له عیلمدا ئه‌ڵێن: ئه‌ی په‌روه‌ردگار دڵمان له حه‌ق لانه‌ده‌ی به‌وه‌ی كه شوێن ئایه‌تی موته‌شابیه بكه‌وین له دوای ئه‌وه‌ی كه هیدایه‌تی ئێمه‌ت دا بۆ حه‌ق [ وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ] وه له لایه‌ن خۆته‌وه ڕه‌حممان پێ بكه به دڵنیایی هه‌ر تۆ به‌خشه‌ری هه‌موو شتێكی ..؟

له (عبدالله بن مسعود ) — خوا لیٚ رازی بێت— ده‌گێرێته‌وه ده‌ڵێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دوعای كرد فه‌رمووی : ((عن النَّبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، أنَّه كان يَدعو بهذا الدُّعاءِ: اللَّهمَّ إنِّي أسأَلُكَ الهُدى والتُّقـى والعَفافَ والغِنى )) .[2] واته: خودایه داوای ڕێنموونی و هیدایه‌ت و پارێزگاری و ته‌قواو ده‌ست و داوێن پاكی و ده‌وله‌مه‌ندیت لیٚ ده‌كه‌م ..؟!

[1]-صحيح مسلم برقم (٣٩٥).
[2]-السنن الترمذي برقم (٣٤٨٩).




## پێنچه‌م : جیهادو تێ كۆشان له پێناوی (خوای گه‌وره)

قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٦٩﴾ [العَنكَبُوت : ٦٩]واته : [ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا ] وه ئه‌و كه‌سانه‌ی كه له پێناو ئێمه‌دا جیهادیان كردووه [ لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ] ئه‌وه به‌دڵنیایی هیدایه‌تیان ئه‌ده‌ین بۆ ڕێگای ڕاستی خۆمان [ وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ] وه به دڵنیایی خوای گه‌وره له‌گه‌ڵ چاكه‌كاراندایه به‌وه‌ی كه پشتیوانیان ئه‌كات و سه‌ریان ئه‌خات و یارمه‌تیان ئه‌دات و هاوكاریان ئه‌كات، والله أعلم..؟!

قال تعالى: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَاۚ ذَٰلِكَۖ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ۝٤ سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ۝٥﴾ [مُحَمَّد : ٤ – ٥] واته : {له كاتی جه‌نگدا له گه‌ردنی كافران بده‌ن} [ فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ ] وه ئه‌گه‌ر گه‌یشتن به كافران له مه‌یدانی جه‌نگدا ئه‌وه بده‌ن له گه‌ردنیان [ حَتَّى إِذَا أَثْخَنْتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ ] تا كوشتارێكی زۆریان لێ ئه‌كه‌ن وه لاوازیان ئه‌كه‌ن ئه‌و كاته ئه‌وانه‌ی كه به دیل گرتان بیانبه‌ستنه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی ڕانه‌كه‌ن [ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً ] دوای كۆتایی هاتنی جه‌نگ و كوشتار ئه‌توانن به‌بێ به‌رامبه‌ر دیله‌كان ئازاد بكه‌ن یاخود به‌به‌رامبه‌ر ئازادیان بكه‌ن [ حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ] تا جه‌نگ كۆتایی دێت له‌گه‌ڵ كافراندا، یاخود تا چه‌كه‌كانیان فڕێ ئه‌ده‌ن و تێكئه‌شكێن، یاخود تا شه‌ریك دانان بۆ خوا نامێنێت [ ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانْتَصَرَ مِنْهُمْ ] ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره ویستی لێ بێت خۆی به‌سه‌ر كافراندا سه‌ر ئه‌كه‌وێ وه توانای سه‌ركه‌وتنی هه‌یه به‌سه‌ریانداو ئه‌توانێ له‌ناویان ببات و له‌لایه‌ن خۆیه‌وه سزایان بۆ بنێرێت به‌بێ ئه‌وه‌ی كه باوه‌ڕداران شه‌ڕ بكه‌ن [ وَلَكِنْ لِيَبْلُوَ بَعْضَكُمْ بِبَعْضٍ ] به‌ڵام خوای گه‌وره كه ئه‌م جه‌نگ و كوشتاره له‌سه‌ر ئێوه پێویست ئه‌كات بۆ ئه‌وه‌ی كه هه‌ندێكتان به هه‌ندێكتان تاقیبكاته‌وه تا ده‌ربكه‌وێ كێ ئارامگره وه كێ ڕاستگۆیه {تایبه‌تمه‌ندێكانی شه‌هید لای خوای گه‌وره} [ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَنْ يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ] وه ئه‌وانه‌یشی كه له پێناوی خوای گه‌وره‌دا كوژراون خوای گه‌وره كرده‌وه‌كانیان نافه‌وتێنێ و به‌ڵكو گه‌شه‌ی پێده‌كات و زیادی ده‌كات و ئه‌جرو پاداشتی ته‌واویان ئه‌داته‌وه، پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ده‌فه‌رمێت: (شه‌هید لای خوای گه‌وره شه‌ش تایبه‌تمه‌ندێتی بۆ هه‌یه: له‌گه‌ڵ یه‌كه‌م دڵۆپه خوێن كه لێی ده ڕژێت خوای گه‌وره له هه‌موو تاوانه‌كانی خۆش ده‌بێت، ته‌نها قه‌رزاری نه‌بێت، وه شوێنی خۆی له به‌هه‌شت ده‌بینێت، وه تاجی ڕێزی له‌سه‌ر ده‌كرێت كه‌نه‌خش كراوه به دوڕو مرواری، هه‌ر مروارییه‌كی له هه‌موو دونیاو ئه‌وه‌ی تێیدایه چاكتره، وه حه‌فتاو دوو حۆری پێ ده‌درێت، وه له سزای گۆڕ پارێزراو ده‌بێت، وه شه‌فاعه‌ت بۆ حه‌فتا كه‌س له خزمه‌كانی ده‌كات). [ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ] خوای گه‌وره هیدایه‌تیان ئه‌دات، واته: ڕێگه‌ی به‌هه‌شتیان نیشان ئه‌دات وه كاروباریان چاك ئه‌كات و ئیصڵاحی حاڵیان ئه‌كات..؟!

له (ابو موسى الاشعرى ) – خوا لێ ڕازی بێت – ده‌گێرنه‌وه ده‌ڵێت : ((سئلَ رسولُ اللهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ عنِ الرَّجلِ يقاتلُ شاعةً ويقاتلُ حميَّةً ويقاتلُ رياءً فأيُّ ذلِكَ في سبيلِ اللهِ قالَ من قاتلَ لتَكونَ كلمةُ اللهِ هيَ العليا فَهوَ في سبيلِ اللَّهِ))[1].واته: پرسیار كرا له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌رباره‌ی كه‌سێ له به‌ر ئه‌وه‌ی وه‌سفی بكه‌ن و بلێن كه‌سێكی ئازاو قاره‌مانه بجنگێ ، كه‌سێك له به‌ر هۆز و خزم و كه‌سو كاری بجنگێ ، كه‌سێك له به‌ر ده‌ستكه‌وتی بجنگێ ، كه‌سێك له به‌ر ئه‌وه‌ی شوێنی دیار بێت بجنگێ ، ئایا ئه‌مانه كامه‌یان له پێناوی خودایه ..؟! فه‌رمووی : ئه‌وه‌ی بجنگی بۆ ئه‌وه‌ی وشه‌ی خوا به‌رزبێته‌وه بێ گومان ئه‌وه له پێناوی خودایه ..؟!

[1]- السنن الترمذي برقم (١٦٤٦).

## شەشەم : لا سایی کردنەوەی یان چاولێ کردنی ئەهلی هیدایەت

**بەلێ بانگەوازی ئیسلام بۆ خەلکی ئەوەی کە لاسایی یان چاو لە ئەهلی باوەردارو چاکە کاران و تەقواداران بکەن ، هەروەکو (خوای گەورە) فەرمان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات کە لاسایی یان چاو لە پێغەمبەرانی پێش خۆی بکات ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویّت :** قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًاۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ۝﴾ [الأنعام : ٩٠] واتە : [ أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ ] ئا ئەمانەن کە خوای گەورە هیدایەتی داون [ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - تۆش شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە، وە شوێنی پێغەمبەرانی پێش خۆت بکەوە [ قُلْ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: من داوای ئەجرو پاداشت و پارە لە ئێوە ناکەم لەسەر ئیمان هێنان و هیدایەت [ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ ] بەڵکو ئەم قورئانە تەنها یادخستنەوەیەکە بۆ هەموو جیهان بە قورئان یادتان ئەخەمەوە..؟!

قال تعالى: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ۝﴾ [الأحزاب : ٢١]واتە: {پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - پێشەواو مامۆستای چاکی ئێوەیە} [ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ] بەدڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا - صلى الله عليه وسلم - بۆ ئێوە پێشەوایەتییەکی زۆر جوان هەیەو پێشەواو مامۆستای چاکی ئێوەیەو چاو لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بکەن و شوێنی بکەون بەڵام بۆ کەسێك کە بە ئومێدی خواو ڕۆژی دوایی و پاداشتی خوای گەورە هەبێت، وە زیکری خوای گەورەی زۆر کردبێت.

**لە ( العرباض بن سارية ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێرنەوە دەلێت :** ((وعظنا رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ يومًا بعد صلاةِ الغداةِ موعظةً بليغةً ذرفَتْ منها العيونُ ووجِلتْ منها القلوبُ فقال رجلٌ إنَّ هذه موعظةُ مُودِّعٍ فماذا تعهد إلينا يا رسولَ اللهِ قال أوصيكم بتقوى اللهِ، والسمعِ والطاعةِ وإن عبدٌ حبشيٌّ فإنه من يعشْ منكم يرَ اختلافًا كثيرًا، وإياكم ومحدثاتِ الأمورِ، فإنها ضلالةٌ فمن أدرك ذلك منكم فعليه بسنَّتي وسنةِ الخلفاءِ الراشدِين المهديّين عَضوا عليها بالنواجذِ)) . [١] **واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای نوێژی بەیانی ووتاری بوودایـن و ئامۆژگاریەکی کاریگەر و گرنگی کردین ، چاوەکانی خستە گریان و دلە کانی خستە ترس و لەر زین ، قسەکەرێ ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایەیشتەکانت لە قسەی یەکێ دەچێت ماڵ ئاوایی بکات ، وە فەرمانت چی یە بۆمان ..؟! فەرمووی : ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی لە (خوای گەورە ) بترسن و گوێرایە لی فەرمانە کانی ، وە لە فەرمانی فەرمانرەوایی خۆتان دەرمەچن ، ئەگەر چی بەندەیەکی حەبەشی بێت ، چونکە بیّ گومان ئەوەی لە ئێوە بمێنیّ جیاوازی و ناکۆکیەکی زۆر دەبینیّ ، ئاگاداری شتە تازەکان بن لە ئاییندا ، بیّ گومان ئەوشتە تازانەش داهێنراو (بیدعە ) وە هەموو داهێنراو (بیدعە)یّك لە ئاییندا گومراییە ، هەر کەس لە ئێوە گەیشتە ئەو سەردەمە بادەست بگرێت بە سووننەتەکانی من و ، سوونەتەکانی خەلیفەی راشدینە ڕێنمایکراوەکانەوە واتە : بە ددانەکانی پێشەوە توند بیگرن ..؟!**

[١]- السنن الترمذي برقم (٢٦٧٦).

حەوتەم : بیرکردنەوە لە گەردوون

قال تعالی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِی رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ۝٢ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ۝٣﴾ [الرَّعْد : ٢ - ٣]واتە : {خوای گەورە بەرز بووەوە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی} [ اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ] الله ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکانی بەرز کردۆتەوە بەبێ ئەوەی کۆڵەکەیەك لە ژێرەوە ڕایگرتبێ کە ئێوەیش دەیبینن [ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ] پاشان پەروەردگار بەرزو بڵند بووەوە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی خۆی بەرز بوونەوەیەك کە شایەن و شیاو و گونجاو بێت بە گەورەیی و مەزنی خوای گەورە لە بەرزبوونەوەی هیچ لە دروستکراوەکانی ناچێت، وە چۆنیەتیەکەشی خوای گەورە خۆی نەبێت کەس نایزانێت، پرسیاری (الإستواء) لە ئیمامی (مالیك) کرا فەرمووی: (الإستواء غير مجهول، والكيف غير معقول، والإيمان به واجب، والسؤال عنه بدعة) واتە: ئیستوا زانراوە، چونکە لەقورئاندا باسکراوە، وە چۆنێتیەکەی نەزانراوە، چونکە باس نەکراوە، وە ئیمان هێنان پێی واجبە، چونکە ئایەتی قورئانی پیرۆزە، وە پرسیار کردن لە چۆنێتی بەرز بوونەوەی خوای گەورە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی بیدعەیە، چونکە هاوەڵان ئەو پرسیارەیان لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نەکردووە، وە چواندنی بە بەرزبوونەوەی دروستکراوەکان کوفرە، چونکە تەشبیه کردنی خوای گەورەی خالقە بە مەخلوقی دروستکراوی لاواز، وە گۆڕینی ماناکەی حەرامە، چونکە مەبەست پێی نیوە هەڵەیە، وەکو گۆڕینی بۆ (استولى) کە بە مانای زاڵ بوون و دەستبەسەراگرتن دێت هەڵەیە، کە بە گوێرەی ئەم تەئویلە فاسیدە دەبێت پێش خوای گەورە کەسێکی تر دەستی بەسەر عەرشدا گرتبێت، کە مرۆڤی ژیر قسەی واناکات، (ابن القيم) دەفەرمێت: ئەم لامەی کە زیادی دەکەن و (استوى) دەکەن بە (استولى) چەند لەو (نونە) دەچێت کە بەنو ئیسرائیل زیادیان کرد کە خوای گەورە پێی فەرموون: بڵێن: (حطة) ئەوان وتیان: (حنطة) وە خوای گەورە غەزەبی لێگرتن، ئەو کەسانەیشی کە سیفاتی خوای گەورە تەئویل دەکەن و ماناکەی دەگۆڕن با لە خوای گەورە بترسن نەك وەك بەنو ئیسرائیل خوای گەورە غەزەبیان لێ بگرێت [ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ] وە خۆرو مانگی ژێربار کردووە بۆ بەرژەوەندی بەندەکانی [ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى ] هەر یەکێك لە خۆرو مانگ ئەڕۆن تا کاتی دیاریکراوی خۆیان کە ڕۆژی قیامەتە، یاخود دەڕۆن بۆ شوێنی دیاریکراوی خۆیان کە ژێر عەرشی خوای گەورەیە (کە دەفەرمێت: دەڕۆن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خۆرو مانگ جێگیر نین و دەجولێن) [ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ] خوای گەورە کاروباری ئەم بوونەوەرە هەڵئەسووڕێنێ بە هەر شێوازێك کە خۆی ویستی لێ بێت [ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ (٢) ] ئایەتەکانی ڕوون ئەکاتەوەو درێژەی پێ ئەدات بەڵکو ئێوە یەقینتان هەبێ بە گەیشتن بە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا..؟! [ وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا ] خوای گەورە ئەو خوایەیە کە زەوی ڕاخستووەو درێژ کردووە، وە شاخەکانیشی وەکو مێخ داکوتیوە لەناو زەویدا بۆ ئەوەی جێگیر بن، وە ڕووباریشی داناوە تیایدا [ وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ ] وە لە هەموو بەرووبوومێکیش خوای گەورە نێرو مێی دروستکردووە [ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ ] بە شەو ڕووناکی ڕۆژ دائەپۆشێ [ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٣) ] بە دڵنیایی هەموو ئەمانە بەڵگەو نیشانەن لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە..؟!

قال تعالی: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۝١٩٠ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝١٩١﴾ [آل عِمْرَان :

١٩٠ - ١٩١]واته : {بیرکردنه‌وه له دروستکراوه‌کانی خوای گه‌وره} [ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ(١٩٠)] به دڵنیایی له دروست کردنی ئاسمانه‌كان و زه‌ویه‌كان و جیاوازی نێوان شه‌و و رۆژ له تاریكی و رووناكی و له كورتی و درێژی و له ساردی و گه‌رمی و له هێمنی و ئارامی و قه‌ره‌باڵغی ئه‌مانه هه‌مووی به‌ڵگه‌ی روون و ئاشكران له‌سه‌ر تاك و ته‌نهایی و تواناو ده‌سه‌ڵاتی خوای گه‌وره بۆ كه‌سانێك كه خاوه‌نی عه‌قڵێكی ڕاست و ساغ و سه‌لیم و ته‌واو بن ..؟! [ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ ] وه ئه‌و كه‌سانه‌ی كه زیكری خوای گه‌وره ئه‌كه‌ن به‌پێوه وه به دانیشتنه‌وه وه به‌ڕاكشانه‌وه له‌سه‌ر لایه‌كانیان، یاخود وتراوه: مه‌به‌ست پێی نوێژه ئه‌وه‌ی كه نه‌توانێ به‌پێوه بیكات به دانیشتنه‌وه، وه نه‌توانێت به ڕاكشانه‌وه ئه‌یكه‌ن [ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا ] وه بیر ئه‌كه‌نه‌وه له دروست كردنی ئاسمانه‌كان و زه‌وی وه ده‌ڵێن: ئه‌ی په‌روه‌ردگار تۆ ئه‌م زه‌وی و ئاسمان و دروستكراوانه‌ت به‌بێ هوده‌و بۆ یاری و گاڵته دروست نه‌كردووه به پووچه‌ڵی [ سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١) ] پاك و مونه‌ززه‌هی بۆ تۆ ئه‌ی په‌روه‌ردگار كه ئیشی تۆ گاڵته‌و بێ هوده‌یی تیادا نیه خوایه بمانپارێزه له ئاگری دۆزه‌خ، پێغه‌مبه‌ر - صلی الله علیه وسلم - شه‌وێك له ماڵی عائیشه شه‌ونوێژی كردو گریا تا ڕیشی پیرۆزی ته‌ڕ بوو، پاشان چووه سوجده‌و گریا تا زه‌وییه‌كه‌ی ته‌ڕ كرد، پاشان بیلال هات ئیزنی وه‌رگرێت بۆ بانگی به‌یانی پێی وت ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلی الله علیه وسلم - چی ده‌تگرێنێت له كاتێكدا خوای گه‌وره له تاوانی رابردوو داهاتووت خۆش بووه؟! فه‌رمووی: ئه‌ی بیلال هاوار بۆ خۆت چی رێگریم لێ بكات له گریان كه ئه‌مشه‌و هه‌ندێك ئایه‌تم بۆ دابه‌زیوه هه‌ڕه‌شه‌ی سه‌خت له‌و كه‌سانه‌ی كه ئه‌یخوێننه‌وه‌و بیری لێ ناكه‌نه‌وه واته: هه‌ر كه‌سێك ئه‌م ئایه‌تانه‌ی خوێنده‌وه ئه‌بێ بیری لێبكاته‌وه ..؟!

قال تعالى: ﴿وَأَلْقَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَٰرًا وَسُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٍ ۚ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴿١٦﴾﴾ [النَّحْل : ١٥ - ١٦]واته : [ وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ ] وه له زه‌ویشدا ئه‌و شاخانه‌ی چه‌قاندووه وه‌كو مێخ بۆ ئه‌وه‌ی كه زه‌وی نه‌جووڵێت و نه‌هه‌ژێت [ وَأَنْهَارًا وَسُبُلًا ] وه رووبارو رێگایشی بۆ داناون بۆ ئه‌وه‌ی له گه‌شته‌كانتاندا به‌و رێگایانه‌دا برۆن [ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ] به‌ڵكو رێگای خۆتانی پێ بدۆزنه‌وه..؟!

قال تعالى: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْآيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٩٧﴾﴾ [الْأَنْعَام : ٩٧]واته : [ فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ ] كۆمه‌ڵێ نیشانه‌ی روون و ئاشكراو دروشمه‌كانی خوا له‌وێ هه‌یه وه‌كو صه‌فاو مه‌روه وه شوێنی راوه‌ستانی ئیبراهیمیشی لێیه كه دیواره‌كه‌ی كه‌عبه‌ی دروست كرد چووه سه‌ر ئه‌و به‌ردانه [ وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا ] وه هه‌ر كه‌سێ بچێته ناو كه‌عبه‌ی پیرۆز ئه‌وه ترسی نابێ وه ئه‌مین ئه‌بێ [ وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ] حه‌قی خوای گه‌وره‌یه به‌سه‌ر به‌نده‌كانی كه له ته‌مندا جارێك حه‌جی ماڵی خوای گه‌وره بكه‌ن هه‌ر كه‌سێ توانای هه‌بێ توانای لاشه‌و جه‌سته و پاره، وه رێگا ئه‌من و ئاسایش بێ [ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ] وه هه‌ر كه‌سێك كه كوفر بكات واته: حه‌ج نه‌كات و باوه‌ڕی به حه‌ج نه‌بێ ئه‌وا خوای گه‌وره بێپێویسته‌و ده‌وڵه‌مه‌نده‌و پێویستی به هیچ كه‌س نیه له جیهان، به‌م ئایه‌ته حه‌ج فه‌رز بوو..؟!

## زیاد بوونی هیدایه‌ت و ڕێنموونی

**بەڵێ ئەگەر بەندە باوەر بە قورئانی پیرۆز بهێنێ ، ئەوا سوود یان بەختی خۆی لێ وەر دەگرێ ، بە گشتی لە لایەن قورئانەوە ڕێنموویی ، وە پێش فەرمان کردن ئاگادار کردنەوە نەهی کردن ، چونکە هەواڵەکەی بەراست داناوە ، ئەمەش هۆکارێکە بۆ گەیاندن بە هیدایەت یان ڕێنمووی کردن ، چونکە هیدایە کۆتایی نیە ، چونکە زیاد بوونی باوەری زیاد بوونی پارێزگاری و تەقواداریە ..؟!**

قال تعالى: ﴿يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٦﴾ [المَائـِدَة : ١٦] واته : [ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ ] بەهۆی ئەو قورئانەوە خوای گەورە هیدایەتی هەر کەسێك ئەدات کە شوێن ڕەزامەندی خوای گەورەو ڕێگای سەلامەتی و پارێزراوی لە سزای خوا وە ڕێگای گەیشتن بە (دار السلام) کە بەهەشتە بکەوێت [ وَيُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ ] وە دەربان دەکات لە تاریکییەکانی کوفرو شیرك و گومرایی بۆ ڕووناکی ئیسلام و ئیمان و سوننەت و چاکە بە ئیزنی خوای گەورە [ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ] وە هیدایەتیان ئەدات بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گەورە..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٩﴾ [يُونُس : ٩] واته: [ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ ] بە دڵنیایی ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە خوای گەورە لە دونیادا بەهۆی ئیمان و کردەوەی چاکی خۆیان هیدایەتیان ئەدات، وە لە قیامەتیش لەسەر پردی (صیراط) ڕێنماییان دەکات بپەڕنەوەو بگەنە بەهەشت، (کردەوەی چاك ئەوەیە بۆ خوا بێت و بۆ ریا نەبێت، وە لەسەر سوننەت بێت و بیدعە نەبێت) [ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ] لەناو بەهەشتی هەمیشەییدا کە تیایدا ئەمێننەوە جۆگەلە ئاو بەژێر دارو ماڵەکانیاندا تێئەپەڕێ..؟!

قال تعالى: ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗىۗ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا ٧٦﴾ [مَرۡيَم : ٧٦] واته : [ وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى ] وە خوای گەورە ئەوانەی کە ئەهلی هیدایەت بوونە زیاتر هیدایەتیان ئەدات [ وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَابًا ] وە ئەو شتانەی کە ئەمێننەوە لە چاکەکان لە زیکر کردن (سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر) یاخود نوێژە جەماعەتەکان، یان هەر کردەوەیەکی چاك ئەوانە باشترە کە مرۆڤ بیکات و لای خوای گەورە پاداشتی باشترە [ وَخَيْرٌ مَرَدًّا ] وە باشترین سەرەنجامە کە ئەگەڕێنەوە بۆی..؟!

قال تعالى: ﴿نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى ١٣﴾ [الكَهۡف : ١٣] واته: {ئەوان گەنجانێکی باوەڕدار بوون} [ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ ] ئەی محمد – ﷺ - ئێمە هەواڵی ئەوانت بە حەق بۆ باس ئەکەین و بۆت ئەگێڕینەوە نەك وەك ئەو هەواڵانەی لەلای ئەهلی کتاب هەیە کە ڕاست نیە [ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ ] بەدڵنیایی ئەمانە کۆمەڵێك گەنج بوون ئیمانیان بە خوای خۆیان هێنا (هەمیشە گەنجان زیاتر روو لە حەق دەکەن، وە ئەوانەیشی باوەڕیان بە پێغەمبەری خوا – ﷺ - هێنا زۆربەیان گەنج بوون و کەمێك لە پیرەکان موسڵمان بوون و زۆربەیان لەسەر شەریك دانان بۆ خوا مردن) [ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ] وە ئێمەش زیاتر هیدایەتمان دان و دامەزراومان کردن (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیادو کەم دەکات، بە گوێرایەڵی و کردەوەی چاك زیاد دەکات و بە تاوان و سەرپێچی کەم دەکات) ..؟! قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ١٧﴾ [مُحَمَّد : ١٧]واتە: وە ئەوانەیشی کە ڕێگای هیدایەتیان گرتۆتەبەرو هاتوونەتە سەر ڕێگای ڕاستی خوای گەورە ئەوا خوای گەورە زیاتر هیدایەتیان ئەدات و دامەزراویان دەکات لەسەری و تەقوایان پێ ئەبەخشێ..؟!

## هۆكاره‌كانی بێ به‌ش بوون یان دوور كه‌وتنه‌وه له هیدایه‌ت یان رێنموویی

### یه‌كه‌م: (الكفر) واته: بێ باوه‌ری

به‌لێ له قورئانی پیرۆز چه‌ندی ئایه‌ت ئاماژه به‌وه ده‌كات ، كه (خوای گه‌وره ) كافران یان بێ باوه‌ران محروم ده‌كات یان رێگریان لێ ده‌كات له هیدایه‌ت و رێنموویی كردن و توفیق بوون ..؟!

قال تعالى: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٧﴾ [التَّوۡبَة : ٣٧]واته: وه خوای گه‌وره هیدایه‌تی كافران نادات..؟!

قال تعالى: ﴿كَيۡفَ يَهۡدِي ٱللَّهُ قَوۡمٗا كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ وَشَهِدُوٓاْ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقّٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٦﴾ [آل عِمۡرَان : ٨٦]واته: [ كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ] چۆن خوای گه‌وره هیدایه‌تی كه‌سانێك ئه‌دات كه كافر بنه‌وه له دوای ئیمان هێنانیان [ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ ] وه شایه‌تیان داوه كه پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - حه‌قه [ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ ] وه به‌ڵگه‌ی ڕوون و ئاشكرایان بۆ هاتووه [ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٨٦) ] به دڵنیایی خوای گه‌وره هیدایه‌تی كه‌سانێكی ئاوا سته‌مكار نادات كه حه‌قه‌كه بناسن و دواتر لێی پاشگه‌ز ببنه‌وه ..؟!

### دووه‌م : (الظلم ) واته: سته‌م كردن

به‌لێ سته‌م كردن ، به‌ر به‌ستێك له به‌ر به‌سته‌كانی هیدایه‌ت یان رێنموویی كردن ، چونكه هۆیه كه له هۆكاره‌كانی سته‌م كردن ، هه‌ر وه‌ك ئه‌وه‌ی كه خاوه‌نه‌كه‌ی محروم یان بێ به‌شی ده‌كات له هیدایه‌ت یان رێنموویی ، چونكه سته‌م كردنی گه‌وره خاوه‌نه‌كه‌ی له بازنه‌ی ئیسلام بێ به ش ده‌كات یان ده‌رده‌چێت و له ناو ئیسلام نامێنی..؟!

قال تعالى: ﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾ [المَائـِدَة : ٥١]واته: [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ ] ئه‌ی باوه‌ڕداران ئێوه جووله‌كه‌و گاوره‌كان مه‌كه‌ن به‌دۆست و خۆشه‌ویستی خۆتان و ئه‌وانتان خۆش نه‌وێت و باوه‌ڕدارانتان خۆش بوێ، وتراوه: مه‌به‌ست له مونافیقان بووه كه به‌ئیماندار ناوبراون له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئیمانیان ئاشكرا كردووه به‌ڵام خۆشه‌ویستی و پشتیوانی خۆیان بۆ گاورو جووله‌كه ده‌رئه‌بڕی [ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ] ئه‌وان جووله‌كه‌كان هه‌ندێكیان دۆست و پشتیوان و سه‌رخه‌ری هه‌ندێكی تریانن وه گاوره‌كان هه‌ندێكیان دۆست و پشتیوان و سه‌رخه‌ری هه‌ندێكی تریانن [ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ] ئه‌ی موسڵمانان ئاگادار بن هه‌ر كه‌سێك له ئێوه وه‌لائی بۆ گاورو جووله‌كه هه‌بێ و خۆشیانی بوێت و سه‌ریان بخات و پشتیوانیان بێت و یارمه‌تیان بدات ئه‌وه له‌وان حیساب ئه‌كرێت و له‌وانه [ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ] به‌راستی خوای گه‌وره هیدایه‌تی كه‌سانێكی ئاوا زاڵم و سته‌مكار نادات كه وه‌لائو خۆشه‌ویستیان بۆ گاورو جووله‌كه هه‌بێت..؟!

قال تعالى: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ۝١٣﴾ [لُقْمَان : ١٣]واته : ئه‌ی کوڕی خۆم شه‌ریك و هاوبه‌ش بۆ خوای گه‌وره بڕیار مه‌ده له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خوای گه‌وره تاك و ته‌نهاو بێ هاوه‌ڵه [ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ] به‌ڕاستی شه‌ریك دانان بۆ خوا گه‌وره‌ترین زوڵم و سته‌مه كه كرابێت..؟!

## سێ یه‌م : (الفسق ) واته: ده‌رچوون له سنووری (خوای گه‌وره)

**به‌ڵێ (الفسق ) واته: ئه‌نجامدانی گوناهی گه‌وره یان گوێڕایه‌ڵی نه‌كردنی فه‌رمانه‌كانی (خوای گه‌وره) و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ ، یان كاروكرده‌وه‌ی به‌ده ئه‌خلاقی و به‌د ره‌وشتی ، كرداره نابه‌سه‌نده‌كان و ناشه‌رعیه‌كان، ئه‌مه ده‌رچوونه له گوێڕایه‌ڵی كردنی (خوای گه‌وره ) ئه‌مه‌ش په‌لده‌كێشی بۆ هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ی دله كان ، وه بێ به‌ش بوون له هیدایه‌ت یان ڕێنموویی كردن ..؟!**

قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝٥﴾ [الصَّف : ٥]واته : { به‌نی ئیسرائیل ئازاری موسا پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - ده‌ده‌ن} [ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي ] وه كاتێك كه موسا - صلى الله عليه وسلم - به قه‌ومه‌كه‌ی فه‌رموو: ئه‌ی قه‌ومی خۆم بۆچی ئازارم ئه‌ده‌ن به‌وه‌ی كه سه‌رپێچی فه‌رمانم ئه‌كه‌ن یان جوێنم پێ ده‌ده‌ن و قسه‌ی ناشیرینم پێ ئه‌كه‌ن، یاخود تانه‌و ته‌شه‌رم لێ ئه‌ده‌ن [ وَقَدْ تَعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ ] له كاتێكدا كه ئه‌زانن من پێغه‌مبه‌ری خوای گه‌وره‌م و بۆ لای ئێوه نێردراوم [ فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ ] كاتێك له شوێنكه‌وتنی حه‌ق لایاندا به‌وه‌ی ئازاری پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یاندا خوای گه‌وره زیاتر دڵیانی له‌سه‌ر حه‌ق و هیدایه‌ت لادا [ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ] وه خوای گه‌وره هیدایه‌تی كه‌سانێكی فاسق نادات كه له گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره ده‌رچووبێتن..؟!

قال تعالى: ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ أَسۡتَغۡفَرۡتَ لَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ لَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝٦﴾ [المُنَافِقُون : ٦]واته : [ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - یه‌كسانه ئه‌گه‌ر داوای لێخۆشبوونیان بۆ بكه‌ی له خوای گه‌وره یان داوای لێخۆشبوونیان بۆ نه‌كه‌ی خوای گه‌وره لێیان خۆش نابێ، چونكه ئه‌وان به‌رده‌وامن له‌سه‌ر نیفاق و كوفرو موسڵمان نه‌بوونه و په‌شیمان نه‌بوونه‌ته‌وه [ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ] به‌ڕاستی خوای گه‌وره هیدایه‌تی كه‌سانێكی فاسق نادات كه له گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره ده‌رچووبێتن وه ڕۆچووبێتن له تاوان و سه‌رپێچی..؟!

قال تعالى: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝٨٠﴾ [التَّوۡبَة : ٨٠] واته: [ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئه‌گه‌ر تۆ داوای لێخۆشبوون بۆ مونافیقان بكه‌یت له خوای گه‌وره یان داوایان بۆ نه‌كه‌یت، یه‌كسانه [ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ ] چونكه ئه‌گه‌ر حه‌فتا جار داوای لێخۆشبوونیان له خوای گه‌وره بۆ بكه‌ی، خوای گه‌وره لێیان خۆش نابێ [ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ] چونكه ئه‌وان كوفریان كردووه به خواو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی - صلى الله عليه وسلم - [ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ (٨٠) ] وه خوای گه‌وره هیدایه‌تی كه‌سانێك نادات كه ده‌رچووبێتن له گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره، ئه‌م ئایه‌ته له‌سه‌ر (عبدالله¬ی كوڕی ئوبه‌ی كوڕی سه‌لول) گه‌وره‌ی مونافیقان دابه‌زی كه مرد پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - نوێژی له‌سه‌ر كرد، ئیمامی عومه‌ر فه‌رمووی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - نوێژی له‌سه‌ر مه‌كه‌و داوای لێخۆشبوونی بۆ مه‌كه ئه‌مه مونافیقه، فه‌رمووی: خوای گه‌وره ئه‌فه‌رمووێ: ئه‌گه‌ر حه‌فتا جاریش داوای لێخۆشبوونی بۆ بكه‌ی لێی خۆش نابم ئه‌گه‌ر بزانم زیاتر له حه‌فتا جار داوای لێخۆشبوونی بۆ بكه‌م خوای گه‌وره لێیخۆش

ئەبێ ئەوە زیاتر داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە بۆ ئەکەم، خوای گەورە نەهی لێ کردو فەرمووی داوای لێخۆشبوون بۆ کافرو موونافیق مەکە، (ئەمە رەحمەت و بەزەیی پێغەمبەری خوایە - صلى الله عليه وسلم - بەرامبەر گەورەی دووڕووەکان کە بە درێژایی تەمەنی ئازاری پێغەمبەری خوای - صلى الله عليه وسلم - دەداو کێشەی بۆ دروست دەکرد..؟!

## چوارەم : (الكذب) واتە: درۆ کردن

**بێ گومان (خوای گەورە ) ڕێ ڕاست و دروست ، وە موفق یان ناکات بۆ هیدایەتدان کە خەلکانی درۆزن نادات ، چونکە هەمیشە و بەردەوام درۆزن روو رەشە لە لای (خوای گەورە) و پێغەمبەرەکەی ، وە لە ژیانی دونیاشدا لە لای خەلکی بە کەسێکی هیچ پووچ و بەد رەفتار ناو دەبرێت ، بۆیە بەردەوام سەر شۆرو ریسوایە لەلای خەلك..؟!**

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ۝٣﴾ [الزُّمَر : ٣]واتە: بە دڵنیایی خوای گەورە هیدایەتی کەسانێك نادات کە زۆر درۆزن و زۆر کافر بن..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ۝٢٨﴾ [غَافِر : ٢٨] واتە : بەڕاستی خوای گەورە هیدایەتی کەسێك نادات کە زیادڕەوی بکات لە تاواندا وە زۆر درۆزن بێت، واتە ئەم وانیەو وتەو کردەوەی لەوپەڕی جوانی و چاکیدایەو ئەگەر درۆی بکردایە دەردەکەوت و خوای گەورە ئاوا هیدایەتی نادا کە هەمووتان دڵنیان لە راستگۆییدا..؟!

قال تعالى: ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١٤٤﴾ [الأَنْعَام : ١٤٤] واتە: کێ زاڵمترە واتە: هیچ کەسێك لەو کەسە زاڵمترو ستەمکارتر نیە کە درۆ هەڵئەبەستێ بۆ خوای گەورەو بەناو خوای گەورەوە قسە دەکات و شت حەلاڵ و حەرام ئەکات [ لِيُضِلَّ النَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ] تا خەڵکی گومڕا بکات بەبێ زانیاری [ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ] بەڕاستی خوای گەورە هیدایەتی کەسانێکی ستەمکار نادات کە بەناو خوای گەورەوە قسە بکەن و خۆیان شت بۆ خەڵك حەڵاڵ بکەن و حەرام بکەن..؟!

قال تعالى: ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ۝١٧﴾ [يُونُس : ١٧]واتە: [ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ] کێ لەو کەسە ستەمکارترە، واتە: هیچ کەسێك لەو کەسە ستەمکارتر نیە کە درۆ بۆ خوای گەورە هەڵبەستێ و بەناو خوای گەورەوە قسە بکات [ أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ ] یاخود وەکو ئێوە ئایەتەکانی خوای گەورە بەدرۆ بزانێ [ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْمُجْرِمُونَ ] بە دڵنیایی خوای گەورە کەسانی تاوانبار سەرفراز ناکات..؟!

## پێنجەم: (الکبر) واتە: خۆ بەگەورە

**بەڵێ لووت بەرز یان خۆ بە گەورە زانی خۆی نمایش دەکات ، چونکە مۆری لە دلی دراوە ، ئەویش لە دەستەی کەم عەقل و بێ ئاگاکانە ..؟!**

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ٣٥﴾ [غافِر : ٣٥]واتە: [ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ ] ئەو کەسانەی کە مشتومڕو دەمەقاڵێ ئەکەن لە ئایەتەکانی خوای گەورە بەبێ بەڵگەیەك کە بەدەستیانەوە بێ بۆ ئەوەی بەتاڵی بکەنەوەو ڕەتی بکەنەوە [ كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ وَعِنْدَ الَّذِينَ آمَنُوا ] بەهۆی ئەم کردەوەیەیان خوای گەورەو باوەڕدارانیش زۆر لێیان تووڕە ئەبن و ڕقیان لێیانە چونکە ئەیانەوێ بە باتڵ و پوچەڵ حەق بەتاڵ بکەنەوە [ كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ] بەم شێوازە خوای گەورە مۆر ئەدات لەسەر دڵی هەموو کەسێکی خۆبەگەورەزان و لووتبەرزی زۆر عیناد..؟!

قال تعالى: ﴿كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٣﴾ [الصَّف : ٣]واتە: خوای گەورە تووڕەبوون و ڕق لێبوونێکی زۆر ڕقی لەو کەسانەیە کە تەنها قسە ئەکەن و بە کردەوە نایسەلمێنن، یاخود شتێکیان نەکردووە ئەڵێن: کردوومانە..؟!

## شەشەم : (الخیانە) واتە: ناپاکی

**بەڵێ (الخیانە ) یان ناپاکی کردن خەسلەتێکی سەرزەنشتکراوە یان زەم کراوە ، بۆیە خاوەنەکەی لە هیدایەتدان یان ڕێنموویی کردن بێ بەش و محروم دەکات ..؟!**

قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٢﴾ [يُوسُف : ٥٢]واتە: [ ذَلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ ] یوسف - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی، یان ئافرەتەکە وتی (تەواوتر ئەوەیە ئەمانە قسەی ئافرەتەکەیە چونکە هێشتا یوسف - صلى الله عليه وسلم - لە بەندینخانە نەهاتۆتە دەرەوە): تا عەزیزی میصر بزانێ کە من خیانەتم لێ نەکردووە بە زینا کردن کاتێك کە خۆی لە ماڵ نەبووە بەڵکو تەنها ویستێك بوو [ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ ] وە خوای گەورەش هیدایەتی نەخشەو پیلانی ناپاکان و خائینان نادات..؟!

قال تعالى: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةٗ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٨﴾ [الأَنفال : ٥٨]واتە: [ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً ] وە ئەو کەسانەی کە عەهدو پەیمان و بەڵێنت لەگەڵیاندا هەیە ئەگەر لەوە ترسای کە بەڵێنەکە هەڵبەوەشێننەوەو خیانەت و ناپاکی لێ ئەکەن [ فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ ] ئەوا ئاگاداریان بکەوە کە تۆیش پەیمانەکەت لەگەڵیاندا هەڵوەشاندۆتەوە بە یەکسانی و لەسەرخۆیی، کە هەردوو لاتان یەکسانن کە ئیتر پەیمان لەنێوانتاندا نەما، بەڵام خیانەت نەکەیت و دەستپێشخەری نەکەیت لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمان [ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ ] چونکە بەڕاستی خوای گەورە کەسانی خائین و ناپاکی خۆش ناوێ تەنانەت لەگەڵ کافریشدا نابێ خیانەتیان لێ بکەن..؟!

## حەوتەم : (الضلال ) واتە: گومڕایی یان سەر گەردان و سەر لێ شێواو

**بەلێ چونکە گومڕایی یان سەرگەردانی پێچەوانەی هیدایەتە یان ڕێنموویی یە ، هەر بۆیە گومڕایی هیدایەت بە یەکەوە کۆنابنەوە یان (جمع ) نابن ، دەبێت تەنها یەکێکیان تێدا بێت یان گومڕایی یان هیدایەت ، چونکە هەرگیز ناکرێت لە گەل یەکتری دا ناگونجێن و مستحیلە ، چونکە پێچەوانەی یەکترین یان دژ بە یەکن ..؟!**

قال تعالى: ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ۝٣٦﴾ [الزُّمَر : ٣٦]واتە: وە هەر کەسێك خوای گەورە گومڕای بکات و شایەنی گومڕایی بێت کەس ناتوانێ هیدایەتی بدات..؟!

قال تعالى: ﴿يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ۝٣٣﴾ [غَافِر : ٣٣]واتە: [ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ] لەو ڕۆژەدا کە پشت هەڵئەکەن و بەرەو ئاگری دۆزەخ ئەڕۆن هیچ کەسێك نیە جگە لە خوای گەورە پارێزەرتان بێ و لە سزای خوای گەورە بتانپارێزێ [ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ] وە هەر کەسێکیش خوای گەورە گومڕای بکات و شایەنی گومڕایی بێت و ڕێگەی هیدایەت نەگرێتە بەر ئەوە کەس ناتوانێ هیدایەتی بدات..؟!

## هەشتەم:( ابتاع خطوات الشیطان ) واتە: شوێن کەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان

**بەلێ چونکە بە دوای شوێنکەوتن و هەنگاوەکانی شەیتان بکەوین ، چونکە شەیتان کردەوەکانی مرۆڤ جوان ڕازەوە دەکات ، بە جۆرێك کردەوە خراپەکان بە باش بزانی یان سەیری بکەی ، نەك هەر ئەم خراپەکاریە بەلکو ڕێگری دەکات هەنگاو بنێت بۆ هیدایەت ..؟!**

قال تعالى: ﴿وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ۝٢٤﴾ [النَّمۡل : ٢٤]واتە : [ وَجَدْتُهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِنْ دُونِ اللَّهِ ] بینیم خۆی و قەومەکەی کڕنوش بۆ خۆر ئەبەن و عیبادەت بۆ خۆر ئەکەن و جگە لە خوای گەورە دەپەرستن (کۆشکێکی بەرزو پتەوی هەبووە کە سێ سەدو شەست تاقی تیادا بووە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەوەو وا دروستکراوە کە هەموو ڕۆژێك خۆر لە تاقێکەوە هەڵبێت و لە تاقێکی بەرامبەریەوە ئاوا بێت بۆ ئەوەی بەیانیان و ئێواران کوڕنوش و سوجدەی بۆ بەرن) [ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ ] وە شەیتان ئەم کوفرەی بۆ ڕازاندنەوە کە عیبادەت بۆ خۆر بکەن [ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ ] وە هەر شەیتانە ڕێگری کردوون لە ڕێگەی ڕاستی خوای گەورە کە ئیمان بە خوای گەورە بێنن [ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ] وە ئەوانیش ئێستا ڕێگەی حەق نادۆزنەوە..؟!

قال تعالى: ﴿وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ۝٦٠﴾ [النِّسَاء : ٦٠]واتە : وە شەیتان ئەیەوێ گومڕایان بکات و لە ڕێگای ڕاست دووریان بخاتەوە گومڕاکردنێکی زۆر دوور..؟!

**ئایه‌تی (٧١)**

قال تعالى: ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟ ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٧١]

واته : [ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَا ذَلُولٌ ] فه‌رمووی: په‌روه‌ردگار ئه‌فه‌رمووێ: با مانگایه‌ك بێت كه ئه‌وه‌نده كاری نه‌كردبێت كه زه‌لیل كرابێ و زۆر ماندوو شه‌كه‌ت بوو بێت [ تُثِيرُ الْأَرْضَ ] به‌وه‌ی كه زه‌وی پێ كێڵرا بێت [ وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ ] یاخود ئاوی پێ هێنرابێت و زه‌رعاتی پێ ئاو درابێت [ مُسَلَّمَةٌ ] ئه‌بێت پارێزراو بێت ساغ و سه‌لیم بێ له‌ هه‌موو عه‌یب و كه‌موكوڕیه‌ك [ لَا شِيَةَ فِيهَا ] ئه‌بێت ڕه‌نگه‌كه‌یشی ڕه‌نگێكی زه‌ردی ته‌واو بێت هیچ په‌ڵه‌یه‌ك له‌ ڕه‌نگی تری تیا نه‌بێ، یان هیچ عه‌یب و كه‌موكوڕیه‌كی تیا نه‌بێت [ قَالُوا الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ ] وتیان: ئێستا حه‌قت بۆمان هێنا، كه پێشتریش موسى صلى الله عليه وسلم هه‌ر حه‌قی هێنابوو [ فَذَبَحُوهَا ] مانگاكه‌یان دۆزیه‌وه وه‌ سه‌ریان ئه‌بڕی [ وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ] وه نزیك بووه هه‌ر ده‌ستیان نه‌كه‌وێ كه ئه‌گه‌ر نه‌یانوتایه (إن شاء الله) ئه‌وه ئه‌و مانگایه‌یان ده‌ست نه‌ئه‌كه‌وت..؟!

به‌ڵیٰ پێغه‌مبه‌ر موسى – عليه السلام – فه‌رمووی : (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت : مانگایه رانه‌هێنراوه جووت كردن وه زه‌وی پێنه كێلراوه ، وه ئاو دێری كشتو كالیشی پێكرابێت، وه ساغ و ته‌ندروسته بیٰ له هه‌موو كه‌م و كوری ، وه یه‌ك ره‌نگه واته: ره‌نگه كه‌ی رانگی زه‌ردی ته‌واو بێت هیچ په‌له یه‌ك له ره‌نگی تری تیا نه‌بێت ، ووتیان : ئێستا حه‌قت بۆ هێنا یان ئێتستا بۆ مان ده‌ركه‌وت كه تۆ ئه‌ی موسى به راستته و گالته مان پێناكه‌یت ، ئه‌و مانگایه یان دۆزییه‌وه كه (خوای گه‌وره ) بۆی باسكردن ، وه سه‌ریان بری هه‌ر چه‌نده خه‌ریك بوون سه‌ری نه‌برن له به‌ر ئه‌و پرسیار كردن ده‌مه‌قاله‌ی كردیان ، وه ئه‌و كه‌لله‌ره‌قیه كه نواندیان ..؟!

به‌ڵیٰ نه‌وه‌ی جووله‌كه ئه‌وه‌نده پرسیاریان كرد و ئه‌وه‌نده‌یان ده‌مه‌قالی كرد له سه‌ر خۆیان توند و قورس كرد ، هه‌ر بۆیه له به‌ر بیٰ مێشكی و كه‌م عه‌قلی خۆیان (خوای گه‌وره ) ئه‌م مه‌رجانه‌ی سه‌پاند به سه‌ریاندا :

١–قال تعالى: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ [البَقَرَةِ : ٦٨]

٢–قال تعالى: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٦٩]

٣–قال تعالى: ﴿إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٧١]

بێ گومان جورەئەت و بەدە رەوشتی نەوەی جوولەکە  لە ئینکاری کردنی ئەوە کە (موسى ) – علیه السلام – پێی هاتووە لە لایەن (خوای گەورە ) ، هەلبەتە تانە لێدانیان لەبەر ئەم ووتەیە : قال تعالى: ﴿ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّ﴾ ، وەك ئەوە وایە وای ببینن کە ئەوەی پێشتر (موسى ) – علیه السلام – پێ هاتبوو یان بۆ بەیان کرد بوون ، ئەوا بە بە عەقلی خۆیان پێشتر (موسى ) حەقی بەیان نەکردبوو ، ئەمەش بێ رەوشتێکی تری دەربینی ووتەکانی جوولەکەیە ، بە بەلگەی قال تعالى: ﴿أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗا﴾ [البَقَرَةِ : ٦٧] واتە: وویتان : ئەی (موسى ) تۆ گالتە و یاری و سووکایەتیمان پێ دەکەیت ..؟! هەروەها هەر لەسەر ئەم ووتەی بەم مانایەش دەگەیەنێ ، قال تعالى: ﴿ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّ﴾ واتە: ئا ئێستا ئیتر هەوالی راستە قینەت پێداین ، کەواتە : پێشتر (موسى) هەولی راستی پێ نەگووت بوون ، یان راستی لەگەل نە ووت بوون ..؟! ئا ئەمەی جوولەکە پێغەمبەرکەیان بەراست نەدەزانی..؟! بەلێ ووتیان : ئەی (موسى ) ئێستا ئیتر هەوالی راتە قینەت پێداین ، لە روون کردنەوەی تەواو سە بارەت بە سەر برینی مانگا ..؟! بێ گومان ئەمە بەلگەیە لە سەر بێ مێشکی و نەزانینیان ، چونکە یەکەم جار هەوالی راستە قینەی بۆ باسکردن  ، هەروەك فەرمووی : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗ﴾ [البَقَرَةِ : ٦٧] واتە: (خوای گەورە ) فەرمانتان پێ دەكات بە سەر برینی مانگایەك ..؟!  بەلێ لێرەدا سوودو وانەیەك و عیبرەتێك فێر دەبین لەم چیرۆکەدا ئەویش ئەوەی کە واجبە لە سەر هەر بەندەیەکی ئیماندار دەست پێشخەری بکات لە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) ، وە ترك کردن یان وازهێنان لە ئینکاری و عینادی کردن و خۆ بە گەورە دانان ، چونکە پێچەوانەی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) یە ، یان دواخستنی جێ بەجێ کردن هۆکار بۆ توند بوونی کارەکە ، یان زۆر پرسیار کردن لە شت ئەویش دەبێتە توند کردنی تاقی کردنەوەی (خوای گەورە) لە سەر بەندە ..؟! یان زۆر دەمەقالی و پرسیار کردن هۆکارە بۆ تووش بوون بە سەرپێچییەکی گەورەتر ..؟!

لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ووشەی قال تعالى: ﴿مُسَلَّمَةٞ﴾ واتە: هیچ پەلە یەکیشی تێدا نیە ..؟![1].

لە (ابن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ووتەی قال تعالى: ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ٧١﴾ [البَقَرَةِ : ٧١] واتە : نەوەی جوولە خەریك بوو ئەم کارە نەکەن ، چونکە ئەوان مەبەستیان ئەوە نەبوو ، ئەوان دەیان ویست کە سەری مانگا کە نەبرن ..؟![2].

---

[1]-تفسير الطبري (٢/٢١٤).
[2]- تفسير الطبري (٢/١١٩)ص ٦٩.

## ئایەتی (٧٢)

قال تعالى: ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا ۖ وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾﴾ [البَقَرَة : ٧٢]

[وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا ] کاتێك ئێوە كەسێكتان كوشت بەناحەق وە جیاوازی و ناكۆكی كەوتە نێوانتانەوە هەر كەسێ تاوانەكەی لەسەر خۆی لائەداو ئەیخستە سەر كەسێكی تر [ وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ] وە ئەوەی كە ئێوە شاردوتانەتەوە خوای گەورە ئاشكرای دەكات و دەری دەكات..؟!

**زیندوو بوونەوەی كەسە كوژراوەكەی نەوەی جوولەكە وە ئاشكرا كردنی كەسە بكوژەكەی نەوەی جوولەكە ..؟!**

**هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا ۖ وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾﴾ [البَقَرَة : ٧٢] واتە: ئەو سا یەكێكتان كوشت لە سەر كوژاوەكە یەكتریان تاوان بار دەكرد ، كە (خوای گەورە ) بۆی دەرخست ئەوەی دەتان شاردەوە ..؟!**

**لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەربارەی ووتەی ﴿فَادَّارَأْتُمْ﴾ دەڵێت : واتە: لە ناوە خۆتاندا ناكۆك بوون لە سەری ..؟!.[1]**

**لە (ابن جرير ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەربارەی ووتەی ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا﴾ دەڵێت : واتە : ئەو كاتە كەسێكتان كوشت لە سەر كوژراوەكە یەكتریان تاوان بار دەكرد ، هندێ دەڵێن : ئێوە كوشتان ، هەندێكی تر ووتویانە : بێ گومان ئێوە خۆتان كوشتان ..؟![2]**

**لە(عبدالرحمن كوری زیدی كوری ئەسلەم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەربارەی ووتەی ﴿وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾﴾ دەڵێت : واتە : ئێوە خۆتان كوشتوتانە ، ئەوەی كە دەتان شاردەوە خودا ئاشكرای كرد ..؟![3]**

**لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەربارەی ووتەی ﴿مَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾﴾ دەڵێت : واتە: ئەوەی دەتان شاردەوە ..؟! .[4]**

---

[1]-فتح الباري (٥٠٦/٦) .
[2]-الطبري (٢٢٥/٢).
[3]-الطبري (٢٢٥/٢).
[4]-ابن ابي حاتم (٢٢٩/١).

بەڵێ دەربارەی ئەوەی کە (خوای گەورە ) دفەرموویێت : ﴿وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ۝٧٢﴾ واتە : (خوای گەورە ) ئەوەی کە ئێوە دەی شارنەوە هەر ئاشکرای دەکات و هەر دەریدێنێ و کەشفی دەکات ، کە بەراستی ئەمە سوننە تێکی خوایە هەر شتێك خەڵك بیشارنەوە خێر بێت یان شەر بێت ، هەر ئاشکرای دەکا یان هەر کەشفی دەکات ..؟! هەروەها (خوای گەورە ) هەر دەری دەخات ، جا چ لە دونیا بێت یان لە قیامەت و دوا رۆژ بێت..؟!

لە (ابو سعید الخدری )– خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((لو أنَّ أَحَدَكم يَعمَلُ في صَخرةٍ صَمَّاءَ ليس لها بابٌ ولا كُوَّةٌ ، لخرَج عمَلُه للنَّاسِ كائنًا ما كان )) .[1]
واتە: ئەگەر کەسێك کردەوەیەك بکات لە نێوان بەردێکی رەقدا ، کە نە دەرگای هەبێت و نە تاقەو پەنچەرەی هەبێ ، کردەوەکە دێتە دەرێ بۆ خەڵکی ، کردەوەکەی هەر چییەك بێت ..؟! کەواتە : مرۆڤ پێی وا نەبێت کە ئەو خێرەی دەیکات ، یاخود ئەو خراپەی دەی کات ، پەنهان دەبێ ، بەڵکو خوا بە جۆرێك لە جۆرەکان هەر بۆ خەڵکی دەریدەخات چ لە دونیا بێت ، چ لە قیامەتدا بێت ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ۝٩﴾ [الطَّارق : ٩]واتە : لە ڕۆژێكدا كە ڕۆژی قیامەتە هەموو نهێنییەكان ئاشكرا ئەبن و دەرئەكەون و هیچ نهێنییەك نامێنێ..؟!

بەڵێ زانستی (خوای گەورە ) بە هەمووشتێکە کە بەندەکان دەیشارنەوە و دیاری دەخەن ، لە بەر ووتەی﴿وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ۝٧٢﴾ واتە: ئاگاداركردنەوە و خۆپاراستن لە شاردنەوەی حەق ، چونکە هیچ شتێك لە (خوای گەورە ) وون نابێت ..؟!

[1]-اخرجه احمد (١١٢٣٠/١)، ابن حبان برقم (٥٦٧٨) ، شيخ الالباني ضعيف الجامع برقم (٤٧٩٩).

## دەربارەی باسی (الكتمان) واتە: شاردنەوە

### یەكەم : پێناسەی (الكتمان) یان واتاو مانای

أ-(الكتمان) واتە: شاردنەوە لە رووی زمانەوانیەوە :

(الكتمان) واتە: شاردنەوە و داپۆشین ، ئەمەیە كە شتێك بشارێتەوە ، وەك : (أكتمه ، كتما وكتمانا ) یان (سركاتم ) واتە : شاردنەوەی نهێنی ، بۆنموونە : پیاوێك شتێك بە نهێنی دەشارێتەوە ، هەروەك ئەم نموونەیەی قەومی فیر عەون كە پیاوێك ئیمانەكەی دەشاریتەوە ، كە (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤۡمِنٌ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ﴾ [غَافِر : ٢٨]واتە: {باوەڕدارەكەی ئالی فیرعەون بەرگری لە موسا دەكات } [ وَقَالَ رَجُلٌ مُؤْمِنٌ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ ] وە پیاوێكی باوەڕدار كە (قیبطی) بوو، وتراوە: ئامۆزای فیرعەون بوو، لە (قیبطی)هكان تەنها ئەم پیاوە ئیمانی هێناوە لەگەڵ ئاسیای خێزانی فیرعەوندا [ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ ] ئەم پیاوە كە ئیمانەكەی ئەشاردەوەو دەری نەبڕیبوو..؟! ... ).[1]

ب-(الكتمان) لە رووی زاراوەیەوە :

(الكتمان) واتە: شاردنەوە یان داپۆشینی شتێك ، وە وازهێنان لەوەی كە ئاشكرابێت یان بە دیار بكەوێت بە مە بەست ، لە گەل ئەوەی بۆ پێویستی بۆی ، واتە : پێویستیەتی بی شارێتەوە یان دای پۆشێت ، چونكە پێویستە هۆكاری دەركەوتنەكەی پشتراست ببێتەوە ، رەنگە ئەمەش تەنها بە داپۆشین و شاردنەوە ئەنجام بدرێ ، وە لەوانەیە بە لابردنی شتێكی تر لە شوێنی خۆی دابێت ..؟! .[2]

قال تعالى: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ١٤٠﴾ [البَقَرَة : ١٤٠] واتە : وە كێ لەو كەسە زاڵمترە؟ واتە: هیچ كەسێك لەو كەسە زاڵمترو ستەمكارتر نیە كە شایەتیەكی لەلابێت و بیشارێتەوە كە جولەكەو گاور ئەو شتانەیان ئەزانی بەلام دەیانشاردەوە لە موسڵمانان، وە ئەیانزانی كە دینی راست تەنها ئیسلامە وە محمد پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم بەلام دەیانشاردەوە [ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ] وە خوای گەورە بێئاگا نیە لەو كردەوە خراپانەی كە ئێوە ئەیكەن لەم زوڵم و ستەمە..؟!

تێبینی / ووشەی (الكتمان ) لە بەكارهێنانی قورئاند بە زمانەوانی ، بەمانای (الخفاء ، الستر ) هاتووە ، واتە: شاردنەوە داپۆشین ، واتە: (كتمان ) لە رووی زمانەوانیدا بە كاهاتووە لە قورئاندا بەمانای (الخفاء ، الستر ) دێت ، واتە : شاردنەوە و داپۆشین ..؟!

[1] - الصحاح الجوهري (٢٠١٨/٥) ، مجمل اللغة ابن فارس ص (٧٧٧) ، لسان العرب ابن منظور (٥٠٦/١٢).
[2] -مفاتح الغيب الرازي (١٤٠/٤)، إرشاد العقل السليم ابو السعود (١٨٢/١).

## دووەم : ئەو ووشانەی پەیوەندی دارن بە ووشەی (الکتمان)

١-(الإخفاء ) لەرووی زاراوەی :

(إخفاء) بەمانای : (الستر) واتە: داپۆشین دێت ، بەرانبەر بە دەربرین یان راگەیاندا یان بەیان کردن دێت ، وەك شاردنەوەی وونکردنی شتێك ، ئەمەش نابێتە ئاماژەیەك بۆ هیدایەت و رێنموویی دانی ئەم ئاراستەیە ..؟! .[١]

(الکتمان ) واتە : شاردنەوەی مانا و بێ دەنگ بوون لە بەیان کردنی ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموێت :
قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٥٩]واتە: {سزای شاردنەوەی دین} [ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ] ئەو كەسانەی كە ئەو شتە ڕوون و ئاشكراو هیدایەتەی كە ئێمە ناردوومانە دەیشارنەوە دوای ئەوەی كە لە كتابەكاندا ئێمە ئاشكرامان كردووە واتە: مەبەست پێی جوولەكەو گاورە وە لە كتابەكانی ئەواندا باسی هاتنی پێغەمبەری خوا كراوە صلى الله عليه وسلم بە ئاشكرا ئەوانیش ئەیشارنەوە وە بە خەڵكی ناڵێن [ أُولَئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ] ئەوانە خوای گەورە نەفرەتیان لێ ئەكات وە هەموو نەفرەتكاران لە فریشتەو جنی و مەلائیكەت و ماسی و نەهەنگەكان و مێرووڵەكان هەموو نەفرەتكارێ نەفرەتیان لێ ئەكات..؟!

٢-(الإکنان) لەرووی زمانەوانیدا :

(الاکنان ) مجع یان کۆیەکەی (کن ) ، (الاکنان ) واتە: شاردنەوە و داپۆشینە یان پەنادان، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا﴾ [النَّحۡل : ٨١]واتە : وە لە شاخەكانیشدا شوێنی وای داناوە كە پەناتان ئەدات لە باران..؟! هەروەها پەنادانی یان داپۆشینی شتێك ، وەکو (خوای گەورە) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿أَوۡ أَكۡنَنتُمۡ فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣٥]واتە: یاخود لە نەفسی خۆتاندا بیشارنەوە تا ئەو ئافرەتە عیددەكەی تەواو ئەبێ..؟! [٢]
هەروەها ووتراوە (الاکنان ) جمعەکەی (کن ) ، واتە: شوێنی و رێگای لە کێوەکان ، بۆ پەنادان یان داپۆشین و خۆپاراستن لە باو باران بارین ..؟! هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً﴾ [الۡأَنۡعَام : ٢٥] واتە : بەڵام ئێمە پەردەمان داوە بەسەر دڵیاندا تا لە قورئانی پیرۆز تێنەگەن، چونكە شایانی هیدایەت نین ..؟! واتە پەنادان .[٣]

---

[١]-المفردات ، الراغب الاصفهاني ص ٢٨٩، الكليات ، الكفوي ص ٥١٤.
[٢]- المفردات ، الراغب الاصفهاني ص ٤٠٤.
[٣]-المحرر الوجيز ، ابن عطية (٣/٤١٢).

ووتراوه : (الاكنان ) : واته: هه‌موو شتێك ده‌پارێزی یان داده‌پۆشیٚ ده‌یگرێته‌وه ، وه‌ك ئه‌وه‌ی كه داپۆشینی ئافره‌ت : بۆئه‌وه‌ی ده‌موچاوی داپۆشێت یان حه‌یاو ئابرووی داپۆشی له ترسی خه‌لكی ..؟! .[1]

٣-(السر) له رووی زمانه‌وانید :

(السر) واته: نهێنی یان ئه‌وه‌ی له نه‌فسی خۆیدا شاردیته‌وه له قسه‌كردن یان قسه‌یه‌كی شاردیته‌وه ، ئه‌وه‌ش پێچه‌وانه ئاشكراكردنه یان راگه‌یاندنه ، (السر) جمع (الاسرار ) واته: نهێنیه‌كان ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویٚت : قال تعالى: ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ﴾ [يُونُس : ٥٤]واته : وه كاتێك كه سزای خوای گه‌وره ئه‌بینن په‌شیمانی و غه‌م و په‌ژاره‌یان ئه‌شارنه‌وه له باوه‌ڕداران به‌ڵام دواتر كه سزاكه به‌سه‌ریاندا جێبه‌جێ ئه‌بێ ئه‌و كاته ئاشكرای ئه‌كه‌ن و ده‌ریئه‌بڕن..؟![2]

(السر) له‌رووی زاراوه‌یی دا :

(السر ) واته: ناوێكه نهێنیه كه له نێو دله‌كان شاراوه‌ن ، وه‌ك : بیرو باوه‌رو نیه‌ت و ووته‌و كرده‌وه‌كان و هی تریش ..؟![3]

٤-(الجهر) له‌رووی زمانه‌وانیدا :

(الجهر) واته: كه‌شف كردنی شتێك ،یان (جهرته واجتهرته ) واته: بینم به‌بیٚ په‌رده نێوان من و ئه‌ودا ، كه‌واته : (الجهر) راگه‌یاندنه له قسه كردندا ، وه‌ك ده‌لێن :( وكان (عمر) رجلا مجهرا )[4] واته:(عمر) خاوه‌نی ده‌نگێكی به‌رزه ، واته : قسه‌كردن ئه‌وه‌یه كه ئاشكرا بكه‌یت ، یان (الجهر ) واته: ده‌نگ به‌رز كردنه‌وه له خوێندنه‌وه‌دا ..؟![5]

(الجهر) له رووی زاراوه‌یی :

(الجهر) واته : ده‌نگ به‌رز كردنه‌وه تاكو گوێی له خۆیی بێت ، وه ده‌وربه‌ریشی گوێی لیٚ بێت ..؟! [6]

[1]-لسان العرب ، ابن منظر (٣٥٦/٤)، المصباح المنير ، الفيومي (٢٧٣/١).
[2]- المفردات ، الراغب الاصفهاني ص ٤٠٤.
[3]- المفردات ، الراغب الاصفهاني ص ٤٠٤.
[4]- اخرجه ابو داود برقم (٤٦٦٢).
[5]-لسان العرب ابن منظور (١٤٩/٤) ، القاموس المحيط الفيروز ابادي (٢١٢/٥).
[6]-معجم لغة الفقهاء ، قلعجي ص١٦٨.

## سێ یەم : هەموو (الكتمان ) یان شاردنەوەیەك (خوای گەورە) پێی دەزانی

بەلێ هیچ شتێك لە لای (خوای گەورە) وون نابێت و شاراوە نیە ، نە لە زەوی و نە لە ئاسمانەکاندا ، کەواتە : باس بابەتی (الكتمان ) شاردنەوە یان داپۆشین لە زانستی (خوای گەروە ) لە قورئانی پیرۆز دا چەند خالێکە :

### یەکەم : زانستی (خوای گەورە) بۆ هەموو شتێك فەرەوانە :

بەلێ زانستی (خوای گەورە ) تەواو گشتگیرە ، وە هیچ شتێك لە سەر زەوی لە ئاسماندا لێی شاراوە نیە ، دەزانێت چی لە ناو زەوی دا هەیە ، وە چی لە زەوی دەچێتە دەرەوە ، وە چی لە ئاسمان دادەبەزێ ،وە ئەوەی تێدا بەرز دەبێتەوە ، چونکە (خوای گەورە ) بە هەموو شتێك زانایە ، ئەم ئایەتانەی خوارەوە بەلگەی فەرەوانی زانستی (خوای گەورە ) یە بە هەموو شتێك ..؟!

١- قال تعالى: ﴿وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا ۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾﴾ [الْأَنْعَام : ٨٠]واتە: وە زانیاری خوای گەورە یەکجار فراوانەو دەوری هەموو شتەکانی داوە ئەوە بۆ یاد ناکەنەوەو بیر ناکەنەوە..؟!

٢- قال تعالى: ﴿وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا﴾ [الْأَعْرَاف : ٨٩]واتە : [ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا ] وە زانیاری خوای گەورە زۆر فراوانەو هەموو دروستکراوانی گرتۆتەوە [ عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا ] ئێمە تەوەکولمان لەسەر تەنها خوایەو پشتمان تەنها بەخوای گەورە بەستووە کە دامەزراومان بکات لەسەر ئیمان..؟!

٣- قال تعالى: ﴿إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾﴾ [طه : ٩٨]واتە : [ إِنَّمَا إِلَهُكُمُ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ ] بە دڵنیایی تەنها پەرستراوی حەقی ئێوە الله یە کە هیچ پەرستراوێك بەحەق نیە شایەنی پەرستن بێت جگە لە زاتی پیرۆزی الله نەبێ ئەمە خواو پەروەردگارو پەرستراوی ئێوەیە نەك ئەم گوێلکە [ وَسِعَ كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا] کە زانست و زانیاری خوای گەورە زۆر فراوانەو هەموو شتێکی گرتۆتەوە..؟!

٤- قال تعالى: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ﴾ [البَقَرَة : ٢٨٢]واتە: [ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ ] وە تەقوای خوای گەورە بکەن ئەوەی کە پێویستتان بێ خوای گەورە فێرتان ئەکات [ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ] بەڕاستی خوای گەورە زانایە بە هەموو شتێك، ئەم ئایەتە ئایەتی دەین و قەرزی پێ ئەووترێ کە درێژترین ئایەتە لە قورئاندا یەك لاپەڕەیەکە..؟!

٥- قال تعالى: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾﴾ [الأَنْعَام : ١٠١] واته : [ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ] خوای گەورە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییەو دروستی کردوون بە شێوازێك کە پێشتر وانەبوونە [ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صَاحِبَةٌ ] خوای گەورە چۆن منداڵی ئەبێت لە کاتێك کە خێزانی نیە ئەمە شتێکی ئەستەمە [ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ ] وە خوای گەورە هەموو شتێکی دروست کردووە بە مەلائیکەت و عیسى و عوزێرو هەموو ئەو کەس و شتانەی تر کە ئەوان ئەیدەنە پاڵ خوای گەورە هەمووی عەبدو دروستکراوی خوای گەورەن [ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ] وە خوای گەورە زانیاری بەهەموو شتێك هەیە..؟!

٦- قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾﴾ [المَائِـدَة : ٩٧] واته: [ ذَلِكَ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] تا بزانن کە خوای گەورە زانیاری هەیە بە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندا هەیە [ وَأَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ] وە بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە بە هەموو شتێك..؟!

٧- قال تعالى: ﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾﴾ [الأَنبِيَاء : ٨١] واته: {خوای گەورە بای بۆ سولیمان پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ژێربار کردبوو} [ وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ ] وە خوای گەورە بای ژێربارو موسەخەر کردبوو بۆ سولەیمان - صلى الله عليه وسلم - بایەك کە وەکو زریان هەڵی ئەکرد بە فەرمانی سولە یمان - صلى الله عليه وسلم - [ إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا ] بۆ ئەو زەویەی کە پڕ خێرو بەرەکەت بوو بەرەکەتمان تێ کردبوو کە زەوی شام (بيت المقدس) بوو (هەرچی پێویست بوایە بە بایەکە دەیگواستەوەو باڵندەیش سێبەری بۆ دەکرد) [ وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ (٨١) ] وە ئێمە زانایین بە هەموو شتێك..؟!

٨-قال تعالى:﴿قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٦﴾﴾ [الحُجُرَات : ١٦]واته : [ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللَّهَ بِدِينِكُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئایا ئێوە خوای گەورە فێری دینەکەتان ئەکەن و ئێوە هەواڵی دین بە خوای گەورە ئەدەن لەوەی کە لە دڵدا شاردوتانەتەوە [ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] لە کاتێکدا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە خوای گەورە زانیاری بەهەمووی هەیەو هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە [ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ] وە خوای گەورە زۆر زانایە بە هەموو شتێك، وە هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە..؟!

٩- قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾﴾ [الحَدِيد : ٣]واته : [ هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ ] وە هەر خوای گەورەیە سەرەتاو یەکەم بووە پێش هەموو کەس و شتێك، وە کۆتاییشە دوای هەموو کەس و شتێك بەتەنها ئەمێنێتەوە دوای ئەوەی هەموو دروستکراوان لەناودەچێت و نامێنێ [ وَالظَّاهِرُ ] وە خوای گەورە بەرزو باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا [ وَالْبَاطِنُ ] وە زانایە بەو شتانەی کە نهێنیە، یاخود بەو شتانەی کە لە دونیادا نادیارەو لە پێش چاو نابینرێت، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەفەرمێت: (اللَّهُمَّ أنتَ الأولُ فَليسَ قبلكَ شَيء، وأنتَ الآخِرُ فَليسَ بعدكَ شَيء، وأنتَ الظاهِرُ فَليسَ فوقكَ شَيء، وأنتَ الباطِنُ فَليسَ دونَكَ شَيء) رواه مسلم. واته: خوایە هەر تۆ سەرەتاو یەکەم بوویتەو پێش تۆ هیچ کەس و شتێك نەبووە، وە هەر تۆ کۆتایی و دواهەمینیت و بە تەنها دەمێنیتەوە دوای لەناوچوونی هەموو دروستکراوەکان، وە هەر تۆ باڵادەستیت بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا، وە هەر تۆ زانایت بە نهێنیەکان و هیچ شتێك نیە کە نهێنی بێت و تۆ نەیبیستیت یان نەیبینیت یان زانیاریت پێی




نه‌بێت و ئاگاداری نه‌بیت [ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ] وه خوای گه‌وره زۆر زانایه به‌هه‌موو شتێك و هیچ شتێك له خوای گه‌وره ناشاردرێته‌وه..؟!

١٠- قال تعالى: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾﴾ [الحَشْر : ٢٢]واته: { هه‌ندێك له ناوه جوانه‌كانی خوای گه‌وره} [ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ] زاتی پیرۆزی (اللَّه) ئه‌و خوایه‌یه كه هیچ په‌رستراوێك به حه‌ق نیه شایه‌نی په‌رستن بێ جگه له زاتی پیرۆزی (اللَّه) نه‌بێت كه ئه‌و خوایه زانای نهێنی و په‌نهان و ئاشكراكانه‌و هیچ شتێكی لێناشاردرێته‌وه [ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ (٢٢) ] وه هه‌ر خوای گه‌وره خوایه‌كی زۆر به‌ره‌حم و سۆزو به‌زه‌یی و میهره‌بانه، یان وتراوه: (الرَّحْمَنُ) بۆ دونیایه ره‌حم به كافرو موسڵمانیش ئه‌كات (الرَّحِيمُ) تایبه‌ته به قیامه‌ت ره‌حمه‌كه‌ی له‌وێ تایبه‌ته به باوه‌ڕداران و له قیامه‌تدا خوای گه‌وره ره‌حم به كافر ناكات..؟!

١٢- قال تعالى: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾﴾ [النِّسَاء : ١٠٨]واته : وه خوای گه‌وره زانیاری هه‌یه‌و زانیاری خوای گه‌وره ده‌وری ئه‌وانی داوه‌و هیچ شتێك له خوای گه‌وره ناشاردرێته‌وه..؟!

١٣- قال تعالى: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطًا ﴿١٢٦﴾﴾ [النِّسَاء : ١٢٦]واته: [ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] وه هه‌رچی له ئاسمانه‌كان و زه‌ویه‌كان و نێوانیاندا هه‌یه هه‌مووی موڵكی خوای گه‌وره‌یه‌و خۆی به ته‌نها هه‌ڵسوكه‌وتی تیادا ده‌كات [ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطًا ] وه زانیاری خوای گه‌وره ده‌وری هه‌موو شتێكی داوه‌و هیچ شتێك له خوای گه‌وره ناشاردرێته‌وه..؟!

١٤- قال تعالى: ﴿إِنَّ رَبِّى بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٩٢﴾﴾ [هُود : ٩٢]واته: به‌راستی په‌روه‌ردگارم زۆر زانایه به‌و كرده‌وانه‌ی كه ئێوه ئه‌یكه‌ن، وه خوای گه‌وره ده‌وری داوه‌و ئاگاداره‌و سزاتان ئه‌دات له‌سه‌ری..؟!

١٥- قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴿٥٤﴾﴾ [فُصِّلَت : ٥٤]واته : [ أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِنْ لِقَاءِ رَبِّهِمْ ] به‌ڵام ئه‌وان گومانیان هه‌یه له زیندوو بوونه‌وه‌و پاداشت و سزاو گه‌یشتن به خوای گه‌وره له رۆژی قیامه‌ت [ أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطٌ ] وه بزانن كه زانیاری خوای گه‌وره ده‌وری هه‌موو شتێكی داوه وه خوای گه‌وره ئاگای له هه‌موو شتێك هه‌یه، والله أعلم..؟!

١٦- قال تعالى: ﴿لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾﴾ [الطَّلَاق : ١٢] واته : تا بزانن خوای گه‌وره توانا‌و ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌یه [ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا ] وه به دڵنیایی زانست و زانیاری خوای گه‌وره ده‌وری هه‌موو شتێكی داوه‌و هیچ شتێك نیه كه خوای گه‌وره زانیاری پێ نه‌بێ و ئاگای لێ نه‌بێت، والله أعلم..؟!

١٧- قال تعالى: ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾﴾ [البَقَرَة : ٩٥]واته: به‌ڵام ئه‌وان هه‌رگیز ئاوات ناخوازن به مردن چونكه ئه‌زانن كه ده‌چنه دۆزه‌خه‌وه به‌هۆی ئه‌و كرده‌وه خراپانه‌ی كه خۆیان ئه‌نجامیان داوه خۆیان ئه‌ناسن [ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ] وه خوای گه‌وره زۆر زانایه به سته‌مكاران..؟!

**دووه‌م : علم و زانینی (خوای گه‌وره ) هه‌موو ئه‌و شتانه‌ ده‌گرێته‌وه‌ که‌ به‌نده‌کانی ده‌ی شارێته‌وه‌ :**

**به‌ڵێ له‌ قورئانی پیرۆز دا چه‌ند ئایه‌تێکی روون ئاشکرا هه‌یه‌ ، که‌ علم و زانینی (خوای گه‌وره ) له‌ سه‌ر ئه‌وه‌ی که‌ به‌نده‌کانی هه‌رچی ده‌شارنه‌وه‌ له‌ خێرو چاکه‌ و ، یان له‌ سته‌م کردن و خراپه‌ ، له‌ کرده‌وه‌کانیان دا ، ئه‌مانه‌ی خواراوه‌ چه‌ند ئایه‌تێکی قورئانی پیرۆزه‌ که‌ هاتووه‌ :**

١- قال تعالى: ﴿قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ [البَقَرَة : ٣٣]واته : [ قَالَ يَا آدَمُ أَنْبِئْهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ ] خوای گه‌وره‌ فه‌رمووی: ئه‌ی ئاده‌م هه‌موو ئه‌و ناوانه‌یان پێ بڵێ [ فَلَمَّا أَنْبَأَهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ ] کاتێك که‌ ئاده‌م ناوی هه‌موو شته‌کانی پێ وتن [ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ] خوای گه‌وره‌ فه‌رمووی: ئایا من پێتانم نه‌ووت که‌ من نهێنی ئاسمانه‌کان و زه‌وی ئه‌زانم، وه‌ ئه‌وه‌ی که‌ ئاشکرای ده‌که‌ن و ده‌ریئه‌برِن ئه‌ویش هه‌ر ئه‌زانم که‌ وتتان ئه‌مه‌ی که‌ تۆ دروستی ئه‌که‌یت ئاشوب ئه‌گێڕێ له‌سه‌ر زه‌وی و خوێن ئه‌ڕێژێ، ئه‌وه‌یشی که‌ شاردووتانه‌وه‌ ئه‌ویش ئه‌زانم له‌وه‌ی که‌ ئیبلیس له‌ نه‌فسی خۆیدا ته‌که‌بورو لووتبه‌رزی شاردبۆوه‌..؟!

٢- قال تعالى: ﴿يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ١٦٧﴾ [آل عِمۡرَان : ١٦٧]واته : به‌ده‌م شتێکیان ده‌ووت که‌ ئیمانیان ده‌رئه‌بڕی به‌ڵام ئیمان له‌ دڵیاندا نه‌بوو کوفریان شاردبۆوه‌ [ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ] به‌ڵام خوای گه‌وره‌ زۆر زاناتره‌ به‌وه‌ی که‌ شاردوویانه‌ته‌وه‌ له‌ کوفر ..؟!

٣- قال تعالى: ﴿وَإِذَا جَآءُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلۡكُفۡرِ وَهُمۡ قَدۡ خَرَجُواْ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكۡتُمُونَ ٦١﴾ [المَائـِدَة : ٦١]واته : [ وَإِذَا جَاءُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا ] کاتێك که‌ مونافیقان دێن بۆ لای ئێوه‌ ئه‌ڵێن: ئێمه‌ ئیمانمان هێناوه‌و ئیمان ئاشکرا ئه‌که‌ن [ وَقَدْ دَخَلُوا بِالْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا بِهِ ] که‌ چوونه‌ته‌ ناو کوفره‌وه‌ وه‌ ئه‌مان به‌کوفریشه‌وه‌ ده‌رچوونه‌ واته‌: که‌ دێنه‌ لای تۆ ئه‌ی محمد- صلى الله عليه وسلم - به‌کوفره‌وه‌ دێن وه‌ که‌ ده‌ریش ئه‌چن هه‌ر به‌ کوفره‌وه‌ ده‌رئه‌چن واته‌: له‌لای تۆ هیچ سوودێك نابینن [ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا يَكْتُمُونَ ] وه‌ خوای گه‌وره‌ خۆی زاناتره‌ به‌وه‌ی که‌ له‌ دڵیاندا شاردوویانه‌ته‌وه‌ له‌ کوفر کردن..؟!

٤- قال تعالى: ﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ٩٩﴾ [المَائـِدَة : ٩٩]واته : [ مَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ ] هیچ شتێك له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا نیه‌- صلى الله عليه وسلم - ئه‌گه‌ر ئێوه‌ گوێڕایه‌ڵی نه‌که‌ن ته‌نها ئه‌وه‌ نه‌بێ که‌ په‌یامی خوای گه‌وره‌تان پێ بگه‌یه‌نێ [ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ] وه‌ ئه‌وه‌ی ئێوه‌ ئاشکرای ئه‌که‌ن وه‌ ئه‌یشارنه‌وه‌ خوای گه‌وره‌ عیلم و زانیاری به‌هه‌مووی هه‌یه‌..؟!

٥- قال تعالى: ﴿إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ۝١١٠﴾ [الأنبياء : ١١٠]واتە : وە بە دڵنیایی پەروەردگار ئاگای لە هەموو وتەیەك هەیە كە بە ئاشكرا بیڵێن وە ئەوەیشی كە ئەیشارنەوە لای خوای گەورە شاراوە نیەو زانست و زانیاری پێیەو ئەیبیستێت..؟!

٦- قال تعالى: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ۝٢٩﴾ [النّور : ٢٩] واتە : [ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ ] بەڵام ئاساییەو تاوانبار نابن ئەگەر بچنە ماڵێكەوە كە ماڵی تایبەت نەبێت و گشتی بێت وەكو فندق و بازاڕو دوكانەكان [ فِيهَا مَتَاعٌ لَكُمْ ] كە ئیشتان تیایدا هەبێ ئەمە پێویست بە ئیزن ناكات [ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ] وە خوای گەورە زانایە بەوەی كە ئێوە ئاشكرای ئەكەن و ئەوەی كە ئەیشارنەوە..؟!

٧-قال تعالى: ﴿بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ۝٢٨﴾ [الأنعَام : ٢٨] واتە: [ بَلْ بَدَا لَهُمْ مَا كَانُوا يُخْفُونَ مِنْ قَبْلُ ] ئەوەی كە پێشتر لە دونیا شاردبویانەوە لە نیفاق و كوفرو كردەوەی خراپ ئێستا هەموویان بۆ دەركەوت، وە ئەزانن كە بەهیلاك ئەچن و حەقیقەتی شتەكانیان بۆ دەركەوت، یان ئەوەی كە لە دونیا لە دڵی خۆیاندا دەیانزانی و باوەڕیان پێی بوو لە ڕاستێتی دین و پێچەوانەكەیان بۆ شوێنكەوتوانیان دەردەخست ئێستا بۆیان دەركەوت، یان مەبەست پێی دووڕووەكانە كە ئیمانیان ئاشكرا دەكردو كوفریان لە دڵیاندا شاردبووەوە ئێستا ئەوەی شاردبوویانەوە دەركەوت [ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ] وە ئەگەر ئێستاش ئەمانە بگەڕێنینەوە بۆ دونیا بە گوێرەی هیواو ئاواتی خۆیان ئەوا ئەگەڕێنەوە بۆ ئەو شتە ی كە نەهیان لێ كرابوو واتە: بۆ كوفرو شیرك و خراپەكاری، وە ڕاست ناكەن كە ئەڵێن: ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دونیا تەوبە ئەكەین و ئیمان دێنین و كردەوەی چاك دەكەین، وە ئەوان درۆزنن لەو بەڵێنانەی كە ئەیدەن تەنها بۆ ئەوەیانە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان بێت..؟!

**ووشەی (الكتمان ) بە مانای (السر ) هاتووە**

٨-قال تعالى: ﴿سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ۝١٠﴾ [الرَّعْد : ١٠]واتە: لای خوای گەورە یەكسانە هەر كەسێك لە ئێوە قسەیەك بە نهێنی بكات یاخود بە ئاشكرا خوای گەورە ئاگای لێیەو هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە..؟!

٩- قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُواْ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٥﴾ [هُود : ٥] واتە: [ أَلَا إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ ] كافران و بێباوەڕان سینگی خۆیان دەرئەپەڕاندو سەریان شۆڕ ئەكردە بان سینگیان بۆ ئەوەی كە خۆیان لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بشارنەوەو نەیانبینێت بۆ ئەوەی بانگیان نەكات بۆ ئیمان هێنان، یان بە گومانی خۆیان بۆ ئەوەی خوای گەورە نەیانبینێت لە نەزانیاندا، یان لە رق لێبوونیان لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - [ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ] (ئیبنو عەبباس) دەفەرمێت: هەندێك لە هاوەڵان پێیان ناخۆش بوو لە كاتی سەرئاو كردن یان جیماع كردن بە رووتی پشت لە ئاسمان بكەن خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: كاتێك كە بە پۆشاكەكانیان خۆیان دائەپۆشن، یان كاتێك كە سینگیان دەرئەپەڕێنن و قسەی خراپ لە دڵیاندا ئەشارنەوە خوای گەورە ئاگای لە نهێنی و ئاشكرای ئەوان هەیە [ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ] بەراستی خوای گەورە زانایە بەو دڵەی كە لە ناو سینگەكاندایە هەرچیەكی تیا بشارنەوە..؟!

١٠- قال تعالى: ﴿وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى ٧﴾ [طه : ٧]واته : وه كاتێك تۆ كه له خوای گه‌وره ده‌پاڕێیته‌وه یان زیكری خوای گه‌وره ئه‌كه‌ی یان قسه ده‌كه‌یت ئه‌گه‌ر به ئاشكرا بیكه‌ی ئه‌وا خوای گه‌وره زانیاری به هه‌موو نهێنی و شاراوه‌یه‌ك هه‌یه و نهێنی و له نهێنی نهێنی تر ده‌زانێت..؟!

١١- قال تعالى: ﴿وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ١٣ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ١٤﴾ [المُلْك : ١٣ - ١٤]واته : وه ئێوه وته‌ی خۆتان به نهێنی بڵێن یاخود ئاشكرای بكه‌ن یه‌كسانه‌و هیچ شتێك له خوای گه‌وره ناشاردرێته‌وه‌و ئاگای له هه‌موو نهێنی و ئاشكرایه‌ك هه‌یه، وه خوای گه‌وره زۆر زانایه به‌وه‌ی كه له سینگدا له‌دڵدا شاردووتانه‌ته‌وه..؟! [ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ (١٤) ] ئایا خوایه‌ك كه خۆی دروستكراوه‌كانی دروست كردووه ئاگای له خۆیان و نهێنیه‌كانیان و دڵیان نیه، به‌ڵێ بێگومان ئاگای لێیانه‌و خۆی شاره‌زاتره به دروستكراوه‌كانی كه چ یاساو شه‌ریعه‌تێك بۆیان گونجاو و شیاوه ئه‌وه‌ی بۆ ته‌شریع كردوون، وه هه‌ر خوای گه‌وره زۆر به‌به‌زه‌ییه، وه زانیاریه‌كی زۆر وردی هه‌یه وه هیچ شتێك له خوای گه‌وره ناشاردرێته‌وه ..؟!

**ووشه‌ی (الكتمان ) به مانای (الاخفاء ) هاتووه**

١٢- قال تعالى: ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٢٨٤﴾ [البَقَرَة : ٢٨٤]واته : [ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ] هه‌رچی له ئاسمانه‌كان و زه‌وی و ئه‌وه‌ی له نێوانیان دایه هه‌مووی موڵكی خوای گه‌وره‌یه [ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ ] هه‌ر شتێك له نه‌فسی خۆتاندایه ئه‌گه‌ر ده‌ری ببڕن یان بیشارنه‌وه ئه‌وا خوای گه‌وره موحاسه‌به‌تان ئه‌كات واته: ئه‌گه‌ر شایه‌تیه‌ك كه ده‌ری ببڕن یان بیشارنه‌وه ناحه‌ق بێ خوای گه‌وره سزاتان ئه‌دات و موحاسه‌به‌تان ئه‌كات، به‌ڵام ئه‌گه‌ر مرۆڤ له نه‌فسی خۆیدا قسه‌یه‌ك بكات تا نه یكات به كرده‌وه یان به وته نه‌یڵێ ئه‌وه خوای گه‌وره له‌م ئوممه‌ته بووراوه له‌وه‌ی كه له دڵی خۆیدا ئه‌یڵێت و سزای نادات [ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ ] خوای گه‌وره خۆش ئه‌بێ له هه‌ر كه‌سێك كه ویستی لێ بێت به فه‌زڵ و چاكه‌ی خۆی [ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ ] وه خوای گه‌وره سزای هه‌ر كه‌سێك ئه‌دات كه ویستی لێ بێت به دادپه‌روه‌ی خۆی [ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ] وه خوای گه‌وره تواناو ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌یه، كه ئایه‌تی دواتر ئه‌م ئایه‌ته‌ی نه‌سخ كردووه..؟!

١٣- قال تعالى: ﴿وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ٢٥﴾ [النَّمل : ٢٥]واته: وه هه‌ر شتێك كه ئێوه شاردبێتتانه‌وه‌و ده‌ری نه‌بڕن له ناخی خۆتاندا یان ئه‌وه‌ی ده‌ری ئه‌بڕن خوای گه‌وره زانیاری به هه‌ر هه‌مووی هه‌یه..؟!

١٤- قال تعالى: ﴿تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١﴾ [المُمْتَحنَة : ١] واته : كه ئێوه خۆشه‌ویستی بۆ ئه‌وان ده‌رئه‌بڕن به نهێنی وه من ئه‌زانم ئه‌وه‌ی كه ئێوه شاردووتانه‌ته‌وه‌و ئاشكرای ئه‌كه‌ن و زانیاریم به‌هه‌مووی هه‌یه‌و هیچ شتێك له من ناشاردرێته‌وه [ وَمَنْ يَفْعَلْهُ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ] وه هه‌ر كه‌سێك له ئێوه كاری وا بكات ئه‌وه له ڕێگای ڕاست لایداوه..؟!

## سێ یەم : (خوای گەورە ) هەمووشتێك ئاشكرا دەكات كە بەندەكانی دەیشارنەوە

بەڵێ (خوای گەورە ) هەرچی شتە ئاشكرای دەكات كە بەندەكانی دەیشارنەوە لە كردەو هەڵسوكەوت بیرو باوەر ، رەنگە ئەم ئاشكرا كردنە یان ئەم فضیحە تە لە ژیانی دونیا بێت ، لە شاردنەوەی سەر پێچی كردنی بێ باوەران ، وە دوو رووەكان مولحیدەكان و لە سنوور دەرچووەكان و هەروەها ستەم كاران ، بێ گومان (خوای گەورە ) ئاشكرا كردون فضیحە تی بەندەكانی لە رۆژی دوایش دا ئاشكرا دەكات ئەوەی كە شاردبوویانەوە لە ژیانی دونیاندا ، ئەوەی راستە ئەوەی سەرپێچی و ستەم و دوو رووی بێ باوەری و خراپەكاری بەندەكانی ئاشكرا دەكات ئەوەی كە دەیشارنەوە ، ئەم ئایەتانەی خوارەوە بەلگەی ئاشكران لە دونیاو لە قیامەتدا ..؟!

### (خوای گەورە) ئاشكرا كردنی كردەوەكانی بەندەكانی ئەوەی دەیشارێتەوە لەدونیاندا:

بەڵێ (خوای گەروە ) ئەوشتانەی كە بەندەكانی دەیشارنەوە ئاشكرای دەكات ، لە سەرپێچی كاران و خراپەكاران و بێ باوەران و دوو رووەكان ستەمكارەكان هەموو كردەوەكانیان (فضح ) دە كات و ئاشكرایی دەكات ، لە ژیانی دونیادا ، ئەوانەی كە درۆ دەكەن دزی جەردەیی و خراپەكاری و ستەم كردن و خواردنی مالی خەلك بە ناحەق بەلێ (فضح) یان دە كات ، ئەمانەی بەلگەی روون قورئانی پیرۆزە ، هەر بەندەیەك سەرپێچی فەرمانەكانی (خوای گەورە ) بكات ، ئەوا (خوای گەورە) لە دونیادا ریسواو سەر شۆرو دەكات ،وكردەوەكانی (فضح)دە كات.

قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ فِيهَاۖ وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ۝٧٢﴾ [البَقَرَة : ٧٢]واتە: [ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا ] كاتێك ئێوە كەسێكتان كوشت بەناحەق وە جیاوازی و ناكۆكی كەوتە نێوانتانەوە هەر كەسێ تاوانەكەی لەسەر خۆی لائەداو ئە یخستە سەر كەسێكی تر [ وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ ] وە ئەوەی كە ئێوە شاردوتانەتەوە خوای گەورە ئاشكرای دەكات و دەری دەكات..؟!

قال تعالى: ﴿يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ۝٦٤﴾ [التَّوۡبَة : ٦٤]واتە : [ يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ ] مونافیقان حەزەر ئەكەن و لەوە ئەترسێن كە خوای گەورە سوورەتێكیان لەسەر داببەزێنێتە خوارەوە كە ئەوەی ناو دڵیان دەربكات و ئاشكرای بكات [ قُلِ اسْتَهْزِئُوا ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئێوە گاڵتە بكەن بە موسڵمانان یان بەدابەزینی سوورەتی قورئان [ إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ ] ئەوەی كە ئێوە حەزەری لێ ئەكەن خوای گەورە دەری ئەكات و ئاشكرای ئەكات بەوەی كە سوورەتی قورئان دائەبەزێ وەكو لە سوورەتی تەوبەدا خوای گەورە ئابڕووی بردن، یان پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئاگادار ئەكاتەوە لە ئێوە..؟!

قال تعالى: ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ ۝٢٩﴾ [مُحَمَّد : ٢٩]واتە : {ئابرووبردنی مونافیقان} [ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ أَنْ لَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ ] ئایا مونافیقان كە نەخۆشی گومان لە دڵیاندایە وا گومان ئەبەن كە خوای گەورە ئەو رِق و كینەو ئیرەییەی كە لە دڵیاندایە بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان دەری ناكات و ئاشكرای ناكات و ئابڕوویان نابات..؟!

(خوای گه‌وره) ئاشکرا کردنی کرده‌وه‌کانی به‌نده‌کانی ئه‌وه‌ی دیشارێته‌وه له رۆژی قیامه‌تدا

**به‌لێ (خوای گه‌وره ) هه‌موو کارو کرده‌وه‌کانی به‌نده‌کانی ئاشکرا ده‌كات ، ئه‌وه‌ی که شاردبوویه‌وه له دونیادا ، له رۆژی قیامه‌ت هه‌مووی ئاشکرا ده‌كات ، نه‌هێنی یه‌کانی بۆ خه‌لکی به‌یان ده‌كات و ئاشکراو به دیاری ده‌خات، چونکه ئه‌م رۆژه رۆژی که‌شف کردنی سر نهێنیه‌کانه ، چونکه هیچ شتێك له (خوای گه‌وره ) وون نابێت و داناپۆشرێت ناشاردرێته‌وه‌له‌م رۆژه دا ، وه هیچ شتێك شاراوه نیه چ له زه‌وی و چ له ئاسمانه‌کاندا ، وه هیچ له لای (خوای گه‌روه ) شاراوه نابێت له کرده‌وه‌کانی به‌نده‌کانی دا ، به‌قه‌د گه‌ردیله‌یه‌ك ، له چاکه‌کاری و خراپه‌کاری دا ، هه‌روه‌ك ده‌فه‌رموویت :** قال تعالى: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۞ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۞﴾ [الزَّلْزَلَة : ٧ - ٨] واته : {چاکه‌و خراپه چه‌ندێك که‌م بێت ده‌یبینیته‌وه} [ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) ] له‌و رۆژه‌دا هه‌ر که‌سێك کرده‌وه ی چاکی کردبێ له دونیادا به ئه‌ندازه‌ی مسقاله زه‌رِه‌یه‌ك واته: بچووکترین مێرووله یاخود ئه‌و گه‌رده‌ی که ئه‌بینرێت ته‌پو تۆزێك له په‌نجه‌ره‌یه‌که‌وه دیاره ئه‌وه‌ش ئه‌گرێته‌وه، جا که‌سێك به ئه‌ندازه‌ی یه‌کێك له‌و گه‌ردانه چاکه‌و خێری کردبێ ئه‌وه له رۆژی قیامه‌تدا ئه‌جرو پاداشته‌که‌ی وه‌رئه‌گرێ، بۆیه نابێ مرۆڤی موسڵمان چاکه‌ی له‌لا که‌م بێ، هه‌ر بۆیه پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - ئه‌فه‌رمووێ: (خۆتان له ئاگری دۆزه‌خ بپارێزن ئه‌گه‌ر به له‌ته خورمایه‌کیش بێت که کردووته به‌خێر له پێناو خوای گه‌وره‌دا به‌که‌می مه‌زانه، ئه‌گه‌ر قسه‌یه‌کی چاکیش بێ به‌که‌می مه‌زانه، ئه‌گه‌ر له دۆڵکه‌که‌ت ئاو بکه‌یته ناو گڵاسی که‌سێکی تره‌وه به‌که‌می مه‌زانه، ئه‌گه‌ر به‌رووی خۆش به‌رامبه‌ر موسڵمانێك ڕاوه‌ستی و رووت له گه‌ڵیدا خۆشبێ به‌که‌می مه‌زانه، ئه‌گه‌ر پێی ئاژه‌ڵێك به‌دیاری به‌ری بۆ هاوسێکه‌ت به‌که‌می مه‌زانه)، ئه‌مانه هه‌رچه‌نده خێرو شتێکی یه‌کجار که‌من، به‌ڵام له رۆژی قیامه‌تدا هه‌ر که‌سێك له‌وانه که‌متر به ئه‌ندازه‌ی گه‌ردێك یان مێروووله‌یه‌کی بچووك خێرو چاکه بکات ئه‌یبینێته‌وه‌و خوای گه‌وره ئه‌جرو پاداشتی ئه‌داته‌وه له‌سه‌ری، وه چاکه‌یش یه‌ك به ده‌یه تا یه‌ك به حه‌وت سه‌د تا زیاتریش..؟! [ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨) ] وه به پێچه‌وانه‌یشه‌وه هه‌ر که‌سێك ئه‌گه‌ر به ئه‌ندازه‌ی مێرووله‌یه‌کی بچووك یان گه‌ردێکی بچووك شه‌ڕو خراپه بکات له رۆژی قیامه‌تدا ئه‌یبینێته‌وه ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره لێی خۆش نه‌بێت، ئه‌گه‌ر لێی خۆشبوو ئه‌وه هیچ ئه‌گه‌ر لێی خۆش نه‌بووبێ ئه‌وه له رۆژی قیامه‌تدا خوای گه‌وره لێپرسینه‌وه‌ی له‌گه‌ڵدا ئه‌كات، بۆیه نابێ مرۆڤی موسڵمان تاوانی بچووکیشی پێ که‌م بێ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هیچ بچووکێك له‌گه‌ڵ به‌رده‌وامیدا بچووك نیه به‌ڵکو گه‌وره ئه‌بێت، والله أعلم..؟!

**به‌لێ به‌دلنیایه‌وه هیچ شتێك له لای (خوای گه‌وره ) له‌م رۆژه‌دا ناشاردرێته‌وه ،وه شاراوه نیه ، سه باره‌ت بارودۆخ کرده‌وه‌کانی به‌نده‌کانی دا له رۆژی قیامه‌تدا ..؟!**

قال تعالى: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ۞﴾ [الحَاقَّة : ١٨]واته: [ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنْكُمْ خَافِيَةٌ (١٨) ] له‌و رۆژه‌دا کرده‌وه‌کانتان هه‌مووی نیشان ئه‌درێ و ئه‌خرێته روو وه هیچ شتێك له وته‌و کرده‌وه‌کانی ئێوه له خوای گه‌وره ناشاردرێته‌وه‌و هه‌مووی ئاماده‌یه، له نهێنی و ئاشکرا، له باش و خراپ..؟!

قال تعالى: ﴿يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ۞﴾ [غَافِر : ١٦]واته : [ يَوْمَ هُمْ بَارِزُونَ لَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ ] له‌و رۆژه‌دا هه‌موو خه‌ڵکی له گۆڕه‌کان ده‌رئه‌چن و ده‌رئه‌که‌ون و هیچ شتێك له خوای گه‌وره ناشاردرێته‌وه له کرده‌وه‌کانیان که له دونیا کردوویانه [ لِمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ ] خوای گه‌وره ئه‌فه‌رمووێ: ئه‌مڕۆ موڵك بۆ کێیه؟ که‌س نیه وه‌ڵام بداته‌وه خۆی ئه‌فه‌رمووێ: [ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ] ته‌نها بۆ خوای گه‌وره‌یه که خوایه‌کی تاك و ته‌نهاو زۆر باڵاده‌ست و به‌توانایه..؟!

قال تعالى: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾﴾ [إبراهيم : ٣٨]واته: [ رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ ] ئه‌ی په‌روه‌ردگار تۆ زانای كه‌ ئێمه‌ چ شتێكمان شاردۆته‌وه‌و چ شتێكمان ئاشكرا كردووه‌ (نیه‌تی من ده‌زانیت له‌ دوعاكردنم بۆ مه‌ككه‌ كه‌ مه‌به‌ستم ره‌زامه‌ندی تۆیه‌) [ وَمَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ ] وه‌ هیچ شتێك له‌ خوای گه‌وره‌ ناشاردرێته‌وه‌ نه‌ له‌ زه‌وی و نه‌ له‌ ئاسمان..؟!

قال تعالى: ﴿يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾﴾ [غافر : ١٩]واته: [ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ ] خوای گه‌وره‌ ئه‌و خوایه‌یه‌ كه‌ ئه‌گه‌ر چاوێك به‌ دزیه‌وه‌ ته‌ماشای ئافره‌تێك بكات ئاگای لێیه‌تی، (ابن عباس) ده‌فه‌رمێت: (مه‌به‌ست له‌م ئایه‌ته‌ پیاوێكه‌ ده‌چێته‌ ماڵێكه‌وه‌ خاوه‌ن ماڵه‌كه‌ ئاگادار نه‌بێت ئه‌م ته‌ماشای ئافره‌ته‌كه‌ ده‌كات، وه‌ كه‌ ئاگادار بێت چاوی ده‌پۆشێت و ته‌ماشا ناكات، خوای گه‌وره‌ ئاگای له‌و تێڕوانینه‌ نهێنیه‌ هه‌یه‌) [ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ] وه‌ ئه‌وه‌یشی كه‌ له‌ دڵدا شاردراوه‌ته‌وه‌ خوای گه‌وره‌ ئاگادارێتی..؟!

قال تعالى: ﴿وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ﴿٤٩﴾﴾ [الكهف : ٤٩]واته: {هاوار كردن له‌ ده‌ست تاوانه‌ بچوكه‌كان!} [ وَوُضِعَ الْكِتَابُ ]وه‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا نامه‌ی كرده‌وه‌كان دائه‌نرێ[ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ ]وه‌ تاوانباران ئه‌بینی ئه‌ترسێن له‌ وه‌رگرتنی نامه‌كانیان بۆ ئه‌وه‌ی ئابڕوویان نه‌چێ[ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا ]وه‌ ئه‌ڵێن: هاوار بۆ خۆمان ئه‌مه‌ چۆن كتابێكه‌ هیچ تاوانێكی بچووك و گه‌وره‌ نیه‌ ئیلا هه‌ر هه‌مووی سه‌رژمێر كردووه‌و هه‌مووی تیا نووسراوه‌ته‌وه‌، یه‌كه‌مجار هاواریان كرد له‌ بچووكه‌كان كه‌ كۆبۆته‌وه‌ له‌سه‌ریان ئینجا له‌ تاوانه‌ گه‌وره‌كان(بۆیه‌ نابێت مرۆڤ تاوانی بچوكی پێ كه‌م بێت، چونكه‌ كۆ ببێته‌وه‌ مرۆڤ به‌ هیلاك ده‌بات و هاوار ده‌كات لێیان)[ وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا ]وه‌ ئه‌وه‌ی له‌ دونیا كردوویانه‌ له‌ چاكه‌و خراپه‌ ئه‌یبینن هه‌ر هه‌مووی نووسراوه‌و جێگیر كراوه‌و پارێزراوه‌ [ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا) ]وه‌ په‌روه‌ردگارت سته‌م له‌ هیچ كه‌سێك ناكات و تاوانی كه‌س ناخاته‌ سه‌ر كه‌سی تر ،وه‌ له‌ پاداشتی كه‌س كه‌م ناكاته‌وه‌.

قال تعالى: ﴿وَيَوۡمَ يُرۡجَعُونَ إِلَيۡهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُواْۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴿٦٤﴾﴾ [النور : ٦٤]واته: وه‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌تیش كه‌ ئه‌گه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ لای خوا دیسان خوای گه‌وره‌ ئاگادارو هه‌واڵتان پێ ئه‌دا به‌و كرده‌وانه‌ی كه‌ له‌ دونیا كردووتانه‌ [ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ] وه‌ خوای گه‌وره‌ زۆر زانایه‌ به‌ هه‌موو كرده‌وه‌یه‌ك كه‌ ئێوه‌ ئه‌نجامی ئه‌ده‌ن، والله أعلم..؟!

له‌ (عبدالله بن عمر )– خوا لیٚ رازی بێت – ده‌گێرنه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌موویه‌تی : ((إنَّ الغادِرَ يُنصَبُ له لِواءٌ يومَ القيامةِ، فيُقالُ: هذه غَدْرةُ فلانِ بنِ فلانٍ)) .[١] واته: غه‌در كه‌ر یان سته‌م كار له‌رۆژی قیامه‌تدا ئالایه‌كی بۆ داده‌چه‌قێنرێت، ده‌ڵێن : بزانن ئه‌مه‌ غه‌دری فلانی كوری فلانه‌ ..؟؟!

له‌ (ابو سعيد الخدری)– خوا لیٚ رازی بێت – ده‌گێرنه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌موویه‌تی : ((لِكُلِّ غادِرٍ لِواءٌ يَومَ القِيامَةِ، يُرْفَعُ له بقَدْرِ غَدْرِهِ، ألا ولا غادِرَ أعْظَمُ غَدْرًا مِن أمِيرِ عامَّةٍ)) .[٢] واته: هه‌موو سته‌م كارێك له‌ رۆژی قیامه‌تدا ئالایه‌كی هه‌یه‌ ، به‌راده‌ی سته‌مه‌كه‌ی بۆ به‌رز ده‌كرێته‌وه‌ ، ئاگادار بن هیچ سته‌م كاریٚ نیه‌ ، سته‌مه‌كه‌ی گه‌وره‌ تر بیٚ ..؟! له‌ سته‌می فه‌رمانره‌وایه‌كی گشتی ..؟! واته: سته‌می فه‌رمانره‌وایان گه‌وره‌ و گرانتره‌ ، وه‌ زۆر تر حسابی بۆ ده‌كرێت له‌ خه‌ڵكی ساده‌ ..؟!

[١]-السنن ابو داود برقم (٢٧٥٦).
[٢]-صحيح مسلم برقم (١٧٣٨).

## چواره‌م : جۆره‌كانی (الكتمان ) داپۆشین یان شاردنه‌وه

١- (المحمود ) واته : ستایشكراو ، ئه‌م جۆرانه ده‌گرێته‌وه وه‌ك: الكتمان (السر ) و(الايمان ) .

٢-(المذموم ) واته :لۆمه‌كراوه یان ناپه‌سند،ئه‌م جۆرانه ده‌گرێته‌وه وه‌ك :الكتمان ( زانست ،ماف ،نیعمه‌ت ) .

**یه‌كه‌م : (المحمود ) واته ستایشكراوه و په‌سه‌ند :**

**١-(الكتمان الايمان ) واته: شاردنه‌وه‌ی ئیمان .**

**به‌ڵێ شاردنه‌وه‌ی ئیمان له پێناوی بانگه‌وازی و به‌رگری كردن له ئاینی (خوای گه‌وره ) ، ئه‌مه‌ش له قوناغی ترس و لاوازی له سه‌ر نه‌فس ده‌یێت ، ئه‌مه‌ش رێگه پێدراوه له شه‌رعدا ، هه‌روه‌كو (خوای گه‌وره ) باسی ئه‌و كه‌سه ده‌كات له قورئانی پیرۆز دا، كه پیاوێك له خزم و هۆزه‌كه‌ی فیرعه‌ون كه قتبی بوو ، له ناو خزمه‌كانی فیرعه‌وندا بوو ، ئیمانه‌كه‌ی شاردبوویه‌وه ، به‌لام له كاتێك دا ده‌ری خست كه به‌رگری له پێغه‌مبه‌ر موسی – علیه السلام – ئا له‌م ئایه‌ته‌ی خواره‌وه دا ، (خوای گه‌وره ) مه‌دح و ستایشی ئه‌و پیاوه ئیمانداره ده‌كات چۆن حه‌ق ده‌ڵێ.**

قال تعالى: ﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾﴾ [غَافِر : ٢٨]واته : {باوه‌ڕداره‌كه‌ی ئالی فیرعه‌ون به‌رگری له موسا ده‌كات } [ وَقَالَ رَجُلٌ مُؤْمِنٌ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ ] وه پیاوێكی باوه‌ڕدار كه (قیبطی) بوو، وتراوه: ئامۆزای فیرعه‌ون بوو، له (قیبطی)هكان ته‌نها ئه‌م پیاوه ئیمانی هێناوه له‌گه‌ڵ ئاسیای خێزانی فیرعه‌وندا [ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ ] ئه‌م پیاوه كه ئیمانه‌كه‌ی ئه‌شارده‌وه ده‌ری نه‌بڕیبوو فه‌رمووی: [ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَنْ يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ ] ئایا ئێوه پیاوێك ئه‌كوژن كه موسایه - صلى الله عليه وسلم - كه ته‌نها تاوانی ئه‌وه‌یه ئه‌ڵێ: په‌روه‌ردگاری من (الله)یه!؟ [ وَقَدْ جَاءَكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ مِنْ رَبِّكُمْ ] كاتێك كه به‌ڵگه‌ی روون و ئاشكراو موعجیزه‌ی له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه بۆ هێناون، پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - له لای كه‌عبه نوێژی ده‌كرد (عقبة بن أبي معيط) هات و شانی گرت و پۆشاكه‌كه‌ی لوولدا له ملی پیرۆزی و توندی كرد بۆ خنكاندنی، (ئه‌بو به‌كری صدیق) هات و كردی به شانیدا و پاڵیپێوه‌ناو له پێغه‌مبه‌ری خوای - صلى الله عليه وسلم - دوور خسته‌وه ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه: ئایا ئێوه پیاوێك ئه‌كوژن ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ده‌ڵێت ته‌نها الله په‌روه‌ردگاری منه؟! [ وَإِنْ يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُ ] وه ئه‌گه‌ر درۆیش بكات زیانی درۆكه‌ی بۆ خۆی ئه‌گه‌ڕێته‌وه‌و خوای گه‌وره سزای ده‌دات، (گومانی نه‌بوو له راستێتی موسی - صلى الله عليه وسلم - به‌ڵام بۆ ئه‌وه‌ی بوو تا ئه‌وان قه‌ناعه‌ت بكه‌ن) [ وَإِنْ يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُمْ بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ ] وه ئه‌گه‌ر راستگۆیش بێ ئه‌و هه‌ڕه‌شانه‌ی كه لێتان ئه‌كات هه‌ندێكی ئه‌تانگرێته‌وه‌و خوای گه‌وره له‌ناوتان ئه‌بات [ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ] به‌ڕاستی خوای گه‌وره هیدایه‌تی كه‌سێك نادات كه زیاده‌ڕه‌وی بكات له تاواندا وه زۆر درۆزن بێت، واته ئه‌م وانیه‌و وته‌و كرده‌وه‌ی له‌وپه‌ڕی جوانی و چاكیدایه‌و ئه‌گه‌ر درۆی بكردایه ده‌رده‌كه‌وت و خوای گه‌وره ئاوا هیدایه‌تی نادا كه هه‌مووتان دڵنیان له راستگۆییدا..؟!

**له (ابو سعيد الخدری ) – خوا لێ رازی بێت – ده گێڕێته‌وه ده‌لێت پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی :**

((أفضَلُ الجِهادِ كلمةُ عَدلٍ عندَ سُلطانٍ جائرٍ. أو أميرٍ جائرٍ)) .[1] **واته: چاكترین جیهادو تێ كۆشان ووتنی ووته‌ی حه‌ق له به‌رده‌م یان له پێش فه‌رمانره‌وای زالم و سته‌مكار دا یان ئه‌میرێكی سته‌مكار ..؟!**

**به‌لێ هه‌ر وه‌ك هاوه‌لانی ئه‌خدود ، كه ئیمانداره‌كانیان ده‌ستووتاند ، بێ ئه‌وه‌ی هیچ گوناهێكیان كردبێت ، یان كافرانی قوره‌یش موسلمانه‌كانیان له شاری مككه دا ، ده‌كوشت یان ئازاریان ده‌دان و ده‌ریان ده‌كردن له و خانوو مالی خۆیاندا ، وه له شاری خۆیاندا كۆچیان كرد بۆ شاری مه‌دینه ، له‌به‌ر ترس بیمه‌ی بێ باوه‌رانی قوره‌یش. ! !**

قال تعالى: ﴿قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ۝٤ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ۝٥ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ ۝٦ وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ ۝٧ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ۝٨﴾ [البُرُوج : ٤ – ٨]واته : {به‌سه‌رهاتی هاوه‌لانی چاڵه‌كه} [ قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ (٤) ] (قُتِلَ) واته: نه‌فره‌تیان لێ بێ (أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ) ئه‌وانه‌ی كه چاڵه‌كه‌یان هه‌ڵكه‌ندو ئاگرێكی گه‌وره‌یان تیادا كردووه‌و باوه‌ڕدارانیان تاقیكردووه‌ به‌وه‌ی كه ئه‌گه‌ر هه‌ر كه‌سێك له موسڵمان بوونی په‌شیمان نه‌بێته‌وه‌و نه‌گه‌ڕێته‌وه بۆ په‌رستنی پاشا ئه‌وه ئه‌یخه‌ینه ناو ئه‌و ئاگره‌و ئه‌یسووتێنین، كه پێغه‌مبه‌ری خوا - صلی الله علیه وسلم - به‌درێژی چیرۆكه‌كه‌یانی باس كردووه‌و له صه‌حیحی موسلیمدا هاتووه، هه‌یه له زانایانی ته‌فسیر ئه‌فه‌رموون: خه‌ڵكی فارس بوونه، یاخود خه‌ڵكی حه‌به‌شه بوونه، یان به‌نی ئیسرائیل بوونه، یان خه‌ڵكی یه‌مه‌ن بوونه، هه‌ر شوێنێك له‌مانه بێت پاشایه‌ك هه‌بووه‌و خه‌ڵكه‌كه لێی هه‌ڵگه‌ڕاونه‌ته‌وه‌و وازیان له په‌رستنی ئه‌و پاشایه هێناوه به‌تاك و ته‌نها خوای گه‌وره‌یان په‌رستووه، ئه‌ویش خه‌ڵكه‌كه‌ی به‌و شێوازه تاقیكردۆته‌وه كه ئه‌گه‌ر نه‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ په‌رستنی خۆم ئه‌بێ بچنه ناو ئه‌و ئاگره‌وه یه‌ك یه‌ك سووتاندوویانێتی، تا ئافره‌تێك منداڵێكی بچووكی پێ بووه له‌به‌ر منداڵه‌كه‌ی دوودڵ بووه به ئیزنی خوای گه‌وره منداڵه‌كه هاتۆته قسه و وتوویه‌تی: ئه‌ی دایكه تۆ له‌سه‌ر حه‌قیت ئارام بگره‌و خۆت هه‌ڵده‌ره ناوی ئه‌ویش خۆی هه‌ڵداوه‌ته ناوی...؟!

[ النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ (٥) ] كه ئاگرێكیان كردووه كه ئاگره‌كه دارێكی یه‌كجار زۆریان تێ كردو گڕو بڵێسه‌یه‌كی یه‌كجار زۆری هه‌بوو..؟! [ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ (٦) ] كاتێك كه خۆیان پاشاو وه‌زیره‌كان و داروده‌سته‌كه‌ی دانیشتبوون له‌سه‌ر كورسی سه‌یریان ئه‌كردن..؟! [ وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ (٧) ] وه خۆشیان له‌وه‌ی كه به باوه‌ڕدارانیان ئه‌كرد ئاماده‌بوون و دانیشتبوون، یاخود له ڕۆژی قیامه‌تدا خۆیان شایه‌تی له‌سه‌ر خۆیان ئه‌ده‌ن و ده‌ست و پێ و ئه‌ندامه‌كانی تری له‌شیان شایه‌تییان له‌سه‌ر ئه‌ده‌ن كه ئه‌مانه به‌ناحه‌ق ئه‌و موسڵمانانه‌یان سووتاندووه..؟! [ وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ (٨) ] وه سزای ئه‌م باوه‌ڕدارانه‌یان نه‌داو تۆڵه‌یان لێنه‌سه‌ندن ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه نه‌بێت كه ئیمانیان به خوای گه‌وره هێنابوو كه خوایه‌كه زۆر به‌عیززه‌ته و زۆر حه‌مدو سوپاسكراوه له هه‌موو حاڵه‌تێكدا..؟!

[1]- السنن ابو داود برقم (٤٣٤٤).

قال تعالى: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ٣٩ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ٤٠﴾ [الحج : ٣٩ - ٤٠]واته : {یه‌که‌م ئایه‌ت له‌سه‌ر کوشتارکردنی کافران} [ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا ] کاتێك پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - له مه‌ککه ده‌رکرا (ئه‌بو به‌کر) فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ره‌که‌یان ده‌رکرد (إنا لله وإنا إليه راجعون) به دڵنیایی تیاده‌چن، خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند: خوای گه‌وره ئیزن و ڕێگای دا به‌و موسڵمانانه‌ی که له‌لایه‌ن کافرانه‌وه کوشتار ئه‌کرێن له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زوڵم و سته‌میان لێکراوه که ئه‌مانیش کوشتاری کافران بکه‌ن، که ئه‌مه یه‌که‌م ئایه‌ته سه‌باره‌ت به کوشتار کردنی کافران هاتۆته خواره‌وه، وه هاوه‌ڵان زانیان که کوشتار روو ده‌دات [ وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ] وه به دڵنیایی خوای گه‌وره له‌سه‌ر سه‌رخستنی باوه‌ڕداران زۆر به‌تواناو ده‌سه‌ڵاته که سه‌ریان بخات به‌سه‌ر کافراندا به‌بێ کوشتاریش به‌ڵام تاقیان ده‌کاته‌وه..؟! [ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ ] ئه‌و موسڵمانانه‌ی له ماڵ و حاڵی خۆیان له مه‌ککه ده‌رکران به ناحه‌ق [ إِلَّا أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ ] ته‌نها تاوانێك هه‌یان بوو ئه‌وه‌بوو که ئه‌یانوت: په‌روه‌ردگاری ئێمه الله یه‌و عیباده‌ت بۆ جگه له الله ناکه‌ین [ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا ] وه ئه‌گه‌ر ئه‌و کوشتاره نه‌بوایه که خوای گه‌وره ته‌شریعی کردووه که پێغه‌مبه‌ران و باوه‌ڕداران کوشتاری کافران و دوژمنانی خوای گه‌وره بکه‌ن ئه‌وا ئه‌هلی کوفرو شیرك زاڵ ئه‌بوون به‌سه‌ر موسڵماناندا‌و ئه‌و کاته له هه‌موو سه‌رده‌مه‌کاندا صه‌ومه‌عه‌و په‌رستگای خواپه‌رستان و که‌نیسه‌کان و شوێنی نوێژی جوله‌که‌کان و مزگه‌وتی موسڵمانان هه‌مووی به‌ده‌ست کافرانه‌وه ئه‌ڕوخا، که له‌و مزگه‌وتانه‌دا زۆر یادی خوای گه‌وره‌ی تیا ئه‌کرێ، واته: ئێوه کوشتاری کافران بکه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی بتوانن زیکرو عیباده‌تی خوای گه‌وره ئه‌نجام بده‌ن [ وَلَيَنْصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ ] وه هه‌ر که‌سێکیش که دینی خوا سه‌ربخات به دڵنیایی خوای گه‌وره‌ش سه‌ری ئه‌خات [ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ] به‌دڵنیایی خوای گه‌وره زۆر به‌هێزو باڵاده‌ست و به‌عیززه‌ته..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ٧٥﴾ [النِّساء : ٧٥] واته: [ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ ] ئه‌وه ئێوه چیتانه بۆ کوشتاری کافران ناکه‌ن له پێناو خوای گه‌وره‌و رزگار کردنی ئه‌و که‌سانه‌ی که لاواز کراوان و دیلن و که‌وتوونه‌ته ژێر ده‌ستی کافران، یاخود ئه‌وانه‌ی که ناتوانن هیجره‌ت و کۆچ بکه‌ن له مه‌ککه‌وه بۆ مه‌دینه له پیاوان و ئافره‌تان و منالان، (ابن عباس) ده‌فه‌رمێت: من و دایکم له‌و که‌سه لاوازکراوانه بووین له مه‌ککه [ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا ] ئه‌وانه‌ی که ئه‌ڵێن: خوایه ده‌رمان بکه له‌م شاره که مه‌ککه‌یه که خه‌ڵکه‌که ی زاڵم و سته‌مکاره [ وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا (٧٥) ] وه تۆ له‌لایه‌ن خۆته‌وه پشتیوان و سه‌رخه‌رو یارمه‌تیده‌رمان بۆ بنێره..؟!

٢-(كتمان السر ) واته: شاردنه‌وه‌ی نهێنی

به‌لیٌ كتمان السر واته: شاردنه‌وه‌ی نهێنی یه‌كێكه له ستایشكراوه‌كان و په‌سه‌نده‌كان ، له زۆر ئایه‌ته‌كانی قورئانی پیرۆز ئاماژه‌ی پێكراوه ، له سیفه‌ته‌كانی مرۆڤی راستگۆ و به وه‌فاو خاوه‌ن سپارده یان ئه‌مانه‌ت و وقار ، چونكه ئه‌م ئه‌مانه‌ت كه نهێنی یان سری براكه‌ت بشاریته‌وه كه‌شفی نه‌كه‌ی ، به‌لكو نهێنی براكه‌ت داپۆشی له لای خه‌لكی دا باسی نه‌كه‌یت ، به‌لیٌ چونكه هه‌ر كه‌سێك نه‌هێنی پیٌ بسپێری و پارێزگاری لیٌ بكات ، هه‌لبه‌ته ئه‌وا وه‌فادارو به ره‌وشته به‌رانبه‌ر به ئه‌مانه‌ته‌كه‌ی ، چونكه (إفاشاء السر خيانة محرمة ) واته: به‌یان كردن یان ئاشكرا كردنی هه‌ر سر یان نه‌هێنی یه‌ك ئه‌وا خیانه‌ت و حه‌رام كراوه ، به‌لكو خیانه‌تی له ئه‌مانه‌ته‌كه‌ی كردووه ، به دلنیایه‌وه حه‌رامه ئه‌گه‌ر به‌یان بكه‌ی یان ئاشكرایی بكه‌یت ، بۆ به‌ر ژه‌وه‌ندی خۆت به كار بهێنی ، چونكه (كتمان السر ) یه‌كێكه له ئه‌مانه‌ته هه‌ر گه‌وره كان ده‌بێت مرۆڤی موسلمان پارێزگاری لیٌ بكات ، دوور كه‌وێته‌وه له خیانه‌تی نه‌هێنی ئاشكرا كردن ، به سپارده یان ئه‌مانه تا مردن له لای خۆی پارێزگاری لیٌ بكات ..؟!

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَـٰنَـٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ٢٧﴾ [الأنفال : ٢٧]واته:{ناپاكی نه‌كردن له راسپارده} [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ ] ئه‌ی باوه‌ڕداران ئێوه خیانه‌ت و ناپاكی له خوای گه‌وره مه‌كه‌ن به تاوان كردن، وه خیانه‌ت له پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - مه‌كه‌ن به وازهێنان له سوننه‌ته‌كه‌ی و سه‌رپێچی كردنی، وه خیانه‌ت مه‌كه‌ن له‌و ئه‌مانه‌تانه‌ی كه له‌لاتان دائه‌نرێ یان له جێبه‌جێ كردنی فه‌رزه‌كان [وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ] له كاتێكدا كه ئێوه ئه‌زانن ئه‌مه خیانه‌ت و ناپاكیه‌و حه‌رامه..؟!

له ( جابر كوری عبدالله ) – خوا لیٌ رازی بێت – ده‌گێرنه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((إذا حَدَّثَ الرجلُ الحديثَ ثم التفَتَ فهي أمانةٌ )) .[1] واته: ئه‌گه‌ر كه‌سیٌ له كاتی قسه كردندا ئاوری ئه‌م لاو ئه‌م لای دایه‌وه ، هه‌تا بزانیٌ كه‌س گوێیی له قسه‌كه‌یه‌تی یان نا ، ئه‌وا قسه‌كه‌ی ئه‌مانه‌ت و سپارده‌یه له لای ..؟!

به‌لیٌ ئه‌م جۆره شاردنه‌وه‌ی كه شاردنه‌وه‌ی نهێنی ئه‌مانه‌ت و سپارده‌یه ، جۆرێكه له راستگۆیی و وه‌فاداری و دلسۆزی ، هه‌روه‌ها نیشانه‌ی وه‌قار كه‌رامه‌ت و شه‌ره‌فه ، بۆ هه‌ر كه‌سێك كه ئه‌م سیفه‌تانه‌ی تێدا به‌دی بكرێت.

[1]-سنن الترمذي برقم (١٩٥٩)، سنن ابو داود برقم (٤٨٦٨).

به‌لێ جه‌خت كردنه‌وه له ئه‌مانه‌ت نهێنی شاردنه‌وه ، كه شایسته‌ی نهێنیه‌كانه له نێوان هاوسه‌ره‌كاندا ..؟!

له (ابی سعید الخدری ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌گێریته‌وه ده‌لێت : له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((إِنَّ مِن أَشَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ مَنْزِلَةً يومَ القِيَامَةِ، الرَّجُلَ يُفْضِي إلى امْرَأَتِهِ، وَتُفْضِي إِلَيْهِ، ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا )) .[1] واته: خراپ ترین كه‌س له لای (خوای گه‌وره ) له رۆژی قیامه‌تدا ، ئه‌و پیاوه‌یه یان ئه‌م دوو هاوسه‌ره‌یه ، كه جماع یان سه‌ر جێی ده‌كات له گه‌ل خێزانه‌كه‌ی دا ، دوایی نهێنیه‌كاندا بلاو ده‌كاته‌وه ..؟!

له (ابی سعید الخدری ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌گێریته‌وه ده‌لێت : له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((إنَّ أعظَمَ الأمانةِ عِندَ اللهِ يومَ القِيامةِ الرَّجُلُ يُفضِي إلى امرأتِهِ وتُفضِي إليه ثمَّ، ينشُرُ سِرَّها )) .[2] واته: گه‌وره‌ترین ئه‌مانه‌ت و سپارده له قیامه‌تدا له لای (خوای گه‌وره) ئه‌وه‌یه ژن و پیاو له جێگای خه‌وتندا پێكه‌وه باسی كاری سه‌ر جێیی ده‌كه‌ن ، له پاشدا پیاوه‌كه ده‌چێ ئه‌و باس خواسه بۆ خه‌لك ده‌گێرێته‌وه و رازو نهێنی ژنه‌كه‌ی یان خێزانه‌كه‌ی باس ده‌كات و بلاو ده‌كاته‌وه ..؟!

یه‌كێكی تری له شاردنه‌وه‌ی نهێنیه‌كان ، كه ئه‌و كرداره قبیح و قێزه‌ونانه‌یه كه مرۆڤ به ووته‌و كردار ئه‌نجامی ده‌دات ، بۆ نموونه : ئه‌و كه‌سه‌ی كه فاحیشه‌یه‌ك ئه‌نجامده‌دات ، وه‌كو داوێن پیسی و زیناو ، شه‌راب خواردنه‌وه ، یان بوختان كردن ... هتد ، ئینجا بروا له لای خه‌لكی رای بگه‌یه‌نێ ، ئه‌م نه‌هێنیه خۆی ئاشكراو بكات و نه‌ی شارێته‌وه ، به‌لاو خۆی لاف پێ لێ بدا ، خۆی پێ هه‌ل بكێشێ ، به‌لكو نهێنی شاردنه‌وه گوناهه‌كان كرده‌وه قێزه‌ونه‌كان ، ستایشكراوه په‌سه‌ند كراوه ، نابێت بتركێنی له لای هیچ كه‌سێك ته‌نها له‌ی خۆتاو (خوای گه‌وره ) شاراوه‌یی نیهێنی بمێنێته‌وه ، چونكه (خوای گه‌وره ) لێ خۆشبوو میهره‌بانه و داپۆشێنه‌ری به‌نده‌كانیه‌تی ..؟!

له (زید بن أسلم ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌گێرێته‌وه ده‌لێت : ((عن زيدِ بنِ أسلمَ، أنَّ رجلاً اعترف على نفسِه بالزنا على عهدِ رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّم، فدعا له رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّم بسوطٍ، فأُتِي بسوطٍ مكسورٍ، فقال فوقَ هذا، فأُتِيَ بسوطٍ جديدٍ لم تُقطع ثمرتُه ، فقال دونَ هذا؛ فأُتِيَ بسوطٍ قد رُكِّبَ به ولانَ، فأمر به رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّم فجُلِدَ؛ ثم قال : أيها الناسُ، قد آن لكم أن تنتهوا عن حدودِ اللهِ، من أصاب من هذه القاذورةِ شيئًا، فليستتر بسترِ اللهِ؛ فإنَّهُ من يُبْدِ لنا صفحتَه، نُقِمْ عليه كتابَ اللهِ )).[3]

---

[1]-صحيح مسلم برقم (١٤٣٧).
[2]- سنن ابو داود برقم (٤٨٧٠).
[3]-اخرجه ملك في (الموطأ ) (٨٢٥/٢)، الشافعي في (الأم) (٣٦٧/٧)، البيهقي في (الكبرى) (٣٢٦/٨).

دووەم: (كتمان المذموم ) واتە: شاردنەوەی لۆمەكراو و ناپەسەند :

١-شاردنەوەی (العلم ) واتە: زانست

(خوای گەورە) نەهی یان قەدەغەی كردووە لە بەندەكان ئەوەی كە علم زانستی پە شتێكی بە سوود هەیە بۆ موسلمانان بە گشتی بە تایبەتی بۆ مرۆڤایەتی ئەگەر بی شارێتەوە یان بلاوی نەكاتە ئاشكرایی نەكات ئەو علم زانستەی كە هەیەتی ..؟! چونكە ئەم ژیانی خەلكە بۆ رێنموویی كردنی رێگایی راست و دروست ، واجەب لە سەر هەر موسلمانێك ئەگەر بەیان نەكات ئەو حەق راستیە كە لە لایەتی ، وە نابێت غەش ناپاكی لە زانستەكەی بكات بلاوی نەكاتەوە بەلكو دەبێت ئاشكرایی بكات و نەی شارێتەوە،چونكە شاردنەوەی زانست پەشەند نیە..؟!

بەلێ بۆ هەر زانایەكی ئایینی دەبێت رێنمایی كار بێت و رێ نیشاندەر بێت بۆ موسلمانان بەو زانستە شەرعیە كە لە لایەتی (خوای گەورە ) فەزلی زانستی پێ بەخشیوە دەبێت بەیان بكاو بلاوی كاتەوە بۆ خەلكی ، هەروەك ئەوەی كە بە چاوی خۆی قەدەغەكراوێكی بینی یان منكری بینی دەبێت نەهی لێ بكات وەك شتێك كە باتل بێت یان لە نێوخەلكی دا بیدعەو داهێناوە و خرافاتەكان شرك هاوبەشی دانان بۆ (خوای گەورە ) ، نابێت لێی بێ دەنگ بێت بوە ستێت ئەو زانستەی هەیە رابگەیەنێ و روونی بكاتەوە بۆ خەلكی ، هەر منكرو قەدەغەكراوێكی بینی لێ بێ دەنگ نەبێت،بەلكودەبێت بەو زانستەی كە هەیەتی بەرگری لە ئاینیی ئیسلام بكات نەی شارێتەوە.؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٥٩]واتە : {سزای شاردنەوەی دین} [ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ] ئەو كەسانەی كە ئەو شتە ڕوون و ئاشكراو هیدایەتەی كە ئێمە ناردوومانە دەیشارنەوە دوای ئەوەی كە لە كتابەكاندا ئێمە ئاشكرامان كردووە واتە: مەبەست پێی جوولەكەو گاورە وە لە كتابەكانی ئەواندا باسی هاتنی پێغەمبەری خوا كراوە صلى الله عليه وسلم بە ئاشكرا ئەوانیش ئەیشارنەوە وە بە خەڵكی ناڵێن [ أُولَئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ] ئەوانە خوای گەورە نەفرەتیان لێ ئەكات وە هەموو نەفرەتكاران لە فریشتەو جنی و مەلائیكەت و ماسی و نەهەنگەكان و مێروولەكان هەموو نەفرەتكارێ نەفرەتیان لێ ئەكات..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٧٤﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٤]واتە : {سزای ئەوانەی بە دین دونیا دەستدەخەن} [ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ الْكِتَابِ ] ئەو كەسانەی كە ئەو شتانە ئەشارنەوە كە خوای گەورە لە كتابدا دایبەزاندووە دیسان جوولەكە یە كە سیفەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەشارنەوە كە لە تەورات و ئینجیلدا خوای گەورە باسی كردووە [ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ] وە ئەوانە بەم كارەیان شتێكی كەم لە دونیای پێ دەست ئەخەن [ أُولَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا النَّارَ ] ئا ئەمانە هیچ شتێك ناخۆن و ئەوە ی كە پەیدای ئەكەن بەشاردنەوەی ئەو حەقە تەنها ئاگرێكە لەناو سكیاندا دەبێتە هۆی سزای ئاگری دۆزەخ بۆیان [ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ ] وە خوای گەورە لە رۆژی قیامەت قسەیان لەگەڵدا ناكات قسەیەك كە پێیان خۆشە چونكە لێیان تورەیە، وە پاكیان ناكاتەوە لە كردەوە پیسەكانیان [ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ] وە سزایەكی زۆر بەئێش و ئازاری بۆ داناون..؟!

قال تعالى: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْاْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ١٨٧﴾ [آل عِمرَان : ١٨٧] واته: [ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ ] وه خوای گه‌وره به‌ڵێن و په‌یمانی له ئه‌هلی کتاب وه‌رگرت له جووله‌که‌و گاوره‌کان [ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ ] ئه‌بێ پێغه‌مبه‌رایه‌تی محمد - صلى الله عليه وسلم - بۆ خه‌ڵك ڕوون بکه‌نه‌وه‌و نه‌یشارنه‌وه به‌ڵام [ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ ] ئه‌مان ئه‌و عه‌هدو به‌ڵێنه‌یان فڕێدایه پشتیان [ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ] وه شتێکی که‌م و دونیایه‌کی که‌می له‌ناوچوویان پێ کڕی [ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ] که ئه‌مه به دڵنیایی خراپترین شته که دونیایان کڕی و ئه‌و عه‌هدو په‌یمانه‌ی خوای گه‌وره‌یان گۆڕیه‌وه به دونیا ..؟!

قال تعالى: ﴿۞ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ١٢٢﴾ [التَّوْبَة : ١٢٢]واته: [وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً ] وه نابێ باوه‌ڕداران هه‌ر هه‌موویان به‌یه‌که‌وه ده‌رچن بۆ غه‌زاو مه‌دینه چۆڵ بکه‌ن [ فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ ] له هه‌ر کۆمه‌ڵێك له‌وانه که‌سانێك بمێنێته‌وه له‌ناو شاردا [ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ ] بۆ ئه‌وه‌ی که له دین شاره‌زا بن و به دوای زانستی شه‌رعیدا بگه‌ڕێن [ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ ] وه پاشان که له دین فێربوون و گه‌ڕانه‌وه قه‌ومه‌که‌یان ئاگادار بکه‌نه‌وه [ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ] به‌ڵکو ئه‌وانیش خۆیان بپارێزن، یاخود ئه‌وانه‌ی که له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوادا - صلى الله عليه وسلم - ئه‌ڕۆن ئه‌وان له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - فێری دین و قورئان و ئه‌حکامی جیهادو ئه‌و شتانه ئه‌بن وه دواتر گه‌ڕانه‌وه خه‌ڵکه‌که فێر بکه‌ن..؟!

**له‌م ئایه‌تانه‌ی سه‌ره‌وه که باسمان کرد بۆ مان ده‌ر ده‌که‌وێت ، که واجبه زانستی شه‌رعی به‌یان و بلاو بکه‌ینه‌وه نابێت بی شارینه‌وه ، هه‌لبه‌ته ئه‌گه‌ر زانا به مه‌به‌ست زانسته‌که‌ی خۆی بشاریته‌وه به یان نه‌کات ، ئه‌وا سه‌رپێچی کردووه گوناهبار ده‌بێت ، یه کێکه له تاوانه گه‌وره کان ، چونك واجبه عین ، تکلیف کراوه له هه‌موو زانایه‌ك که زانسته‌که‌ی (خوای گه‌وره ) بلاو بکاته‌وه به‌وه‌ی که شاره‌زایی لێ هه‌یه ، که‌واته : ئه‌گه‌ر زه‌ره و زیانی هه‌بیچت له شاردنه‌وه‌ی ئه‌و زانسته شه‌رعیه بێ گومان تاونی گه‌وره ئه‌نجامداوه چونکه خه‌لکی پێویستی پێ هه‌یه ..؟! بێ گومان شاردنه‌وه‌ی زانستی (خوای گه‌وره ) ده‌بێته زیان گه‌یاندن به ئایینی ئیسلام یان ده‌بێته به فیرۆدانی ئه‌حکامه‌کانی شه‌رعی ، که په‌یوه‌ندی به گوێرایه‌لی فه‌رمانه‌کانی (خوای گه‌وره ) و پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی ﷺ هه‌یه ، ئه‌م ئاشکراکردنه فه‌رزه ..؟!**

**٢-(كتمان الشهاده) واته: شاردنه‌وه‌ی شاهێدی دان یان گه‌واهیدان :**

**(خوای گه‌وره ) نه‌هی كردووه له‌وه‌ی كه شاهیدان به شاریته‌وه ، چونكه ئه‌م شاردنه‌وه‌یه گه‌وره‌ترین تاوانه له تاوانه گه‌وره‌كاندا ، هه‌لبته ئه‌م گه‌واهیدانه یان شاهیدانه هاوتایه یان هاوشێوه‌ی شاهیدانه به درۆ كردن ، چونكه حه‌قیقه‌ت و راستی له‌سه‌ر دانه‌مه‌زراوه ، ئه‌مه‌ش به‌لگه‌ی قورئانی پیرۆز ئه‌م ئایه‌تانه‌ی خواره‌وه ئاماژه‌یه ..؟!**

قال تعالى: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ١٤٠﴾ [البَقَرَة : ١٤٠] واته : [ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَتَمَ شَهَادَةً عِنْدَهُ مِنَ اللَّهِ ] وه كێ له‌و كه‌سه زاڵمتره؟ واته: هیچ كه‌سێك له‌و كه‌سه زاڵمترو سته‌مكارتر نیه كه شایه‌تیه‌كی له‌لابێت و بیشارێته‌وه كه جوله‌كه‌و گاور ئه‌و شتانه‌یان ئه‌زانی به‌ڵام ده‌یانشارده‌وه له موسڵمانان، وه ئه‌یانزانی كه دینی راست ته‌نها ئیسلامه وه محمد پێغه‌مبه‌ری خوایه صلى الله علیه وسلم به‌ڵام ده‌یانشارده‌وه [ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ] وه خوای گه‌وره بێئاگا نیه له‌و كرده‌وه خراپانه‌ی كه ئێوه ئه‌یكه‌ن له‌م زوڵم و سته‌مه..؟!

قال تعالى: ﴿وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ٢٨٣﴾ [البَقَرَة : ٢٨٣]واته: [ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ ] وه شایه‌تی مه‌شارنه‌وه‌و هه‌ر كاتێك پێویست بوو بڕۆن شایه‌تی حه‌ق بده‌ن [ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ ] وه هه‌ر كه‌سێك شایه‌تی بشارێته‌وه ئه‌وا به‌ڕاستی دڵی ئه‌و كه‌سه تاوانباره كه‌سێكه سه‌رپێچی خوای گه‌وره‌ی كردووه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌هۆی ئه‌و شاردنه‌وه یه له‌وانه‌یه خاوه‌ن حه‌ق حه‌قه‌كه‌ی له‌ده‌ست بدات [ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ] به‌ڕاستی خوای گه‌وره زۆر زانایه به كرده‌وه‌كانی ئێوه ..؟!

قال تعالى: ﴿وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْءَاثِمِينَ ١٠٦﴾ [المَائـِدَة : ١٠٦]واته : [ وَلَا نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ ] وه شایه‌تی خوای گه‌وره ناشارینه‌وه [ إِنَّا إِذًا لَمِنَ الْآثِمِينَ (١٠٦) ] ئه‌گه‌ر شایه‌تیمان شارده‌وه ئێمه له تاوانبارانین، (ته‌میمی داری) ده‌فه‌رمێت: هه‌موو خه‌ڵكی له‌م ئایه‌ته دورن ته‌نها من و (عه‌دی كوڕی به‌دداء) نه‌بێت، كه هه‌ردووكیان گاور بوون و له پێش ئیسلامدا ده‌چوون بۆ بازرگانی بۆ شام، وه كۆیله‌یه‌كی (به‌نی سه‌هم) له‌گه‌ڵیاندا رۆیشت كه ناوی (به‌دیلی كوڕی ئه‌بی مه‌ریه‌م) بوو وه‌قاپێكی له زیو پێ بوو بۆ پاشای ده‌برد، كه گه‌وره‌ترین بازرگانیه‌كه‌ی بوو، نه‌خۆش كه‌وت و وه‌سێتی بۆ كردن ئه‌وه‌ی به‌جێی هێشتووه بیگه‌یه‌نن به كه‌سوكاری، (ته‌میم) ده‌فه‌رمێت: كه مرد قاپه‌كه‌مان فرۆشت و دامان به هه‌زار درهه‌م و دابه‌شمان كرد له نێوانماندا، كاتێك كه گه‌ڕاینه‌وه بۆ لای كه‌سوكاری ئه‌وه‌ی پێمان بوو دامان پێیان و ئه‌وانیش داوای قاپه زیوه‌كه‌یان كرد، وتمان جگه له‌مانه هیچی تری به‌جێنه‌هێشتووه هیچی تری پێمان نه‌داوه، (ته‌میم) ده‌فه‌رمێت: له پاش هاتنی پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله علیه وسلم - كه موسڵمان بووم زۆرم پێناخۆش بوو خۆم به تاوانبار زانی چووم بۆ لای كه‌سوكاری و هه‌واڵم پێدان و بۆم گێڕانه‌وه‌و پێنج سه‌د درهه‌مم پێدان، وه پێم وتن: هاوڕێكه یشم ئه‌وه‌نده‌ی تری لایه، ئه‌وانیش چوون سوێندیاندا به سوێندێك كه له دینه‌كه‌ی ئه‌ودا گه‌وره بوو ئه‌ویش سوێندی خوارد به درۆ وه خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند..؟!

به‌ڵێ بێ گومان له سەر هەر موسلمانێك واجبه ، به شاهێدان یان گەواهیدانی ئاشكراو دیار ، وه نهی كردووه له شاردنه‌وه‌ی شاهێدان یان گه‌وهیدان ، چونكه ئایینی ئیسلام هەر هەمووی دادوەری یەكسانی تێدا بەدی دەكرێ، هیچ زولم ستەمێك له هیچ كەس قبول ناكات ، وه له هیچ ستەمێك رازی نابێت له هەر كەسێك له سەر گۆیی زەویدا ، جا ئیماندار بێت ، یان بێ باوەرو كافر بێ ، یان دەولەمەند و زەنگین بێت ، یان فەقیر هەژار بێت ، یان خزمی نزیك بێت یان دوور بێت ، چونكه له رێگەی شاهێدی یان گەوهیدانه كه ماف و حەق به كەسی زولم لێكراو دەدرێت ، هەلبەته شاردنەوەی شاهێدان به حەق ، ئەوا مافی خاوەن زولم لێكراو پێشه دەكرێت و دەفەوتێت..؟!

هەروەها ئەو كەسەی كه شاهێدان یان گەواهیدانەكەی دەشاریتەوه ئەو ستەمی كردووه ، (خوای گەوره ) سزاو ئازاری دەداتەوه له رۆژی دواییدا ، چونكه به مەبەست و عمدا شاهێدانەكه دەشارێتەوه، كەچی زۆر چاك دەزانی راستەیەكه كامەیه ، بەلام ئەو به مەبەست دەی شارێتەوه ، كەچی نازانێت (خوای گەوره ) زاناو دانا شارەزایه به نێو هەموو دل دەروونەكان ، وه به نیەت و مەبەستی هەموو كەسێك دەزانی و شارەزاو خبیره به دله كان..؟!

قال تعالى: ﴿۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ١٣٥﴾ [النِّسَاء : ١٣٥]واته : [ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا ] ئەگەر لەوە ترسان كە ناكۆكی و كێشەی نێوان ژن و پیاو گەورە بێتەوە [ فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا ] ئەوا دوو پیاوی عاقڵ و دیندارو دادپەروەر بنێرن یەكێك لە لایەنی پیاوەكەو یەكێك لەلایەنی ئافرەتەكەوە بۆ ئەوەی ئەوان صوڵح بكەن لە نێوان ئەو ژن و پیاوەدا [ إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا ] ئەگەر ئەو دوو دادوەرە مەبەستیان صوڵح و رێكەوتن بێت و نیەتیان باش بێت ئەوە خوای گەورە نێوانی ئەو ژن و پیاوە رێك ئەخاتەوەو بەیەكتریان ئەگەیەنێتەوە [ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە وە زانیاریەكی زۆر ووردی هەیە..؟!

له (عبد الرحمن بن ابي بكر ) له (باوكی )یه وه – خوا لێیان رازی بێت – ده گێرنەوه دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((ألا أحدِّثُكم بأكبرِ الكبائرِ؟ قالوا: بلى يا رسولَ اللَّهِ، قال: الإشراكُ باللَّهِ، وعقوقُ الوالدينِ قال: وجلسَ وَكانَ متَّكئًا قال: وشَهادةُ الزُّورِ - أو قولُ الزُّورِ - قال: فما زالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليْهِ وسلَّمَ يقولُها حتَّى قلنا ليتَهُ سَكتَ )). [1]

واته : ئاگادار بن له تاوانه هەر گەورەكانتان پێ رادەگەیەنم ، ووتیان : بەلێ . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرمووی: هاوەل بریاردان بۆ (خوای تاك تەنیا ) ئازاردان و دەل رەنجاندنی دایك وباوك ، ووتی : لەو كاتەدا شانی دەدا بوو جارێك دانیشت و فەرمووی : شایەتی یان گەواهی دان به درۆ و ناحەق یان ووتەی درۆ ساخته ، ووتی : ئەوەندەی ووتەوه ، هەتا ووتمان : خۆزگه بێدەنگ دەبوو با ئەوەند هیلاك نەبوایه ..؟!

[1]- السنن الترمذي برقم (٣٠١٩).

له (انس بن مالك) – خوا لێ رازی بێت – ده‌گێرنه‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((فى الكبائرِ، قال: الشِّرْكُ باللَّهِ، وعقوقُ الوالدينِ، وقتلُ النَّفسِ، وقولُ الزُّورِ)) . [1] واته: گوناهو تاوانه هه‌ر گه‌وره‌كات ئه‌مانه‌ن : هاوه‌ل بریاردان بۆ (خوای تاك و ته‌نیا ) ئازاردان و دل ره‌نجاندنی دایك و باوك ، كوشتنی كه‌سێ به ناحه‌ق یان ناره‌وا ، وه ووته‌ی درۆ شایه‌تی ناحه‌ق و ناره‌وا ، یان شاردنه‌وه و شاهێدی دان یان گه‌واهیدان به‌درۆ.

له (النعمان بن بشير) – خوا لێ رازی بێت – ده‌لێت : له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بیستووه ده‌ی فه‌رموو : ((سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يقولُ: وأَهْوَى النُّعْمانُ بإصْبَعَيْهِ إلى أُذُنَيْهِ، إنَّ الحَلالَ بَيِّنٌ، وإنَّ الحَرامَ بَيِّنٌ، وبيْنَهُما مُشْتَبِهاتٌ لا يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ، وعِرْضِهِ، ومَن وقَعَ في الشُّبُهاتِ وقَعَ في الحَرامِ، كالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الحِمَى ، يُوشِكُ أنْ يَرْتَعَ فيه، ألا وإنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، ألا وإنَّ حِمَى اللهِ مَحارِمُهُ، ألا وإنَّ في الجَسَدِ مُضْغَةً، إذا صَلَحَتْ، صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وإذا فَسَدَتْ، فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، ألا وهي القَلْبُ)). [2] واته: –له‌و كاته‌دا (نعمان ) په‌نجه‌كانی یان ده‌ستی برد بۆ هه‌ردوو گوێی – ( بێ گومان حه‌لال ئاشكراو روونه ، وه حه‌رامیش ئاشكراو روونه ،وه له نێوانیاندا چه‌ند شتێكی گوماناوی هه‌ن ..؟!زۆرێك له خه‌لكی نایان زانن ، وه هه‌ر كه‌سێك خۆی له گومان بپارێزی ئه‌وا خۆی ئاینه‌كه‌ی پاراستوه له تانه و تاوان ، هه‌ر كه‌سێكیش بكه‌وێته ناو شتی گوماناویه‌وه ئه‌وا كه‌تۆته ناو شتی حه‌رامه‌وه ، وه‌ك چۆن شوانێك ئاژه‌له‌كانی له ده‌وربه‌ری قه‌ده‌غه‌كراوه‌ی ده‌له وه‌رێنی دوور نیه تێ بكه‌وێت ، چاك بزانن هه‌موو پادشایه‌ك یان فه‌رمانره‌وایه‌ك یان كار به‌ده‌ستێك ، قه‌ده‌غه‌كراوێكی تایبه‌تی به‌خۆی هه‌یه ، چاك بزانن قه‌ده‌غه‌كراوی (خوای گه‌وره ) هه‌ر ئه‌و شتانه‌یه كه حه‌رامی كردووه ، بزانن كه له لاشه‌دا پارچه گۆشتێك هه‌یه ، ئه‌گه‌ر چاك بێت ، ئه‌وا هه‌موو له‌ش چاك ده‌بێت ، وه ئه‌گه‌ریش خراپ فاسد بێت ، ئه‌وا هه‌ووو لاشه خراپ فاسد ده‌بێت ، چاك بزانن ئه‌و پارچه گۆشته دله ..؟!

له( زيد بن خالد الجهني )– خوا لێ رازی بێت – ده‌لێ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((ألا أُخْبِرُكُمْ بخَيْرِ الشُّهَداءِ الذي يَأْتي بشَهادَتِهِ قَبْلَ أنْ يُسْأَلَها )) . [3] واته: ئایا پێتان بلێم چاكترین شاهێدان كێ یه ..؟! چاكترین شایه‌تی یان گه‌واهیدان ئه‌و كه‌سه‌یه كه شاهێدی یان گه‌واهی ده‌دات ، پێش ئه‌وه‌ی پرسیاری لێ بكرێت یان داوایی لێ بكرێت ..؟!

---

[1]- السنن الترمذي برقم (٣٠١٨).
[2]-صحيح مسلم برقم (١٥٩٩).
[3]-صحيح مسلم برقم (١٧١٩).

٣-(كتمان الحقوق ) واته : شاردنه‌وه‌ی حه‌ق و راستی :

**به‌ڵێ (خوای گه‌وره ) له نه‌وه‌ی جووله‌كه‌ی قه‌ده‌غه‌كردووه یان رێگری لێ كردوونه ، له‌م كاروكرده‌وه قبیح و قێزه‌وونانه له چه‌واشه‌كاری و گومرایی ، هه‌روه‌ها حه‌ق باتل تێكه به یه‌كیان ده‌كردو سه‌ریان له خه‌ڵك ده‌شێواند ، حه‌قیان ده‌شارده‌وه ناحه‌ق و باتل یان به دیار ده‌خست ، چونكه زۆر چاك حه‌قیان یان ده‌ناسی كامه‌یه ، به‌لام به دریان نه‌ده‌خست و ئاشكرایان نه‌ده‌كرد كه محمد ﷺ پێغه‌مبه‌ری خوا ، وه به‌حاق نێردراوه بۆ هه‌موو گویی زه‌وه‌ی له مرۆڤ جنۆكه ، ئه‌و به‌رنامه‌ش كه هێناویه‌تی قورئانی پیرۆز ، به‌لام ئه‌وان قورئانیان وا ده‌رده‌خست كه باتل ، وا راستی و حه‌قیان داده‌پۆشی ده‌یان شارده‌وه ، وه ئاشكرایان نه‌ده‌كرد له به‌ڵگه روون وئاشكراكانی قورئانی پیرۆز ، به‌لام كه‌چی له لایه‌ن (خوای گه‌وره ) فه‌رمانیان پێكرا بوو ، كه حه‌ق ئاشكرا بكه‌ن رابگه‌یه‌نن ، ئه‌م ئایه‌تانه‌ی خواره‌وه به‌ڵگه‌ی بێ باوه‌ری ئه‌و كه‌سانه‌ن كه حه‌ق و راستی ده‌شارنه‌وه به‌یان ناكه‌ن.**

قال تعالى: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ۝٤٠ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ۝٤١ وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ۝٤٢﴾ [البَقَرَةِ : ٤٠ - ٤٢]واته : {ئامۆژگاری كردنی به‌نی ئیسرائیل} [ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ ] ئیسرائیل واته: به‌نده‌ی خوا كه یه‌عقوبی كوڕی ئیسحاقی كوڕی ئیبراهیم بوو (صه‌ڵات و سه‌لامی خوای گه‌وره‌یان له‌سه‌ر بێت)، ئه‌ی نه‌وه‌كانی ئیسرائیل یادی ئه‌و نیعمه‌تانه‌ی من بكه‌نه‌وه كه رژاندم به‌سه‌رتاندا، كه پێغه‌مبه‌رو كتابم بۆ ناردن و له فیرعه‌ون رزگارم كردن، وه جۆره‌ها نیعمه‌تی تر [ وَأَوْفُوا بِعَهْدِي ] وه وه‌فاتان هه‌بێ به‌رامبه‌ر به‌و په‌یمانه‌ی كه به‌منتان داوه كه شوێن محمد صلى الله علیه وسلم بكه‌ون كاتێك كه دێت [ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ ] منیش ئه‌و ئه‌جرو پاداشتانه‌ی كه وه‌عدم پێ داون بۆتان جێبه‌جێ ئه‌كه‌م و لێتان رازی ده‌بم و ده‌تانخه‌مه به‌هه‌شته‌وه [ وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ (٤٠) ] وه به‌تاك و ته‌نها له من بترسێن..؟! [ وَآمِنُوا بِمَا أَنْزَلْتُ مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ ] وه ئیمان بێنن به‌و كتابه كه قورئانی پیرۆزه بۆم دابه‌زاندووه كه به‌ڕاستدانه‌ری ته‌ورات و ئینجیله كه خۆتان پێتانه [ وَلَا تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ ] وه مه‌بن به یه‌كه‌م كافرێك له به‌نی ئیسرائیل كه كوفر بكه‌ن به قورئانی پیرۆز یان به پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله علیه وسلم [ وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا ] وه ئایه‌ته‌كانی من مه‌فرۆشن به نرخێكی كه‌م و بۆ دونیایه‌كی كه‌م (كه ئه‌گه‌ر هه‌موو دونیایش بێت هه‌ر كه‌مه) [ وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ (٤١) ] به‌تاك و ته‌نها ته‌قوای من بكه‌ن و له من بترسێن..؟! [ وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ ] وه حه‌ق و باتڵ تێكه‌ڵ مه‌كه‌ن و سه‌ر له خه‌ڵك مه‌شێوێنن و حه‌ق مه‌شارنه‌وه كه ناردنی محمدو صلى الله علیه وسلم ئیمان هێنانه پێ [ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٤٢) ] له كاتێكدا كه ئه‌زانن محمد پێغه‌مبه‌ری خوایه صلى الله علیه وسلم..؟!

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنۡهُمۡ لَيَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ۝١٤٦﴾ [البَقَرَةِ : ١٤٦]واته : [ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ ] ئه‌و كه‌سانه‌ی كه كتابمان پێ به‌خشیوون له جووله‌كه‌و گاوره‌كان ئه‌وانه پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله علیه وسلم ئه‌ناسن وه ئه‌زانن كه ئه‌مه پێغه‌مبه‌ری خوایه هه‌روه‌كو چۆن مناڵه‌كانی خۆیان ئه‌ناسن هیچ گومانێكیان له پێغه‌مبه‌رایه‌تی محمد دا نیه صلى الله علیه وسلم [ وَإِنَّ فَرِيقًا مِنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ] به‌ڵام كۆمه‌ڵێك له‌وان كه زاناكانیانه ئه‌وان زیاتر شاره‌زان ئه‌و حه‌قه ئه‌شارنه‌وه كه شێوازو سیفه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوایه صلى الله علیه وسلم كه له كتابه‌كانیاندا باسكراوه وه ئه‌یشزانن كه ئه‌مه پێغه‌مبه‌ری خوایه صلى الله علیه وسلم..؟!

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٢٠﴾ [الأَنعَام : ٢٠]واته : {ئه‌هلی کتاب پێغه‌مبه‌ر- صلى الله عليه وسلم - ده‌ناسن وه‌کو منداڵه‌کانی خۆیان} [ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ ] ئه‌و که‌سانه‌ی که کتابمان پێ به‌خشیوون وه‌کو ته‌ورات و ئینجیل ده‌زانن که که‌عبه قیبله‌یه‌و هیچ گومانێکیان تێیدا نیه، یان پێغه‌مبه‌ری خوا- صلى الله عليه وسلم - ئه‌ناسن هه‌روه‌کو چۆن منداڵه‌کانی خۆیان ده‌ناسن، وه چۆن گومانیان له منداڵه‌کانی خۆیاندا نیه ئاواش گومانیان له پێغه‌مبه‌رایه‌تی محمد دا نیه- صلى الله عليه وسلم - وه ئه‌زانن که ئه‌مه پێغه‌مبه‌ری خوایه - صلى الله عليه وسلم - چونکه پێغه‌مبه‌رانیان له کتابه‌کانیاندا باسی هاتنی پێغه‌مبه‌ری خوایان- صلى الله عليه وسلم - بۆ ئوممه‌ته‌کانیان کردووه‌و سیفاته‌کانی و شاره‌که‌ی و شوێنی کۆچکردنه‌که‌یان باس کردووه، که (عبدالله‌ی کوڕی سه‌لام) ی زانای جوله‌که موسڵمان بوو (ئیمامی عومه‌ر) پێی فه‌رموو: خوای گه‌وره وا ده‌فه‌رمێت ئایا ئێوه پێشتریش ده‌تانزانی که محمد- صلى الله عليه وسلم - پێغه‌مبه‌ری خوایه؟ وتی: به‌ڵێ چۆن ده‌مانزانی ئه‌مه منداڵی خۆمانه ئاوایش ده‌مانزانی که محمد- صلى الله عليه وسلم - پێغه‌مبه‌رو نێردراوی خوایه، به‌ڵکو زیاتریش له منداڵی خۆمان چونکه گومانمان هه‌بووه له منداڵی خۆمان به‌ڵام گومانمان نه‌بووه له پێغه‌مبه‌رایه‌تی محمد- صلى الله عليه وسلم - [ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ] کافران که خۆیان دۆڕاندووه به عینادی کردن و ئیمان نه‌هێنانیان ئه‌مانه ئیمان ناهێنن..؟!

قال تعالى: ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ١٥٦ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ [الأَعۡرَاف : ١٥٦ - ١٥٧]واته : [ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ] به‌ڵام ڕه‌حمه‌تی من ئه‌وه‌نده فراوانه هه‌موو شتێکی گرتۆته‌وه [ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ ] ڕه‌حمه‌تی خۆم ئه‌نووسم بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی که ته‌قوای من ئه‌که‌ن وه زه‌کاتی ماڵه‌کانیان ئه‌ده‌ن، یان ده‌روونی خۆیان پاك ده‌که‌نه‌وه له خراپه [ وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ] وه ئه‌و که‌سانه‌ی که ئیمانیان به ئایه‌ته‌کانی ئێمه هه‌یه وه ملکه‌چن بۆی..؟!

{شوێنکه‌وتوانی پێغه‌مبه‌ری خوا – صلى الله عليه وسلم – سه‌رکه‌وتوون} [ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ ] ئه‌و که‌سانه‌ی که شوێن ئه‌و پێغه‌مبه‌ره ئه‌که‌ون که ڕه‌سول و نه‌بی بووه نێردراوی خوای گه‌وره بووه (الْأُمِّيَّ) بووه واته: نه‌خوێنده‌وار بووه وه بۆ لای قه‌ومێکی نه‌خوێنده‌وار نێردراوه که عه‌ره‌ب بوونه [ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ ] که جووله‌که‌و گاوره‌کانیش له لای خۆیان سیفه‌تی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره که محمده - صلى الله عليه وسلم - ئه‌بینن و نووسراوه [ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ] ئه‌و پێغه‌مبه‌ره فه‌رمانیان پێ ئه‌کات به هه‌موو کارێکی چاك، که چاکترینیان په‌رستنی خوای گه‌وره‌یه به تاك و ته‌نها [ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ ] وه قه‌ده‌غه‌و ڕێگریان لێ ئه‌کات له هه‌موو کارێکی خراپ، که خراپترینیان هاوبه‌ش بڕیاردانه بۆ خوای گه‌وره [ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ ] وه هه‌موو شتێکی پاك و به‌تام و چێژو به‌له‌زه‌تیان بۆ حه‌ڵاڵ ئه‌کات، به‌تایبه‌تی ئه‌وه‌ی که به‌نو ئیسرائیل کاتی خۆی له خۆیانیان حه‌رام کردبوو [ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ ] وه هه‌موو شتێکی پیسیان لێ حه‌رام ئه‌کات [ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ ] وه ئه‌و باره گرانانه‌ی که خۆیان خستبوویانه سه‌رشانی خۆیان ئه‌م هه‌موو ئه‌و باره قورسانه‌یان له‌سه‌رشان لائه‌دات [ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ] وه‌ئه‌و کۆت و زنجیرانه‌ی که پێیانه‌وه بوو که باری قورسیان خستبووه سه‌رشانی خۆیان به‌بێ ئه‌وه‌ی به‌رژه‌وه‌ندیه‌کی تیادا بێت ئه‌م پێغه‌مبه‌ره - صلى الله عليه وسلم - هه‌موو ئه‌و شتانه‌یان له‌سه‌ر لائه‌دا..؟!

له ( عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌لێت : ((أنَّ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ أُتِيَ بيَهُودِيٍّ وَيَهُودِيَّةٍ قدْ زَنَيَا، فَانْطَلَقَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ حتَّى جَاءَ يَهُودَ، فَقالَ: ما تَجِدُونَ فى التَّوْرَاةِ علَى مَن زَنَى؟ قالوا: نُسَوِّدُ وُجُوهَهُمَا، وَنُحَمِّلُهُمَا، وَنُخَالِفُ بيْنَ وُجُوهِهِمَا، وَيُطَافُ بهِمَا، قالَ: فَأْتُوا بالتَّوْرَاةِ إنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ، فَجَاؤُوا بهَا فَقَرَؤُوهَا حتَّى إذَا مَرُّوا بآيَةِ الرَّجْمِ وَضَعَ الفَتَى الذى يَقْرَأُ يَدَهُ علَى آيَةِ الرَّجْمِ، وَقَرَأَ ما بيْنَ يَدَيْهَا، وَما وَرَاءَهَا، فَقالَ له عبدُ اللهِ بنُ سَلَامٍ: وَهو مع رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ مُرْهُ فَلْيَرْفَعْ يَدَهُ، فَرَفَعَهَا فَإِذَا تَحْتَهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فأمَرَ بهِما رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فَرُجِمَا. قالَ عبدُ اللهِ بنُ عُمَرَ: كُنْتُ فِيمَن رَجَمَهُمَا، فَلقَدْ رَأَيْتُهُ يَقِيهَا مِنَ الحِجَارَةِ بنَفْسِهِ )) .[١] واته: كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ، پیاو ژنێكی جووله‌كه‌یان هێنایه خزمه‌تی ، ئه‌وان داوێن پیسی یان زینایان كردبوو ، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئینجا رۆیشت تا هاته لای جووله‌كه‌كان ، فه‌رمووی : (ئێوه چی له (ته‌ورات ) ئه‌م بینن ده‌رباره‌ی كه سێك كه داوێن پیسی یان زینا بكات ..؟! ) ئه‌وانیش ووتیان : ده‌م وچاوی هه‌ردووكیان ره‌ش ده‌كه‌ین ..!! هه‌ر دووكیان به‌ره‌و پشت واته پشتاو پشت سواری ووشترێك یان گوێ درێژێك ده‌كه‌ین و ئه یان گه‌رێ نین ..!!پێغه‌مبه‌ری ﷺ فه‌رمووی : ده (ته‌ورات ) بهێنن ئه‌گه‌ر راست ده‌كه‌ن ..؟!ئه‌وانیش هێنایان و خوێندیانه‌وه ، تاكاتێ تێپه‌رین به‌سه‌ر ئایه‌تی رجم یان به‌رد باران كردندا ..؟!ئه‌م سه‌رو ئه‌وسه‌ری ئایه‌ته‌كه‌ی ده‌خوێنده‌وه ، له‌و كاته‌دا (عبدالله‌ی كوری سلام ) له گه‌ل پێغه‌مبه‌ر ﷺ دا بوو ،ووتی : پێ بلێ . با ده‌ست به‌رز بكاته‌وه ..؟! ئه‌ویش كاتێ ده‌ستی به‌رز كرده‌وه ده‌بینی ئایه‌تی رجم كردن یان به‌رد باران كردن له بن ده‌ستی دایه ..؟! ئینجا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمانی به هه‌ردووكیان كرد ، رجم كران یان به‌رد باران كران ، (عبدالله كوری عمر ) ده‌لێ : من خۆم یه‌كێك بووم له‌وانه‌ی به‌رد بارانیان كردن ، بینیم پیاوه‌كه خۆی ئه‌دایه به‌ر به‌رده‌كان و ژنه كه‌ی لێ ده‌پاراست ..؟!

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَـٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٧١﴾﴾ [آل عِمْرَان : ٧١]واته : [ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ ] ئه‌ی ئه‌هلی كتاب بۆ حه‌ق و باتڵ تێكه‌ڵ ئه‌كه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی سه‌ر له خه‌ڵك بشێوێنن [ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٧١) ] وه‌حه‌قه‌كه ئه‌شارنه‌وه كه هاتنی پێغه‌مبه‌ری خوایه - صلى الله عليه وسلم - له كاتێكدا ئه‌زانن كه محمد پێغه‌مبه‌ری خوایه - صلى الله عليه وسلم - له كتابه‌كانی ئێوه‌دا ئه‌و موژده‌یه‌تان پێدراوه ..؟!

[١]-صحيح مسلم برقم (١٦٩٩).

بەلێ لە حەق باتل یان پووچ چوار ووتە هەیە ئەمانەن :

١-(الحق ) داپێدانانە بە هەندێك فەرمان پێغەمبەری خوا ﷺ ، و (الباطل) شاردنەوەی هەندێك فەرمانەكان..؟!

٢-(الحق ) ئیمان هێنان بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، و (الباطل) بێ باوەری پێی ..؟!

٣-(الحق ) ( تەوراتە) لە لایەن (خوای گەورە) بۆ موسی - علیه السلام - دابەزیوە ، (الباطل) بەوەی كە بەدەستی خۆیان تەوراتیان دەنووسیەوە واتە: تەوراتیان دەنووسی زیادو كەم یان دەكرد دەیان گۆری ..؟!

٤-(الحق) ئیسلامە ، و (الباطل) ئاینی یهود و نصرانیە ، واتە :ئاینی جوولەكە و گاورەكانە ..؟!

قال تعالى: ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ [النِّسَاء : ٤٦] واتە : { جولەكە دەستكاری تەورات دەكەن} [ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ ] ئەو كەسانەی كە جوولەكەن دەستكاری تەورات ئەكەن و وشەكان لە جێی خۆی ئەگۆڕن و ماناكانی دەگۆڕن و تەئویلی ئەكەن..؟!

قال تعالى: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ﴾ [المَائـِدَة : ١٣] واتە: [ فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ ] جوولەكە بەهۆی ئەوەی كە ئەم بەلێن و پەیمانەیان شكاندو هەلیانوەشاندەوە خوای گەورە نەفرەتی لێ كردن و لە ڕەحمەت و هیدایەتی خۆی دەری كردن [ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ] وە دڵیانمان ڕەق كرد كە پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن [ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ ] وە قسەو فەرموودەكانی خوای گەورە كە ئایەتەكانی تەورات بوو لە جێی خۆی ئەیانگۆڕی و دەستكاریان ئەكردو تەئویلیان ئەكرد (ئەمەیش بەلگەیە لەسەر ئەوەی كە سەرجەم كتێبە ئاسمانیەكان قسەو فەرموودەی خوای گەورەیەو دروستكراو نیە) [ وَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ ] وە ئەوەی كە یادیان خرایەوە لەبیریان كرد كە چ بەشێكیان هەیە لە قیامەتدا ئەگەر وا نەكەن و ئیمان بێنن، یاخود كاریان پێ نەكرد..؟!

قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ﴾ [المَائـِدَة : ٤١]واتە: [ وَمِنَ الَّذِينَ هَادُوا سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ ] وە خەفەت لە جوولەكەكانیش نەخۆی كە گوێ بۆ درۆی گەورەكانیان ئەگرن ئەوانەی كە دەستكاری تەورات ئەكەن [ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ] وە گوێ لە كەسانێكی تریش ئەگرن ئەوانەی كە خۆیان نایەن لە مەجلیسی تۆدا دانیشن لە تەكەبورو لووتبەرزیدا [ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِنْ بَعْدِ مَوَاضِعِهِ ] دەستكاری تەورات ئەكەن كە وتە و فەرموودەی خوای گەورەیە، وە لە شوێنەكانی خۆی ئەیگۆڕن وەكو ئایەتی ڕەجم كە دەستكاریان كردبوو..؟!

٤-(كتمان النعم ) واتە: شاردنەوەی نیعمەت :

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ٣٧﴾ [النِّسَاء : ٣٧]واتە: [ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ ] ئەو كەسانەی كە خۆیان ڕەزیلن و ئەو مافانەی لەسەریانە جێبەجێی ناكەن وە فەرمانیش بەخەڵكی ئەكەن بەڕەزیلی و چروكی [ وَيَكْتُمُونَ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ ] وە ئەوەی كە خوای گەورە پێی بەخشیوون لە فەزڵ و چاكەی خۆی ئەیشارنەوەو پێیانەوە دیار نیەو خۆیان وادەرئەخەن كە فەقیرو هەژارن، یاخود مەبەست پێی جولەكەیە كە ڕەزیلیان كردو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوایان- صلى الله عليه وسلم - شاردەوەو دەریاننەخست [ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا ] وە بۆ ئەو كەسانەی كە كافرن و كوفرانەی نیعمەتی خوا دەكەن لەناو دۆزەخدا سزایەكمان بۆیان داناوە كە ڕیسواو سەرشۆڕیان ئەكەین..؟!

بەڵێ (خوای گەورە) لەم ئایەتەدا باسی لەم جۆرە خەلكانە دەكات كە خۆشی ناوێن ، رەقی لەم رەوشتانەیە كە ئەنجامی دەدن ، ئەویش ئەوانەی فێلباوز خۆیان بە گەورە دەزانن فخر و شانازی بە خۆیان دەكەن ، ئەوانەش كە بخیل یان رەزیل و چاوچنۆك پێسكن ، ئەوانە بێ گومان سیفەتێكی لۆمەكراویان تێدا بەدی دەكرێت ، ئەو كەسانە بەد بەخت و لۆمەكراون چونكە كەوتوونەتە ناویەوە ، كە خراپترین سیفەتی قێزەونیان هەلگرتووە ، ئەوانیش كە رەزیل قرچۆك چاو چنۆكن لە مال و سامانەكانیان ، هەروەها فەرمان بەخەلكی دەكەن كە ئەم سیفەتە ناشرینە ئەنجام بدەن وەكو خۆیان ، هەروەها شاردنەوەی یان داپۆشینی ئەو نیعمەتانەی كە (خوای گەورە ) پێ بەخشیون ، بە هیچ شێوەیەك نیعەتەكانی كە (خوای گەورە ) پێ بەخشیون ئاشكرای ناكەن ، جا چ نیعمەتی مال سامان بێت ، یان نیعمەتی علم زانست بێت ، یان نیعمەتی تەندروستی صحەتی باش بێت ، جگە لەو نیعمەتە زۆرانەی كە (خوای گەورە ) بە ئەوانی بەخشیوە ...هتد چونكە رەزیل و پێسكە چاوچنۆك هەمیشەو بەردەوام ئینكاری یان جحود لە نیعەتەكانی (خوای گەورە) دەكەن ، وە ئاشكرای ناكەن دەی شارنەوە ئەم نیعمەتە زۆرانەی كە پیان بەخشراوە ، وەكو ئەم سەردەمەی ئێستا لە هیچ شتێكی كەم نیە كار بەدەست فەرمانرەوایە كفر مە نیعمەتەكان دەكات ، (خوای گەورە ) ناناسێ و دژایەتی ئاینەكەی دەكات كەچی هەموو نیعمەتێكی پێ بەخشیوە لە هەموو نیعمەتەكانی گەورەتر ئیسلامە ، بەلام باوەری بە رۆژی لێ پرسینەوە نیە ، خەلكی پرسی دەكات تەنها بۆ خۆش گوزەرانی خۆی ، ئەم نیعمەتە زۆرانە كە بەسەری دا رژاوە نایبینێ ، ئەی شارێتەوە ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ٣٧﴾ [النِّسَاء : ٣٧] واتە : وە بۆ ئەو كەسانەی كە كافرن و كوفرانەی نیعمەتی خوا دەكەن لەناو دۆزەخدا سزایەكمان بۆیان داناوە كە ڕیسواو سەرشۆڕیان ئەكەین..؟!

## پێنجەم: چارە نووسی کتمانی ستایشکراو و چارەنووسی کتمانی لۆمەکراو

### یەکەم: (عاقبة کتمان المحمود ) واتە: چارە نووسی شاردنەوەی ستایشکراو :

١-(کتمان السر ) واتە: شاردنەوەی نهێنی ستایشکراو ، جا لە دونیا بێت یان لە دوا ڕۆژ بێت ، چونکە بەهێزترین هۆکارە بۆ سەر کەوتن ، بەردەوامە لە سەر چاکە کاری ، چونکە دەبێتە یارمەتی دەر هاوکاری کردنێکی باش بۆ ئەوەی کەسی (الحسد) یان ئیرەی و فێڵ باز لە خۆت بپارێزی لەمانە ،بۆ ئەوەی لە فێڵ ی فێڵ بازان و چاوی (الحسد ) خۆتی لێ بپارێزی دەبێت شاردنەوەی نهێنی بۆ ئەوەی نەتوانن زیانت پێ بگەیەنن ، چونکە ڕاگەیاندنی نێهێنی تایبەت بە خۆدی خۆت دەبێتە زیان ئەو کەسانە زیانت پێ دەگەیەنن وەکو فیلْ باز (الحسد ) هەر وەك :

لە (معاذ بن جبل ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێرنەوە دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((استَعينوا على قضاءِ الحوائجِ بالكتمانِ فإنَّ كلَّ ذي نعمةٍ محسودٌ )) .[١] واتە: هاوکاری کردن و یارمەتی دەری پێویستیەکانە شاردنەوە یان دپۆشین ، چونکە هەر کەسێك نیعمەتێکی هەیە ئیرەیی یان حسودی پێدەبرێت..؟!

٢-(کتمان ذنب)واتە :شاردنەوەی گوناهو تاوان و داپۆشین یان ستر کردن لەبەر چاوی خەلك، چونکە لە بەر ئەوەی خۆی لە ئیهانە و زەلیل و سەرزەنشتکردن خەلکی دەپارێزی ، وە ئەگەر تاوانێك یان گوناهێکی ئەنجامدا پێوسیتە بەسزاو تەمێکردنە ،ئەوا داواکردن لە دونیادا ، بەلام ئەگەر تاوان گوناهەکەی خۆی شاردەوەو دای پۆشی و تسری کرد ، ئەوا سزاکەی لە نێوان خۆی و (خوای گەورە) یە چونکە (خوای گەورە ) لێ خۆشبوو میهرەبانە ، ئەوای گەورە لە دونیا ستری دەکات ، گوناهو تاوانەکەی دادەپۆشێت ، دەی شارێتەوە ..؟!

لە (عبداللە بن عمر ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێرنەوە دەلێت : ((قالَ رَجُلٌ لاِبْنِ عُمَرَ كيفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ يقولُ: فِى النَّجْوَى؟ قالَ: سَمِعْتُهُ يقولُ: يُدْنَى الْمُؤْمِنُ يومَ القِيَامَةِ مِن رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ، حتَّى يَضَعَ عليه كَنَفَهُ، فيُقَرِّرَهُ بذُنُوبِهِ، فيَقولُ: هلْ تَعْرِفُ؟ فيَقولُ: أَىْ رَبِّ أَعْرِفُ، قالَ: فإنِّى قدْ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فى الدُّنْيَا، وإنِّى أَغْفِرُهَا لكَ اليَومَ، فيُعْطَى صَحِيفَةَ حَسَنَاتِهِ، وَأَمَّا الكُفَّارُ وَالْمُنَافِقُونَ، فيُنَادَى بهِمْ علَى رُؤُوسِ الخَلاَئِقِ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ كَذَبُوا علَى اللَّهِ )).[٢]واتە:

لە (کوری عمر) یان پرسی ووتیان : چۆنت بیستووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە باسی تاون پۆشی یان شاردنەوەی تاوانی بۆ کردبی ؟!ووتی : لێم بیستووە فەرموویەتی :لەرۆژی قیامەتدا ئیماندار لە پەروەردگاری خۆی نزیك دەبێتەوە ،تاکو بالی میهرەبانی خۆی بە سەردا دەکێشی ،دانی پێدا ئەنێت بە گوناهو تاوانەکانی دا،دەفەرمووێت :ئایا دەزانیت ؟!ئەویش دەلێ ئەی پەروەردگار دەزانم ،دەمن لە دونیادا بۆ تۆم پۆشیت ، ئەمرۆش لە تۆ خۆش دەبم ، ئینجا نامەی چاکەکەی پێدە درێت ، بەلام بێ باوەرو دوو رووەکان لە بەر چاوی هەموو خەلکیدا جاریان بۆ دەدرێت ، ئەمانە بوون کە درۆیان دە کرد بەدەم (خوای گەورە) ..؟!

[١]-اخرجه الخطيب بغدادي في تاريخ بغداد (٥٦/٨) .
[٢]-صحيح مسلم برقم (٢٧٦٨).

له (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرنەوە دەلێت: ((كلُّ أُمَّتى مُعافًى إلا المجاهرين، و إنَّ من الجِهارِ أن يعملَ الرجلُ بالليلِ عملاً ثم يُصبحُ و قد ستره اللهُ تعالى فيقولُ : عملتُ البارحةَ كذا و كذا، و قد بات يسترُه ربُّه، و يُصبِحُ يكشفُ سِترَ اللهِ عنه )) .[1] واته : بیستومه له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : هەموو ئوممەتم بەخشراوە جگە لەوانەی ( گوناهو تاوانی) ئاشكرا دەكەن ..؟! بەراستی ئەوە لە گوناهو تاوان دەرخستنە كە كەسێك لە شەودا تاوانێك ئەنجام بداو ، كە رۆژ دەبێتەوە (خوای گەورە ) ستری یان پۆشیویەتی ، بەلام خۆی ئاشكرایی دەكا و دەلێ : فلان كەس ! دوێنی وام كردو وام كرد ، لە كاتێكدا لە شەودا (خوای گەورە) ستری كردووە پۆشیویەتی ، وە بەردەوامیش ئەی پۆشێ و ستری دەكات ، كەچی خۆی كە رۆژ بوویەوە ئەوەی (خوای گەورە ) پۆشیویەتی  ئەو دەری دەخات ..؟!

٣-(كتمان ذنب اخيه وستره ) واته : شاردنەوە داپۆشینی گوناهو تاوان هەلەی براكەت ، نابێت ئاشكرا بكەی ، چونكە پاداشتی شاردنەوە هەل و گوناهو تاوانەی برا موسلمانەكەت لە دونیاو لە قیامەت دەدرێتەوە ، هەلبەتە لە دونیادا براكەی دادەپۆشیت و ستری دەكات ، هەلەیەك ناكات ئاشكرای بكات ، بۆ ئەوەی زەلیل و سەر شۆری بكات خەلكی پێ بزانن و رقیان لێ بێت ، چونكە ستر كردنی هەل و گوناو تاوانی برا موسلمانە كەت لە دونیادا ، پاداشت وەرگرتنەوەیە لە قیامەت ، وەنابێت كردەوە كانی ناشرینەكانی ئاشكرا بكرێت لە دونیادا چونكە (خوای گەورە ) ستری برا موسلمانەكەی كردووە ، تۆ بۆ ئاشكرای دەكەیت ، بەلكو دەبێت  بشاردرێتەوە ئەوەی كە زیانی بۆ خۆی هەیە ، ئەوەشی كە زیان بە خەلكی دەگەیێنی دەبێت ئامۆژگاری بكرێت و خەلكی لێ بە ئاگابن..؟!

له (عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرنەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((المسلمُ أخو المسلمِ لا يظلمُهُ ولا يسلمُهُ ومن كانَ فى حاجةِ أخيهِ كانَ اللَّهُ فى حاجتِهِ ومن فرَّجَ عن مسلمٍ كُربةً فرَّجَ اللَّهُ عنهُ كُربةً من كُرَبِ يومِ القيامةِ، ومن سترَ مسلمًا سترَهُ اللَّهُ يومَ القيامةِ )) .[2] واته: موسلمان برای موسلمانە ، زولم ستەمی لێ ناكات ، سەر شۆری ناكات و نایدا بەدەستەوە ، بەلكو سەری دەخات ، هەر كەس پێویستی برایەكی موسلمانی خۆی جێبەجێ بكات (خوای گەورە) پێویستی ئەو جێ بەجێ دەكات ، ناخۆشی و خەم و پەژارەیەكی دونیا لە سەر موسلمانێك سووك بكات و لە تەنگانە رزگاری بكات ، ئەوا (خوای گەورە) لە رۆژی قیامەتدا ناخۆشی و خەم پەژارەیەكی لە سەر سووك دەكات و لە تەنگانە رزگاری دەكات ، وە هەر كەسێك عەیب عاری برا موسلمانەكەی دا بپۆشێت ئەوا (خوای گەورە ) لە دونیادا عەیب و عاری ئەو دا دەپۆشێت ..؟!

---

[1]- صحيح مسلم برقم (٢٩٩٠).
[2]-السنن الترمذي برقم (١٤٢٦).

٤-(كتمان السر بين الزوجين ) واته: شاردنه‌وه‌ی نهێنی نێوان دوو هاوسه‌ر ، چونكه به یه‌كێك له مانه‌وه‌و سه‌قامگیری به‌رده‌وام بوونی ژیانی ژن و پیاو یان دوو هاوسه‌ر و هاوژیان داده‌نرێت ، چونكه ده‌بێته زیان گه‌یاندن به له‌كدار كرنی ژیانی هاوسه‌ری خێزانداری ، هه‌روه‌ها زیان گه‌یاندن به تاك و گۆمه‌لگا له رووی به‌د ره‌وشتیه‌و ، وه په‌یوه‌ندیه كۆمه‌لایه‌تیه‌كان ده‌پچرێنی كێشه‌و به‌د ئه‌خلاقی بلاو ده‌بێته‌وه له نێو خیزانه‌كاندا ، به‌لام قورئانی پیرۆز ده‌رباره‌ی ئه‌مه بۆ مان باس ده‌كات ، ده‌رباره‌ی خێزانه كانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ..؟!

قال تعالى: ﴿وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُۥ وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتْ مَنْ أَنۢبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْخَبِيرُ ۝٣ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ وَجِبْرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ۝٤ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ۝٥﴾ [التَّحْرِيم : ٣ - ٥]واته : [ وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا ] پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - به‌ نهێنی قسه‌ی لای یه‌كێك له‌ خێزانه‌كانی كرد كه‌ (حه‌فصه‌) بوو وتی: ئه‌وه‌ (ماریه‌) م له‌ خۆم حه‌رام كردووه‌، یان لای (زه‌ینه‌ب) بوو كه‌ وتی: هه‌نگوینم له‌ خۆم حه‌رام كردووه‌، به‌ڵام به‌ كه‌س نه‌ڵێی [ فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ ] به‌ڵام ئه‌و خێزانه‌ (حه‌فصه‌ یان زه‌ینه‌ب) لای عائیشه‌ باسیان كرد [ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ ] وه‌ خوای گه‌وره‌ به‌ پێغه‌مبه‌ری - صلى الله عليه وسلم - وت و بۆی ئاشكرا كرد كه‌ ئه‌و خێزانه‌ به‌وانی تری وتووه‌ [ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ ] هه‌ندێكی به‌ حه‌فصه‌ وت وه‌ هه‌ندێكیشی پێی نه‌ووت وه‌كو رێزلێنان [ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ ] كاتێك كه‌ پێی وت كه‌ ئه‌م شته‌ت بڵاو كردۆته‌وه‌ [ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَذَا ] (حه‌فصه‌)یش وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - كێ ئه‌م هه‌واڵه‌ی به‌ تۆ راگه‌یاند كه‌ من بڵاوم كردۆته‌وه‌؟ [ قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ (٣) ] پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - فه‌رمووی: خوای گه‌وره‌ به‌ منی راگه‌یاندووه‌ هه‌واڵی پێ داوم كه‌ خوایه‌كه‌ زۆر زانایه‌ وه‌ زانیاریه‌كی زۆر وردی هه‌یه‌و هیچ شتێك له‌ خوای گه‌وره‌ ناشاردرێته‌وه‌..؟! [ إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ] پاشان خوای گه‌وره‌ گفتوگۆ له‌گه‌ڵ عائیشه‌و حه‌فصه‌دا ئه‌كات (خوایان لێ رازی بێ) ئه‌گه‌ر ئێوه‌ هه‌ردووكتان ته‌وبه‌ بكه‌ن و بۆ لای خوای گه‌وره‌ بگه‌رێنه‌وه‌ ئه‌وه‌ دڵتان به‌لای خوای گه‌وره‌دا گه‌ڕاوه‌ته‌وه‌، یاخود به‌لای ته‌وبه‌دا گه‌ڕاوه‌ته‌وه‌، واته‌: ته‌وبه‌ بكه‌ن و جارێكی تر شتی وا مه‌كه‌ن [ وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ ] به‌ڵام ئه‌گه‌ر جارێكی تر یه‌ك بگرن وه‌ هاوكاری یه‌ك بكه‌ن له‌ به‌رامبه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوادا - صلى الله عليه وسلم - وه‌ نهێنی بدركێنن [ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ ] ئه‌وه‌ ئه‌و كاته‌ خوای گه‌وره‌ خۆی دۆست و پشتیوان و سه‌رخه‌ری پێغه‌مبه‌ری خوایه‌ - صلى الله عليه وسلم - وه‌ جبریل و به‌نده‌ چاك و باوه‌ڕداره‌كانی وه‌كو (ئه‌بوبه‌كرو عومه‌رو عوسمان و عه‌لی) (خوایان لێ رازی بێ) [ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ (٤) ] وه‌ له‌ پاش ئه‌مانیش مه‌لائیكه‌تیش دیسانه‌وه‌ پشتیوانی پێغه‌مبه‌ری خوان - صلى الله عليه وسلم -..؟![ عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ ] ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئێوه‌ ته‌ڵاق بدات ئه‌وا به‌ دڵنیایی په‌روه‌ردگارتان له‌ جیاتی ئێوه‌ خێزانانێكی له‌ ئێوه‌ باشتر به‌ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئه‌به‌خشێ [ مُسْلِمَاتٍ ] ئه‌و خێزانانه‌ی كه‌ به‌ پێغه‌مبه‌ری خوای - صلى الله عليه وسلم - ئه‌به‌خشێ هه‌موویان ئافره‌تانێكی موسڵمانن [ مُؤْمِنَاتٍ ] وه‌ باوه‌ڕدارن [ قَانِتَاتٍ ] وه‌ گوێڕایه‌ڵن بۆ خواو پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - [ تَائِبَاتٍ ] وه‌ ته‌وبه‌كارن و له‌ تاوان و ئه‌گه‌ رێنه‌وه‌ بۆ لای خوا [ عَابِدَاتٍ ] وه‌ په‌رستش بۆ خوای گه‌وره‌ ئه‌نجام ئه‌ده‌ن و ملكه‌چی خوای گه‌وره‌ن [ سَائِحَاتٍ ] كۆچكه‌ریشن، یاخود به‌ رۆژوون كه‌سانێكن به‌رده‌وام به‌رۆژوون رۆژووی سوننه‌ت [ ثَيِّبَاتٍ ] وه‌ هه‌یانه‌ بێوه‌ژنه‌ [ وَأَبْكَارًا (٥) ] وه‌ هه‌یشیانه‌ كچه‌، به‌ڵام ئه‌م شته‌ رووی نه‌دا وه‌ خێزانه‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ لای خوای گه‌وره‌ وه‌ ته‌وبه‌یان كرد له‌و كاره‌یان..؟!

٥-(كتمان السرار) واته: شاردنه‌وه‌ی نهێنیه‌كان ، كه‌واته پاراستنی نهێنیه‌كان یه‌كێكه له‌و هۆكاره هه‌ره گرنگه‌كان كه یارمه‌تی كۆمه‌لگه‌ی موسلمانان ده‌دات ، وه كار بۆ پته‌و كردنی په‌یوه‌ندیه كۆمه‌لایه‌تیه‌كان ده‌دات ، وه دروست كردنی پێوه‌ندی خۆشه‌ویستی نێوان موسلمانان و ئه‌وانه‌ی كه نهێنی یه‌كتری ده‌پارێزن ..؟!هه‌روه‌ك موسلمانان هۆشداریان پێدراوه یان ئاگادار كرانه‌وه له‌وه‌ی نهێنی یه‌كتری ئاشكرا نه‌كه‌ن ، به‌لكو ده‌بێت له نێوان خۆیان دا نه‌هێنی یه‌كتری بپارێزن دو دای بپۆشن ئاشكرای نه‌كه‌ن ، چونكه له هه‌ر دانیشتنی نێوان موسلمانان دا به‌راست گۆیی ئه‌مانه‌ته‌وه به‌رێوه ده‌چن خه‌لكی متمانه‌یان به یه‌كتری زیاتر ده‌بێت ، له‌وه‌ی كه له هه ر دانیشتن و كور و كۆبوونه‌وه‌یه‌ك نهێنیه‌كان ئاشكرا بكرێت ،ئه‌وه متمانه‌و خۆشه‌ویستی په‌یوه‌ندی كۆمه‌لایه‌تی تێك ده‌چێت ، چونكه پیویسته له هه‌ر مجلس و دانیشتن و كور كۆبوونه‌وه نهێنیه‌كان پارێزگاری لێ بكرێت ئاشكرا نه‌كرێت..؟!

له (جابر بن عبدالله ) – خوا لیّ رازی بێت – ده‌لێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((إذا حَدَّثَ الرجلُ الحديثَ ثم التَفَتَ فهي أمانةٌ )) . واته : ئه‌گه‌ر كه‌سێك له كاتی قسه‌كردندا ، ئاوری دایه‌وه و به‌ملاو به‌و لا دا ، هه‌تابزانیّ كه‌س گۆیی له قسه‌كه‌یه‌تی یان نا ئه‌وه قسه‌كه‌ی ئه‌مانه‌ت و سپارده‌یه ..؟!

به‌كورتی چاره‌نووسی شاردنه‌وه‌ی نهێنیه‌كان له دونیاو له قیامه‌تدا ده‌رئه‌نجامێكی (المحمود ) یان ستایشكراوه ، چونكه پاراستنی نهێنیه‌كان به كێكه له عیباده‌ت و په‌رستنه‌كان داده‌نرێت ،وه‌یه‌كێكه له بنه‌ما ئه‌خلاقی و ره‌وشت به‌رزه‌یه‌كانی مرۆڤی موسلمان ،یان یه‌كێكه له به‌ها ئه‌خلاقیه ره‌سه‌نه‌كانی كۆمه‌لگای ئیسلامی داده‌نریّ.

**دووەم : (عاقبة كتمان المذموم ) واتە: چارەنووسی شاردنەوەی لۆمەكراوە ئەوانەی حەق دەشارنەوە :**

**تێبینی / نهێنی ئاشكرا كردن دەبێتە كاریگەر نەرێنی لە سەر تاكە كانی نێو كۆمەلگایی موسلماناندا ..؟!**

**بەلێ چارەنووس دەرئەنجامی شاردنەوەی سەرزەنشت كراو یان لۆمەكراو ، لەم ئایەتانەی خوارەوە باسكراوە.؟!**

١- **(دەرئەنجامی شاردنەوەی لۆمەكراو سزاو ئازاردانی ناو ئاگر شایەنیەتی )**قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٧٤﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٤]واتە : {سزای ئەوانەی بە دین دونیا دەستدەخەن} [ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ الْكِتَابِ ] ئەو كەسانەی كە ئەو شتانە ئەشارنەوە كە خوای گەورە لە كتابدا دایبەزاندووە دیسان جوولەكەیە كە سیفەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەشارنەوە كە لە تەورات و ئینجیلدا خوای گەورە باسی كردووە [ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ] وە ئەوانە بەم كارەیان شتێكی كەم لە دونیای پێ دەست ئەخەن [ أُولَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا النَّارَ ] ئا ئەمانە هیچ شتێك ناخۆن و ئەوەی كە پەیدای ئەكەن بەشاردنەوەی ئەو حەقە تەنها ئاگرێكە لەناو سكیاندا دەبێتە هۆی سزای ئاگری دۆزەخ بۆیان [ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ ] وە خوای گەورە لە رۆژی قیامەت قسەیان لەگەڵدا ناكات قسەیەك كە پێیان خۆشە چونكە لێیان تورەیە، وە پاكیان ناكاتەوە لە كردەوە پیسەكانیان [ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٧٤) ] وە سزایەكی زۆر بەئێش و ئازاری بۆ داناون..؟!

٢-**(دەرئەنجامی شاردنەوەی لۆمەكراو نەفەرتكردن یان لعنەتە شایەنیەتی )** قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٥٩]واتە: {سزای شاردنەوەی دین} [ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ] ئەو كەسانەی كە ئەو شتە ڕوون و ئاشكراو هیدایەتەی كە ئێمە ناردوومانە دەیشارنەوە دوای ئەوەی كە لە كتابەكاندا ئێمە ئاشكرامان كردووە واتە: مەبەست پێی جوولەكەو گاورە وە لە كتابەكانی ئەوواندا باسی هاتنی پێغەمبەری خوا كراوە صلى الله عليه وسلم بە ئاشكرا ئەوانیش ئە یشارنەوە وە بە خەڵكی ناڵێن [ أُولَئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ] ئەوانە خوای گەورە نەفرەتیان لێ ئەكات وە هەموو نەفرەتكاران لە فریشتەو جنی و مەلائیكەت و ماسی و نەهەنگەكان و مێرووڵەكان هەموو نەفرەتكارێ نەفرەتیان لێ ئەكات..؟!

٣-**( دەر ئەنجامی شاردنەوەی لۆمەكراو چارەنووسی ستەمكارانە )**قال تعالى: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ١٤٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٤٠]واتە : [ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَتَمَ شَهَادَةً عِنْدَهُ مِنَ اللَّهِ ] وە كێ لەو كەسە زاڵمترە؟ واتە: هیچ كەسێك لەو كەسە زاڵمترو ستەمكارتر نیە كە شایەتیەكی لەلایێت و بیشارێتەوە كە جولەكەو گاور ئەو شتانەیان ئەزانی بەلام دەیانشاردەوە لە موسڵمانان، وە ئەیانزانی كە دینی ڕاست تەنها ئیسلامە وە محمد پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم بەلام دەیانشاردەوە [وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ] وە خوای گەورە بێئاگا نیە لەو كردەوە خراپانەی كە ئێوە ئەیكەن لەم زوڵم و ستەمە..؟!

٤-(دەر ئەنجامی شاردنەوەی لۆمەکراو بەد رەوشتی و لە سنوور دەرچونە) قال تعالى: ﴿وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾﴾ [البَقَرَة : ٢٨٣]واتە: [ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ ] وە شایەتی مەشارنەوەو هەر كاتێك پێویست بوو بڕۆن شایەتی حەق بدەن [ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ ] وە هەر كەسێك شایەتی بشارێتەوە ئەوا بەڕاستی دڵی ئەو كەسە تاوانبارە كەسێكە سەرپێچی خوای گەورەی كردووە لەبەر ئەوەی بەهۆی ئەو شاردنەوەیە لەوانەیە خاوەن حەق حەقەكەی لەدەست بدات [ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ] بەڕاستی خوای گەورە زۆر زانایە بە كردەوەكانی ئێوە..؟!

٥-(دەرئەنجامی شاردنەوەی لۆمەکراو کفرو بێ باوەریە) قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٣٧﴾﴾ [النِّسَاء : ٣٧]واتە : [ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ ] ئەو كەسانەی كە خۆیان ڕەزیلن و ئەو مافانەی لەسەریانە جێبەجێی ناكەن وە فەرمانیش بەخەڵكی ئەكەن بەڕەزیلی و چروكی [ وَيَكْتُمُونَ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ ] وە ئەوەی كە خوای گەورە پێی بەخشیوون لە فەزڵ و چاكەی خۆی ئەیشارنەوەو پێیانەوە دیار نیەو خۆیان وادەرئەخەن كە فەقیرو هەژارن، یاخود مەبەست پێی جولەكەیە كە ڕەزیلیان كردو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوایان- صلى الله عليه وسلم - شاردەوەو دەریاننەخست [ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا] وە بۆ ئەو كەسانەی كە كافرن و كوفرانەی نیعمەتی خوا دەكەن لەناو دۆزەخدا سزایەكمان بۆیان داناوە كە ڕیسواو سەرشۆڕیان ئەكەین..؟!

٦-(دەر ئەنجامی ش شاردنەوەی لۆمەکراو یان سەر زەنشتکراو ، زەلیلی و ریسواییە ) قال تعالى: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ١٨٧]واتە: [ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ ] وە خوای گەورە بەڵێن و پەیمانی لە ئەهلی كتاب وەرگرت لە جولەكەو گاورەكان [ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ ] ئەبێ پێغەمبەرایەتی محمد - صلى الله عليه وسلم - بۆ خەڵك ڕوون بكەنەوەو نە یشارنەوە بەڵام [ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ ] ئەمان ئەو عەهدو بەڵێنەیان فڕێدایە پشتیان [ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ] وە شتێكی كەم و دونیایەكی كەمی لەناوچوویان پێ كڕی [ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ] كە ئەمە بە دڵنیایی خراپترین شتە كە دونیایان كڕی و ئەو عەهدو پە یمانەی خوای گەورەیان گۆڕیەوە بە دونیا ..؟!

٧-(دەر ئەنجامی شاردنەوەی لۆمەکراو ئاواتی مەرگ و لە ناو چوون هیلاکیە ) قال تعالى: ﴿يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾﴾ [النِّسَاء : ٤٢]واتە: لەو ڕۆژەدا كە ڕۆژی قیامەتە ئەوانەی كە كوفریان كردووە وە سەرپێچی پێغەمبەری خوایان كردووە- صلى الله عليه وسلم - لە دونیاداو ئیمانیان پێی نەهێناوەو گوێڕایەڵیان نەكردووە ئاواتەخوازن لەگەڵ زەویەكەدا ڕێك بخرێنەوە واتە: زەوی شەق بوایە بچوونایەتە ناویەوەو قوتی بدانایە بەڵام لێپرسینەوە یان لەگەڵدا نەكرایا [ وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا ] وە لەو ڕۆژەدا هیچ قسەیەك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوەو قسەكانیان هەمووی ئاشكرایەو ڕووبەڕوویان ئەبێتەوەو دانی پێدا دەنێن..؟!

## ئایەتی (٧٣)

قال تعالى: ﴿فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَاۚ كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾﴾ [البَقَرَة : ٧٣]

واتە : [ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ] وتمان: هەندێك ئەندامی ئەو مردووە بكێشن بە مانگاكەدا ئەوانیش پیایاندا كێشا خوای گەورە مردووەكەی زیندوو كردەوە وە وتی كە برازایەكی خۆی كوشتویەتی بۆ ئەوەی كە ببێ بە میراتگری پاشان مراندیەوە [ كَذَلِكَ يُحْيِ اللَّهُ الْمَوْتَى ] بەم شێوازە خوای گەورە مردوو زیندوو ئەكاتەوە [ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ] وە نیشانەو بەڵگەكانی تواناو دەسەڵاتی خۆیتان پێ نیشان ئەدات بەڵكو ئێوە فێربن و عاقڵ بن و چی تر كاری وا ئەنجام نەدەن..؟!

(خوای گەورە ) كوژراوەكە زیندوو دەكاتەوە ناوی بكوژەكەشیان ئاشكرا دەكات ، پیاوە بكوژە دیار دەكات..؟!

جا ئەم رووداوە لە تەفسیرە گەورە كان باسكراوە ، وە تەفسیری (طبری ) و (ابن كثیر ) و (قرطبي )... هتد ، ئەگێرنەوە دەڵێن : خەریك بوو دوو تاقم یان دوو كۆمەڵە ، لە پیاوەكانی نەوەی جوولەكە ببێتە شەریان ناكۆكیان لە نێوان خۆیان دا بووە دەمەقالێ ، ئەمەش ئەوە بوو كە پیاوێكی جوولەكە هیچ كورێكی نەبوو، واتە : ووجاغ كوێر بوو ، ئینجا خزم و كەس كاری ئەو پیاوە تەماحیان لە مال و سامانەكەی بوو ، كاتێك ئەو بمرێ ئینجا مال سامانی بە میرات بۆیان بمێنێتەوە ، بەلام لە ناو هەموو خزم كەس و كارەكەیدا برازایەكی تەماحی زیاتر لە میراتی پیاوەكە بوو ، واتە: ئەو برازایەی هەولدەدا پاش مردنی مامی میراتەكەی بۆ ئەو بێت ، ئەوە بوو ئەو برازایەی شەوێك لە شەوەكان چووە مالی مامی ، ئەوە بوو مامەكەی خۆی كوشت بۆ میراتەكەی ، وە لاشەكەی یان تەرمەكەی لە نزیك گوندێكی تر فرێدا ، واتە : گوندێك بوو لە لێواری یان لە قەراغی ئاوێك بوو ، كە بەیانی بوویەوە خەلكی لە خەو هەلستان بینییان ، ئەوا ئەم پیاوە دەولەمەندە كوژراوە ، ئەویش خزمەكانی هەلسان یەخەی خەلكی گوندەكەیان گرت ، پێیان ووتن : وا دیارە ئێوە ئەم پیاوەی خزمی ئێمەتان كوشتووە ، چونكە لە نزیك گوندەكەی ئێوە تەرمەكەی یان لاشەكەی فرێدراوە ..؟! هەلبەتە برازای كوژراوەكە لە هەموو خزمەكانی زیاتر رشتر گەرمتر بوو بۆ مامەكەی ..؟! هەروەك ئەم پەندە وایە كە دەلێن : (يقتل القتيل ويمشي في جنازته) واتە :بكوژەكەی دەی كوژێت و لە دوای تەرمەكەشی دەروات ..؟! خەلكی گوندەكەی تەرمەكەی لا فرێدرا بوو ، ووتیان : ئێمە نەمان كوشتووە ، ئێوە خۆتان كوشتونانە ، لەم دەمەقالیە و یەكتری تاوانبار كردنە ، خەریك بوو بیكەن بە شەرێكی گەورەو چەند كەسێك تێدا بكوژرێ ، ئینجا لە سەر گوندەكەی كە لاشەكەی یان تەرمەكەی تێدا فرێدراو بوو بچەسپێت و بێ خەنە ملی ئەوا ، داب نەریتی ئەو كات وابوو ، ئەگەر تەرمەكە لە نزیك هەر گوندێك فرێ بدرایە ئەوا تاوانی كوشتنەكە ئەوان لە ئەستۆیان بگرتایە ..؟!

بەلام ئەگەر بەلگەش نەبوایە دەبووایە بۆ ئەم کارە (پەنجا) پیاو لەم گوندە سوێند بخوات ، کە ئەوان نەیان کوشتووە ، بەلام لە دوایی دا هەردوو لا رێك نەکەوتن ، ئەوە بوو بریاریاندا بچنە لای (موسی ) — علیه السلام — بۆ ئەوەی ئەو رێگە چارەیەکیان بۆ بدۆزێتەوە ، ئەویش وەکو باسمان کرد لە باسەکانی سەرەوەدا ، بە هەردوو لای ووت : برۆن مانگایەك بهێنن ، سەری ببرن و ئینجا کە زاندار کە چۆنیان سەربری ..؟! ئەوە بوو ویستی (خوای گەورە ) ئاوا بوو ، لەو کوشتنەیان زیندوو بوونەوەی رۆژی قیامەت نیشانی نەوەی جوولەکان بدات ،وە بیکاتە کارێکی لە تونا بەدەر یان نیشان و (معجزە ) بوو بۆ (موسی ) — علیه السلام — نەوەی جوولەکەش بە چاوی خۆیان ببینن کە چۆن (زیندوویان دەکاتەوە ) ئینجا لە پاشان مانگاکەیان سەر بری ، کە (شێخ عبدالوهاب نجار ) لە کتێبی (قصص الانبیاء ) باسی دەکات دەلێت : کە (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ فِيهَاۖ﴾ [البَقَرَةِ : ٧٢]واتە: کەوتنە مشتومر دەمەقالە لە ناو خۆیاندا، هەروەها پێشەوا (مراغی ) لە تەفسیرەکەیدا دەلێت : بۆیە (خوای گەورە) لە ناو هەموو ئاژەل گیانلەبەرانی تردا فەرمانی بە نەوەی جوولەکە کرد بە سەر برینی ئاژەلی مانگادا ، چونکە ئەوان کوێرەکە یان (گۆلك ) پەرست بوون ، لە پێشدا ، ئەو باسە ی کە (موسی ) چوو بۆ سەر کێوی توور ، گفت و گۆو قسەی لە گەل پەروەردگاری خۆیدا کرد ، لە کاتی گەرانەوەی بۆ ناو قەم و هۆزەکەی کە جوولەکە بوون ، ئەوان خەریکی گوێرەکە یان (گۆلك) پەرستن بوون ، ئەویش پیاوێك بوو بەناوی (سامری ) ئەوانی گومرا کرد ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) دوو بارە بە ئاژەلی مانگا تاقیان دەکاتەوە، بەلێ (خوای گەورە )ویستی لە سەر بوو هۆشیاریان بکاتەوە ، تابزانن کە پێشتر ئاژەلی گوێرەکەیان دەپەرست و بە خوای خۆیان دەزانی ، بەلام ئێستا فەرمانیان پێ دەکات کە (خوایە) کەیان ئاژەلی مانگایە سەری ببرن..؟! تابیر بکەنەوە تێ بفکرن و تێبگەن کە چۆن دەبێت خودا سەر ببرن ..؟! چونکە بەراستی (خوای گەورە ) ئەم خوا یەیە کە کەس زال نابی بەسەری ، دەبێ ئەوەیش بیلێن هەر لە بەر ئەوەش بوو کە (خوای گەورە ) هەر لە سەر تاوە کوژراوەکەی زیندوو نەکردەوە ..؟!جا لێرە دا پەندو ئامۆژگاری لەم چیرۆکە ئەوەیە کە سەرجەمی مرۆڤایەتی بزانن کە بێ گومان هەروەك ئەو مردووە زیندوو بوویەوە ، هەر ئاواش (خوای گەورە ) هەموو بردووانی رابردوو لە پێغەمبەران و پیاو چاکان و خزم و کەس کارو ، وە خراپەکاران لە زالم و ستەم کاران بێ باوەران دوو رووەکان مولحیدەکان زیندوو دەکاتەوە ..؟!هەروەها (خوای گەورە ) نیشانە وئایەت و معجیزە وشتە سەر سورهێنەرەکانی خۆی بە بەندەکانی نیشان دەدا ..؟! بەلکو بۆ ئەوەی هۆشیار ببنەوە عەقل ژیریان بخەنە گەر ، لە رێگای راست دورستی (خوا پەرستی راستەقینە لانەدەن ) ئەویش رێگای قال تعالى: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦]واتە: کەرێنمووی رێگایی راستەقینەیە ، ئەویش ئایینی ئیسلامە کە ئایینی پێغەمبەری ئاخر زمانە محمد ﷺ رێگای حەق و راستی بەختەوەریە لە دونیاو لە دوا رۆژدا ..؟!

قال تعالى: ﴿فَقُلْنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَا﴾ واتە: پارچەیەك لەلاشەی مانگاكە لە لاشەی مردووەكە یان كوژارەكە بدەن..؟!ئینجا ئەو پارچەیە هەرشتی بێت لە لاشەی مانگاكە ، ئەوا نیشانە یان معجیزەكە دێتە دی روودەدات ، خۆ ئەگەر دیاریش بكرایە ، یان ئەگەر لە دیاری كردنیدا سوودێكی ببوایە بۆ دونیا و بۆ قیامەتمان بێ گومان (خوای گەورە) بۆی دیاری دەكردین ، بەلام كە دیاری نەكردووە و لەهیچ رێگەیەكی راستەوە نەهاتووە لە لایەن پێغەمبەرانەوە باسیان كردبێ ، ئێمە هەر بەم شێوەیە دەیهێلینەوە وەك (خوای گەورە ) چۆن ب دیاری نەكراو هێشتویەتیەوە ..؟! پاشان (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ واتە: (خوای گەورە ) ئاوا مردوو زیندوو دەكاتەوە ،واتە: لە پارچەیەك لە مانگاكەیان لێدا و كوژارەكە زیندوو بوویەوە ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) هۆشیاری دەدات لە سەر تواناو دەسەلاتی خۆیی و زیندووكردنەوەی مردووەكە و پێشاندانیان بەوەی كە كێ ئەم پیاوەی كوشتوویەتی ، (خوای گەورە كردیە بەلگە لە سەر زیندوو بوونەوە لە رۆژی قیامەتدا ، ئەو كێشەو لاساری جوولەكەش دەربخات و كۆتایی پێبهێنی ..؟! هەروەك لە ئایەتێكی تر دا (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٥٦﴾ [البَقَرَةِ : ٥٦]واتە : لە دوای مردنتان خوای گەورە زیندووی كردنەوە بەڵكو شوكرانەبژێری خوای گەورە بكەن، لە دونیا خوای گەورە نابینرێ بەڵام فەرموودەكان موتەواتیرن لەسەر بینینی خوای گەورە لە رۆژی قیامەت لەلایەن باوەڕدارانەوە..؟! ئەم ئایەتە باس لەوە دەكات كە بەسەرهاتی ئەو كەسەی بەلای شارەكەدا تێپەری خانوو مالە كانیان بە سەر یەكدا روخابوو ، وە بە سەر هاتەكەی پێغەمبەر (ئیبراهیم ) – علیه السلام – چوار بالندەكە ..؟!

هەروەها (خوای گەورە) بەندەكانی ئاگادار كردۆتەوە بەوەی زیندوو بوونەوەی زەوی دوایی مردنی ..؟!

قال تعالى: ﴿وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ٣٣ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ٣٤﴾ [يس : ٣٣ - ٣٤]واتە: تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە} [ وَآيَةٌ لَهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا ] وە یەكێكی تر لە نیشانەی تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە ئەو زەویە مردووە وشكەیە كە خوای گەورە زیندووی ئەكاتەوە بەهۆی باران بارین [ وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا ] وە جۆرەها دانەوێڵەی لێ دەرئەكەین [ فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ] كە هەیانە ئێوە لێی ئەخۆن..؟! [ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ ] وە جۆرەها باخ دەژێنینەوە لە دارخورماو دار مێو [ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ ] وە لە ناویشیدا چەندەها كانیمان تەقاندۆتەوە..؟!

## باس كردنی (الموت ) واته: مردن

### یه‌كه‌م : پێناسه‌ی : (الموت ) واته: مردن

أ-(مردن) یان (الموت) له‌رووی زمانه‌وانیدا :

مردن له زمانه‌وانیدا (الموت ) واته : مردن دێت ، دژی یان پێچه‌وانه‌ی (الحیاة) واته: ژیانه ، له عه‌ره‌بیدا چۆن ساردو گه‌رم دژ به‌یه‌كن یان پێچه‌وانه‌ی یه‌كترین ، ده‌ڵێن : ئه‌و شته گه‌رمه واته: سارد نیه ، یان ئه‌وشته سارد واته گه‌رم نیه ، كه بڵێن : مرد واته: ژیانی نیه ، وه رووحی لێ جیا بووه‌ته‌وه له‌به‌ر ئه‌وه‌یه له زمانه‌وانیدا ، ده‌ووترێت : (الموت الموتان ضد الحیاة ) ..؟! [1] واته : مردن چ (الموت ) ی پێ بگوترێت چ (الموتان ) هه‌ر دووكیان دژ به ژیانه ..؟!.[2] وه ئه‌صل له مردندا جێگیربوونه هه‌ر وه‌ك له (لسان العرب ) دا هاتووه ، هه‌ركه‌س و شتێك ئه‌گه‌ر جێگیربوو جووڵه‌ی لێ برا پێی ده‌گوترێت مردو ..! ! هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌یه خه‌وتنیش جوله‌ت لێ ده‌برێ و هۆشت له سه‌ر خۆت نامێنێ ده‌ڵێن : خه‌وتنیش جۆرێكه له مردن ..؟! [3] جا له زمانی عه‌ره‌بیدا ئه‌گه‌ر ئاگر كه ده‌كوژێته‌وه ده‌ڵێن ئاگره‌كه مرد ، كاتێك رووناكی نامێنی ده‌ڵێن : رووناكیه‌كه مرد ، با كاتێك نامێنێ ده‌ڵێن : با یه‌كه مرد ، كه‌واته مادەم راوه‌ستان و نه‌مان پێی ده‌گوترێت : مردن له زانه وانێد ..؟! [4] وه ده‌ڵێن : مردن جیاوبوونه‌وه‌ی رووحه له جسته‌دا ..؟! [5]

ب-(مردن ) یان (الموت ) له لای زانایانی ئیسلامدا :

له (ئیمامی القرطبي ) - ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت - ده‌ڵێت : (( أنقطاع تعلق الروح بالبدن و مفارقته ، وحیلولة بینهما ، وتبدل حال وانتقال من دار إلی دار )) ..؟! .[6]واته: بچرانی رووح یان گیان له لاشه یان له جسته ،كه رووحه‌كه جیابوویه‌وه ، رووحه‌كه چووه لایه‌ك ولاشه‌كه‌ش یان جسته كه‌ش له‌شوێنێكدا مایه‌وه ئه‌وه ده‌ڵێن: كه‌سه كه مردوه و رووحی له ده‌ستداوه یان گیانی له‌ده‌ستداوه ، له حاڵێك یان له بارێ ده‌گۆرێ بۆ حاڵێكی تر یان بارێكی ، واته: له ماڵ و ژیانێكی تر گوزه‌ر ده‌كات بۆ ماڵ و ژیانێكی تر دا ..؟!

---

[1]- لسان العرب ابن منظور (٥٤٧/٣).
[2]- لسان العرب ابن منظور(٧٧٤/١).
[3]- لسان العرب ابن منظور(٥٤٧/٣).
[4]- لسان العرب ابن منظور(٥٤٧/٣).
[5]- المجموع النووي (١٠٥/٥).
[6]-تفسیر القرطبي سورة الملك ایة ٢.

له (ابن قیم الجزری ) – ره‌حمه‌تی خوا لیٚ بیٚت – ده‌لیٚت : هه‌ر مرۆڤ و گیان له‌به‌ریٚك چوار مالی هه‌یه ئه‌مانه :

مالی یه‌که‌م : ناو سکی دایکته ، که زۆر ته‌سکه و جووله‌یه‌کی وات پیٚ ناکریٚت .

مالی دووه‌م : دونیایه واته: ئه‌م گه‌ردوونه‌یه که تیٚدا ده‌ژین له جیهاندا .

مالی سیٚ یه‌م : ژیانی دوای مردنه واته: ژیانی نه گۆره ، چۆن کاتیٚك له دونیادا ده‌ژیت ئه‌گه‌ر بیربکه‌یته‌وه تۆ کاتیٚك هه‌بووه له ناو سکی دایکتدا ژیاوی چه‌نده ته‌نگ له چاو دونیادا ..؟! دونیا چه‌نده فراوانتره له چاو سکی دایکت ..؟! پیٚت ته‌نگ ده‌بیٚت کاتیٚك ده‌چیته ژیانی دوای مردن (به‌رزه‌خ ) به‌و شیٚوه‌یه فراوانتره له چاو ژیانی دونیادا ..؟!

مالی چواره‌م : ژیانی دوای به‌رزه‌خ یان دوای زیندوو بوونه‌وه ، واته : مه‌یدانی حه‌شر یان رۆژی قیامه‌ت و رۆژی حیساب و چوونه به‌هه‌شت یان چوونه دۆزه‌خ ، ئه‌ویشیان به ئه‌ندازه‌ی فراوانی ژیانی به‌رزه‌خ که چه‌نده فراوانتره له ژیانی دونیادا ئه‌ویشیان ئه‌وه‌نده فراوانتره له ژیانی به‌رزه‌خ و دوای مردن ..؟! .[1]

هه‌روه‌ها خه‌وتنیش پیٚ ده‌ووتریٚت : (مردن ) هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویٚت : قال تعالى: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّىۖ ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝٦٠﴾ [الْأَنْعَام : ٦٠] واته : [ وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ بِاللَّيْلِ ] خوای گه‌وره ئه‌و خوایه‌یه که به شه‌و ئیٚوه ئه‌خه‌ویٚنیٚ (يَتَوَفَّاكُمْ) وه‌فات به‌مانای خه‌وتن دیٚت [ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُمْ بِالنَّهَارِ ] وه زانیاری هه‌یه که به رۆژ ئیٚوه چ کرده‌وه‌یه‌کتان کردووه له چاك و خراپ [ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ ] پاشان به‌رۆژ به‌خه‌به‌رتان دیٚنیٚته‌وه [ لِيُقْضَى أَجَلٌ مُسَمًّى ] بۆ ئه‌وه‌ی کاتیٚکی دیاریکراوی خۆتان به‌سه‌ر به‌رن [ ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ] پاشان گه‌ڕانه‌وه‌تان ته‌نها بۆ لای خوای گه‌وره‌یه له رۆژی قیامه‌ت پاشان خوای گه‌وره هه‌واڵتان پێ ئه‌دات به‌و کردەوانه‌ی که ئێوه ئه‌نجامتان داوه..؟!

تیٚبینی / ووشه‌ی (الموت ) له قورئانی پیرۆزدا (٦٥) جار هاتووه ..؟!

[1] -ابن قيم ، كتاب الروح ص ١٥٥.

## دووەم: (مردن ) لە قورئانی پیرۆز بەچوار شێوە هاتووە :

١-(الموت نفسه) واتە: مردنی هەموو نفسێك ، قال تعالی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ [آل عِمۡرَان : ١٨٥]واتە : هەموو نەفسێك ئەبێ مردن بچێژێ ئەگەر چاكەكار بێ یان خراپەكار، مرۆڤ بێت یان جنی، مەلائیكەت بێت یان شەیتان..؟!

٢-بە شێوەی (النطفة) واتە : دڵۆپە ئاو ، قال تعالی: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٢٨﴾ [البَقَرَة : ٢٨]واتە: [ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنْتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ] ئێوە چۆن كوفر ئەكەن بە خوایەك لە كاتێكدا ئێوە لەسەرەتادا بوونتان نەبووەو ئێوەی دروست كردووە [ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ] پاشان ئەتانمرێنێتەوە پاشان لە ڕۆژی قیامەت زیندووتان ئەكاتەوە پاشان بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێنەوە..؟!

٣-بە شێوەی (الضلال) واتە: گومرایی ، قال تعالی: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ۝١٢٢﴾ [الأَنۡعَام : ١٢٢] واتە : [ أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ ] ئایا كەسێك كە مردبێ و زیندوومان كردبێتەوە، واتە كافر بێ و هیدایەتمان دابێ بۆ ئیسلام [ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ ] وە نوورو ڕووناكیمان پێ بەخشی بێت كە لەناو خەڵكدا بتوانێ پێی بڕوات كە قورئان و ئیسلامە [ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا ] ئایا وەكو كەسێك وایە كە لەناو تاریكییەكانی كوفرو نەزانی و گومراییدا بێت كە نەتوانێ لێی دەرچێ [ كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ] بەم شێوازە كافران كردەوەكان و كوفریان بۆ جوان كرابوو وە ڕازێندرابۆوە..؟!

٤-بە شێوەی (الجدب النبات ) واتە: نەبوونی ڕووك ، یان زەویەكی بێ ڕووك بێ بەرهەم ، پاشان زیندوو دەكریچتەوە بە ئاو ڕووەكی لێ دەڕوێت ، قال تعالی: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ۝٣٣﴾ [يس : ٣٣]واتە : {تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە} [ وَآيَةٌ لَهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا ] وە یەكێكی تر لە نیشانەی تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە ئەو زەویە مردووە وشكەیە كە خوای گەورە زیندووی ئەكاتەوە بەهۆی باران بارین [ وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا ] وە جۆرەها دانەوێڵەی لێ دەرئەكەین [ فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ (٣٣) ] كە هەیانە ئێوە لێی ئەخۆن..؟!

## سێ یەم: شێوازی قورئان بۆ خستنە رووی راستیەکانی مردن

**یەکەم: حقیقەتی مردن :**

**بەلێ مردن شتێکی حەتمیەو هەموو کەسێك و وە رووح لە بەرێك دەبێت تامی مردن بچێژی ، هەروەها دەبێت مردنی بە سەر دا بێت و هەر دەگات بەو رۆژە کە کەس نیە لە مردن زرگاری بو بێت ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٨٨﴾ [القَصَص : ٨٨]واتە: [ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ] هەموو شتێك لەناو ئەچێ تەنها زاتی پیرۆزی خوای گەورە نەبێ (جێگیر کردنی سیفەتی رووی تێدایە بۆ خوای گەورە، کە روویەکی پیرۆزو بەرێزەو لە رووی دروستکراوەکان ناچێت و تەنها خوای گەورە چۆنێتیەکەی دەزانێت) [ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ] حوکم و بڕیاردان هەر بۆ خوای گەورەیە وە لە ڕۆژی قیامەتیش تەنها بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێنەوە، والله أعلم..؟!

**لە( ئیمامی الغزالی ) —رەحمەتی خوا لێ بێت — دەلێت : ((ئەگەر مردن نەزانی چیە ، هەر گیز لە راستی و حقیقەتی ژیان نازانی یان تێ ناگەیت ..؟! )).[1]**

**لە (سید قطب ) — رەحمەتی خوا لێ بێت — دەلێت : (( ئێمە تا ساتە وە قتەی ئێستا ، هیچ لە بارەی حقیقەتی ژیان و حەقیقەتی مردن یان مەرگ نازانین ، بەلام ئێمە بە دیار کەوتنەکانیان لە زیندوان و مردوان دەناسینەوە ،کەواتە : ئێمە پابەندین کە هەموو سەرچاوەکانی ژیان و مردن ، سپاردەی بە هێزێك بکەین کە بە هیچ شێوەیەك وەك ئەم ئەم هێزانە لە دونیادا ، بەلکو ئەو هێزە کە سپاردمان کردوو هێزی (خوای گەورەیە ) ..؟! )).[2]**

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًاۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝٢﴾ [المُلْك : ٢]واتە: [ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ] ئەو خوایەی کە مردن و ژیانی دروست کردووە تا تاقیتان بکاتەوەو دەرکەوێت کامتان باشترین کردەوەتان ئەنجام داوە، باشترین کردەوەش ئەوەیە مرۆڤ نیەتی بۆ خوای گەورە بێت و بۆ ریای نەبێت، وە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بێت و بیدعە نەبێت، بۆیە هیچ کاتێك بە بیدعە ناووترێ: کردەوەی چاك، وە خوای گەورە لێرە نەیفەرمووە کامتان کردەوەی زۆرترە بەڵکو فەرمووی: کامتان کردەوەی چاکترە [ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ] وە خوای گەورە زۆر بەعیزەت و باڵادەست و لێخۆشبووە..؟!

---

[1]-إحيا علوم الدين ، امام الغزالي (٤٩٥/٤).
[2]- في ظلال القرآن ، سيد قطب (٢٩٨/١).

**دووەم: مردن چارەنووسی هەموو بوونەوەرێکی زیندووە :**

**بەڵێ هەروەك باسمان كرد مردن چارەنووسێكی یان دەر ئەنجامێكی حەتمییە بۆ هەموو بوونەوەرێكی زیندوو ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ۝٥٧﴾ [العَنكَبُوت : ٥٧] واتە : [ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ] هەموو نەفسێك ئەبێ مردن بچێژێ [ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ] پاشان تەنها بۆ لای ئێمە ئەگەڕێنەوە..؟!

قال تعالى: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ۝٢٦ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ۝٢٧﴾ [الرَّحۡمَٰن : ٢٦ - ٢٧]واتە:{هەموو دروستكراوەكان لەناو دەچن} [ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ] هەرچی لەسەر ڕووی زەوی هەیە لە خەڵكی و ئاژەڵ و گیانلەبەران هەر هەموویان ڕۆژێك لە ڕۆژان لەناو ئەچن و كۆتاییان پێ دێت..؟! [ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ] تەنها زاتی پیرۆزی پەروەردگاری تۆ ئەمێنێ كە خوایەكە خاوەنی گەورەیی و پیرۆزی و ڕێزەو شایانی ئەوەیە كە بەگەورەو بەڕێز بزانرێت و گوێڕایەڵی بكرێت و سەرپێچی نەكرێت..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ۝٣٠﴾ [الزُّمَر : ٣٠]واتە: {پێغەمبەری خوایش -صلى الله عليه وسلم - وەفات دەكات} [ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ] ئەی محمد -صلى الله عليه وسلم - تۆش دەمریت و ئەوانیش دەمرن، ئەمە هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خوا بوو -صلى الله عليه وسلم - ، (ئەبو بەكری صدیق لە كاتی كۆچی دوایی پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم - ئەم ئایەتەی خوێندەوەو كردیە بەڵگە لەسەر وەفاتی پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم - ).

قال تعالى: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ۝٣٤﴾ [الأنبيَاء : ٣٤]واتە: [ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - لە پێش تۆدا بەردەوامی ژیانمان لە دونیا بە هیچ مرۆڤێك نەبەخشیوەو هەموویان مردوون (هەیە لە زانایان ئەم ئایەتە دەكاتە بەڵگە لەسەر مردنی خضر پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم -، وە تەنها عیسا زیندووەو خوای گەورە بەرزی كردۆتەوە بۆ ئاسمان و پێش هاتنی قیامەت دادەبەزێنێت و دەججال دەكوژێت و دواتر دەمرێت) [ أَفَإِنْ مِتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ ] ئایا تۆ ئەمریت و ئەوانی تر ئەمێننەوە؟ نەخێر ئەوانیش وەكو تۆ ئەمرن و كەس نامێنێت..؟!

**لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێی رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ دەی فەرموو :** ((أَنَّ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ كانَ يقولُ: اللَّهُمَّ لكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وإلَيْكَ أَنَبْتُ ، وَبِكَ خَاصَمْتُ ، اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بعِزَّتِكَ -لا إلَهَ إلَّا أَنْتَ- أَنْ تُضِلَّنِي، أَنْتَ الحَيُّ الَّذِي لا يَمُوتُ، وَالْجِنُّ وَالإِنْسُ يَمُوتُونَ ))[1]. **واتە: خوایە ، خۆم تەسلیمی تۆ كردووە ،وە باوەڕم تەنها بە تۆیە ،تەنها پشت بە تۆ دەبەستم و ، بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە و ، بە تۆ سەر دەكەوم بەسەر دوژمندا ، خوایە ، بەراستی من پەنا دەگرم بە گەورەیی تۆ ، هیچ خوایەك نیە تەنها تۆ نەبێت ، داوات لێدەكەم كە گومرام نەكەیت ، تۆ ئەو زیندووەیت كە هەرگیز نامرێت ، جنۆكە و مرۆڤە كان هەموویان دمرن ..؟!**

[1]-صحيح مسلم برقم (٢٧١٧).




قال تعالى: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ۝٦ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٧ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَـٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝٨﴾ [الجُمُعَة : ٦ - ٨] واته: [ قُلْ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ هَادُوا إِنْ زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ لِلَّهِ مِنْ دُونِ النَّاسِ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - به‌ جووله‌كه‌ بڵێ: ئه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ جووله‌كه‌ن كه‌ به‌ گومانی خۆتان ئه‌ڵێن: ته‌نها ئێمه‌ دۆست و خۆشه‌ویستی خوای گه‌وره‌ین وه‌ ئه‌چینه‌ به‌هه‌شته‌وه‌و به‌هه‌شت تایبه‌ت بۆ ئێمه‌یه‌، (كه‌ ئه‌یانووت: ئێمه‌ نه‌وه‌و خۆشه‌ویستی خوای گه‌وره‌ین وه‌ ناچینه‌ دۆزه‌خه‌وه‌و به‌هه‌شت تایبه‌ته‌ بۆ ئێمه‌، وه‌ محمدو موسڵمانان گومڕان) [ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٦) ] مادام به‌هه‌شت بۆ ئێوه‌یه‌ وه‌ ئێوه‌ ڕاسته‌وخۆ ئه‌چنه‌ به‌هه‌شته‌وه‌ ده‌ی ئاوات بخوازن به‌ مردن بۆ ئه‌وه‌ی یه‌كسه‌ر بچنه‌ به‌هه‌شته‌وه‌ ئه‌گه‌ر ڕاستگۆن، یان دوعا بكه‌ن كێ گومڕایه‌ ئه‌وه‌ له‌ناوبچێت، به‌ڵام خۆیان ئه‌یانزانی كه‌ ڕاست ناكه‌ن بۆیه‌ ئاواتیان ناخواست، پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - ئه‌فه‌رمووێ: (ئه‌گه‌ر ئاواتیان بخواستایه‌ بمرن یه‌كسه‌ر خوای گه‌وره‌ ئه‌ یمراندن و شوێنی خۆیانی له‌ دۆزه‌خدا نیشان ئه‌دان وه‌ ئه‌یخستنه‌ دۆزه‌خه‌وه‌)..؟! [ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ] وه‌ ئه‌وان هه‌رگیز ئاواته‌خوازی مردن نابن و له‌ هه‌موو كه‌س زیاتر ژیانیان خۆش ئه‌وێ به‌هۆی ئه‌و كرده‌وه‌ خراپانه‌ی كه‌ له‌ پێش خۆیان ناردوویانه‌ له‌ كوفرو تاوان و سه‌رپێچی و ده‌ستكاری كردن و گۆڕانكاری له‌ كتابه‌كانی خوای گه‌وره‌دا، وه‌ كوشتنی هه‌ندێك له‌ پێغه‌مبه‌ران و هه‌وڵدان بۆ كوشتنی هه‌ندێكی تریان [ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ] وه‌ خوای گه‌وره‌ زۆر زانایه‌ به‌ سته‌مكاران..؟! { مردن ده‌تانگرێته‌وه‌} [ قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئه‌و مردنه‌ی كه‌ ئێوه‌ لێی ڕائه‌كه‌ن هه‌ر ئه‌تانگرێته‌وه‌و پێتان ئه‌گات و ڕزگارتان نابێت له‌ ده‌ستی [ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ] پاشان ئه‌گه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ لای خوایه‌ك كه‌ زانای هه‌موو نهێنی و په‌نهانه‌كانه‌ [ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ] وه‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌ت خوای گه‌وره‌ هه‌واڵتان پێ ئه‌دات به‌ هه‌موو ئه‌و كرده‌وه‌ خراپانه‌ی كه‌ له‌ دونیا كردووتانه‌، وه‌ سزا وه‌رئه‌گرن له‌سه‌ری و هیچی نافه‌وتێ..؟!

قال تعالى: ﴿قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ۝١٦﴾ [الأَحْزَاب : ١٦] واته: [ قُلْ لَنْ يَنْفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِنْ فَرَرْتُمْ مِنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ڕاكردن له‌ مردن یان له‌ كوشتن هیچ سوودێك به‌ ئێوه‌ ناگه‌یه‌نێ به‌ڵكو ئه‌جه‌له‌و هه‌ر كاتێك بێ ئه‌تانگرێته‌وه‌ [ وَإِذًا لَا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ] وه‌ كه‌ ڕایشبكه‌ن ئه‌و ڕاكردنه‌ ئه‌جه‌لتان دوا ناخات و ناتوانن ژیان به‌سه‌ربه‌رن و ڕابوێرن ته‌نها كه‌مێك نه‌بێ ئه‌جه‌ل به‌ده‌ست خوای گه‌وره‌یه‌..؟!

قال تعالى: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ [النِّسَاء : ٧٨] واته : كه‌س له‌ مردن ڕزگاری نابێت} [ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِكْكُمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنْتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ ] ئێوه‌ ئه‌گه‌ر خۆیشتان بشارنه‌وه‌ له‌ كوشتارو جیهادی كافران، كه‌ ئه‌جه‌لتان بێ له‌ هه‌ر شوێنێك بن مردن هه‌ر ئه‌تانگرێته‌وه‌و ده‌مرن ئه‌گه‌ر چی ئێوه‌ له‌ناو قه‌ڵای زۆر پته‌و و به‌هێزو به‌رزدا بن..؟!

قال تعالى: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ١٨٥﴾ [آل عِمرَان : ١٨٥]واته : [ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ] هه‌موو نه‌فسێك ئه‌بێ مردن بچێژێ ئه‌گه‌ر چاكه‌كار بێ یان خراپه‌كار، مرۆڤ بێت یان جنی، مه‌لائیكه‌ت بێت یان شه‌یتان [ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ] وه‌ ئێوه‌ش ئه‌جرو پاداشتی خۆتان له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا به‌ته‌واوی وه‌رئه‌گرن [ فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ ] جا هه‌ر كه‌سێك خۆی دووربخاته‌وه‌ له‌ ئاگری دۆزه‌خ به‌ ئیمان هێنان و كرده‌وه‌ی چاك [ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ] وه‌ بخرێته‌ به‌هه‌شته‌وه‌ به‌ دڵنیایی ئه‌وه‌ براوه‌ی حه‌قیقی و ڕزگار بووی ته‌واوه‌ [ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ ] وه‌ ژیانی دونیا هیچ شتێك نیه‌ ته‌نها ڕابواردن و هیواو ئومێدو ئاواتێكی كه‌می له‌ناوچووه‌ كه‌ مرۆڤی پێ له‌ خشته‌ ئه‌برێ ..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ٣٠﴾ [الزُّمَر : ٣٠]واته: {پێغه‌مبه‌ری خوایش -صلى الله عليه وسلم - وه‌فات ده‌كات} [ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ (٣٠) ] ئه‌ی محمد -صلى الله عليه وسلم - تۆش ده‌مریت و ئه‌وانیش ده‌مرن، ئه‌مه‌ هه‌واڵی وه‌فاتی پێغه‌مبه‌ری خوا بوو -صلى الله عليه وسلم - ، (ئه‌بو به‌كری صدیق له‌ كاتی كۆچی دوایی پێغه‌مبه‌ری خوا -صلى الله عليه وسلم - ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه‌و كردیه‌ به‌ڵگه‌ له‌سه‌ر وه‌فاتی پێغه‌مبه‌ری خوا -صلى الله عليه وسلم - )..؟!

**له‌ (عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌گێڕێته‌وه‌ ده‌ڵێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی :** ((إِنَّ خَلْقَ أَحدِكم يُجمَعُ فى بَطنِ امِّه أَربَعينَ يومًا، ثُمَّ يَكونُ عَلَقةً مِثلَ ذلكَ، ثُمَّ يَكونُ مُضغةً مِثلَ ذلكَ، ثُمَّ يُبعَثُ إليه مَلَكٌ فيُؤمَرُ بأَربعِ كَلِماتٍ: فيَكتُبُ رِزقَه وأَجَلَه وعَملَه، ثُمَّ يَكتُبُ شَقيٌّ أو سَعيدٌ، ثُمَّ يُنفَخُ فيه الرُّوحُ؛ فإنَّ أَحدَكم لَيَعمَلُ بِعَملِ أهلِ الجنَّةِ حتَّى ما يَكونُ بَينَه وبَينَها إلاَّ ذِراعٌ، أو قِيدُ ذِراعٍ، فيَسبِقُ عليهِ الكِتابُ فيَعمَلُ بِعَملِ أَهلِ النَّارِ فيَدخُلُها، وإنَّ أَحدَكم لَيَعمَلُ بِعَملِ أَهلِ النَّارِ حتَّى ما يَكونُ بَينَه وبَينَها إلاَّ ذِراعٌ، أو قِيدُ ذِراعٍ، فيَسبِقُ عليهِ الكِتابُ، فيَعمَلُ بِعَملِ أَهلِ الجنَّةِ فيَدخُلُها )).[١] **واته: هه‌ر كێ له‌ ئێوه‌ كه‌ (خوای گه‌وره‌) دروستی ده‌كات چل ڕۆژ له‌ سكی دایكیدا به‌ (نوتفه‌ ) تۆمه‌یی كۆده‌كرێته‌وه‌و ده‌مێنێته‌وه‌ ، له‌ پاشاندا ده‌بێت به‌ پارچه‌ خوێنێكی مه‌یو چل ڕۆژیش به‌و شێوه‌یه‌ ده‌مێنێته‌وه‌ ،له‌ پاشاندا ده‌بێت به‌ پارچه‌ گۆشتێ چل ڕۆژیش به‌و شێوه‌یه‌ ده‌مێنێته‌وه‌ ، ئینجا (خوای گه‌وره‌ ) فه‌رمان ده‌كات به‌ فریشته‌یه‌ كه‌ رووح ده‌كات به‌ به‌ریا ئه‌م چوار ووشه‌یه‌ بنوسێت : ڕۆزی و كارو كرده‌وه‌یی و ئه‌جه‌ل و ئاكامی ، له‌ پاشاندا بۆی ده‌نووسێت كامه‌ران و به‌خته‌وه‌ر یان به‌د به‌خت و به‌د كاره‌ ، له‌ پاشاندا رووح ده‌ات به‌ به‌ریا ، كه‌سی واتان هه‌یه‌ كرده‌وه‌ی خه‌ڵكی به‌هه‌شت ده‌كات تا له‌ نێوانی ئه‌و به‌هه‌شتدا ته‌نها بالێك ده‌مێنی ،جا نووسراوه‌كه‌ی پێشی ده‌كه‌وێت و كرده‌وه‌ی خه‌ڵكی ئاگر ده‌كات و ده‌چێته‌ ئاگره‌وه‌ ، وه‌ كه‌سی وه‌هاشتان هه‌یه‌ كرده‌وه‌ی خه‌ڵكی ئاگر ده‌كات تا له‌ نێوانی ئه‌و و ئاگردا بالێك ده‌مێنێ ، جانووسراوه‌كه‌ی پێشی ده‌كه‌وێت و كرده‌وه‌ی خه‌ڵی به‌هه‌شت ده‌كات و ده‌چێته‌ به‌هه‌شته‌وه‌ ..؟!**

**سێ یه‌م : هه‌ركه‌سێك یان هه‌ر بوونه‌وه‌رێك له‌ ئه‌جه‌ل و له‌ كاتی دیاری كراوی خۆیدا ده‌بێت بمرێت :**

**به‌ڵێ ئه‌جه‌ل كاتی دیاری كراوه‌ی هه‌موو شته‌كان له‌ لایه‌ن (خوای گه‌وره‌ ) دیاری كراوه‌ ، وه‌ هه‌ر گیز گۆرانی به‌ سه‌ردا نایه‌ت ، هیچ كه‌سێك ناتوانێت له‌و ئه‌جه‌له‌ رابكات و رزگاری ببێت ..؟! كه‌ (خوای گه‌وره‌) فه‌رمووی :**

[١]-السنن ابو داود برقم (٤٧٠٨) ، سنن الترمذي برقم (٢١٣٧).

**فلان كەس دەبێت بمرێت لەو چركە ساتەدا دەبێت بمرێت ، ئەگەر هەموو دونیا لە دەوری بێت و پاسەوانی لێ بكات و بیپارێزی ..؟! وە ئەگەر هەموو پزیشكەكانی دونیاش دەورەی لێ بدەن و لێ كۆببێتەوە و نەخۆش بێت هەر چارەی ئەو كەسەی پێ ناكرێت ئەگەر دەردەكەی مردن بێت ئەجەل و كاتی تەواو بێت ، ئیلا مردن دەیگاتێ و گیانی دەردەچێ و دەبێت بمرێ ، ئەم ژیانەی دونیا بەجێ بهێلێ بچێتە نێو ژیانی بەرزەخ كە وێسگەی قیامەتە.**

قال تعالی: ﴿مَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًاۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْءَاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَاۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾﴾ [آل عِمرَان : ١٤٥]واته : {كەس لە مردن رزگاری نابێت} [ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِكْكُمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنْتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ ] ئێوە ئەگەر خۆیشتان بشارنەوە لە كوشتارو جیهادی كافران، كە ئەجەلتان بێ لە هەر شوێنێك بن مردن هەر ئەتانگرێتەوەو دەمرن ئەگەر چی ئێوە لەناو قەڵای زۆر پتەو و بەهێزو بەرزدا بن. { باوەڕ بوون بە قەدەری خوا} [ وَإِنْ تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ ] وە ئەگەر مونافیقان تووشی چاكەیەك ببوونایە لە رزق و رۆزی و بەروبووم ئەیانووت: ئەمە لەلایەن خوای گەورەوەیە [ وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِكَ ] وە ئەگەر تووشی بەڵاو موسیبەتێكیش ببوونایە لە نەبوونی و كەمی بەروبووم و مردنی منداڵ ئەیانووت: ئەی محمد- صلی الله علیه وسلم - ئەمە بەهۆی تۆو شوێنكەوتنی تۆوە بووە [ قُلْ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ ] ئەی محمد- صلی الله علیه وسلم - پێیان بفەرمە: هەموو شتێك لەلایەن خوای گەورەوەیەو بە قەزاو قەدەرو بەدەستی خوای گەورەیە [ فَمَالِ هَؤُلَاءِ الْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ] ئەوە ئەم كەسانە چیانە بۆ لە قسە تێ ناگەن..؟!

**هەموو ئومەتێك و یان هەموو بەندەیەك ئەجەل و كاتی دیاری كراوەی خۆی هەیە ، نەدوا دەكەوێ نەپێش دكەوێ.**

قال تعالی: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾﴾ [الأَعرَاف : ٣٤]واتە: [ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ] وە هەموو ئوممەتێك كاتی دیاریكراوی خۆیان هەیە كە تیایدا ئەجەلیان دێت [ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ] وەكاتێك كە ئەجەلیان دێت تەنها یەك چركەو كاتێك نە ئەجەلیان دوا ئەكەوێ نە پێش ئەكەوێ..؟!

**هیچ كەسێك و هیچ بوونەوەرێك ناتوانێت لە بەردن رابكاو ، هەر مردن پێ دەگات ..؟!**

قال تعالی: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ﴾ [الجُمُعَة : ٨]واتە: { مردن دەتانگرێتەوە} [ قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ] ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - پێیان بڵێ: ئەو مردنەی كە ئێوە لێی ڕائەكەن هەر ئەتانگرێتەوەو پێتان ئەگات و رزگارتان نابێت لە دەستی..؟!

له‌(عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌گێڕێته‌وه ده‌ڵێت : (ئوم حبيبه ) –خوا لێ رازی بێت – ووتی:

((قالَتْ اُمُّ حَبِيبَةَ زَوْجُ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: اللَّهُمَّ أَمْتِعْنِي بزَوْجِي رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، وَبِأَبِي أَبِي سُفْيَانَ، وَبِأَخِي مُعَاوِيَةَ قالَ: فَقالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: قدْ سَأَلْتِ اللَّهَ لِآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ، وَأَيَّامٍ مَعْدُودَةٍ، وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ، لَنْ يُعَجِّلَ شيئًا قَبْلَ حِلِّهِ، أَوْ يُؤَخِّرَ شيئًا عن حِلِّهِ، ولو كُنْتِ سَأَلْتِ اللَّهَ أَنْ يُعِيذَكِ مِن عَذَابٍ في النَّارِ، أَوْ عَذَابٍ في القَبْرِ، كانَ خَيْرًا وَأَفْضَلَ قالَ: وَذُكِرَتْ عِنْدَهُ القِرَدَةُ، قالَ مِسْعَرٌ: وَأُرَاهُ قالَ: وَالْخَنَازِيرُ مِن مَسْخٍ، فَقالَ: إنَّ اللَّهَ لَمْ يَجْعَلْ لِمَسْخٍ نَسْلاً وَلاَ عَقِبًا، وَقَدْ كَانَتِ القِرَدَةُ وَالْخَنَازِيرُ قَبْلَ ذلكَ. وفي روايةٍ : مِن عَذَابٍ في النَّارِ وَعَذَابٍ في القَبْرِ)) .[1] واته: خوایه ! به هاوسه‌رم پێغه‌مبه‌ر ﷺ و به (ابو سفيان ) و به (معاويه) ی برام شادم که‌ره‌وه ، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : تۆ له خودا داوای چه‌ند ئه‌جه‌ل و کۆتاییه‌کت کردووه که نووسراوه ، هه‌روه‌ها داوای ڕێره‌وه‌ی دیاری کردنت کردووه و ! !داوای رزق رۆزی دیاری کراوت کردووه !! ئه‌مانه‌ی که تۆ داوات کردووه هیچیان پێش ناکه‌ون پێش کاته‌که‌ی خۆی ..؟!هه‌روه‌ها دواش ناکه‌ون دوای ئه‌و کاته‌ی بۆی دیاری کراوه ..؟!ئه‌گه‌ر داوات بکردایه له (خوای گه‌وره ) که له ئاگری دۆزه‌خ ئێش و ئازاری قبر یان گۆر بتپارێزیت چاکتر بوو بۆت .. ! !پیاوێك ووتی :ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئایا مه‌یموون و به‌رازه‌کان له‌وانه‌ن که مسخ کراون یان گۆراون ..؟!پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : (خوای گه‌وره ) هیچ ئومه‌تێکی له ناو له بردووه که پاش خۆیان وه‌چه‌یان هه‌بێت .. ! !مه‌یموون و به‌رازه‌کان پێش ئه‌وه بووه ..؟!

قال تعالى: ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾﴾ [المُنَافِقُون : ١١]واته : [ وَلَنْ يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا ] وه هیچ نه‌فسێك كه ئه‌جه‌ل و كاتی مردنی هات خوای گه‌وره مۆڵه‌تی پێ نادات و مردنه‌كه‌ی دواناخات [ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ] وه خوای گه‌وره زۆر زانیاریه‌كی وردی هه‌یه به‌و كرده‌وانه‌ی كه ئێوه ئه‌یكه‌ن، وه هیچ شتێكی لێناشاردرێته‌وه، والله أعلم ..؟!

قال تعالى: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾﴾ [الوَاقِعَة : ٦٠]واته : ئێمه‌ین كه مردنیشمان بۆ دیاری كردوون و كاتی دیاریكراومان بۆ داناون، وه هیچ كه‌سێكیش نیه زاڵ بێ به‌سه‌ر ئێمه‌دا به‌ڵكو ئێمه‌ین كه تواناو ده‌سه‌ڵاتمان هه‌یه به‌سه‌ر هه‌موو كه‌س و شتێكدا..؟!

قال تعالى: ﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾﴾ [الرَّعْد : ٣٨]واته: هه‌موو بڕیارێكی خوای گه‌وره، یان هه‌موو كتابێك كه دایبه‌زاندبێت كاتی دیاریكراوی خۆی هه‌یه..؟!

---

[1]- صحيح مسلم برقم (٢٦٦٣).

**چوارەم : ئەجەل مان لێ دیار نیە هەتاکو پێمان دەگات :**

**بێ گومان ئێمە نازانین کەی دەمرین ..؟! ئایا چەند چرکە ساتمان ماوە لە ژیاندا ..؟! یان چەند سەعاتێکی ترە و رۆژێکی ترە و چەند سالێکی ترە ..؟! هەر بۆیە هەریەکێك لە ئێمە ئەجەل مان دیاری کراوە و ناشزانین چ کاتێك پێی دەگەین ، بێ گومان ئەمەش غەیب پەنهایییە لە لای (خوای گەورە ) یە هیچ کەس نازانی جگە لە (اللە).**

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ٣٤﴾ [لُقْمَان : ٣٤]واتە: پێنج نهێنییەکە} [ إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ ] پیاوێکی دەشتنشین هاتە لای پێغەمبەری خواو - صلى الله عليه وسلم - وتی: خێزانەکەم دووگیانە پێم بڵێ کچی دەبێت یان کوڕ، وە لای ئێمە بێبارانییە پێم بڵێ کەی باران دەبارێت، وە خۆم دەزانم کەی لە دایك بوومە تۆ پێم بڵێ کەی دەمرم، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: بە دڵنیایی تەنها خوای گەورە ئەزانێ کە کاتی هاتنی قیامەت کەیە چ رۆژو مانگ و ساڵێکەو خوای گەورە نەبێ کەس نازانێ رۆژی قیامەت کەی دێت نە پێغەمبەرێکی نێردراو نە فریشتەیەکی نزیك لە خوا [ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ ] وە هەر خوای گەورە خۆی ئەزانێ کەی باران دائەبەزێنێ و ئەبارێنێ و بارانی سودبەخشە یان زیانبەخشە (کەشناسی و ئەزمونی خەڵکی و دیاریکردنی باران بارین بە خێرایی باو پلەی گەرما لەم جۆرە نیەو دروستە هەرچەندە سەدا سەد نیەو زۆرجاریش بە پێچەوانەوە دەردەچێت وەکو بیستراوەو بینراوە) [ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ] وە هەر خۆی ئەزانێ چی لە رەحمی ئافرەتاندا هەیە لە نێرو مێ، لە لەشساغی و ناتەواوی، لە بەختەوەری و بەدبەختی، لە خراپەکار و چاکەکار (سۆنارو ئامێرەکان لەم جۆرە نیەو ئەمیش سەدا سەد نیەو زۆرجار بە پێچەوانەوە دەردەچێت وەکو بیستراوەو بینراوە) [ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا ] وە هیچ کەسێك نازانێ سبەینێ چی بەسەر دێت و چی بەدەست دێنێت لە کاروباری دین و دونیای چونکە غەیبەو خوا نەبێت کەس غەیب نازانێت تەنانەت پێغەمبەرانیش، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - یەك مانگ خەفەتی دەخوارد کە بۆهتان بۆ (عائیشە) کراو نەیزانی راستە یان نا، تا خوای گەورە پاکێتی دەرخست و دە ئایەتی لەسەرەتای سوورەتی (نور) دابەزاند، وە ئیبراهیم پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - کە فریشتەکان لەسەر شێوەی مرۆڤدا هاتن غەیبی نەزانی و نەیناسین و رۆیشت گوێلکێکی سەربڕی و سوری کردەوەو بۆی هێنان کە نەیانخوارد ترساو پاشان خۆیان پێیان راگەیاند کە ئەمان فریشتەن و خواردن ناخۆن، وە کاتێك چوون بۆ لای لوط پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ئەمیش ترسا قەومەکەی دەستدرێژی بکەنە سەریان و نەیناسین و غەیبی نەزانی تا خۆیان پێیان وت: مەترسە ئەوان ناگەنە ئێمەو ئێمە فریشتەی خوای گەورەین، وە یەعقوب پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - لە خەفەتی یوسفی کوڕی - صلى الله عليه وسلم - ئەوەندە گریا تا چاوەکانی کوێر بوو غە یبی نەزانی و نەیزانی لە میصرە تا دواتر یوسف - صلى الله عليه وسلم - ناردی بە شوێنیانداو بە یەکتر شادبوونەوە، وە سولەیمان پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - لەگەڵ ئەوەی باو شەیتان و جن لە ژێر دەسەڵاتیدا بوون هەواڵی بەلقیسی پاشای نەزانی تا هودهودەکە هەواڵی بۆ هێنا، کە ئەم پێغەمبەرە بەڕێزانە غەیب نەزانن چۆن فاڵچی و جادووگەرو ساحیر غەیب دەزانن؟! پێویستە مرۆڤی موسڵمان باوەڕیان پێ نەکات چونکە باوەڕ پێکردنیان دەبێتە هۆی کافر بوون و لە دین دەرچوون، چونکە باوەڕ نەبوونە بە چەندەها ئایەتی قورئان و فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ، وە باوەڕیشیان پێ نەکەیت و تەنها بچیت بۆ لایان ئەوا چل رۆژ نوێژت لێ قبوڵ نابێت وەکو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - فەرموویەتی [ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ] وە هیچ کەسێکیش نازانێ لە چ زەویەکدا ئەمرێ و ئەجەلی لە کوێ دێت [ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە وە زانیاریەکی زۆر وردی هەیە وە هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە، واللە أعلم..؟!

له (عبدالله بن عمر )– خوا لیٚ رازی بیٚت – ده‌لیٚت : له پیٚغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : ((مِفْتَاحُ الغَيْبِ خَمْسٌ لا يَعْلَمُهَا إلاَّ اللَّهُ: لا يَعْلَمُ أَحَدٌ ما يَكونُ فى غَدٍ، ولاَ يَعْلَمُ أَحَدٌ ما يَكونُ فى الأرْحَامِ، ولاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا، وما تَدْرِى نَفْسٌ بأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ، وما يَدْرِى أَحَدٌ مَتَى يَجِىءُ المَطَرُ )) .[١]

واته: کلیله‌کانی غه‌یب پیٚنچ شته که ته‌نها (خوای گه‌وره ) ده‌یزانیٚت ..؟!هیچ که‌سیٚك نازانیٚت که سبه‌ی یان به‌یانی چی رووده‌دات ..؟! هیٚچ که‌سیٚك نازانیٚت له ناو سکی دایکدا چی رووده‌دات ..؟!وه هیچ نه‌فسیٚك نازانی سبه‌ی یان به یانی چی به‌ده‌ست ده‌هیٚنیٚ یان چ کاریٚك ئه‌نجامده‌دات ..؟! وه هیچ که‌سیٚك نازانیٚت له چ خاکیٚك یان زه‌ویه‌ك ده‌مریٚت ..؟!وه هیچ که‌سیش نازانیٚت که‌ی باران ده‌باریٚت یان باران دیٚت ..؟!

تیٚبینی / ده‌رباره‌ی ئه‌م ئایه‌ت و ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ی باسمان کرد ، که له ئیٚستا دا زانست پیٚشکه‌وتووه، مولحیده‌کان و نه‌فام و نه‌زانه‌کان ئه‌مه‌یان کردۆته به گومان یان شبهه له نیٚو موسلمانانداندا ، که گوایه دژ و پیٚچه‌وانه‌ی ده‌قی قورئانی پیرۆز و فه‌رمووده‌ی پیٚغه‌مبه‌ری خوایه ﷺ ، ده‌لیٚن: ئه‌ی که‌شناسی باران دیاری ناکات ..؟! یان ئه‌ی سوونه‌ری پزیشکی بۆ ئافره‌تان کۆرپه‌له دیاری ناکات که ره‌گه‌زی میٚ و نیٚر دیاری ده‌کات.؟!

وه‌لام / به‌لیٚ هه‌ر (خوای گه‌وره) ده‌زانی که‌ی باران ده‌باریٚنی یان دائه‌به‌زیٚنی ، وه هه‌ر خۆی ده‌زانی ئه‌وه‌ی ده‌باریٚنی سوود به‌خش و ره‌حمه‌ت یان زیان به‌خش غه‌زه‌به ، باران بارینیش ئه‌وه که خه‌لکی لیٚکدانه‌وه‌ی بۆ ده‌که‌ن به هۆی ئه‌زموونه‌که‌ی سال بۆ سال ، یان ئه‌وه‌ی که زانست که‌شناسی هه‌یه‌تی ته‌نها خیٚرایی باو یان پاله‌په‌ستۆی با ، له چ ئاراسته‌یه‌که‌وه دیٚت ، وه یان پله ی گه‌رما ، له‌م جۆره نیه که مولحیده‌کان ده‌ی که‌ن به به‌لگه ، به‌لکو باران بارین ئاراسته‌ی با و پله‌ی گه‌رما زۆر له‌وه زیاتره که (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویٚت : [ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ ] واته: ته‌نها ئه‌و ده‌زانیٚت که‌ی باران ده‌باریٚت . جا که‌ی و چۆنه ..؟! ئه‌م زانسته گه‌وره ته‌نها له لای (خوای گه‌وره ) ، به‌لیٚ ئه‌زموونی خه‌لك ئاراسته‌ی با پله‌ی گه‌رما له‌م جۆره نیه ، چونك سه‌د له سه‌د نیه زۆر جار پیٚچه‌وانه ده‌رده‌چیٚت ، وه‌ك بیستراو بینراوه ..؟!ده‌رباره‌ی کۆرپه‌له‌ی سکی دایك ، هه‌ر (خوای گه‌وره ) ده‌زانیٚت چ له سکی یان له ره‌حمی ئه‌م دایکه دا هه‌یه له نیٚرو میٚ ، له له‌ش ساغی ناته‌واوی و ئیفلیجی ، له به‌خته‌وه‌ری و به‌د به‌ختی ، له خراپه‌کار و چاکه کار ، وه سۆنه‌ر و ئامیٚره‌کان له‌جۆره نی ، چونکه سه‌د له سه‌د نیه زۆر جار پیٚچه‌وانه ده‌رده‌چیٚت ، وه ك بیستراو بینراوه ..؟!هه‌ر بۆیه زانایانی ئیسلام فتوایان داوه که جائز نیه بۆ دایك و باوك و هه‌روه‌ها (دکتوره‌که‌ش )سه‌د له سه‌د جه‌زمی بکات بلیٚ ئه‌و نیٚره یان میٚیه..؟! چونکه هه‌ندیٚك جار درۆش ده‌رچووه ..؟!به‌لامده‌کریٚ(دکتوره‌که )بلیٚ له‌وانیه ئه‌م ره‌گه‌زه‌بیٚ به‌گویٚره‌ی سۆنه‌ره‌که..؟!

---

[١]- صحيح البخاري برقم (١٠٣٩).

پێنچەم: پرسیارێك : حیكمەت لە مردندا چییە ..؟!

وەلام : حیكمەت لە مردن بۆ چەند خالێك دەگەڕێتەوە ئەمانەی خوارەوەن :

١-مردن ئەوپەری هێز و توانای (الله تعالى ) دەردەخات یەكێكە لە نیشانە كانی بالادەستی و گەورەی (خوای گەورە ) ، چونكە مردن شتێكە زۆر جێگای سەر سورمانە ..!! كە كەسێك لە گەل تۆ دا دەژی كە ئەجەلی هات لە ناكاودا گیانی دەردەچێت و دەمرێت ..؟!

٢-(خوای گەورە ) كە مردن ژیانی دروست كردوە بۆ تاقی كردنەوەی بەندەكانی ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢﴾ [المُلْك : ٢]واتە: [ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ] ئەو خوایەی كە مردن و ژیانی دروست كردووە تا تاقیتان بكاتەوەو دەركەوێت كامتان باشترین كردەوەتان ئەنجام داوە، باشترین كردەوەش ئەوەیە مرۆڤ نیەتی بۆ خوای گەورە بێت و بۆ ریای نەبێت، وە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بێت و بیدعە نەبێت، بۆیە هیچ كاتێك بە بیدعە ناووترێ: كردەوەی چاك، وە خوای گەورە لێرە نەیفەرموو كامتان كردەوەی زۆرترە بەڵكو فەرمووی: كامتان كردەوەی چاكترە [ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ (٢) ] وە خوای گەورە زۆر بەعیززەت و باڵادەست و لێخۆشبووە..؟!

٣-(خوای گەورە) مرۆڤی وا دروست نەكردووە كە لاشە و جستەی ساغبی لە ژیانی دونیادا یان بە هەمیشەیی بمێنی ..؟! بەلكو بەو شێوازەی دروستكردوە كە كاتێك بە تەمەندا چوو پەكی بكەوێت ..؟! ئەوەش وات لێدەكات كۆتاییت پێ دەهێنێت و دەتباتە ژیانێكی تر ، بە لاشە و جەستەیەكی تر زیندووت دەكاتەوە ئەو هەمیشەیی بێت كۆتایی پێ نێت ئەویش قیامەتە جا دۆزەخی بیت یان بەهەشتی بیت ..؟!

٤-تۆ لەزەت دەكەیت لە نیعمەت و خۆشیەكان بەتەواویی،كاتێك دەزانیت كۆتایی هاتنی بەدوایە هەولی ئەوە دەدەی تام و چێژی تەواو لەحەلالە كان بكەیت وە لە سەر زەویدا بەو شێوەیە ژیان بكەیت،(خوای گەورە)لە خۆت رازی بكەیت ،چونكە دەزانیت رۆژێك لە ناو دەچی جستەو لاشەت لە جوولە دەكەوێت و مردنی بەدوا دایێت.؟

٥-پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( الدونيا سجن المؤمن ، وجنة الكافر ) .[1]واتە:دونیا زیندانیە بۆ ئیمانداران ، وە بەهەشتە بۆ كافرەكان ..؟!

[1]-صحيح مسلم برقم ( ٢٩٥٦).

ده‌گێرنه‌وه ده‌لێن : (احمدی کوری حنبل ) – ره‌حمه‌تی خوا لێ بێت – که تازه له به‌ندیخانه یان سجن ، ئازاد کرابوو ، دوای ماوه‌یه‌کی زۆر که‌م وه‌فاتی کرد ، (عبدالله کوری احمد کوری حنبل ) – ره‌حمه‌تی خوا لێ بێت – که ئیمامی (احمد) باوکیه‌تی ، (عبدالله ) وا باوکی خوێنی لێ ده‌رژێ ، کاتێك بۆ سه‌ر ئاو داده‌نیشت ، خوێنی داده‌به‌زاند له‌به‌ر ته‌عزیب و ناخۆشیه کانی ناو سجن که ته‌حه‌مولی کردبوو ئه‌و ئیمامه به‌رێزه ،عبدالله کوریشی له به‌رامبه‌ری دانیشت و چاوی فرمێسکی کرد ، فه‌رمووی : بابه گیان سوێند به الله من کوری گه‌وره‌ی تۆم له‌وه‌ته‌ی فامم کردوه نه‌مبینیوه تۆ  رۆژ و شه‌وێك بحه‌سێته‌وه من بینیومه شه‌وان یان شه‌و نوێژت کردوه یان خه‌ریکی عیلم زانستی بووی، به‌رۆژیش بینیومه ده‌رس و وانه‌ت ده‌وتوه‌ته‌وه یان چووی صولحت له نێوان خه‌لکیدا ده‌کرد یان کاسبی حه‌لالت کردوه ، بینیومه له سه‌ر فتوای حه‌ق راسته‌کانت  زیندانی کرایت ، وه ته‌عزیب ئازار ئه‌شکه‌نجه‌ت و ئازاری ده‌روونی درای و قسه‌ی ناخۆشت پێ گوتراوه یان ماندوو بووی ئاره‌قت رشتووه یان خوێنت لێ هاتووه ، بابه گیان نه‌مبینی رۆژێك بحه‌سێته‌وه ، سۆزی کور و باوکایه‌تی  ده‌نوێنم بۆت ، ئیمامی (احمد ) – ره‌حمه‌تی خوا لێ بێت – فه‌رمووی : رۆڵه‌ی شیرینم وه‌ره با فرمێسکه‌کانت بسرمه‌وه ژیانی ئیماندار نابێت حه‌سانه‌وه‌ی هه‌بێ ، ئه‌و هه‌موو ماندوو بوونه بۆ ئه‌وه‌ی چونکه ئه‌وه ژیانی دونیایه  سوێند به والله (الله تعالى ) ژیانی دونیا بۆ تاقی کردنه‌وه داناوه ، هه‌مووی بۆ ئه‌وه‌یه‌تی باوکت یه‌که‌م چرکه که (ملك الموت ) لێ مێوان ده‌بێت بۆ ئه‌وه‌ی گیانی بکێشێت ، هه‌ر کاتێك منیا برد له ناو گۆره ته‌نگ و تاریکه‌که‌ی دایاننام له‌وێدا (الله تعالى ) ئیسراحه‌تی هه‌میشه‌یم پێشکه‌ش بکات و به نسیبم ببێت و بحه‌سێمه‌وه ..؟!

به‌لێ مردن بۆ ئیماندار حه‌سانه‌وه‌یه له ناخۆشی و زه‌رحمه‌تیه‌کانی دونیادا ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره) ده‌فه‌رمووێت: قال تعالى: ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٌ لِّلۡأَبۡرَارِ ١٩٨﴾ [آل عِمۡرَان : ١٩٨]واته : هێشتا ئه‌وه‌ی لای خوای گه‌وره‌یه بۆ چاکه‌کاران باشترین شته که خوای گه‌وره بۆیانی ئاماده‌کردووه ..؟! قال تعالى: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٌ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ١٧٨﴾ [آل عِمۡرَان : ١٧٨]واته : [ وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِأَنْفُسِهِمْ ] وه با كافران وا نه‌زانن كه ئێمه ته‌مه‌نیان درێژ ئه‌كه‌ین و ژیانی خۆشیان پێ ئه‌ده‌ین یان له‌ جه‌نگێك به‌سه‌ر موسڵماناندا سه‌ر ئه‌كه‌ون وا نه‌زانن ئه‌مه‌ خێرو چاكه‌یه‌ بۆ ئه‌وان [ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوا إِثْمًا ] به‌ڵكو ئێمه‌ بۆیان درێژ ئه‌كه‌ینه‌وه‌ یان پێیان ئه‌به‌خشین بۆ ئه‌وه‌ی زیاتر تاوانبار بن [ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ ] وه‌ سزایه‌كیان ئه‌ده‌ین كه‌ ڕیسواو زه‌لیل و سه‌رشۆڕیان ئه‌كه‌ین ..؟! قال تعالى: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ١٦٩﴾ [آل عِمۡرَان : ١٦٩]واته : [ وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ] جابری كوڕی عبدالله‌ (خوایان لێ ڕازی بێت) ده‌فه‌رمێت: پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - پێی فه‌رمووم ئه‌ی جابر بۆ ئه‌بینم خه‌فه‌تباری؟ وتم ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - باوكم شه‌هید بووه‌و كۆمه‌ڵێك منداڵی به‌جێهێشتووه‌و قه‌رزاریشه‌، فه‌رمووی: ئایا هه‌واڵت پێ بده‌م كه‌ خوای گه‌وره‌ له‌گه‌ڵ هیچ كه‌سێكدا قسه‌ی نه‌كردووه‌ ئیلا له‌ پشت په‌رده‌وه‌ نه‌بێت به‌ڵام به‌بێ په‌رده‌ ڕووبه‌ڕوو قسه‌ی له‌گه‌ڵ باوكتدا كردو فه‌رمووی: داوا بكه‌ پێت ببه‌خشم وتی ئه‌ی په‌روه‌ردگار بمگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ دونیا تا دووباره‌ له‌ پێناو تۆدا بكوژرێمه‌وه‌، خوای گه‌وره‌ فه‌رمووی بڕیارم داوه‌ كه‌ گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ دونیا نیه‌، وتی ئه‌ی په‌روه‌ردگار تا هه‌واڵ بده‌مه‌ ئه‌وانه‌ی دونیا، خوای گه‌وره‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند، له‌سه‌ر ئه‌و حه‌فتا صه‌حابه‌یه‌ دابه‌زی كه‌ له‌ (بیئر مه‌عونه‌) كوژران، ئه‌وانه‌ی له‌ جه‌نگی ئوحود وه‌ له‌ هه‌ر شوێنێك له‌ پێناو خوای گه‌وره‌دا ئه‌كوژرێن وانه‌زانن ئه‌وانه‌ مردوون [ بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ] به‌ڵكو ئه‌وانه‌ زیندوون له‌ حه‌یاتی به‌رزه‌خدا لای په‌روه‌ردگار ڕزق و ڕۆزیان پێ ئه‌درێ به‌ به‌رده‌وامی..؟!

## ئایه‌تی (٧٤)

قال تعالى: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةًۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾﴾ [البَقَرَة : ٧٤]

واته : [ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ ] له‌ دوای ئه‌م هه‌موو موعجیزانه‌ دیسانه‌وه‌ ئێوه‌ له‌ جیاتی ئه‌وه‌ی به‌رده‌وام بن له‌سه‌ر تاعه‌ت و عیباده‌تی خوای گه‌وره‌ دڵتان ڕه‌ق بوو [ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ] دڵتان وه‌كو به‌رد ڕه‌ق بووه‌ یاخود دڵتان له‌ به‌رد ڕه‌قتر بووه‌ [ وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ ] وه‌ له‌ناو به‌رده‌كانیشدا هه‌یه‌ ئه‌ته‌قێ و كانی ئاوی لێ ده‌رئه‌چێت [ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ ] وه‌ هه‌یشه‌ له‌ت ئه‌بێت و ئاوی لێ ده‌رئه‌چێت [ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ] وه‌ هه‌یه‌ له‌سه‌ر شاخه‌كان به‌ر ئه‌بێته‌ خواره‌وه‌ له‌ ترسی خوای گه‌وره‌، مجاهد ئه‌فه‌رموێت: هه‌ر به‌ردێك له‌سه‌ر شاخ به‌ربۆوه‌ ئه‌وه‌ له‌ ترسی خوای گه‌وره‌یه‌، هه‌ر به‌ردێ شه‌ق بردو ئاوی لێ ده‌رچوو له‌ ترسی خوای گه‌وره‌یه‌ [ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ] به‌ڕاستی خوای گه‌وره‌ بێئاگا نیه‌ له‌و كرده‌وانه‌ی كه‌ ئێوه‌ ئه‌نجامی ئه‌ده‌ن..؟!

## باسێك له‌ دڵره‌قی جووله‌كه‌

جا بێ گومان دوایی نیشاندانی ئه‌و هه‌موو به‌ڵگه‌یه‌ و موعجیزانه‌ ، ئه‌و جووله‌كه‌ ناپاكانه‌ یان خیانه‌تكاران هێشتاش هه‌ر دڵره‌ق و فه‌رمانبه‌ردار نه‌بووه‌ ، به‌ڵكو هه‌ر ئینكار و ملهوور بوون له‌ گه‌ڵ (خوای گه‌وره‌) پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یان كه‌ (موسى ) – عليه السلام – بوو ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره‌) ده‌فه‌رموێت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ واته‌ : دوای ئه‌م هه‌موو نیشانه‌ و موعجیزانه‌ هه‌ر دڵه‌ كانتان بوون به‌ به‌رد ، بگره‌ له‌ به‌ردیش ره‌قتریش ، بێ گومان نه‌وه‌ی جووله‌ كه‌ هیچ په‌ندو ئامۆژگاریان وه‌رنه‌گرت له‌م هه‌موو نیشانه‌ و موعجیزانه‌ ، ئه‌و هه‌موو تاقی كردنه‌وانه‌ی كه‌ به‌ سه‌ر یان هات ..؟! به‌ڵێ ده‌لره‌قی سیفه‌تی جووله‌كه‌كانه‌ ، واجبه‌ موسلمانان خۆی له‌م سیفه‌ته‌ بپارێزن ، له‌به‌ر ئه‌وه‌ نه‌هی كراوه‌ ئیماندار وه‌ك ئه‌هلی كتاب بێت و دل ی ره‌ق بێت ، هه‌ر كه‌سێك دلی ره‌ق بێت وه‌ك به‌رد ، سزا ده‌درێت به‌ به‌رد له‌ دۆزه‌خدا ..؟!

تێبینی : به‌رد هه‌یه‌ نرمتر و باشتر بێت ، له‌ دل ی جووله‌كه‌ ، چونكه‌ به‌رد هه‌یه‌ رووباری لێ هه‌لده‌قولێت ، هه‌شیانه‌ له‌ ت له‌ت ده‌بێت و ئاوی لێ ده‌ چۆرێ یان دێته‌ ده‌ره‌وه‌ ، هه‌شیانه‌ له‌ ترسی (خوای گه‌وره‌) وه‌ك لوتكه‌ی شاخه‌كان به‌رده‌بێته‌وه‌ ، ووردو خاش ده‌بێت یان ده‌بێته‌ دوو له‌ت ..؟!

بەلێ بەرد هەیە باشترو نەرمترە لە دڵ ی جوولە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ ، بە لێ چونکە بەرد هەیە لە ترسی (خوای گەورە) لە لوتکەی چیاو کێوە کان بەر دەبێتەوە ، لە ترسی خوا ، هەرەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ﴾ [البَقَرَة : ٧٤]واتە : وە هەیە لەسەر شاخەکان بەر ئەبێتە خوارەوە لە ترسی خوای گەورە، مجاهد ئەفەرمووێت: هەر بەردێك لەسەر شاخ بەربۆوە ئەوە لە ترسی خوای گەورەیە، هەر بەردێ شەق بردو ئاوی لێ دەرچوو لە ترسی خوای گەورەیە..؟!

هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾﴾ [الإِسْرَاء : ٤٤]واتە : [ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ ] وە هیچ شتێك نیە ئیلا تەسبیحاتی خوای گەورە ئەکات و حەمدو سەناو ستایشی خوای گەورە ئەکات [ وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ] بەڵام ئێوەی مرۆڤ لە تەسبیحاتی ئەوان تێ ناگەن [ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر حەلیمە پەلە ناکات لە سزادانی بەندەکانیدا وە زۆر لێخۆشبووە..؟! بەلێ جێگیردنی گەورەیی خوا واجبی ترسان لێی و بەگەورە دانانی ، چونکە ئەگەر بەرد و بێ گیان و زیندوو یان بە رووح لێ بترسێن ، ئەوە کەسی عاقل پێشترە لێی بترسێت ، واجب بوونی ترسان لە سەر کەسی عاقل واجب ترە ..؟ !هەروەهابالادەستی تەواوی (خوای گەورە ) و زانستی بەسەر هەموو کردەوەکانی بەندەکانی دا هەیە ، وە لێ بێ ئاگانەبووە ..؟! هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾﴾ [البَقَرَة : ٧٤]واتە: بەڕاستی خوای گەورە بێئاگا نیە لەو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی ئەدەن..؟!

کەواتە : کە (خوای گەورە ) باسی جوولەکە دەکات سەرزەنشتیان دەکات ، بەوەی کە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ [البَقَرَة : ٧٤] ، هەلبەتە جوولەکە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دوایی ئەو هەموو نیشانەی و موعجیزەیەی (خوای گەورە ) شتە گەورانە کە باب و باپیرانتان بینیویانەو ، ئێوەش لە کتێبەکانتاندا هەیەو بە شێك لە (کتێبی پیرۆز — الکتاب المقدس ) و کەلە پووری خۆتانی دەزانن ، ئنجا دڵ یشیان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ رەق بوو ، بەلام چ رەقیەك وەکو بەرد بەلکو لە بەردیش رەقترە ، شایانی باسە توێژەرەوانی قورئانی پیرۆز زۆر باسی ئەوەیان کردووە کە ووشەی (أو ) واتە: بەرکوردی (یان ) مەبەست لەمە ئەوەیە کە (خوای گەورە ) هەر گیز لە گوماندا نیە ..؟! بفەرمووی : وە بەرد رەق بوو ، یان لە بەرد رەقترە ، بۆیە کەوتوونەتە مشت و مرەوە ، کە ئایا تەفسیرو تەئویلی ئەوە چیە ..؟!بەلام دەلێن : ماناکەی ئاوایە : وەك بەرد وایە ، یان لە بەرد رەقترە ، یانی هەندێکی وەك بەرد وایە هەندێکیشی لەبەرد رەقترە ، چونکە هیچ دڵ یێك هاوتایی یەکتری نیە جۆراو جۆرن ، لە پلەی رەقیەتی دا هەندێك وەك بەرد رەقن هەندێکی تریش لەبەرد رەقترە ، وەك ئاسن و پۆلا وایە ، بەم شێوەیە پلە پلە رەقیتەی زیاتر دەکەن سەختردەبن..؟!بەلێ (خوا گەورە ) کە باسی جوولەکەکان دەکات ، واتەك دڵ ی کافرەکانیان ، یاخود هی زۆربەیان ، وە یان هی ئەو جوولەکانەی کە بێ باوەر بوون بە پێغەمبەری ئاخر زمان محمد ﷺ ، کە دەفەرمووێ

: قال تعالى: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ واته: دڵ تان وەك بەرد و بەلكو لە بەردیش رەقترە ، پاشان باسی بەرد دەكات ، پاشان دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ واته: بەرد هەیە دەبێتە شوێنی دەرقولێنی كانی و سەرچاوەو رووباری لێ دێتە دەرەوە ، پاشان دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ﴾ واته: وە بەرد هەیە كە شق یان درز دەبات كەم و زۆر ئاوی لێ دەچۆڕێتە دەرەوە ، پاشان دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ وە هەیە لە سەر شاخەكان بەردەبێتەوە خوارەوە لە ترسی (خوای گەورە ) ، هەروەك (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ( هەر بەردێك لەسەر شاخ بەر بێتەوە خوارەوە ، ئەوا لە ترسی (خوای گەورە)یە ، هەر بەردێك شەق یان درزی برد ئاوی لێ داچۆڕا یان دەرچوو ئەوا لە ترسی (خوای گەورە ) یە ..؟! لەسەر ووتەی : ﴿مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ ئەوەیە كە رای جیاوازی لەسەر ئایا برد ترسی خوا هەیە..؟! هەندێك دەلێن :مەبەست ئەوەیە كە ئەو بەردە پابەندە بەو یاسا و فیزیكیانەی كە (خوای گەورە) بۆی داناون كە لەسەری بێتە خوارەوە ..؟! چونكە پابەندی هەر دروستكراوێك یان مخلوقێك بە یاسای بەدیهێنەریەوە،جۆرێكە لە ملكەچی و جۆرێكە لە لێ ترسی ..؟! دەگونجی بێ گیانیش یان جمادیش جۆرێك لە هەست شعوری هەبێت ، كە ئێمەی مرۆڤ نازانین چۆنە ..؟! هەم (خوای بەتاكو بە پاك بگری ) هەمیش لێ بترسێ ، دەشگونجێ مەبەست پێ ئەوە بێت كە دروست كراو یان مخلوق هیچیان لە یاساو رێسایی پەروەدگاری خۆیان دەر ناچن ، هەر هەموویان بۆ ئەو سیستەمەی كە (خوای گەورە ) بۆی داناون ، ملكەچی فەرمانەكانیەتی ..؟!

## باسکردنی (القلب ) یان (دڵ)

### یەکەم : پێناسەی ( دڵ )

لە (الجرجانی )– رەحمەتی خوا لێ بێت – دەڵێت : (دڵ میهرەبانی پەروەردگارە ، بۆیە وابەستەی ئەم دڵە جسمانی شێوەی سنۆبەریە ، دەکەوێتە لای چەپی سینگەوە ، وە ئەو میهرەبانیەش راستی حەقیقەتی مرۆڤە ، وەئەمشە ناوی دانایی یان حکیمی پێ دەڵێن : نەفسی روان بێژ ، وە رووحی ناوەوە ، وە رووحی ئاژەڵ ئاوێتەیە ، ئەوە هەستی پێ دەکرێت ، وە جیهانی مرۆڤ ،وە قسەکەرەکان ، داوا کراوەکان ، سەر زەنشت کراوەکان ؟!.[1]

ووتراوە : دڵ فەرمانرەوایەکە کە بەسە تەواو ئەندام و توانا جستەیی و مەعنەوییەکان مرۆڤدا هەیە ، فەرمان دەدات ئەوانی ئەستۆگرتووە و رۆلی سەرەکی دەبینێ لە نێوانیاندا ..؟!

دڵ گرنگترین ئەندامی ئادەمێزادە کۆلەکە پایەی ژیان و سەرچاوەی رووحی ئاژەلی و جێگە و شوێنی غەریزە و بۆماوەیە؟!

دڵ کانگەو شوێنگەی هۆش و ژیری ، زانست هێمنی و ، بە خشندەیی ، ئازایەتی و دلخۆشی و چەند سێفەتێکی تری مرۆڤە..؟!

تەواو ئەندام و توانا رووالەتی ناوەکییەکان ، سەربازگەلێکی گوێرایەل و بەردەست و گوێگری دڵن ..؟!

هەر بۆیە (خوای گەورە ) لە زۆربەی بوارەکاندا ئەم سیانەی بەیەکەوە باس کردووە ، وەك : چاو ، زمان و ، دڵ ) ، چونکە چاو دیدەوەری یەکەم و رێنمویی کەری ئەو بۆ دۆزینەوەی شتە بینراوەکان و هەرکاتێ چاو شتێ ببینێ هەوال دەداتە دڵ بە هۆی پەیوەندی و نزیکی بەهێزی نێوان دڵ و چاو هەر کاتێ لە یەکێکیاندا جێگیری بێ ، لە ئەوی تریاندا بە دیار دەکەوێت و لە راستی دا چاو ئاوێنەیە کە کە دەتوانرێ لە پالیدا ئەوەی کە لە دڵدا جێگیرە و بوونی هەیە ببینی ، هەروەها زمانیش وەرگێر و گێرەرەوەی ئەو شتانەیە کە لە دڵدان ..؟!

هەروەك (خوای گەروە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾﴾ [الإِسۡرَاء : ٣٦] واتە : [ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ] بەراستی بیستن و بینین و دڵی مرۆڤ هەر هەموو ئەمانە لە رۆژی قیامەت خوای گەورە پرسیاریان لێ ئەکات و ئەیانهێنێتە قسە..؟!

**تێبینی / ووشەی (القلب ) لە قورئانی پیرۆزدا (١٣٢) جار هاتووە ..؟!**

---

[1] -التعریفات الجرجاني ص ١٧٨.

## دووه‌م : (دڵ) له‌ قورئانی پیرۆز به‌ سێ شێوه‌ به‌كارهاتووه‌

**یه‌كه‌م : به‌مانای (العقل ) واته‌: ژیری ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویّت :** قال تعالى: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾﴾ [ق : ٣٧]واته‌ : به‌ڕاستی ئه‌م سووره‌ته‌ یان قورئانی پیرۆز یادخستنه‌وه‌ یه‌كه‌ بۆ هه‌ر كه‌سێك كه‌ دڵی هه‌بێت دڵێك كه‌ سوودی لێ ببینێ یاخود گوێ بگرێت و تێبگات و شایه‌ت بێت، یان دڵی ئاماده‌و ئاگادار بێت..؟!

**دووه‌م : به‌مانای (الرأی ) واته‌: بۆچوون ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌روه‌ ) ده‌فه‌رموویّت :** قال تعالى: ﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾﴾ [الحَشْر : ١٤]واته‌ : [ لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ ] ئه‌وان ناتوانن كوشتاری ئێوه‌ بكه‌ن هه‌موویان به‌ یه‌كه‌وه‌ كۆببنه‌وه‌ بۆ كوشتاری ئێوه‌ چونكه‌ ترسنۆكن، مه‌گه‌ر له‌ناو خانوو و ماڵی دێیه‌كدا كه‌ شوراو قه‌ڵای پته‌وی هه‌بێ [ أَوْ مِنْ وَرَاءِ جُدُرٍ ] یان له‌ پشت دیواره‌كانه‌وه‌ خۆیان بشارنه‌وه‌ له‌ ترسدا مه‌گه‌ر ئاوا كوشتاری ئێوه‌ بكه‌ن ئه‌گه‌رنا ڕووبه‌ڕوو ناتوانن [ بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ] به‌ڵام جووله‌كه‌و مونافیقان ڕق و كینه‌یان له‌ناو یه‌كدا زۆر سه‌خته‌و دڵیان جیاوازه‌ [ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى ] تۆ وا ئه‌زانی ئه‌وانه‌ هه‌موویان یه‌كن به‌ڵام دڵیان لێك جیاوازه‌و دڵیان له‌گه‌ڵ یه‌كدا نیه‌و یه‌ك دڵ نین [ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ ] له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌مانه‌ كه‌سانێكی ناحاڵی و ناتێگه‌یشتوون..؟!

**سێ یه‌م : (القلب الذي في الصدر ) واته‌ : ئه‌و دڵه‌ی كه‌ له‌ سینه‌ دایه‌ ، هه‌روه‌ك (خوای گه‌وره‌ ) ده‌فه‌رموویّت :** قال تعالى: ﴿وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾﴾ [الحَج : ٤٦]واته‌ : به‌ڵكو ئه‌و دڵه‌ی كه‌ له‌ سینگدایه‌ كوێره‌و حه‌قیقه‌ت و ڕاستیه‌كان نابینێ..؟!

## سێیەم : جۆرەکانی (دڵ)

سێ جۆر (دڵ) ی سەرەکی هەیە ئەمانەی خوارەوەن :

یەکەم : (دڵ)ی (السلیم) واتە: (دڵ)ی تەندروست و ساغ و سەلیم .

دووەم: (دڵ)ی (المریض) واتە: (دڵ)ی نەخۆش و ناتەندروست .

سێیەم: دڵ)ی (میت) یان دڵی مردوو .

یەکەم : (دڵ) سلیم یان تەندروست :

## جۆره‌كانی دڵ

### یه‌كه‌م (القلب السليم) یان (القلب صحيح) واته: دڵێكی ته‌ندروست و ساغ:

به‌ڵێ دڵ ی ته‌ندروست ئه‌و دڵه‌یه كه ته‌نیا خاوه‌نی ئه‌و دڵانه له دوا رۆژدا ئه‌هلی ئاسووده بوون و به‌خته‌وه‌ری و خۆشبه‌ختی ده‌بن ، هه‌روه‌كو چۆن په‌روه‌ردگاری گه‌وره و به‌به‌زه‌یی ده‌فه‌رموویت : قال تعالى: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ۝ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ۝﴾ [الشُّعَرَاء : ٨٨ – ٨٩]واته : [ يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ (٨٨) ] له رۆژێك كه رۆژی قیامه‌ته هیچ شتێك سوودی نیه نه ماڵ و سه‌روه‌ت و سامان نه منداڵ سوود به هیچ كه‌سێك ناگه‌یه‌نێت و له سزای خوای گه‌وره رزگاری ناكات..؟! [ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ (٨٩) ] ئیلا ئه‌گه‌ر كه‌سێك بگاته خوای گه‌وره به دڵێكی پاكه‌وه كه پڕ بێت له ته‌وحیدو سوننه‌ت دوور بێت له شیرك و بیدعه، وه دڵێك پاك بێت له تاوان و سه‌رپێچی كه دڵی مرۆڤی ئیمانداره..؟!

دڵ ی ته‌ندروست هه‌مان دڵ ی ساغ و ته‌واو و دروسته و به‌م هۆیه ووشه‌ی ساغ وه‌كو : درێژ و كه‌م كورتی و جوان بۆ سیفه‌تی تایبه‌تمه‌ندی به‌كاردێت ، په‌روه‌ردگاریش ئه‌وی بۆ پێناسه كردن وه‌سف كردنی دڵ به‌كارهێناوه ،هه‌ر بۆیه دڵ ته‌ندروست ، دلێكه كه سه‌لامه‌تی و ته‌ندروستی بۆی به شێوه‌ی سیفه‌ت گه‌لێكی به‌رده‌وام و راوه‌ستاویان لێ هاتبێ ، وه‌كو زانا و به توانا ، له‌لایه‌كه‌وه ته‌ندروست له خالی به‌رامبه‌ری نه‌خۆش و ناساز و ناساغدا جێگیره ، هه‌روه‌ها دڵ ته‌ندروست و ساغ دلێكه كه له‌گه‌ل ته‌واوی ئه‌و راكێشان و هه‌واو هه‌وه‌سانه‌ی كه له‌گه‌ل رێگه پێدراو و رێگه پێنه‌دراوه‌كانی په‌روه‌ردگاردا نا له بار و ناساگارن ، ساغ و ته‌ندروست بووه له هه‌ر جۆره شك و گومانێ كه له‌گه‌ل رێنموونییه‌كانی په‌روه‌ردگاردا دژایه‌تی هه‌بێ خالی بێت ، هه‌روه‌ها دڵ ی ته‌ندروست و ساغ ئه‌و دله یه‌ك كه له هه‌ر جۆره هاوه‌ل بریاردانێ به هه‌ر جۆر و شێوه‌یه‌ك پاك بێت و له به‌ندایه‌تی كردنی په‌روه‌ردگار و باوه‌ردا ، ویست و ئیراده ، خۆشه‌ویستی ، پشت به ستن و ئه‌نابه‌ت ، مه‌لكه‌چی ، ترس و پارانه‌وه پاك و بێ دوودلی ، وه كردارو كرده‌وه‌ی خۆی پاك بكاته‌وه بۆ په‌روه‌ردرگار ، ئه‌گه‌ر دۆستایه‌تی و دووژمنایه‌تی ده‌كات ، ته‌نها ده‌بێت دۆستایه‌تی و دوژمنایه‌تییه‌كه‌ی واته: (الولاء والبراء ) بۆ ره‌زامه‌ندی په‌روه‌ردگا بێت ..؟!

له (النعمان بن بشير ) – خوا لێ رازی بێت – ده‌لێت : پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی : (( ... ألا وإنَّ حِمَى اللهِ مَحارِمُهُ، ألا وإنَّ في الجَسَدِ مُضْغَةً، إذا صَلَحَتْ، صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وإذا فَسَدَتْ، فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، ألا وهي القَلْبُ)) .[١]واته: بزانن له جه‌سته‌دا پارچه گۆشتێك هه‌یه ، ئه‌گه‌ر چاك بێت هه‌موو جسته چاك ده‌بێت ، ئه‌گه‌ر خراپیش بوو هه‌موو جسته خراپ ده‌بێت ، چاك بزانن ئه‌و پارچه گۆشته‌ش دڵ ه ..؟!

---

[١]-صحيح مسلم برقم (١٥٩٩).

## قلب سليم یان دڵ ی تەندروست بە چەند ئایەتمەندییەك دەناسرێتەوە ئەمانەی خوارەوەن:

### یەكەم : دلنیا كردنەوە یان دلنیابوونەوە :

**وەسف كردنی دڵ ی ئیمانداران بە دلنیاكردنەوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى:**
﴿إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى﴾ [البَقَرَةِ : ٢٦٠]واتە : {ئیبراهیم صلى الله علیه وسلم داوای بینینی زیندوو كردنەوەی مردوو دەكات} [ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَى ] كاتێك ئیبراهیم پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم بە پەروەردگاری فەرموو ئەی پەروەردگار بەچاو نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو ئەكەیتەوە [ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ ] خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئیبراهیم ئایا ئیمانت نەهێناوە ئیمانت بەوە نیە كە من توانام هەیە لەسەر زیندوو كردنەوەی مردوو [ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ] فەرمووی: بەڵێ ئیمانم هەیە بەڵام بۆ ئەوەی كە زیاتر دڵم ئارام بێ و ئیمانەكەی دڵ و بینینی چاوم یەك بگرێ و لە (علم اليقين)ەوە بەرز بمەوە بۆ (عين اليقين)..؟!

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾ [الرَّعْد : ٢٨]واتە : {بە زیكری خوا دڵ ئارامو ئاسودە دەبێت} [ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ ] ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوەو دڵیان ئارام ئەبێت بە زیكرو یادی خوای گەورە [ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ (٢٨) ] وە بزانن كە تەنها بە زیكرو یادی خوای گەورە دڵەكان هێمن و ئارام و ئاسوودە ئەبێت..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ [الْأَنفَال : ١٠]واتە : [ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَى ] وە خوای گەورە ئەم پشتیوانیەی ئێوەی كرد بەم فریشتانە ئەمە تەنها مژدەی سەركەوتنە بە ئێوە [ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ] وە تا دڵیشتان پێی ئارام بێت [ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ ] وە سەركەوتنیش نیە تەنها لەلایەن خوای گەورەوە نەبێت، تەنانەت لەلایەن ئەو مەلائیكەتانەش نیە كە خوای گەورە بۆ ئێوەی ناردووە [ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ] بەڕاستی خوای گەورە زۆر باڵادەست و زاڵ و كاربەجێیە..؟!

قال تعالى: ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَـٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾﴾ [النَّحل : ١٠٦]واتە : هەركەسێك بە زۆر كوفری پێ بكرێت كافر نابێت ئەگەر دڵی پڕ لە باوەڕ بێت} [ مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ ] هەر كەسێك كوفر بكات بە خوای گەورە لە پاش ئیمان هێنانی [ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ ] مەگەر كەسێك زۆری لێ بكرێ و بە زۆر كوفری پێ بكرێ پێی بڵێن: ئەگەر كوفر نەكەی ئەتكوژین ئەویش تەنها بە دەم كوفر بكات و دڵی پڕ لە باوەڕ بێ ئەوا ڕێگای پێدراوەو عوزری هەیە وەكو (عەمماری كوڕی یاسر) كاتێك كە دایك و باوكیان كوشت ئەگەر كوفری نەكردایە خۆیشیان ئەكوشت كوفری كردو دواتر پرسیاری لە پێغەمبەری خوا - صلى الله علیه وسلم - كرد خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، بەڵام زانایان كۆدەنگن لەسەر ئەوەی كە ئەگەر ئەو كەسە خۆی بگرێت و كوفر نەكات تا دەیكوژن ئەوا باشترەو بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر دەكات [ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا ] بەڵام كەسێك كوفر بكات و ڕازی بێ پێی و دڵی پێی ئارام بێ بەو كوفرەی كە كردوویەتی [ فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ ] ئەوانە غەزەبی خوای گەورەیان لەسەرەو خوای گەورە لێیان تووڕە ئەبێ [ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ] وە سزایەكی زۆر گەورەیان بۆ هەیە..؟!

**دووه‌م : ئارامی و ئۆقره‌یی :**

**به‌ڵێ دڵ ئارامی و خۆگری ئۆقره‌یی یه‌كێكه له سیفه‌ته‌كانی دڵ ته‌ندروست و ساغ وپاك و بێگه‌ر ، هه‌روه‌ك له قورئانی پیرۆزدا چه‌ندین باس و له سه‌ر ئارامی دڵ یان (القلب السكینه ) هاتوو ، هه‌روه‌ك ئه‌م رووداوه‌ی په‌یمانی حه‌دیبیه كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له گه‌ل كافرانی قوره‌یش به‌ستی ، وه له‌گه‌ل به‌یعه‌تی رزوان له ژێر دارێكدا هاوه‌لان به پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دا ، له‌م كاته‌دا موسلمانان زۆر دلگران بوون به‌وه‌ی كه موشریك و كافران رێگه‌یان نه‌دا بچنه ناو حه‌رامی مككه ، ئه‌وه بوو (خوای گه‌روه ) دڵ ی موسلمانانی ئارام و ئۆقره و هێمن كرده‌وه ، هه‌ر له‌و كاته‌دا موژده‌ی فتح كردن به موسلمانان به‌خشی ، هه‌روه‌ك ده‌فه‌رموویت : قال تعالی:** ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾ [الفَتْح : ١] واته : {رێككه‌وتننامه‌ی حوده‌یبییه} [ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا (١) ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئێمه سه‌ركه‌وتن و فه‌تحمان بۆ تۆ كردووه سه‌ركه‌وتن و فه‌تحێكی زۆر ئاشكرا، كه مه‌به‌ست پێی فه‌تحی (مه‌ككه) نیه به‌ڵكو مه‌به‌ست پێی صوڵح و رێككه‌وتننامه‌ی (حوده‌یبییه)یه كه له ساڵی شه‌شی كۆچیدا پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - له (حوده‌یبییه) له‌گه‌ڵ كافرانی قوره‌یشدا كردی كه نابێت ئه‌م ساڵ موسڵمانان بچنه مه‌ككه‌وه‌و عومره بكه‌ن، ئیمامی عومه‌ر هات بۆ لای پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - وتی: ئایا ئێمه له‌سه‌ر حه‌ق نین و ئه‌وان له‌سه‌ر باتڵن!؟ ئایا كوژراوانی ئێمه له‌به‌هه‌شتدا نین و كوژراوانی ئه‌وان له دۆزه‌خدا نین!؟ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - فه‌رمووی: (به‌ڵێ)، وتی: ئه‌ی ئیتر بۆچی سازش له دینه‌كه‌مان بكه‌ین و بگه‌ڕێینه‌وه‌و هێشتا خوای گه‌وره بڕیاری له نێوانماندا نه‌داوه!؟ پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - فه‌رمووی: (ئه‌ی كوڕی خه‌تتاب من پێغه‌مبه‌ری خوام و هه‌رگیز خوای گه‌وره ده‌ستبه‌ردارم نابێت و نامفه‌وتێنێت) ئیمامی عومه‌ر به توڕه‌یی گه‌ڕایه‌وه‌و خۆی بۆ نه‌گیراو تا چوو بۆ لای ئیمامی ئه‌بو به‌كرو وتی: ئه‌ی ئه‌بو به‌كر ئایا ئێمه له‌سه‌ر حه‌ق نین و ئه‌وان له‌سه‌ر باتڵ نین!؟ ئیمامی ئه‌بو به‌كر هه‌مان وه‌ڵامی پێغه‌مبه‌ری خوای - صلى الله عليه وسلم - دایه‌وه، وه سوره‌تی فه‌تح دابه‌زی، پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ناردی به شوێن ئیمامی عومه‌رداو بۆی خوێنده‌وه، ئه‌ویش وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئایا فه‌تحه؟ فه‌رمووی: به‌ڵێ، ئه‌میش پێی دڵخۆش بوو، بۆیه پێی وتراوه: فه‌تح له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كافران تێكه‌ڵ موسڵمانان ئه‌بوون و خه‌ڵكێكی یه‌كجار زۆریان موسڵمان بوو به‌هۆی ئه‌وه‌ی كه گوێیان له موسڵمانان ئه‌بوو، وه پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ده‌رباره‌ی ئه‌م سووره‌ته ده‌فه‌رمێت: (سووره‌تێكم به‌سه‌ردا دابه‌زیووه له دونیاو هه‌رچی له دونیادا هه‌یه خۆشه‌ویستتره له‌لام).

**(خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمویت:قال تعالی:** ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ٤﴾ [الفَتْح : ٤]واته : ئیمان زیادو كه‌م ده‌كات} [ هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ ] خوای گه‌وره ئه‌و خوایه‌یه كه هێمنی و ئارامی و ڕه‌حمه‌تی دابه‌زانده سه‌ر دڵی باوه‌ڕداران له (حوده‌یبییه) تا له‌گه‌ڵ ئه‌و ئیمانه‌ی كه هه‌یانه ئیمانیان زیاتر بكات، (ئه‌م ئایه‌ته به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ئیمان زیادو كه‌م ده‌كات) [ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ] وه هه‌رچی سه‌ربازه‌كانی ئاسمان و زه‌وی هه‌یه هه‌مووی سه‌ربازی خوای گه‌وره‌ن له با و باران و فریشته‌و موسڵمانان [ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ] وه خوای گه‌وره زۆر زاناو كاربه‌جێیه..؟!

سێ یه‌م : خشوع ترس و ملكه‌چی بۆ (خوای گه‌وره ) :

به‌ڵێ خشوع و ترس و ملكه‌چی یه‌كێكه له سیفه‌ته‌كانی (القلب السلیم ) واته: دڵ ی ته‌ندروست پاك و بێگه‌ر ، هه‌ر وه‌ك (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویێت : قال تعالى: ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿١٦﴾﴾ [الحديد : ١٦]واته: {كاتی ئه‌وه‌یه دڵتان بۆ قورئان نه‌رم بێت} [ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ ] ئایا كاتی ئه‌وه نه‌هاتووه باوه‌ڕداران دڵیان نه‌رم بێ له كاتی زیكری خوای گه‌وره‌و بیستنی قورئان و خوێندنه‌وه‌ی، وه له‌و حه‌قه‌ی كه قورئانه‌و بۆیان دابه‌زیوه تا ملكه‌چ و گوێڕایه‌ڵ بن بۆی، (ئیبنو مه‌سعود) ده‌فه‌رمێت:(ته‌نها چوار ساڵ بوو موسڵمان ببوین خوای گه‌وره به‌م ئایه‌ته گله‌یی لێكردین) [ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ] وه وه‌ك ئه‌و كه‌سانه نه‌بن كه ئه‌هلی كتابن له جووله‌كه‌و گاوره‌كان كه پێش ئه‌وه‌ی قورئان دابه‌زێ ئه‌مان كتابیان بۆ هاتبوو به‌ڵام كه سه‌رده‌میان دووركه‌وته‌وه له پێغه‌مبه‌رانیان دڵیان ره‌ق بوو، وه زۆرێك له‌وان فاسق بوون و له ڕێگای راست و گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره ده‌رچوو بوون، (خوای گه‌وره به‌ره‌هه‌ڵستی له موسڵمان ده‌كات له خۆچواندنیان به گاورو جوله‌كه كه ده‌ستكاری كتابی خوای گه‌وره‌یان كردو دونیایان پێ كڕی و پشتگوێیان خست و وازیان لێهێناو روویان له بیرو بۆچوونی خه‌ڵكی كردو لاسایی كوێرانه‌یان كردنه‌وه خوای گه‌وره‌یش دڵی ره‌ق كردن)..؟!

خشوع له قورئانی پیرۆزدا به چوار شێوه هاتووه :

١-(التواضع ) واته: كه‌سێكی كراوه و خۆنه‌ویست ،قال تعالى: ﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴿٤٥﴾﴾ [البقرة : ٤٥] واته: وه پشت به صه‌بر گرتن و نوێژ كردن ببه‌ستن له‌سه‌ر چاكه، وه به‌ڕاستی نوێژ زۆر گه‌وره‌و قورسه ته‌نها له‌سه‌ر كه‌سانێك نه‌بێ كه خاشع و ملكه‌چی فه‌رمانی خوای گه‌وره‌ن..؟!

٢-(الخوف ) واته: ترس ، قال تعالى: ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ﴿٩٠﴾﴾ [الأنبياء : ٩٠]واته: [ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى ] ئێمه‌یش وه‌ڵاممان دایه‌وه وه یه‌حیامان - صلى الله عليه وسلم - پێ به‌خشی [ وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ ] وه خێزانه‌كه‌یشیمان چاك كرد كه نه‌زۆك بوو وامان لێ كرد كه منداڵی ببێ [ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ ] به دڵنیایی ئه‌م پێغه‌مبه‌رانه ده‌ستپێشخه‌ریان ئه‌كرد له كرده‌وه‌ی چاكدا [ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ] وه لێمان ده‌پاڕانه‌وه‌و عیباده‌تی ئێمه‌یان ئه‌كردو ره‌غبه‌تیان هه‌بوو له خێرو چاكه، وه له شه‌ڕو خراپه خۆیان پاراستووه، یاخود به ره‌غبه‌تی به‌هه‌شته‌وه‌و له ترسی دۆزه‌خدا عیباده‌تی ئێمه‌یان كردووه [ وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ] وه بۆ ئێمه ملكه‌چ و باوه‌ڕدار بوونه..؟!

٣-(سكون الجوارح ورمى البصر إلى موضع السجود ) واتە :هێمنی و بێ جوولەی ئەندامەكانی لاشە، وە چاو برینە شوێنی سووژدە بردن لە كاتێ نوێژ دا ، كەواتە: لە نوێژە كانیاندا هێمن و ئارام وە دڵیان لەلای نوێژە كانیانەوە خشوعیان هەیە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ① ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ②﴾ [المُؤْمِنون : ١ - ٢] واتە:[ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ] بە دڵنیایی باوەڕداران سەرفرازو بەختەوەرو سەركەوتوو بوونە لە دونیاو قیامەتدا..؟! ئەو باوەڕدارانەی كە ئەم سیفەتانەیان تیابێ: {هەندێك لە سیفاتی باوەڕداران} [ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ] ئەو كەسانەی كە لە نوێژەكانیاندا هێمن و ئارامن وە دڵیان لای نوێژەكانیانەو خشوعیان هەیە..؟!

٤-(الذل والتذلل ) واتە : ملكەچ بوون و خۆ زەلیل كردن ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَوۡمَئِذٖ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِيَ لَا عِوَجَ لَهُۥۖ وَخَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ فَلَا تَسۡمَعُ إِلَّا هَمۡسٗا ⑩⑧﴾ [طه : ١٠٨]واتە: [ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ الدَّاعِيَ ] لەو ڕۆژەدا خەڵكی هەمووی شوێنی بانگخوازی خوای گەورە ئەكەوێ بەرەو ساحەی مەحشەر (ئەگەر لە دونیا شوێنی بكەوتنایە باشتر بوو بۆیان) [ لَا عِوَجَ لَهُ ] هیچ كەسێك نیە لا بدات یان بتوانێ لا بدات و بەلایەكی تردا بڕوات، بەڵكو هەموویان شوێنی دەنگەكە دەكەون [وَخَشَعَتِ الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَنِ ] وە دەنگەكان هەمووی كپ و هێمن و بێدەنگ ئەبن لە ترسی خوای گەورەدا یان لەبەر بیستنی قسەی خوای گەورە [ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ] هیچ شتێك نابیستی تەنها چپەو دەنگی نزم نەبێت، یان دەنگی پێیەكان..؟!




چواره‌م : دلسۆزی و ملكه‌چی رازی بوونی فه‌رمانه‌كانی په‌روه‌ردگار :

قال تعالی: ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾﴾ [الحج : ٥٤]واته : [ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ ] وه تا باوه‌ڕداران بزانن كه ئه‌مه‌ی ئه‌م پێغه‌مبه‌ره بلاوی ئه‌كاته‌وه حه‌قه له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارته‌وه [ فَيُؤْمِنُوا بِهِ ] بۆ ئه‌وه‌ی كه باوه‌ڕی پێ بێنن، یان ئیمانیان زیاد بكات، یان دامه‌زراو بن له‌سه‌ر ئیمانه‌كه‌یان [ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ ] وه دڵیان ئارام و ملكه‌چ بێت بۆ خوای گه‌وره [ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ] وه به دڵنیایی خوای گه‌وره هیدایه‌تی باوه‌ڕداران ئه‌دات بۆ ڕێگا ڕاسته‌كه‌ی خۆی كه هیچ گێڕیه‌كی تیا نیه..؟!

قال تعالی: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَـٰمِ ۗ فَإِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾﴾ [الحج : ٣٤]واته : [ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنْسَكًا ] وه هه‌موو ئوممه‌تێك جه‌ژن و دروشمی خۆیان و شوێنی عیباده‌ت و ئاژه‌ڵ سه‌ربڕینی خۆیانمان بۆ داناون [ لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ ] تا ناوی خوای گه‌وره بێنن له‌سه‌ر ئه‌و ڕزقه‌ی كه خوای گه‌وره پێی به‌خشیوون له‌و ئاژه‌ڵانه، واته: بسم الله، الله أكبر بكه‌ن [ فَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ ] وه ئێوه هه‌رچه‌نده شه‌ریعه‌تی پێغه‌مبه‌رانتان جۆراو جۆرو جیاواز بێت به‌ڵام یه‌ك خواو په‌رستراوێكی حه‌قتان هه‌یه جگه له‌و په‌رستراوی ترتان نیه كه الله یه [ فَلَهُ أَسْلِمُوا ] وه ئێوه هه‌مووتان خۆتان ته‌سلیمی ئه‌و خوایه بكه‌ن و ملكه‌چ و گوێڕایه‌ڵی بن و عیباده‌تی بكه‌ن [ وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ ] وه موژده بده به‌و كه‌سانه‌ی كه دڵسۆزو ملكه‌چ و خۆبه‌كه‌مزانن بۆ عیباده‌تی خوای گه‌وره به پاداشتی گه‌وره..؟!

(الاخبات ) دلسۆزی یان ملكه‌چی له دوو شێوه له قورئاندا هاتووه :

١–به‌مانای دلسۆزی ، قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَأَخْبَتُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾﴾ [هود : ٢٣]واته : [ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ] ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ئیمانیان هێناوه‌و كرده‌وه‌ی چاكیان كردووه، (كرده‌وه‌ی چاك ئه‌وه‌یه كه له‌سه‌ر سوننه‌ت بێت و بیدعه نه‌بێت، وه ئیخلاص و دڵسۆزی بۆ خوای گه‌وره هه‌بێت و بۆ ریاو رووبینی نه‌بێت) [ وَأَخْبَتُوا إِلَى رَبِّهِمْ ] وه گه‌ڕاونه‌ته‌وه بۆ لای خوای گه‌وره‌و ملكه‌چی خوای گه‌وره‌ن [ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ] ئه‌مانه هاوه‌ڵی به‌هه‌شتن به نه‌مری و هه‌میشه‌یی تێیدا ده‌مێننه‌وه..؟!

٢–به‌مانای رازی بوون یان ملكه‌چی ، قال تعالی: ﴿فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ﴾ [الحج : ٥٤]واته : وه گه‌ڕاونه‌ته‌وه بۆ لای خوای گه‌وره‌و ملكه‌چی خوای گه‌وره‌ن..؟!

## دووه‌م: (دڵ)ی (المریض ) واته: (دڵ)ی نه‌خۆش و ناته‌ندروست .

به‌لێ جۆری دووه‌م دلێکه که هه‌م خاوه‌نی ژیانه و هه‌میش له ئازار و ئێش و ژان و زه‌لیلی ریسوایی و ده‌ردو ناره‌حه‌تی و نه‌هامه‌تی و ره‌نجه‌رۆیی و ، وه هه‌میشه له ده‌روونی دا، دوو هێز بوونیان هه‌یه که هه‌ر کامێکیان بۆ لای خۆی راده‌کێشێ ، کاتێ ئه‌م و کاتێکی تریش ئه‌ویان زال ده‌بن به سه‌رێدا ، خۆشه‌ویستی و باوه‌ر و پاکیه‌تی و پشت به‌ستن که تایبه‌تمه‌ندی ژیانن بوونیان هه‌یه له ناویدا ، به‌لام دڵی نه‌خۆش له به‌رامبه‌ردا حه‌زکردن له په‌یره‌وی کردن به هه‌واو هه‌وه‌س و ئاره‌زوو زال بوون و گرنگی دان پێیان و هه‌ول و کۆشش به به‌ده‌ست هێنانیان و هه‌روه‌ها رژدی و خۆ به‌گه‌وره زانین و لووت به‌رزی و خۆ ویستن و خۆشه‌ویستی فروفێڵ و ته‌له‌که‌بازی پیسکه‌یی هیچ نه‌بوویی رووبازیی ، که ئه‌مانه هۆکاری تیچا چوون یان له ناو چوون و تێکشکانی دڵ ، ئینجار نه‌هامه‌تی ره‌نجه‌رۆیی و زه‌لیلی ریسوایی ، ئه‌مانه هه‌ر هه‌مووی نه‌خۆشه‌یه‌کانی دڵ سه‌رئه‌نجامی سه‌رگه‌ردانیه..؟! به‌لێ نه‌خۆشی دڵ : ئه‌ویش ئه‌وه‌یه که له ناسین و ئاشنایه‌تی ، رێز ، خۆشه‌ویستی و حه‌زلێکردن بۆ بینینی په‌روه‌ردگار و چاودێری و گه‌رانه‌وه بۆی و به‌رز نرخاندنیان به‌سه‌ر کاره‌کانی تردا ، که به‌هۆی ئه‌وانه‌وه دروست کراو ، بێ توانا و بێ هێز بێت ، هه‌ر وه‌کو چۆن که مرۆڤ جگه له (خوای گه‌وره) خۆی هه‌ر شتێکی تر بپه‌رستێ و بناسێ و ئه‌گه‌ر چێ بکات ته‌واو خۆشی به‌خششه‌کانی دونیا ، ناگاته پله و پایه‌ی خۆشه‌ویستی په‌روه‌ردگار و ئاره‌زوو مه‌یلی بینین و هاوده‌می و هاورازی له‌گه‌لی دا و وه‌کو ئه‌وه وایه که به‌هیچ شێوه‌یه‌ك به‌چێژ ، به‌خشش و به‌خته‌وه‌ری و خۆش به‌ختی نه‌گه‌یشتبێ ..؟! هه‌ر که‌سێ به ناسنینی راسته‌قینه‌ی په‌روه‌ردگار بگات ، به دروستی په‌روه‌ردگاری خۆش ده‌وێ ، په‌رستش و یاد و زکرو کردتی بۆ په‌روه‌ردگار پاك ده‌کاته‌وه و خۆشه‌ویستی ئه‌و له‌گه‌ل خۆشه‌ویستی هیچ شتێکی تردا ناگۆرێته‌وه، چونکه هه‌ر که‌سێ خۆشه‌ویستی شتێ له‌گه‌ل خۆشه‌ویستی په‌روه‌ردگار بگۆرێته‌وه و ، وه خۆشه‌ویستی ئه‌و شته له خۆشه‌ویستی په‌روه‌ردگار به به‌رزتر و باشتر بزانێ ..؟! ئه‌وا ئه‌و دڵه نه‌خۆش ، به هه‌مان شێوه‌ی که ئه‌گه‌ر ماعیده یان گه‌ده به خواردن گه‌لێکی پیس و خراپ خوو بگرێت و رابێت ، ئه‌و سا ئه‌و خواردنه پیس و به‌سه‌ر چووانه به باشتر ده‌زانێ له خواردنه پاك و دلخوازه‌کان ، خواردنی ئه‌و دووانه له گه‌ل یه‌کتردا ده‌گۆردرێ ، چونکه هه‌ندێك جار دڵ تووشی نه‌خۆشی ده‌بێ و له کاتێکدا رۆژ له دوای رۆژ ئه‌و نه‌خۆشییه زۆرتر ده‌بێ ، خاوه‌نی ئه‌و دڵه ، لێی بێ ئاگا ده‌بێت و ته‌نانه‌ت هه‌ندێ جاریش دڵ رووبه‌رووی مردن تیاچوون ده‌بێته‌وه ، به‌لام خاوه‌نه‌که‌ی ئاگای له مردنی نییه ..؟!

## سیفه‌ته‌کانی نه‌خۆشی دڵ

### یه‌که‌م: (القسوه ) واته: دڵ ره‌قی:

**له سیفه‌ته‌کانی دڵ ئه‌وه‌که که نه‌خۆشی دڵ ره‌قیه ، واته: رقبوونی دڵ ، وەك ئه‌وه‌ی که ده‌ڵێن : که دڵ ی وەك به‌رده واته: ره‌قه ..؟! وه ئه‌م سیفه‌ته‌ش له چه‌ند ئایه‌تێکی قورئانی پیرۆز هاتووه ئه‌مانه‌ن :**

١-قال تعالى: ﴿ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٧٤﴾ [البَقَرَة : ٧٤]واته : [ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ ] له دوای ئه‌م هه‌موو موعجیزانه دیسانه‌وه ئێوه له جیاتی ئه‌وه‌ی به‌رده‌وام بن له‌سه‌ر تاعه‌ت و عیباده‌تی خوای گه‌وره دڵتان ڕەق بوو [ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ] دڵتان وه‌کو به‌رد ڕەق بووه یاخود دڵتان له به‌رد ڕەقتر بووه [ وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ ] وه له‌ناو به‌رده‌کانیشدا هه‌یه ئه‌ته‌قێ و کانی ئاوی لیٰ ده‌رئه‌چێت [ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ ] وه هه‌یشه له‌ت ئه‌بێت و ئاوی لیٰ ده‌رئه‌چێت [ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ] وه هه‌یه له‌سه‌ر شاخه‌کان به‌ر ئه‌بێته خواره‌وه له ترسی خوای گه‌وره، مجاهد ئه‌فه‌رمووێت: هه‌ر به‌ردێك له‌سه‌ر شاخ به‌ربۆوه ئه‌وه له ترسی خوای گه‌وره‌یه، هه‌ر به‌ردیٰ شه‌ق بردو ئاوی لیٰ ده‌رچوو له ترسی خوای گه‌وره‌یه [ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (٧٤) ] به ڕاستی خوای گه‌وره بێئاگا نیه له‌و کرده‌وانه‌ی که ئێوه ئه‌نجامی ئه‌ده‌ن..؟!

٢-قال تعالى: ﴿فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗ﴾ [المَائـِدَة : ١٣]واته : [ فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ ] جووله‌که به‌هۆی ئه‌وه‌ی که ئه‌م به‌ڵێن و په‌یمانه‌یان شکاندو هه‌ڵیانوه‌شانده‌وه خوای گه‌وره نه‌فره‌تی لیٰ کردن و له ڕه‌حمه‌ت و هیدایه‌تی خۆی ده‌ری کردن [ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ] وه دڵیانمان ڕەق کرد که په‌ندو ئامۆژگاری وه‌رناگرن..؟!

٣-قال تعالى: ﴿فَلَوۡلَآ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٤٣﴾ [الأَنْعَام : ٤٣]واته: [ فَلَوْلَا إِذْ جَاءَهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا ] ئه‌بوایه کاتێك که به‌ڵاو موسیبه‌تی ئێمه‌یان بۆ بهاتایه به‌زه‌لیلی و ملکه‌چیه‌وه له خوای گه‌وره بپاڕانایه‌ته‌وه [ وَلَكِنْ قَسَتْ قُلُوبُهُمْ ] به‌ڵام ئه‌وان دڵیان زیاتر ڕەق بوو [ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ] وه شه‌یتانیش کرده‌وه خراپه‌کانی بۆ ڕازاندنه‌وه‌و له‌لایان جوانی کرد تا گومڕای کردن و له خشته‌ی بردن..؟!

٤–قال تعالى: ﴿لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾﴾ [الحَج : ٥٣]واته : [ لِيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ ] تا ئەو دوودڵی و گومانانەی کە شەیتان بڵاوی ئەکاتەوەو ئەیخاتە ناو دڵی خەڵکیەوە خوای گەورە ئەمە ئەکاتە تاقیکردنەوەیەك بۆ ئەو کەسانە ی کە نەخۆشی گومان و دوودڵی لە دڵیاندا هەیە لە مونافیقان، وە ئەو کەسانەیشی کە دڵیان ڕەقە لە موشریکان ئەمە تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوان [ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ] وە بە دڵنیایی ستەمکاران لە دژایەتیەکی زۆر سەختی باوەڕداراندان دژایەتی و بەدبەختیەکی زۆر دوور..؟!

٥–قال تعالى: ﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾﴾ [الحَدِيد : ١٦]واته : {کاتی ئەوەیە دڵتان بۆ قورئان نەرم بێت} [ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ ] ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە باوەڕداران دڵیان نەرم بێ لە کاتی زیکری خوای گەورەو بیستنی قورئان و خوێندنەوەی، وە لەو حەقەی کە قورئانەو بۆیان دابەزیوە تا ملکەچ و گوێڕایەڵ بن بۆی، (ئیبنو مەسعود) دەفەرمێت: (تەنها چوار ساڵ بوو موسڵمان ببوین خوای گەورە بەم ئایەتە گلەیی لێکردین) [ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ ] وە وەك ئەو کەسانە نەبن کە ئەهلی کتابن لە جوولەکەو گاورەکان کە پێش ئەوەی قورئان دابەزێ ئەمان کتابیان بۆ هاتبوو بەڵام کە سەردەمیان دوورکەوتەوە لە پێغەمبەرانیان دڵیان ڕەق بوو، وە زۆرێك لەوان فاسق بوون و لە ڕێگای ڕاست و گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوو بوون، (خوای گەورە بەرهەڵستی لە موسڵمان دەکات لە خۆچواندنیان بە گاورو جولەکە کە دەستکاری کتابی خوای گەورەیان کردو دونیایان پێ کڕی و پشتگوێیان خست و وازیان لێهێناو ڕوویان لە بیرو بۆچوونی خەڵکی کردو لاسایی کوێرانەیان کردنەوە خوای گەورەیش دڵی ڕەق کردن)..؟!

**دووەم : (الريب ) واته: شك و گومان :**

**گومان لە بنەرەتدا سەرچاوەی لە شتێکە ، یان گومان لە شتێکدا سەر هەلدەدات ، کە ئەمەش دلەراوکیٚ رارایی و گێژاوی نفسە ..؟! ئەگەر چی گومان لە مانایدا بە شك ناسراوە ، لە بنەرەتدا قلق و دڵراوکیٚ و راراییە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ۝٢٣﴾ [البَقَرَة : ٢٣]واته : {قورئان تەحەددا دەکات} [ وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ ] وە ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لەو قورئانە پیرۆزەی کە بۆ سەر عەبدی خۆمان کە محمدە صلى الله عليه وسلم دامان بەزاندووە ئەوا تەنها هاوشێوەی سوورەتێکی قورئان بێننەوە ئەگەر وەکو کورتترین سوورەتیش بێت [ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ] وە شایەت و پشتیوانەکانی خۆیشتان بێنن لە غەیری خوا شایەتیتان بۆ بدات کە ئەمەی ئێوە هێناوتانەتەوە هاوشێوەی سوورەتێکی قورئانە ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن..؟!

قال تعالى: ﴿وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ [المُدَّثِّر : ٣١]واته: وە تا ئەهلی کتاب و باوەڕدارانیش تووشی گومان نەبن..؟!

**بەلیٚ گومان پەیوەندی هەیە بە دلە کانەوە ، هەر بۆیە لەم ئایەتانەدا باس لە دڵ ی دوو رووەکان دەکات ..؟!**

قال تعالى: ﴿إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ ۝٤٥﴾ [التَّوۡبَة : ٤٥]واته : [ إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ] بەڵکو بەتەنها ئەو کەسانە داوای ئیزن لە تۆ ئەکەن کە نەیەن بۆ جیهادو دوابکەون کە باوەڕیان بەخواو بەڕۆژی دوایی نیە واتە: مونافیقان [ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ ] وە دڵیشیان پڕە لە گومان [ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ] وە ئەوان لە گومانی خۆیاندا دوودڵ و سەرلێشێواون و هیچ عوزرێکیشیان نیەو داوای ڕوخسەت ئەکەن..؟!

قال تعالى: ﴿أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥۚ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٥٠﴾ [النُّور : ٥٠]واته : [ أَفِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ ] ئایا ئەمانە دڵیان نەخۆشە نەخۆشی لە دڵیاندا هەیە نەخۆشی گومان و دوودڵی و نیفاق [ أَمِ ارْتَابُوا ] یان لە گوماندان لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - یان لە دادپەروەری پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - [ أَمْ يَخَافُونَ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ ] یاخود لەوە ئەترسێن خواو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نا دادپەروەر بن لە حوکم دان بەسەریاندا [ بَلْ أُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ] شتی وا نیە بەڵکو ئەمانە خۆیان زاڵم و ستەمکارن..؟!

قال تعالى: ﴿لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ۝١١٠﴾ [التَّوۡبَة : ١١٠]واته: [ لَا يَزَالُ بُنْيَانُهُمُ الَّذِي بَنَوْا رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمْ ] بەردەوام ئەو مزگەوتەی کە دروستیان کرد گومان و نیفاق دروست کرد لە دڵیاندا [ إِلَّا أَنْ تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ] ئیلا ئەگەر دڵیان بپرێ بە مردن و بیانکوژیت، واتە: تا مردن هەر لە گوماندا ئەژین [ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١١٠) ] وە خوای گەورە زۆر زاناو کاربەجێیە..؟!

## سێ یەم :(الغل )معنی : (غش - حقد - خیانە ) واتە: فێڵ – رق و کینە - ناپاکی :

بەلێ ووشەی (الغل ) لە بنەرەتدا بە مانای (غش ، حقد ، خیانە ) واتە: فێڵ و ، رق و کینە ، ناپاکی دێت ، هەرەك دەلێن : (الغل ) شوێنەکەی لەسینەدایە ، واتە : ئەوەی لە سینەدا دەی شارێتەوە لە رەق کینە و فروفێل و ناپاکی کردن ، هەروەها ووشەی (الغل ) لە بەرکار هێنانی قورئانی پیرۆز دا هاتووە ، کە پیوەندی بە دڵ هەیە..؟! قال تعالی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠﴾ [الحَشْر : ١٠]واتە: [ وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ ] وە ئەوانەیشی کە لە دوای موهاجیرو ئەنصارەوە هاتوونەو شوێن ئەوان دەکەون تا ڕۆژی قیامەت ئەڵێن: [ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ ] خوایە لە ئێمەو لەو برایانەشمان خۆشبە کە بە ئیمانەوە پێش ئێمە کەوتوون، واتە: صەحابەو هەموو باوەڕدارانی تر، واتە: دەبێت دوعا بۆ صەحابە بکرێت نەك جوێنیان پێ بدرێت [ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا ] خوایە هیچ ڕق و کینەو حەسوودیەك مەخەرە دڵمانەوە بەرامبەر ئەو صەحابە باوەڕدارانە، وە بەرامبەر سەرجەم موسڵمانان، بۆیە هەر کەسێك ڕق و کینەی لە صەحابە هەبێ ئەوە ئەم ئایەتە نایگرێتەوەو شەیتان بەسەریدا زاڵ بووە، وە لە (فەیئیشدا) هیچ بەشێکی نابێ [ رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ] خوایە تۆ زۆر بە ڕەئفەت و بە سۆزو بەزەیی و میهرەبانی..؟!

بەلێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفی ئەو کەسانەی کردووە ، کە ئەهلی بەهەشتن بەوەی کە دڵ یان کرداری (الغل ) واتە: غش و فێل و حقد و کینە و خیانە و ناپاکی و حسوودی تێدا نیە ، ئەوانە ئەهلی بەهەشت کە خۆیان لەو رەشتە ناشرینانە دەپارێزین تەقوای (خوای گەورە) دەکەن ، بە کرداری چاکە دڵ یان پاك و بێگەردە ، هەرگیز فروفێل و ناپاك نین ..؟!

لە (أنس کوری مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێریتەوە دەلێت : ((يَطْلُعُ الآنَ عليكم رجلٌ من أهلِ الجَنةِ فطَلَعَ رجلٌ من الأنصارِ تَنطُفُ لِحيتُه من وُضوئِه، قدْ عَلَّقَ نَعليْه بِيدِه الشِّمالِ، فلمَّا كان الغَدُ قال النَّبيُّ مِثلَ ذلِكَ؛ الرجلِ مِثلَ المَرَّةِ الأُولَى، فلَمَّا كان اليومُ الثَّالِثُ قال النَّبيُّ مِثلَ مَقالَتَهُ أيضًا، فطَلَعَ ذلِكَ الرجلُ على مِثلِ حالِهِ الأَوَّلِ، فلَمَّا قامَ النبيُّ تَبِعَه عبدُ اللهِ بنُ عمروٍ فقال : إنِّي لَاحَيْتُ أبِي فأقْسَمْتُ أنِّي لا أدخلُ عليه ثلاثًا، فإنْ رأيتَ أنْ تُؤْوِينِي إليكَ حتى تَمْضِي فعلْتَ ؟ قال : نَعَمْ قال أنَسٌ : فكانَ عبدُ اللهِ يُحدِّثُ أنَّه باتَ مَعهُ تلكَ الليالِيَ الثلاثِ، فلمْ يَرَهُ يَقومُ من الليْلِ شيئًا، غيرَ أنَّه إذا تعارَّ وتَقَلَّبَ في فِراشِهِ ذكر اللهَ عزَّ وجلَّ وكَبَّرَ حتى يقومَ لِصلاةِ الفجرِ قال عبدُ اللهِ : غَيرَ أنِّي لَم أسْمعْهُ يَقولُ إلاَّ خيرًا فلمَّا مَضَتِ الثَلاثُ الليالِيَ، وكِدْتُ أحْتَقِرُ عَمَلَهُ، قُلتُ : يا عبدَ اللهِ ! لم يَكن بَينِي وبينَ أبِي غَضَبٌ ولا هِجرةٌ، ولَكِن سمعتُ رسولَ اللهِ يقولُ لكَ ثلاثَ مَرَّاتٍ يَطْلُعُ الآنَ عليكم رجلٌ من أهلِ الجنةِ فطَلَعْتَ أنتَ الثلاثَ المَرَّاتِ فأرَدتُ أنْ آوِيَ إليكَ لأنْظُرَ ما عملُكَ ؟ فأَقْتَدِي به، فلَمْ أرَكَ عَمِلْتَ كَبِيرَ عَمَلٍ، فمَا الذي بَلَغَ بِكَ ما قال رسولُ اللهِ ؟ قال ما هو إلا ما رَأَيْتَ فلَمَّا وَلَّيْتُ دَعَانِي فقال ما هو إلاَّ ما رَأَيْتَ؛ غَيرَ أنِّي لا أجِدُ في نَفسِي لأحدٍ من المسلِمينَ غِشًّا، ولا أحْسِدُ أحدًا على خَيرٍ أعطاهُ اللهُ إيَّاهُ فقال عبدُ اللهِ : هذه التي بَلَغَتْ بِكَ، ( وهِيَ التي لا نُطِيقُ )..؟! [1]

[1]-الشيخ اللباني ضعيف الترغيب برقم (١٧٢٨).

## چواره‌م :(الغلظة )واته : دڵ ره‌قیه‌کی زۆر توند یان دووژمنایه‌تی :

**(الغلظة ) ضد (الرقة ) واته: دڵ رق پێچه‌وانه‌ی دڵ نه‌رمییه ، ئه‌وه‌ش یه‌کێکه له سیفه‌ته‌کانی نه‌خۆشی دڵ ، له ( قرطبي ) –ره‌حمه‌تی خوا لێ بێت – ده‌لێت : دڵ رقی زۆر عیباره‌ته له که‌می سۆز و به‌زه‌یی ، وه یان نه‌بوونی سۆز له ئاره‌زووه‌کاندا ..؟!**

قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾﴾ [التَّوْبَة : ١٢٣]واته: [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ ] ئه‌ی باوه‌ڕداران کوشتاری ئه‌و کافرانه بکه‌ن که له جه‌نگو رووبه‌ڕووبوونه‌وه لێتانه‌وه نزیکن [ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً ] وه با توندی و ره‌قیتان لێوه ببینن [ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ] وه‌بزانن که خوای گه‌وره له‌گه‌ڵ ئه‌و که‌سانه‌دایه که ته‌قوای خوای گه‌وره ئه‌که‌ن به‌وه‌ی که سه‌ریان ئه‌خات‌و پشتیوانیان ده‌کات..؟!

قال تعالى: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾﴾ [آل عِمْرَان : ١٥٩]واته: { نه‌رمونیانی پێغه‌مبه‌ری خوا – ﷺ - } [ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - به‌هۆی ره‌حمه‌تی خوای گه‌وره‌وه به‌سه‌ر تۆوه تۆ ئاوا نه‌رم و نیان بووی له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌ی ده‌وروبه‌رت [ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ ] وه ئه‌گه‌ر تۆ که‌سێکی قسه‌خراپ و ره‌وشت خراپ و ره‌ق و ووشك و دڵره‌ق بوویتایه [ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ] ئه‌وا له ده‌ورت دوور ئه‌که‌وتنه‌وه [ فَاعْفُ عَنْهُمْ ] بۆیه له مافی خۆتدا که‌مته‌رخه‌میان کرد تۆ لێیان ببوره [ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ ] وه له مافی خوای گه‌وره بوو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکه [ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ] وه له کاروباردا راوێژیان پێ بکه [ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ] وه ئه‌گه‌ر بۆ هه‌ر کارێکیش دوای ئه‌وه‌ی راوێژت پێیان کرد ویستت بیکه‌یت و عه‌زیمه‌تت هه‌بوو ئه‌وا پشت به خوای گه‌وره ببه‌سته له ئه‌نجامدانی [ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ] به‌دڵنیایی خوای گه‌وره ئه‌و که‌سانه‌ی خۆش ئه‌وێ که پشت به خوای گه‌وره ده‌به‌ستن و کاره‌کانیانی پێ ده‌سپێرن ..؟!

قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾﴾ [التَّوْبَة : ٧٣]واته: [ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ ] ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا – ﷺ - جیهادو کوشتاری کافران بکه، وه جیهادی مونافیقان بکه به‌وه‌ی به‌ڵگه‌یان به‌سه‌ردا جێبه‌جێ بکه‌یت به زانست، وه سنووره‌کانی خوای گه‌وره‌یان به‌سه‌ردا جێبه‌جێ بکه [ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ ] وه دڵره‌ق به له‌گه‌ڵیاندا [ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ] وه شوێنی ئه‌مانه ئاگری دۆزه‌خه که خراپترین سه‌ره‌نجامه مرۆڤ بۆی بگه‌ڕێته‌وه..؟!

له (عطاء کوری یسار ) – خوا لێ رازی بێت –ده‌لێت : ((عَنْ عبدِ اللَّهِ بنِ عَمْرِو بنِ العَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عنْهمَا: أنَّ هذِه الآيَةَ الَّتي في القُرْآنِ: {يَا أيُّها النبيُّ إنَّا أرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا ومُبَشِّرًا ونَذِيرًا}، قالَ في التَّوْرَاةِ: يا أيُّها النبيُّ إنَّا أرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا ومُبَشِّرًا وحِرْزًا لِلْأُمِّيِّينَ، أنْتَ عَبْدِي ورَسولِي، سَمَّيْتُكَ المُتَوَكِّلَ، ليسَ بفَظٍّ ولاَ غَلِيظٍ، ولاَ سَخَّابٍ بالأسْوَاقِ، ولاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَةَ بالسَّيِّئَةِ، ولَكِنْ يَعْفُو ويَصْفَحُ، ولَنْ يَقْبِضَهُ اللَّهُ حتَّى يُقِيمَ به المِلَّةَ العَوْجَاءَ، بأَنْ يقولوا: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ فَيَفْتَحَ بهَا أعْيُنًا عُمْيًا، وآذَانًا صُمًّا، وقُلُوبًا غُلْفًا )) .[1]

---

[1]-صحيح البخاري برقم (٤٨٣٨).

## پێنجه‌م : (اللهو) واته‌: گاڵته‌ و گه‌مه‌و خۆشی پرو پوچی ئاره‌زووه‌کانی دونیا :

به‌ڵێ ئه‌مه‌ش یه‌کێکه‌ له‌ نه‌خۆشیه‌ باوه‌کانی دڵ ، چونکه‌ خۆشی گه‌مه‌ و رابواردنی کرده‌وه‌ی پرو پوچی دونیا ، ئاکامی نه‌خۆشی دڵه‌ ، ئه‌مه‌ش وه‌کو ئالوده‌بوونه‌ به‌م نه‌خۆشیه‌ ، چونکه‌ واز هێنانی ئه‌سته‌مه‌ و وابه‌سته‌ی دونیا بووه‌ ، قیامه‌تی خۆی له‌ بیر کردووه‌ ..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ يُؤۡتِكُمۡ أُجُورَكُمۡ وَلَا يَسۡـَٔلۡكُمۡ أَمۡوَٰلَكُمۡ ٣٦﴾ [مُحَمَّد : ٣٦]واته‌ : [ إِنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ] ژیانی دونیا ته‌نها بریتییه‌ له‌ یاری و کات به‌سه‌ربردن [ وَإِنْ تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْأَلْكُمْ أَمْوَالَكُمْ ] به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئیمان بێنن وه‌ ته‌قوای خوای گه‌وره‌ بکه‌ن خوای گه‌وره‌ ئه‌جرو پاداشتی ته‌واوتان ئه‌داته‌وه‌، وه‌ فه‌رمانتان پێ ناکات به‌وه‌ی که‌ هه‌موو پاره‌که‌تان به‌ زه‌کات بده‌ن و له‌ پێناو خوای گه‌وره‌ ببه‌خشن به‌ڵکو بڕێکی که‌می که‌ له‌ چلدا یه‌که‌..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٦٤﴾ [العَنكَبُوت : ٦٤]واته‌ : {به‌ ژیانی دونیا هه‌ڵمه‌خه‌ڵه‌تێن} [ وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ] وه‌ ئه‌م ژیانی دونیایه‌ زۆر بێنرخه‌و له‌ناوده‌چێت و هیچ شتێك نیه‌ ته‌نها كات به‌سه‌ربردن و یاری كردنه‌ [ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ ] به‌ڵام ڕۆژی دوایی و ڕۆژی قیامه‌ت ژیانێكه‌ كه‌ به‌ هه‌میشه‌یی مرۆڤ تیایدا زیندووه‌و ئه‌مێنێته‌وه‌و له‌ناو ناچێت [ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ] ئه‌گه‌ر بزانن ده‌بێت ئه‌و ژیانه‌ هه‌ڵبژێرن كه‌ ده‌مێنێته‌وه‌ به‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ناو ده‌چێت..؟!

قال تعالى: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ١ مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ٢ لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ هَلۡ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡۖ أَفَتَأۡتُونَ ٱلسِّحۡرَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ ٣﴾ [الأَنبِيَاء : ١ - ٣] واته‌: [ اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ ] لێپرسینه‌وه‌ی ڕۆژی قیامه‌ت له‌ خه‌ڵكی نزیك بۆته‌وه‌ له‌ كاتێكدا خه‌ڵكی بێئاگان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی سه‌رقاڵی دونیان و پشتیان كردووه‌ له‌ قیامه‌ت و خۆیان بۆ ئاماده‌ نه‌كردووه‌..؟! [ مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنْ رَبِّهِمْ مُحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ] هیچ زیكرو یادو وه‌حی و قورئانێكیان بۆ نایات له‌ لایه‌ن په‌روه‌ردگاریانه‌وه‌ كه‌ تازه‌ دابه‌زیوه‌ ئیلا كه‌ گوێی لێ ئه‌گرن ئه‌وان یاری ئه‌كه‌ن وه‌ گرنگی و بایه‌خی پێ ناده‌ن، (ئیبنو عه‌بباس) به‌ كافرانی قوڕه‌یش ده‌فه‌رمێت: (ئه‌وه‌ چیتانه‌ قورئانی پیرۆز تازه‌ترین كتابه‌ ئێوه‌ شوێنی ناكه‌ون كه‌چی ئه‌ڕۆن پرسیار له‌ جوله‌كه‌ ده‌كه‌ن كه‌ ته‌وراته‌كه‌یان ده‌ستكاری كراوه‌و زیادو كه‌م كراوه‌..؟! [ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ ] دڵیشیان بێئاگایه‌و ئاوڕی لێ ناده‌نه‌وه‌ [ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا هَلْ هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ ] وه‌ سته‌مكاران قسه‌و چپه‌ چپی نهێنی خۆیان شارده‌وه‌و به‌ شاراوه‌یی وتیان: ئه‌م محمده‌ - صلى الله عليه وسلم - هیچ شتێك نیه‌ ته‌نها مرۆڤێكه‌ وه‌كو ئێوه‌ ئه‌خوات و ئه‌خواته‌وه‌و ژن دێنێت و ئه‌مرێت چۆن ئه‌بێ ئه‌مه‌ پێغه‌مبه‌ر بێت؟! [ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنْتُمْ تُبْصِرُونَ (٣) ] وه‌وتیان ئه‌مه‌ی كه‌ محمد - صلى الله عليه وسلم - هێناویه‌تی سیحره‌، ئێوه‌ چۆن شوێنی سیحر ئه‌كه‌ون له‌ كاتێكدا كه‌ خۆتان ئه‌یبینن..؟!

**شه شه م :(الزیغ) واته: لەسەر حەق لادان یان شك :**

**لە قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتێکدا ووشەی (الزیغ ) هاتووە ، بە مانای لە سەر ڕێ حەق لادان یان شك و گومان کردنە لە موسلمانان ، چونكە ئەوان دڵ یان حەق دەبینن بەلام لە سەری ڕێگای حەق لە دەدن ، لە سنووری فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا دەردەچن ، دڵە كانیان هەر گیز لە حەقی نابێژن ، بەلكو دڵ یان(زیغە )..؟!**

قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ٨﴾ [آل عِمرَان : ٧ - ٨]واته : {ئایەتی موحكەمو موتەشابیهـ} [ هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - خوای گەورە ئەو خوایەیە كە ئەم قورئانە پیرۆزەی بۆ سەر تۆ دابەزاندووە [ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ ] كە هەیە لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز موحكەمن واتە: یەك تەفسیرو یەك لێكدانەوەی هەیە زیاتر لە مانایەك هە ڵناگرێ و ماناكانی ئاشكراو ڕوونە [ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ ] كە ئەمانە ئەسڵ و بنچینەی قورئانی پیرۆزن [ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ ] وە هەندێك ئایەتی تریش هەیە موتەشابیهن كە زیاتر لە ماناو تەفسیرێك هەڵئەگرێ و هەموو كەس ماناكانی نازانێ [ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ ] جا ئێمە ئەمرمان پێ كراوە شوێن ئایەتی موحكەم بكەوین و ئیشی پێ بكەین، وە ئیمان بە ئایەتی موتەشابیهـ بێنین، بەڵام ئەو كەسانەی كە زەیغ و لادان لە حەق لە دڵیاندا هەیەو دڵیان لەسەر حەق لایداوە [ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ ] ئەمانە ئەچن شوێن ئایەتە موتەشابیهەكان ئەكەون بۆ ئەوەی گومان بۆ موسڵمانان دروست بكەن وە مەبەستیان ئەوەیە كە فیتنە و ئاشووب بۆ خەڵكی موسڵمان بنێنەوەو دینەكەیان لێ تێكبدەن وە ئەیانەوێ تەئویلیشی بكەن و لێكی بدەنەوە بەو شێوازەی كە گونجاو بێ لەگەڵ بیروبۆچوونی خراپی خۆیان [ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ ] لە كاتێكدا ئەو ئایەتە موتەشابیهانە هیچ كەسێك تەفسیرو لێكدانەوەی نازانێ تەنها زاتی پیرۆزی الله نەبێ [ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا ] جا هەیە لە زاناكان لێرە ڕائەوەستێ، واتە: تەنها خوا ئەزانێ و ئەوانەی لە زانست و زانیاری چەسپاو و دامەزراون ئەڵێن: ئیمانمان پێی هێناوە، وە هەیشە ئەفەرمووێ: تەنها خوای گەورەو زانا دامەزراوەكانیش مانای ئەو ئایەتە موتەشابیهانە ئەزانن وەكو ابن عباس ئەفەرمووێ: منیش یەكێكم لەو كەسانەی كە لێكدانەوەی ئەو ئایەتانە ئەزانم، وە زانایان ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان بەهەمووی هەیە بە موحكەم و بە موتەشابیهەوە چونكە هەمووی لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە [ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ] وە هیچ كەسێك بیر ناكاتەوە مەگەر ئەوانەی كە خاوەن عەقڵ و تێگەیشتن ..؟! [ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا ] ئەمە هەر قسەی زانا چەسپاو و دامەزراوەكانە لە عیلمدا ئەڵێن: ئەی پەروەردگار دڵمان لە حەق لانەدەی بەوەی كە شوێن ئایەتی موتەشابیە بكەوین لە دوای ئەوەی كە هیدایەتی ئێمەت دا بۆ حەق [ وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ (٨) ] وە لە لایەن خۆتەوە ڕەحممان پێ بكە بە دڵنیایی هەر تۆ بەخشەری هەموو شتێكی ..؟!

قال تعالى: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ۝١١٧﴾ [التَّوۡبَة : ١١٧]واتە : [ لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ ] خوای گەورە لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - خۆشبوو لەبەر ئەوەی پێشتر ئیزنی موونافیقانی دا کە دواکەون و نە یەن بۆ غەزا، یاخود لەبەر ئەوەی داوای لێخۆشبوونی بۆ (ئەبو تاڵیب)ی مامەی کرد، وە لە موهاجیرو ئەنصارەکان خۆش بوو لە هەر تاوانێك کە کردبێتیان [ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ ] ئەوانەی کە شوێن پێغەمبەری خوا کەوتن - صلى الله عليه وسلم - لە غەزای (تەبووك)دا لە کاتی تەنگانەدا کە کاتێکی یەکجار گەرم بوو، وە خواردنیان زۆر کەم پێبوو تا خورمایەکیان دەکردە دوو لەتەوە بۆ دووکەس، وە ئاو نەبوو زۆر تینوو بوون، وە دوژمن زۆر بەهێز بوو [ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ] کە نزیك بوو دڵی هەندێك لە موسڵمانان بگۆڕێت بەوەی کە دوابکەون لە غەزاکەدا [ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ] پاشان خوای گەورە لەوانیش خۆشبوو [ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ] بەراستی خوای گەورە زۆر بەڕەئفەت و ڕەحمەت و سۆزو بەزەیی و میهرەبانە لەگە ڵیان..؟!

قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝٥﴾ [الصَّف : ٥]واتە: { بەنی ئیسرائیل ئازاری موسا پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - دەدەن} [ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي ] وە کاتێك کە موسا - صلى الله عليه وسلم - بە قەومەکەی فەرموو: ئەی قەومی خۆم بۆچی ئازارم ئەدەن بەوەی کە سەرپێچی فەرمانم ئەکەن یان جوێنم پێ دەدەن و قسەی ناشیرینم پێ ئەکەن، یاخود تانەو تەشەرم لێ ئەدەن [ وَقَدْ تَعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ ] لە کاتێکدا کە ئەزانن من پێغەمبەری خوای گەورەم و بۆ لای ئێوە نێردراوم [ فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ ] کاتێك لە شوێنکەوتنی حەق لایاندا بەوەی ئازاری پێغەمبەرەکەیاندا خوای گەورە زیاتر دڵیانی لەسەر حەق و هیدایەت لادا [ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ] وە خوای گەورە هیدایەتی کەسانێکی فاسق نادات کە لە گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچووبێتن..؟!

# دڵ ی مردوو

بێ گومان دڵ ی مردوو لە خالی بەرامبەر دلی زیندوودا جێگیرە ، دڵی مردوو دلێکە کە خاوەن ژیانێکە بە واتا راستەقینە کەنا ، پەروەردگاری خۆی ناناسێ ، بریار و فەرمانەکانی جێ بەجێ ناکات یان پەیرەوی ناکان ، وە بەدوای بەدەست هێنانی رەزامەندی (خوای گەورە) وە نیە ، بەلکو هاورێی هەواو هەوەس و ئارەزووەکانیەتی دونیا پەرستە ، بەوەی کەوا ئەم کێشمەکێش و هەواو هەوەس و ئارەزوو بازییە دەبێتە هۆی خشم و توورەیی پەرەوەدگار گرنگی پێ نادات و گوێی پێ نادات ..؟! مەبەستی ئەو تەنیا گەیشتنە بە ئامانجە تاونبار و گوناهبارەکانی خۆیەتی و رەزامەندی و توورەیی پەروەردگار بۆ ئەو دڵ ی مردوو گرنگ نییە ..؟!مەبەست لە دڵ ی زیندوو وە دڵ ی مردوو ، ئەوەیە کە ژیان و مردن بە واتای زاراویی نیە ، بەلکو مەبەست لە زیندوو بوونی دڵ هۆشیاری بە ئاگایی تەقوداری چاکە کاریە ، وەرگرتنی حەق و پاکی دڵ سۆزی و خواپەرستنی راستەقینەیە ، دڵی مردووش پێچەوانەی ئەم کردارە چاکانەیە، کە جگەلە خوتا شتێ کی تر بپەرستێ و یان خراپەکاری و فسادی و جاهلی و نەزانی و غافل بوون لە پەروەردگاری خۆیەتی ..؟! چونکە خاوەنی دڵ ی مردوو تەواوی خۆشەویستی ، توورەیی ، رەزامەندی ، رەق و توورەیی و قینە و هەستی گەورەیی تایبەت کردووە بە غەیری خواوەوە و لە خەلکانی تر پەیرەوەی و گوێرایەلی دەکات ..؟! چونکە تەواو ئەوانەی کە مەبەستیەتی کە ئەگەر شتێکی خۆش بوویێت یاخود رقی لە شتێ هەبێ ، ببەخشێ و یاخود لە بەخشین و خەلات کردن دوورە پەرێزی بکات ، تەواو ئەوانە لە پێناوی هەوا هەوەس و ئارەزووەکانی خۆی ئەنجامی دەدات ..؟! بەلکو دڵ ی مردوو تەواو هزرو بیری خۆی دەخاتە گەر بۆ بەدەست هێنانی ئامانده قێزەونەکانی دونیا ، وە ئامانجە دونیا کانی بەکارهێناوە و سەرخۆشی و بێ ئاگایی و هەواو هەوەس و خۆش ویستنی دونیا سەراپای ئەوی داگیر کردووە و هاواری گەرانەوە بۆ گوێرایەلی کردنی پەروەردگار و بەدەست هێنانی توێشووی دوا رۆژ لە شوێنێکی دوورەوە و گوێ ناداتە ئامۆژگاری ئامۆژگاری کەران و گرنگی نادات بە بەزەیی و دلسۆزی دلسۆزان و لە هەر شەیتانێکی دیار ونا دیار گوێرایەلی دەکات ..؟!تەنیا مەسەلە ماددیی و دونیاییەکانە کە توورەیی و یاخود ئاسوودەیی و دلخۆشی ئەو دەبزوێنی و گوێی ئەو لە ئاست بیستنی حەق و راستیدا کەرە و هیچ نابیستێ و بۆ بیستنی شتی نارەوا و هیچ و پووچ کراوە و والایە و دەبیستێ ..؟!

# سیفەتەکانی دڵ ی مردوو

## یەکەم : (العمى ) واتە: دڵ ی کوێر :

بەلێ ئەمەش یەکێك لە نەخۆشی دڵ ئەویش دڵ ی کوێرە ، هەروەك لە (الراغب ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : لە دەست دانی بینی و تێروانینە ، هەروەك (خوا گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢﴾ [عَبَس : ٢]واتە : [ أَنْ جَاءَهُ الْأَعْمَى (٢) ] کاتێك کە پیاوە نابیناکە (عبدالله-ی کوڕی ئوم مەکتوم) هات بۆ لای، خوای گەورە لۆمەی پێغەمبەری خوای کرد - صلى الله عليه وسلم - (نابێت بانگخوازان تەنها گرنگی و بایەخ بە دەسەڵاتداران و گەورەکان و دەوڵەمەندەکان بدەن بەڵکو ناودارو بێناو، فەقیرو دەوڵەمەند، دەسەڵاتدارو بێ دەسەلات، ژن و پیاو، گەورەو بچووك ئەبێ گرنگی و بایەخ بە هەمووی بدرێت پاشان خوای گەورە خۆی هیدایەتی هەر کەسێك ئەدات کە ویستی لێ بێت و ئەو کەسەیش شایانی هیدایەت بێت)..؟!

بەلێ کوێر بوون لە قورئانی پیرۆز لە گەل دڵ بەکارهاتووە ، قال تعالى: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ۝٤٦﴾ [الحَج : ٤٦]واتە: {دڵ شوێنی تێگەیشتنە} [ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا ] ئایا ئەم کافرانەی مەککەش بەسەر زەویدا نەگەڕاون تا ئەم شتانە بە چاوی خۆیان ببینن وە دڵیان هەبێ تا بە دڵیان تێبگەن [ أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ] یاخود گوێیان هەبێت و شتی پێ ببیستن [ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ ] بەڵام چاو کوێر و نابینا نابێ [ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ] بەڵکو ئەو دڵەی کە لە سینگدایە کوێرەو حەقیقەت و ڕاستیەکان نابینێ..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعۡمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ۝٧٢﴾ [الإِسۡرَاء : ٧٢]واتە : [ وَمَنْ كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى ] وە هەر کەسێکیش لە دونیادا کوێر بێت و حەق نەبینێ [ فَهُوَ فِي الْآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلًا ] ئەوە لە قیامەتیشدا هەر کوێرە، وە گومڕاترەو ڕێگای خۆی نادۆزێتەوە..؟!

قال تعالى: ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ۝١٢٤ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ۝١٢٥ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ۝١٢٦﴾ [طه : ١٢٤ - ١٢٦]واتە: {پشت کردن لە ئیسلام هۆکاری ژیان ناخۆشییە} [ وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي ] وە هەر کەسێکیش پشت لە دین و قورئانەکەی من بکات [ فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا ] ئەوە بە دڵنیایی ژیانێکی تەنگ و تەسك لە دونیادا ئەیژێنین لە دوودڵی و گومان و دڵەڕاوکێ و شڵەژاویدا دەژێت، وە لەناو گۆڕیشدا سزا دەدرێت و گۆڕەکەی لێ تەسك دەکرێتەوە تا پەراسوەکانی هەموو دەشکێت [ وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى (١٢٤) ] وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری ئەکەین..؟! [ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنْتُ بَصِيرًا (١٢٥) ] ئەویش ئەڵێ: ئەی پەروەردگار بۆ بە کوێری حەشرم ئەکەی لە کاتێکدا کە من لە دونیا هەردوو چاوم بینا بووەو کوێر نەبووم..؟! قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا ] خوای گەورە ئەفەرمووێ: بەم شێوازە ئایەتەکانی ئێمەت پێگەیشت تۆ پشتت تێ کردو پشتگوێت خست و وازت لێ هێناو تەماشات نەکرد [ وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنْسَى (١٢٦) ] ئێستاش ئاوا بە کوێری بەجێ ئەهێڵدرێی لەناو ئاگری دۆزەخداو وەکو لەبیرکراو مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێت..؟!

**یەکەم : (الران) واتە: دڵی تەواو داپۆشیوە بە رەش یان تاوان کردن لە سەر تاوان:**

**بەلێ لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ داهاتووە مانای ووشەی (الران ) واتە: وەکو خالێکی رەش  بە سەر دڵ و دەروونیەوە ..؟!**

**لە (ابو هريره ) — خوا لێ رازی بێت — دە گێرێتەوە دەلێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((إن العبدَ إذا أخطأ خطيئةً نُكِتتْ فی قلبهِ نُكتةً سوداءَ فإذا هو نزعَ واستغفرَ وتابَ سُقلَ قلبهُ وإن عادَ زيدَ فيها حتى تعلو قلبهُ وهو الرانُ الذی ذكرَ اللهُ كَلاّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ )) . [1] **واتە: هەر بەندەیەك کە گوناهو تاوان دەکات ، خێرا خالێکی رەش  بە دڵ یەوە دەنووسیٚ ، جا ئەگەر تەوبەی کرد و پەیشیمان بوویەوە ، ئەوا لێ پاك دەبێتەوە ، ئەگەر نا ، وردە وردە زیاد دەکات تا بە تەواوی دڵ ی ژەنگ دەگرێت ، هەر ئەوەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت :** قال تعالى: ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤﴾ [المُطَفِّفِين : ١٤]واتە : [ كَلَّا ] واتە: نەخێر نابێ وابن، وە وانیە وەکو ئەوان کە ئەیڵێن بەڵکو ئەم قورئانە فەرموودەو کەلام و وەحی خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی - صلى الله عليه وسلم - [ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (١٤) ] بەڵکو ئەوەی کە وای لێ کردوون ئیمان نەهێنن ئەوەیە (ڕان) لەسەر دڵیانە، (حەسەنی بەصری) ئەفەرمووێ: (ڕان): واتە: تاوان لەسەر تاوان ئەکەن تا دڵیان تەواو ڕەش ئەبێ و دڵیان دائەپۆشێ، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئەفەرمووێ: (کاتێك بەندە تاوانێك بکات خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی دروست ئەبێ، ئەگەر تەوبە بکات و داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکات ئەوە نامێنێت و سپی ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر تاوان لەسەر تاوان بکات ئەوە خاڵی ڕەش لەسەر خاڵی ڕەش لەسەر دڵی دروست ئەبێ تا دڵی تەواو ڕەش ئەبێ ئەوە ئەو (ڕانە)یە کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئەکات)..؟!

[1] -السنن الترمذي برقم (٣٣٣٤).

قال تعالى: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٖ ۝٧ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ۝٨ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ۝٩ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ۝١٠ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝١١ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ۝١٢ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ۝١٣ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ۝١٤﴾ [المُطَفِّفِين : ٧ - ١٤]واته: [ كَلَّا ] واته: نه‌خێر نابێت حاڵیان وابێ [ إِنَّ كِتَابَ الْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ (٧) ] به دڵنیایی په‌ڕاوی کرده‌وه‌ی خراپه‌کاران ئه‌وانه‌ی که له کرێن و فرۆشتندا فێڵ ئه‌که‌ن، وه به‌سه‌رجه‌م خراپه‌کاران ئه‌وانه‌ی که سه‌رپێچی فه‌رمانی خواو پێغه‌مبه‌ری خوا ئه‌که‌ن - صلى الله عليه وسلم - وه تاوان ئه‌که‌ن ئه‌وان ناونووس کراون له (سِجِّين) واته: له سجن و به‌ندینخانه‌ی دۆزه‌خدان، وه له شوێنه ته‌سکه‌کانی دۆزه‌خدا ئه‌مانه به‌ند ئه‌کرێن و سزا ئه‌درێن، وتراوه: له ژێر زه‌وی حه‌وته‌مه‌وه‌یه تا دابه‌زی بۆ ژێر زه‌ویه‌کانی تر ته‌سکترو سه‌ختتر ئه‌بێته‌وه، وه وتراوه له ناو بیره‌کانی دۆزه‌خدان، ئه‌وان له‌و شوێنانه‌دا سزا ئه‌درێن..؟! [ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سِجِّينٌ (٨) ] ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆ چوزانی ئه‌و سجن و به‌ندینخانانه‌ی ناو ئاگری دۆزه‌خ چۆنه، ئه‌مه بۆ به‌گه‌وره‌زانینه، واته: له‌وپه‌ڕی سه‌ختی و سه‌غڵه‌تی و ته‌نگی و سزادایه..؟! [ كِتَابٌ مَرْقُومٌ (٩) ] ئه‌مانه کتابیان هه‌مووی وه‌کو خۆی نووسراوه‌و لێ بۆته‌وه‌و زیادو که‌م ناکرێت..؟! [ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ (١٠) ] هه‌ڕه‌شه‌ی قورس و سه‌خت و ئاگری دۆزه‌خ بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی که ئه‌و ڕۆژه به‌درۆ ئه‌زانن..؟! [ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ (١١) ] ئه‌وانه‌ی که ڕۆژی قیامه‌ت که ڕۆژی سزاو لێپرسینه‌وه‌یه به‌درۆی ئه‌زانن..؟! [ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ (١٢) ] وه هیچ که‌سێك ئه‌و ڕۆژه به‌درۆ نازانێ مه‌گه‌ر که‌سانێك که زۆر سنووریان به‌زاندبێ له کرده‌وه‌کانیانداو حه‌رامیان خواردبێت و تاوانبار بووبێتن و تاوانیان ئه‌نجام دابێت و له تاوان نه‌گه‌ڕابێتنه‌وه..؟! [ إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ (١٣) ] کاتێك ئایه‌ته‌کانی ئێمه و قورئانی پیرۆزی به‌سه‌ردا بخوێنیته‌وه ئه‌ڵێ: ئه‌مه فه‌رمووده‌و فه‌رمایشت و وه‌حی خوای گه‌وره نیه بۆ پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - به‌ڵکو ئه‌مه به‌سه‌رهات و سه‌رگوزشته‌و چیرۆکی ئوممه‌تانی پێشتره..؟! [ كَلَّا ] واته: نه‌خێر نابێ وابن، وه وانیه وه‌کو ئه‌وان که ئه‌یڵێن به‌ڵکو ئه‌م قورئانه فه‌رمووده‌و که‌لام و وه‌حی خوای گه‌وره‌یه بۆ پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی - صلى الله عليه وسلم - [ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (١٤) ] به‌ڵکو ئه‌وه‌ی که وای لێ کردوون ئیمان نه‌هێنن ئه‌وه‌یه (ڕان) له‌سه‌ر دڵیانه، (حه‌سه‌نی به‌صری) ئه‌فه‌رمووێ: (ڕان): واته: تاوان له‌سه‌ر تاوان ئه‌که‌ن تا دڵیان ته‌واو ڕه‌ش ئه‌بێ و دڵیان دائه‌پۆشێ، پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئه‌فه‌رمووێ: (کاتێك به‌نده تاوانێك بکات خاڵێکی ڕه‌ش له‌سه‌ر دڵی دروست ئه‌بێ، ئه‌گه‌ر ته‌وبه بکات و داوای لێخۆشبوون له خوای گه‌وره بکات ئه‌وه نامێنێت و سڕی ئه‌بێته‌وه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر تاوان له‌سه‌ر تاوان بکات ئه‌وه خاڵی ڕه‌ش له‌سه‌ر خاڵی ڕه‌ش له‌سه‌ر دڵی دروست ئه‌بێ تا دڵی ته‌واو ڕه‌ش ئه‌بێ ئه‌وه ئه‌و (ڕانه)یه که خوای گه‌وره له قورئاندا باسی ئه‌کات)..؟!

## دووەم: (الکفر) واتە: بێ باوەڕی :

**بەڵێ مەترسیدارترین هۆکاری دڵی مردوو ، بێ باوەڕی یان کوفر کردنە ..؟! هەر وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.**

قال تعالی: ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْۖ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٩٣﴾ [البَقَرَة : ٩٣]واتە: [ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ ] وە ئێمە عەهدو پەیمانمان لە ئێوە وەرگرت [ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ ] وە وەکو باسمان کرد خوای گەورە کێوی (طور)ی هەڵکێشاو خستیە بان سەریان و سێبەری بۆیان کرد [ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ ] دەی ئێستا ئەوەی کە بۆتان هاتووە بە جددی و بە گرنگی و پڕ بایەخەوە وەری بگرن [ وَاسْمَعُوا ] وە ببیستن وە وەری بگرن وە گوێڕایەڵ بن [ قَالُوا سَمِعْنَا ] وتیان: بەڵێ ئەوە بە گوێ بیستمان [ وَعَصَيْنَا ] بەڵام سەرپێچیت ئەکەین و فەرمانەکانت وەرناگرین و قبووڵی ناکەین [ وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ] خۆشەویستی گوێرەکەکەی کە ئەیانپەرست چوو بووە ناخی دڵیانەوە بەهۆی کوفر کردنیانەوە [ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ بِهِ إِيمَانُكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (٩٣) ] ئەی محمد صلى الله عليه وسلم بڵێ: بەڕاستی ئەم ئیمانەی ئێوە ئەمرتان پێ ئەکات بە خراپترین شت کە کوفر کردن و سەرپێچی کردنی پێغەمبەرانە..؟!

قال تعالی: ﴿كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ١٢﴾ [الحِجۡر : ١٢]واتە: [ كَذَلِكَ نَسْلُكُهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ (١٢) ] بەم شێوازە گومڕایی و شیرك ئەخەینە ناو دڵی تاوانبارانەوە ئەوانەی کە شایەنی هیدایەت نین و عینادی دەکەن لە وەرگرتنی حەق [ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِ ] ئیمان ناهێنن بەو قورئانە کە دامانبەزاندووە..؟!

## سێ یه‌م : (النفاق ) واته‌: دوو ڕوویی :

به‌ڵێ دوو ڕوویی ئه‌و نه‌خۆشیه‌یه که دڵ تووشی ده‌بێت ، هه‌لبه‌ته سه‌ر ئه‌کێشێ بۆ دڵ ی مردوو ، چونکه سه‌رتا به دووڕوویی ده‌ست پێ ده‌کات ، نه‌خۆشیه‌که‌ی سه‌رجه‌م لاشه‌ی ده‌گریته‌وه ئه‌و کاته ده‌بێته وه‌ستانی دڵ یان دڵ ی مردوو ، هه‌ر بۆیه ئه‌و که‌سه دڵ ی زیندووه که یادو زکری (خوای گه‌وره ) ده‌کات گوێڕایه‌لی فه‌رمانه کان و خۆی دوور ده‌کات له قه‌ده‌غه‌کراوه کانی ، به‌لام سیفه ته‌کانی که‌سی دووڕوو که که‌سێکی نه‌خۆشه ، پێچه‌وانه‌ی هه‌موو چاکه کاریه‌که فه‌رمان ده‌که‌ن به خراپه کاری دوور ده‌که‌ونه‌وه له چاکه کاری ، بۆیه دڵی ره‌ش ده‌بێت و نه‌خۆشیه‌که‌ی زیاد ده‌کات و دله‌که‌ی ده‌مرێت ..؟!هه‌روه‌ك قال تعالی: ﴿ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٦٧﴾ [التَّوْبَة : ٦٧] واته : [الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ ] پیاوانی دووڕوو ئافره‌تانی دووڕوو [ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ ] هه‌ندێکیان دۆست و پشتیوانی هه‌ندێکی تریانن [ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ ] فه‌رمان ئه‌که‌ن به خراپه‌و ڕێگری ئه‌که‌ن له چاکه [ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ] وه ده‌ستیان تووند ئه‌گرن و ڕه‌زیلن له به‌خشین [ نَسُوا اللَّهَ ] خوای گه‌وره‌یان له‌بیر کرد [ فَنَسِيَهُمْ ] خوای گه‌وره‌ش وه‌کو له‌بیرچوو مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵدا ده‌کات و ئیهمالیان ده‌کات، ئه‌گه‌رنا خوای گه‌وره هیچ شتێك له بیر ناكات [ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ] به‌ڕاستی مونافیقان ئه‌وانن که فاسقن و ده‌رچوون له گوێڕایه‌ڵی خوا..؟!

قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ١٤٥﴾ [النِّسَاء : ١٤٥]واته: [ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ ] به‌دڵنیایی مونافیقان له خوارترین پله‌ی ئاگری دۆزه‌خن، که (ده‌رك) یان (ده‌ره‌كات) پله‌یه بۆ خواره‌وه به پێچه‌وانه‌ی (ده‌ره‌ج) یان (ده‌ره‌جات) که پله‌یه بۆ سه‌ره‌وه، بۆیه به‌هه‌شت (ده‌ره‌جاتی) هه‌یه پله‌كانی بۆ سه‌ره‌وه‌یه‌و دۆزه‌خ (ده‌ره‌كاتی) هه‌یه پله‌كانی بۆ خواره‌وه‌یه، خوارترین پله‌ی ئاگری دۆزه‌خ که سه‌خترین سزایه بۆ مونافیقانه [ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا (١٤٥) ] وه نابینی كه‌س پشتیوانیان بێ وه ڕزگاریان بكات له ئاگری دۆزه‌خ..؟!

قال تعالی: ﴿وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ١٢﴾ [الْأَحْزَاب : ١٢]واته : {هه‌ڵوێستی مونافیقو دووڕووان} [ وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ ] وه مونافیق و دووڕووان ئه‌وانه‌ی که گومان له دڵیاندا بووه‌و شڵه‌ژابوون وتیان: [ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا (١٢) ] خواو پێغه‌مبه‌ری خوا - صلى الله عليه وسلم - هیچ به‌ڵێنێكیان به ئێمه نه‌دا ته‌نها ئێمه‌یان له خشته‌بردو وایان لێ كردین له خۆمان بایی بین، كاتێك كه پێغه‌مبه‌ر - صلى الله عليه وسلم - خه‌نده‌ق و چاڵه‌كه‌ی هه‌ڵئه‌كه‌ند ئه‌و كاته موژده‌ی موڵكی فارس و ڕۆمی پێدان، یه‌كێك له مونافیقان وتی: یه‌كێك له ئێمه ناتوانێ بڕوات سه‌رئاو بكات ئه‌م لێره باسی كه‌نزو موڵكی ڕۆم و فارس ئه‌كات..؟!

قال تعالى: ﴿ * لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ ﴾ [الأَحْزَاب : ٦٠]واته: {سزای بڵاو كردنه‌وه‌ی پڕوپاگه‌نده‌ی درۆ} [ لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ الْمُنَافِقُونَ ] ئه‌گه‌ر بێتوو مونافیقان ده‌ست هه‌ڵنه‌گرن و واز نه‌هێنن [ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ ] وه‌ ئه‌و كه‌سانه‌یشی كه‌ نه‌خۆشی گومان و دوودڵی له‌ دڵیاندایه‌ كه‌ مونافیقانن، یان زیناكارانن [ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ ] وه‌ ئه‌وانه‌یشی كه‌ پڕوپاگه‌نده‌ بڵاو ئه‌كه‌نه‌وه‌ له‌ مه‌دینه‌دا كه‌ ئه‌ڵێن: موسڵمانان تێكشكاون یان كوژراون یان دوژمن ده‌داته‌ سه‌ریاندا ئه‌گه‌ر ئه‌مانه‌ واز نه‌هێنن [ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ] ئه‌وه‌ ئه‌ی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆ زاڵ ئه‌كه‌ین به‌سه‌ریانداو ڕیشه‌كێشیان بكه‌ی [ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا ] پاشان له‌ مه‌دینه‌دا نه‌مێننه‌وه‌و ده‌ریان بكه‌ی [ إِلَّا قَلِيلًا ] ته‌نها ماوه‌یه‌كی كه‌م نه‌بێ..؟!

قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٨ - ١٠]واته: {هه‌ندێك له‌ سیفاتی مرۆڤی مونافیقو دووڕوو} پاشان خوای گه‌وره‌ دێته‌ سه‌ر باسكردنی مونافیقان كه‌ له‌ مه‌دینه‌ ده‌ركه‌وتن: [ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ (٨) ] له‌ناو خه‌ڵكیدا كه‌سانێك هه‌ن كه‌ ئه‌ڵێن: ئێمه‌ ئیمانمان به‌خوای گه‌وره‌و به‌ ڕۆژی دوایی هه‌یه‌ به‌ڵام ڕاست ناكه‌ن و له‌ حه‌قیقه‌ت و ڕاستیدا ئیمانیان نیه‌..؟! [ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩) ] به‌ حسابی خۆیان فێڵ له‌ خوای گه‌وره‌و باوه‌ڕداران ئه‌كه‌ن به‌ڵام له‌ حه‌قیقه‌ت و ڕاستیدا فێڵ له‌ هیچ كه‌سێك ناكه‌ن ته‌نها له‌ خۆیان نه‌بێ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی فێڵ له‌ خوای گه‌وره‌ ناكرێ به‌ڵام خۆیان هه‌ست ناكه‌ن..؟! [ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ ] ئه‌مانه‌ نه‌خۆشی شه‌ك و گومان و نیفاق له‌ دڵیاندایه‌ [ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا ] خوای گه‌وره‌ش ئه‌و نه‌خۆشیه‌یانی زیاتر كرد له‌به‌ر ئه‌وه‌ی حه‌قیان ناسی و لایاندا لێی و ئیمانیان به‌ پێغه‌مبه‌ری خوا نه‌هێنا صلى الله عليه وسلم [ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ (١٠) ] وه‌ سزایه‌كی زۆر به‌ ئێش و ئازاریان بۆ هه‌یه‌ به‌هۆی ئه‌و درۆ كردنه‌ی كه‌ ئه‌یانكرد، بانگه‌شه‌ی ئیمانیان ده‌كردو ئیمانداریش نه‌بوون..؟!

